# الفرقان

## بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان

به كوردی

نووسینی

ابن تيمية

وه‌رگێرانی

نوری هه‌مه‌وه‌ند

به‌رگی یه‌که‌م

نارین




نـــاوی کتێـــــب: الفرقان بین أولیاء الرحمن وأولیاء الشیطان بە کوردی.

نووسیـــنــــــی: ابن تیمیة.

وەرگێڕانـــــــی: نوری هەمەوەند.

نـەخشەسازی ناوەوە: کۆمپیوتەری نارین(کامران رفیق).

نورەو ســـاڵی چـــاپ: چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٦ .

نـــــــــــرخ: ٢٥٠٠٠ د.ع .

ژمـــارەی سپـاردن: (٧٦١) ی ساڵی (٢٠١٥) ی پێدراوە.




هەولێر/ بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی

Website: www.nareenpub.com

E-mail: info@nareenpub.com

تەلەفۆن:٦٦٢٥١١٩٨٢(٠٠٩٦٤)

مۆبایل:٠٠٩٦٤٧٥٠٤٠٦٤٦١٠

# الفرقان

## بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان

### به کوردی

بەرگی یەکەم

**نووسینی**

ابن تيمية

**وەرگێڕانی**

نوری هەمەوەند

ناریـن

## پێشەكی وەرگێڕ

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان، پەروەردگاری خاوەن میهرەبانی و بەزەیی، خاوەنی ڕۆژی پاداشت و سزا، پەرستراوی ڕاستەقینەی هەر هەبوو و بەردەوامی هەتاهەتایی، ڕاگری ئاسمانەكان و زەوی و هەموو بونەوەر، ئەو خوایەی كە سەر بەرزی تەنها لە گوێڕایەڵی ئەودا بە دەست دێت، شایەتی دەدەم كە تەنها (اللَّهُ) شایستەی پەرستن و ملكەچییە، تاك و تەنهایە لەسیفاتی مەزنییەتی و تەواویەتی دا هیچ هاوبەش و هاوتایەكی نییە .

هەر كات ئادەمیزاد هەستا بەئەركی (تەنها خواپەرستی) و دووركەوتنەوە لەهەموو ئەوانەی كە جگە لەخوا دەپەرسترێن ئەوا ڕزگاری دەبێت و، دەبێتە دۆستێكی تەواوی خوای گەورە.

خوێنەری بەڕێز: كتێبخانەی كوردی كتێبی ئاینیی زۆری تێدایە، لە هەموو بوارەكانی بیروباوەڕو، فیقه و، موعامەلات و، هەموو بوارەكانی دیكەدا، بەڵام تاوەكو ئێستا كتێبێكی بەم جۆرەی تێدانییە كە بەتەواوی دۆستانی خوای گەورەو دۆستانی شەیتان بە خەڵك ئاشناكات و، لێكیان جیابكاتەوە، خەڵكیش بزانن چۆن دەبن بەدۆستی خوای گەورە و چۆن خۆیان لە شەیتان و فێڵەكانی بە دور بگرن .

لە ڕاستیدا ئەم كتێبەی پێشەوا ئیبنوتەیمیە لەبوارەكەی خۆیدا تاكە، پێویستە تێكڕای خەڵكی بیخوێننەوەو سوودی لێوەربگرن، بۆیە بە ئەركی سەرشانی خۆمم زانی بەم كارە هەستم و، تێكڕای خوێنەرانی كوردی لێ ئاشنا بكەم.

ئەو كارانەی لەم كتێبەدا ئەنجامم داون:

١_ وەرگێڕانی كتێبەكە .

٢_ بۆ زیاتر تێگەیشتن لەناوەڕۆکی کتێبەکە هەستاوم بە وەرگێڕانی ئەو شەرحەی کە شێخی پایە بەرز (صالح بن فوزان الفوزان) بۆ ئەم کتێبە کردویەتی، بە دەرهێنانی لە ئینتەرنێت.

٣_ ئەو شەرحەی کە شێخ (صالح بن فوزان الفوزان) کردویەتی بۆ کتێبەکە شەرحێکی بەپێزەو تەواوە، بەڵام هێندێ جار شەرحی هێندێ بڕگەی نەکردووە، منیش بۆ ئاشناکردنی زیاتری خوێنەری کورد هەستام بە دەرهێنانی شەرحی شێخانی تر لە ئینتەرنێت و وەرگێڕانی و لە جێگەی پێویستی خوێدا ئاماژەم پێداوە.

داواکارم خوای گەورە بۆ خاتری ناوە پیرۆزو سیفەتە جوانەکانی ئەم کردارەمان قبوڵ بکات و بە لوتف و کەرەمی خۆی لە تەرازووی چاکەکانماندا بینوسێت.

نوری هەمەوەند

کەلار ٢٠١٣

الفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان

لشيخ الإسلام ابن تيمية

رحمه الله تعالى

## بسم الله الرحمن الرحيم

خُطبة الكتاب

الحمد لله، نستعينه و نستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهد الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، ونشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، ونشهد أن محمداً عبده ورسوله، أرسله بالهدى ودين الحق ليظهره على الدين كله، وكفى بالله شهيداً.

**سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە پێغەمبەری ﷺ پێش ڕوودانی قیامەت نارد، وەکو مژدەدەرو ترسێنەر، بانگەواز کارێك بۆ ڕێگەی ڕاستی خوا بە فەرمانی خوا، وەکو چرایەکی ڕۆشنکار، کردی بە هۆکارێك بۆ هیدایەتدان لە گومڕایی، هۆکارێك بۆ تێگەیاندن لە سەرلێشێواندن، کردی بە ڕێنوێن بۆ گەڕانەوە لەهەڵەو تاوان و لەڕێ لادان، کردی بەهۆکارێك بۆ کردنەوەی چاوگەلێکی کوێر، گوێگەلێکی کەڕ، دڵگەلێکی داپۆشراو، کردی بە هۆکارێك بۆ جیاکردنەوەی هەق و پووچی، ڕێنوێنی و گومڕایی، ژیری و سەرلێشێوان، ئیمانداران و کافران، بەختیارانی ئەهلی بەهەشت و بەد بەختانی ئەهلی دۆزەخ، لە نێوان دۆستانی خواو دوژمنانی خوا.**

**بۆیە کە پێغەمبەری خوا _صلى الله عليه وسلم_ شایەتی بۆ هەر کەس دەدات دۆستی خوایە ئەوا دۆستی ڕەحمانە. کە شایەتیشی بۆ هەر کەس دابێ دوژمنی خوایە ئەوا یەکێکە لە دۆستانی شەیتان[1]**

---

**[1] پێشەوا (ابن تيمية) _ڕەحمەتی خوای لێبێت_ ئەم کتێبە بەنرخەی سەبارەت بە مەسەلەیەکی گرنگ نووسیوە، کە هەق و ناڕەوایی تێدا تێکەڵ بە یەکتر بووە، لە سەردەمی خۆیەوە تاوەکو ئەمڕۆش ئەو تێکەڵ و شێواندنە هەر بەردەوامە، بەڵام واپێویستە هەق ڕوون بکرێتەوە، چونکە لە کاتی تێکەڵی و شێواندندا پێویستە**

کەسی زاناو ئاگادار ئەم تێکەڵ بوون و شێواندنە بەدەرخات و، بۆ جەماوەری خەڵك هەق ئاشکرا کات، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلا تَكْتُمُونَهُ﴾[آل عمران: ١٨٧] واتە: (بێنەوە بیریان) کاتێك کە خوا وەری گرت پەیمان لەوانەی کە نامەیان پێ بەخشرا بوو دەبێ ئەو نامەیە روون بکەنەوە بۆ خەڵکی و نەیشارنەوە. هەروەها خوای تعالی دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنْزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى مِنْ بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ أُولَئِكَ يَلْعَنُهُمُ اللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللاعِنُونَ﴾[البقرة: ١٥٩] واتە بێ گومان ئەوانەی دەیشارنەوە ئەوەی کە ناردومانەتە خوارەوە لە ئایەتانی ڕۆشن و ڕێنمایی دوای ئەوەی کە ڕوونمان کردۆتەوەبۆ خەڵکی لە نامەی (تەورات و ئینجیل)دا ئەوانە خودا نەفرەتیان لێ دەکات و نەفەرەتکارانیش نەفرەتیان لێ دەکەن. بۆیە شێخ _ ڕەحمەتی خوا لێبێت _ بەم کارە هەستا، سەرەڕای چەندین کاری مەزنی تریش کە لە سەردەمی خۆیدا پێی هەستا، وەکو سەرخستن و ئاشکراکردن و ڕوونکردنەوەی هەق و، بەرپەرچدانەوەو ڕەتدانەوەو وەڵامدانەوەی پووچیی و ناڕەوایی، بۆ ئەوەی شتەکە بە تێکەڵ و پێکەڵیی و بە شێواوی لە بیری خەڵکەوە نەمێنێتەوە . بۆیە شێخ _ ڕەحمەتی خوا لێ بێت _ بەم کارە هەستا، سەرەڕای چەندین کاری مەزنی تریش کە لە سەردەمی خۆیدا پێی هەستا، وەکو سەرخستن و ئاشکرا کردن و ڕوونکردنەوەی هەق و، بەرپەرچدانەوەو ڕەتدانەوەو وەڵامدانەوەی پووچیی و ناڕەوایی، بۆ ئەوەی شتەکە بە تێکەڵ و پێکەڵیی و بە شێواوی لەبیری خەڵکەوە نەمێنێتەوە.

لەو مەسەلە گرینگانەی کە شێخ هەستا بە ڕوونکردنەوەی، مەسەلەی دۆستایەتی خواو دۆستایەتی شەیتان بوو، چونکە خەڵك لەم بارەوە بوونەتە دوو کۆمەڵەوە، بڕواداران و کافران، بڕواداران دۆستانی خوان و، کافرانیش دۆستانی شەیتانن، بەڵام لە

زەمەنی شێخداو تا ئێستاش کەسانی باوەڕپووچ و خوارفی جیاوازی لە نێوان دۆستانی خواو دۆستانی شەیتاندا ناکەن، بۆیە و فاڵچی و جادووگەر و چاو بەستکەر بە دۆستی خوا دادەنێن، چونکە تەنها تەماشای ئەو شتە لە سروشت بەدەرو نا ئاسایی شەیتانیانە دەکەن کە ئەنجامی دەدەن و، وا دەزانن هەموو ئەوانە کەراماتە، چونکە دەیانبینن بەسەر ئاودا ڕێ دەکەن و، دەچنە نێو ئاگرەوەو، بە هەوادا دەفڕن.

بەڵام لە ڕاستیدا هەموو ئەو شتانە کاری شەیتانە کە بەسەر ئاوەکەدا هەڵیاندەگرێ و، بە هەوادا دەیانفڕێنێت و، دەچنە نێو ئاگرەوە، تەنها شەیتان ئەو شتە لە سروشت بەدەرو نائاسایانەیان بۆ ئەنجام دەدات، پێشتریش خەڵك بەو شتانە ئاشنا نەبوونە، بۆیە واتێدەگەن ئەو کەسانە دۆستی خوان و شتەکانیشیان کەراماتە، کەچی خەڵك تەماشای چاکێتی و خراپێتی کاروکردەوەی ئەو کەسانە ناکەن، چونکە ئەنجامدانی شتی لە سروشت بەدەرو نائاسایی بەتەنها بەس نییە تاوەکو تەماشای چاکێتی و خراپێتی کاروکردەوەی کەسەکە نەکرێت، ئەگەر کاروکردەوەکانی صالح و چاك بوون، ئەوا شتە لە سروشت بەدەرو نائاسایەکانیشی کەراماتەو، پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿أَلا إِنَّ أَوْلِيَاء اللَّهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ (٦٢) الَّذِينَ آمَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ﴾[يونس: ٦٢_٦٣] واتە: ئاگاداربن بێ گومان دۆستانی خوا ترسیان لە سەر نیە خەفەتیش ناخۆن ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و هەمیشە خۆیان دەپارێزن و لە خوا دەترسن. بۆیە ئەگەر ئەو کەسە بڕوادارو تەقوادار بێت، یەکسەر دەزانرێت کردەوە لە سروشت بەدەرو نائاسایەکانیشی کەراماتەو، لە لایەن خوای گەورەوە پێی دراوە، مەرجیش نیە هەموو دۆست و وەلییەکی خوا لە سەر دەستی کەرامەت بێتە دی، لەوانەیە جار بە جار ئەوە بێتە دی و ڕوبدات، بەڵام ئەگەر کاروکردەوەی ئەو کەسە خراپ بوو، نوێژەکانی پشتگوێ دەخست، حەڕام کراوەکانی ئەنجام دەدا، ئەوا

---

---

---

---

دەزانرێت ئەو کردەوە ناسروشتی و نائاساییانەی کە لە سەر دەستی دێتە دی، شەیتانیەو کەراماتێك نیە لە لایەن خواوە پێی درابێ. ئەم کەسانە لەم بوارەدا سەریان لە خەڵك تێکداوەو، دۆست و وەلی شەیتانیان کردووە بە دۆست و وەلی خوا، بەو بەهانەیەوە کە گوایە کردەوەی ناسروشتی و نائاسایی ئەنجام دەدەن، بەبێ ئەوەی تەماشای چاکێتی و خراپێتی کاروکردەوەو، ئەو باروحاڵە بکەن کە ئەو کەسانەی تێدان. بێ گومان ئەم مەسەلە مەترسیدارەو ئەنجامەکەشی گومڕا بوونە. بەم شێوازە خەڵکانێکی زۆر لە ڕێگەی ڕاست لایاندو، ئەولیایان پەرست، چ مردووبن بن یاخود زیندوو، بەو بەهانەیەوە کە گوایە دۆستان و وەلی خوان و، کردەوەی لە سروشت بەدەرو نائاسایی ئەنجام دەدەن، بەبێ تەماشاکردنی کاروکردەوەو ئەو باروحاڵەی کە تیایدان. شێخ _ ڕەحمەتی خوا لێبێت _ لەم کتێبەدا ویستویەتی ئەم مەسەلە بە تەواوی ڕوون بکاتەوەو، دۆست و ئەولیای خوامان بە ڕوونی بۆ ئاشکراکات، تا ئێمەش دۆستایەتیان لە گەڵ ببەستین و، شوێنیان بکەوین، هەروەها ویستویەتی دوژمنانی خوامان بە تەواوی بۆ بە دەرخات، بۆ ئەوەی ئێمەش بە دوژمنی خۆمانیان بزانین،و بۆ ئەوەی هەق و پووچی و ناڕەوایی تێکەڵ بە یەکتر نەبن.

دەروازەی (الولاء والبراء) واتە دۆستایەتی ئەولیای خواو بەریبوون لە دوژمنانی خوا دەروازەیەکی گرینگەو، خەڵکی لەم بارەوە جیاوازن مەگەر کەسانێك کە خوای تعالى هیدایەتی دابن و، ڕێگەی هەقی پێشان دابن، چونکە کەسانێك لەم دەروازەیەدا زێدەڕۆیی دەکەن و، خەڵك تەکفیر دەکەن، وەکو خەواریج و کەسانیتر کە لەسەر ڕێڕەوی ئەوان دەچن، ئەم تاقمە ئەو ئایەتانە وەردەگرن کە باسی بەریبوونی تێدایە لە دوژمنانی خوا، ئەمەش هەق و ڕاستە، کەچی تەماشای ئەو ئایەتانە ناکەن کە مامەڵکردنی تێدایە لە گەڵ دوژمنانی خوادا، ئەم تاقمە دەیانەوێت مامەڵەکردنیان لە

---------------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------------
-----------------------------------------------------------

گەڵدا ببڕن بە هەتا هەتایی، بەڵام خوای تعالی فەرمانی داوە مامەڵیان لە گەڵدا بکرێت، لە بواری کاروباری دونیاییدا، ئەو کاروبارانەی پەیوەندیان بە ئایینەوە نییە، بۆیە پەیمانامەو، صولح و ئاشتەواییان لەگەڵدا دەبەسترێت، ئەمان و ئارامییان پێدەدرێت و، ئیتر دەستدرێژیان ناکرێتە سەرو، ناکوژرێن و، ماڵ و، سامان و، شەرف وناموسیان دەپارێزرێت، ئەو مافانەیان دەبێت کە موسڵمانان دەیانبێت و، ئەوەشیان لە سەر دەبێت کە لە سەر موسڵمانان دەبێت، هەروەها هیچ ڕێگرییەك لە ئارادا نییە کردارەکانی کڕین و، فرۆشتن و، بازرگانیان لەگەڵدا بکرێت، هیچ ڕێگرێك لە ئارادا نیە سوود لەو تواناو، کارشناسی و، دەسترەنگینیەیان وەرگیرێت کە ئەوان شارەزان تیایدا، ئەم شتە قەدەغە ناکرێ و، هیچ دژایەتیەکی لە گەڵ (الولاء والبراء)دا نییە، کەچی ئەم تاقمە کۆتاییان بە هەموو ئەو شتانە هێناوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ (٨) إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَى إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ(٩)﴾[الممتحنة: ٨_٩]واتە: خوا ڕێتان لێ ناگرێت لەگەڵ ئەوانەی کە جەنگیان لە گەڵ نەکردوون لە سەر ئەم دینە و دەریان نەکردوون بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش ئەوێ کە دادگەرن بێگومان خوا ڕێ گریتان لێ دەکات تەنها لەوانەی کە جەنگیان لە گەڵ کردوون لە سەر دین و دەریان کردوون لە جێگەو شوێنەوارتاندا و یارمەتی یان داوە لە سەر دەرکردنتان (بەرگریتان دەکات) لەوەی کە دۆستایەتیان یان لە گەڵ بکەن و بەدۆستیان دابنێن و هەر کەسێك دۆستایەتیان بکات ئا ئەوانە خۆیان ستەمکارن. خوای گەورە لە نێوان تاقمە جۆر بە جۆرەکانی کافراندا جیاوازی کردووە . دایك و بابی کافر، خوای گەورە بە واجبی داناوە منداڵان چاکەیان لەگەڵدا

بكەن، بەلام بە مەرجێك شوێنی دینەكەیان نەكەون، چونكە خوای گەورە لە سورەتێكی تردا دەفەرموێت: ﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ (١٤) وَإِن جَاهَدَاكَ عَلَى أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا﴾ (١٥) [لقمان: ١٤_١٥] واتە: فەرمانمان داوە بە ئادەمی (بەچاكی هەڵس و كەوت كردن لەگەڵ) دایك و باوكیدا دایكی هەڵی ئەگرێ بە دوو گیانی (پێی لاواز دەبێ) لاوازی لە دوای لاوازی و بڕینەوەی لە شیر لە (دوا تەمەنی) دوو ساڵیەوە (وە فەرمانمان بە ئادەمی دا) كە سوپاس گوزاری من (خوا) و باوك و دایكت بكە تەنها بۆ لای منە گەڕانەوەتان و ئەگەر (باوك و دایكت) ئەو پەڕی هەوڵیان دا لە گەڵت بۆ ئەوەی شتێ بكەیت بە هاوبەشی من كە هیچ زانیارییەكت پێی نییە ئەوە گوێڕایەڵیان مەكە بەلام لە دونیادا زۆر بە چاكی هاوڕێیەتیان بكە. واتە ئەگەر دایك و باب كافر بن، پێویستە شوێنی دینەكەی ئەوان نەكەون، بەڵكو شوێنی دینی بڕواداران بكەون، بەلام بەچاكی ڕەفتاركردن لە گەڵ دایك و بابدا كارێكی واجبە لە سەر منداڵی موسڵمان. كۆمەڵی دووەم بە پێچەوانەی كۆمەڵی یەكەم بیر دەكەنەوە بە تەواوی، تا ئەو ئاستەی (الولاء والبراء) دەتوێننەوەو، دەڵێن: پێویستە خۆشەویستیمان هەبێ بۆ هەموو مرۆڤێك، ئاینەكەی ئێمە ئایینی لێبوردن و چاو پۆشینە، ئایینی ئاشتی و یەكگرتنی نێوان هەموو مرۆڤایەتیە، ئەم تاقمە بە پێچەوانەی تاقمی یەكەمەوەن و، دەڵێن: (الولاء والبراء) لە نێوان مرۆڤایەتیدا نیە. باسی مافەكانی مرۆڤ و شتی تری بەو هاوشێوانە دەكەن، بۆیە پێچەوانەی تاقمی یەكەم بوونەتەوە، تەماشا دەكەین تاقمی یەكەم زێدەڕۆیی دەكەن و، تاقمی دووەمیش نەرم ونیانی دەنوێنن تا ئەو ئاستەی هەوڵدەدەن (الولاء والبراء) لە كتێبی یەكخواپەرستی و مەنهەجەكانی خوێندندا لادەن، هەوڵ دەدەن جیهاد لە منهەجەكانی

-----------------------------------------------------------------------
-----------------------------------------------------------------------
-----------------------------------------------------------------------

خوێندندا لادەن، وەکو ئەوەی بەلاتانەوە ئاشکرایە، قسە لەم شتانەدا دەکەن و، بە کارێکی قورس و گرانی دادەنێن و، سەماحەت و لێبوردەیی و بەخشندەیی ئیسلام دەکەنە بەلگە، بێگومان ئیسلام ئایینێکی لێبوردەیە، بەڵام سەماحەت و لێبوردەیی سنووری هەیەو، شوێنی خۆی هەیە، لە شوێنی خۆیدا بەکاردێت، سنورو ڕێساو یاسای شەرعی خۆی هەیەو، ڕەها نیە.

کۆمەڵی سێ یەم کۆمەڵی باوەڕ پووچان و خورافین، ئەوانەن کە شێخ مەبەستێتی و لەم کتێبەدا باسیان دەکات، وەکو کەسانی باوەڕ پووچ و خورافی کە بۆم باس کردن، ئەم تاقمە هەموو کەسێك کردەوەیەکی لە سروشت بەدەرو نائاسایی ئەنجام بدات بە وەلی و دۆستی خوای دادەنێن، بەبێ ئەوەی تەماشای کاروکردەوەو ئەو باروحاڵە بکەن کە ئەو کەسەی تێدایە، هەر کەسێك شتێکی پێ بێت وەکو جادووگەری، بانگەشەی غەیبزانی، فاڵچێتی بە وەلی و دۆستی خوای دادەنێن و، تەماشای کاروکردەوەو لە خواترسان و تەقواکەی ناکەن، تەماشای ئەو ئایەتانە ناکەن کە شێخ لەم کتێبەدا باسی کردوون. کۆمەڵی چوارەم ئەوانەن کە (الولاء والبراء) بۆ فیرقەو کۆمەڵەکان دەگەڕێننەوە، بۆیە دۆستایەتی و پشتگیری هیچ کەسێکی تر ناکەن، جگە لە فیرقەو کۆمەڵەکەی خۆیان و، دوژمنایەتی هەموو کەسێکی تر دەکەن، (الولاء والبراء) بۆ فیرقەو کۆمەڵەکان دەگەڕێننەوە، بۆیە هەر کەسێك لە سەر ڕێباوەڕو مەزهەب و بیرو بۆچونی ئەوان بێت، ئەوا بە دۆست و پشتگیری خۆیانی دادەنێن و، هەر کەسیش موخالەفەیان بکات، بە دوژمنی دادەنێن، بێگومان ئەم دیاردەیە ئاشکرایەو هەیە . ئەمە چوار کۆمەڵن لەو بارەوە گومڕا بوون . بەڵام کۆمەڵی پێنجەم، کۆمەڵی سوننەت و جەماعەتن، کە شێخ _ ڕەحمەتی خوا لێ بێت _ لەم کتێبەدا باسیان دەکات، ئەوانەن کە تەماشای هەموو قورئانیان کردو، هەستان بە ( الجمع )

كردن لە نێوان ئایەتەکانداو، تەماشای سیفاتی دۆستانی خواو سیفاتی دۆستانی شەیتانیان کرد، ئائەمە ئەو تەوەرەیە کە کتێبەکە باسی دەکات، کتێبی ( الفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان )، بێ گومان ئەمە کتێبێکی بەنرخەو، زۆر پێویستیشە بۆ لادانی ئەم تێکەڵ و پێکەڵ و شێواندنە، کە بەلای خەڵکانێکی زۆرەوە ( الولاء والبراء )ی تێدا شێواوەو، کەسانێك زێدەڕۆی تێدا دەکەن و، کەسانێك وازی لێ دەهێنن و، کەسانێکیش هەر لە بنەڕەتەوە نکۆڵیی لێ دەکەن.

وەکو ئەوەی بیستوتانە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ لە نێوان کەسانێکدا دەرکەوت کە لە پەرستنەکانیاندا جیاواز بوون، هیچ زانستێکیان پێ نەبوو، بەڵکو شوێنی ئارەزوواتی خۆیان و، شوێنی باو باپیرانیان دەکەوتن، بۆیە خوای تعالى قورئان و سونەتی ی بۆ دابەزاندن، کردی بە هۆکارێك بۆ هیدایەتدانی ئەوانەی کە ویستی لێ بوو هیدایەتیان بدات و، بە هیدایەتدان شایستە بوون، ئەو کەسانەشی پێ گومڕا کرد کە ویستی لێ بوو چاویان کوێر بکات و، دڵیان داپۆشێت، بۆیە ئەم هەقەیان قبوڵ نەبوو، ئیتر بە ناردنی ئەم پێغەمبەرە دۆستان و وەلی خوا لە دۆستان و وەلی شەیتان جیابونەوەو ئاشکرا بوون، خوای تعالى قورئان و سونەتی ی بۆ دابەزاندو، دۆستانی خوای بۆ ڕوون کردینەوە بۆ ئەوەی خۆشمان بوێن و شوێنیان کەوین و، دوژمنانی خواشی ئاشکرا کرد، بۆ ئەوەی ڕقمان لێیان بێتەوەو، خۆمان لە ڕێگەو ڕێچکەکانیان بەدور بگرین، هەروەها چۆنیەتی مامەڵ کردنی لە گەڵ ئەوانەدا بۆ ڕوون کردینەوە، بۆ ئەوەی بزانین چۆن مامەڵەیان لە گەڵدا بکەین، بەڵێ، کتێبەکە ئەم تەوەرەیە باس دەکات.

## دۆستانی ڕەحمان و دۆستانی شەیتان[1]

خوای گەورە لە قورئان و سونەتی پێغەمبەرەکەیدا ئەوەی ڕوون کردۆتەوە کە خوا دۆستانێکی هەیە لە خەڵك، شەیتانیش دۆستی هەیە[2] خوای گەورە دۆستانی خواو دۆستانی شەیتانی لە یەکدی جیاکردۆتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلا إِنَّ أَوْلِيَاء اللَّهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ (٦٢) الَّذِينَ آمَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ(٦٣)لَهُمُ الْبُشْرَى فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ لاَ تَبْدِيلَ لِكَلِمَاتِ اللَّهِ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ (٦٤)﴾[يونس: ٦٢ ــ ٦٤] واتە: ئاگادرابن بێ گومان دۆستانی خوا ترسیان لە سەر نییەو خەفەتیش ناخۆن،ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو هەمیشە خۆیان دەپارێزن و لە خوا دەترسن هەر بۆ ئەوانە مزگێنی لە ژیانی دونیادا و لە دوا ڕۆژیشدا گۆڕان نییە بۆ وتە(وبەڵێنە)کانی خوا هەر ئەوەیە سەرکەوتنی زۆر گەورە.

---

(١)_وشەی (أولياء)م بە دۆستان وەرگێڕاوە، تاکیشی (ولِي)ە واتە دۆست، وەرگێڕ.

(٢)_بەڵێ ئەمە لە قورئاندا هەیەو، چەند ئایەتێکیشتان بۆ دەهێنێتەوە، سیفاتی دۆستانی خواو دۆستانی شەیتانی تێدایە، خوای تعالی جیاوازی لە نێوان دۆستانی خواو دۆستانی شەیتاندا کردووەو، سیفاتی دۆستانی خواو سیفاتی دۆستانی شەیتان باس دەکات، بۆیە ئاگاداری ئەمە بن.

**دیسان خوای تعالی دەفەرموێت:** ﴿ اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُمْ مِنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴾[البقرة: ٢٥٧] **واتە: خوا دۆست و کارسازی ئەوانەیە کە بڕوادارن دەریان دەهێنێت لە تاریکستانی بێ بڕوایی بۆ ڕووناکی باوەڕو ڕێنموونیی و ئەوانەی کە بێ بڕوان شەیتان دۆستیانە دەریان دەهێنێ لە ڕووناکی (و بیروباوەڕ)ەوە بۆ تاریکستان ئەوانە هاوڕێی دۆزەخن تیایا ئەمێننەوە هەتا هەتایە**[1]

---

**(١)_ئەم ئایەتە باسی دۆستانی خواو دۆستانی شەیتانی تێدایە، خوای گەورە دەفەرموێت:** (اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا) **واتە خوای گەورە دۆست و کارسازی ئیماندارانە، ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت:** (يُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ) **واتە: لە تاریکستانیەکانی کوفرو شیرك و گومان دەریان دەهێنێت بۆ نورو ڕووناکی ئیمان و زانست و ڕێنموونی، ئا ئەمە بەرووبومی دۆستایەتێکەیانە بۆ خوای گەورە، لە تاریکستانیەکان دەریان دەهێنێت، تەماشای وشەی** (الظُّلُمَاتِ) **واتە تاریکستانیەکان بکەن کە هیچ سنورێکی نییە، بەشێوەی** (الجمع) **واتە: کۆ هاتووە، چونکە هیچ سنورێکی نییەو، تاریکستانیەکی زۆرە،** (إِلَى النُّورِ) **واتە بۆ نورو ڕووناکی، یەك نورو ڕوناکیەو، نەیفەرمووە:** (الأنوار) **واتە نورو ڕوناکیەکان، لە ئایەتێکی دیکەدا خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلاَ تَتَّبِعُواْ السُّبُلَ﴾[ الأنعام:١٥٣] **واتە:** ﴿وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا﴾ **(فەرمانی داوە کە) بێ گومان ئەمە ڕێگای ڕاستی منە کە ڕاست و دروستە** ﴿فَاتَّبِعُوهُ﴾ **کەواتە شوێنی بکەون** ﴿وَلاَ تَتَّبِعُواْ السُّبُلَ﴾ **و شوێنی ڕێچکەکانی تر مەکەون . چونکە ڕێگای ڕاستی خوا یەکەو، ڕێچکەکانی تری پێچەوانەی ڕێگای ڕاستی خوا زۆرن، کەوا بوو تاریکستانیەکانیش زۆرن و، نورو ڕووناکیش تەنها یەکەو هیچی تر، لە تاریکستانیەکان دەریان دەهێنێت بۆ نورو ڕووناکی، ئەمانە دۆست و ئەولیای خوان، باشە دۆست و ئەولیای شەیتان**

---

---

---

كێن؟ ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمُ الطَّاغُوتُ﴾ كافران، ئەوانەی بەخوای گەورە کوفریان کردووە، ئەوانە شەیتان دۆستیانە کە لە نورو ڕووناکیەوە دەریان دەهێنن بۆ تاریکستانیەکان، لە زمانی عەرەبیدا وشەی (الطاغوت) لە وشەی (الطُغْيان)ەوە وەرگیراوە، کە مانای لە سنوور دەرچوون دەبەخشێت، (الطواغيت)یش زۆرن و، هەر هەمووشیان ناوی (الطاغوت) دەیانگرێتەوە، (الطاغية) ئەوەیە کە لە گوێڕایەڵی خوای گەورە چوو بێتە دەرەوە، شەیتان (الطاغوت)ەو، هەموو شەیتانەکانی ئینس و جن بەتێکڕا (الطاغوت)ن، سنوورێکی دیاریکراو بۆ (الطاغوت) نییە، هەموو (الطاغوت)ێکیش شوێنکەوتەی هەیە، بەڵام ئیمانداران تەنها شوێنی خوای گەورە دەکەون و، خوای گەورە دۆستیانە، تەماشاکەن ئیمانداران خوای گەورە دۆستیانە بەتەنها، بەڵام کافران دۆستیان زۆرە، (الطاغوت)ێکی زۆر دۆستیانە، (الطاغوت)یش لە زمانی عەرەبیدا (إسم جنس)ە، واتە ناوە بۆ ڕەگەزێکی دیاریکراو و، هەموو شەیتانێك لە شەیتانەکانی ئینس و جن و کەسانی بانگەوازکەرانی گومڕایی دەگرێتەوە، ﴿يُخْرِجُونَهُمْ مِنَ النُّورِ﴾، واتە: لە نورو ڕووناکی پەیام و ئیمان و ڕێنموونی دەریان دەهێنێت، ﴿إِلَى الظُّلُمَاتِ﴾ بۆ تاریکستانیەکانی کوفرو شیرك، ئەم شتەش تاوەکو هەستانی قیامەت بەردەوامە، پاشان خوای گەورە عاقیبەت و دەرەنجامی ئەوانمان بۆ ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێت: ﴿أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ﴾ کە لە هاوەڵانی دۆزەخن، هاوەڵانی دۆزەخ واتە: لێی جیا نابنەوەو، لەو ئاگرە ڕزگاریان نابێ، هاوەڵانی ئاگر، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ لێی جیا نابنەوەو بە هەتا هەتایی تیایدا دەمێننەوە، ئا ئەمە دەرەنجام و عاقیبەتیانە _ پەنا بە خوا _ کەوا بوو جیاوازی نێوان دۆستانی خواو دۆستانی شەیتانمان زانی، کە دۆستانی خوا ئیماندارانن و دۆستانی شەیتانیش کافرانن.

دیسـان خـوای گـەورە دەفـەرمویّت:﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللَّهَ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ(٥١) فَتَرَى الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ يُسَارِعُونَ فِيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَى أَنْ تُصِيبَنَا دَائِرَةٌ فَعَسَى اللَّهُ أَنْ يَأْتِيَ بِالْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِنْ عِنْدِهِ فَيُصْبِحُوا عَلَى مَا أَسَرُّوا فِي أَنْفُسِهِمْ نَادِمِينَ(٥٢) وَيَقُولُ الَّذِينَ آمَنُوا أَهَؤُلاَءِ الَّذِينَ أَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ إِنَّهُمْ لَمَعَكُمْ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَأَصْبَحُوا خَاسِرِينَ (٥٣) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَنْ يَرْتَدَّ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلاَ يَخَافُونَ لَوْمَةَ لاَئِمٍ ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ (٥٤) إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ (٥٥) وَمَنْ يَتَوَلَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا فَإِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْغَالِبُونَ﴾[المائدة: ٥١ _ ٥٦] واتە: ئـەی ئەوانـەی باوەڕتـان هێنـاوە جوولەکـەو گـاور مەکەن بەپشـتیوان و خۆشەویستی خۆتـان ئەوانـە دۆسـتی یـەکترن ئـەوەتان ئـەوان بکات بە پشتیوان و دۆست ئەوە بەڕاستی ئەو کەسە لەوانە بێگومـان خـوا ڕێنمـوونی گەلی ستەمکاران ناکات بۆیە ئەبینی ئەوانەی دڵیان نەخۆشی (دوو ڕوویی ) تیایە پێش برکێ ئەکەن لە دۆستایەتی ئەو (جوولەکەو گاور)انەدا ئەڵێن ئەترسین کە بەسەر هاتی ناخۆشی ڕۆژگار دووچارمان ببێت دەی نزیکـە خـوا سـەرکەوتن و زاڵ کردنـی تـەواو بنێرێت (بۆ پێغەمبەر ﷺ) یان لە لایەن خۆیـەوە کـارێکی تـر بکـات بـەهۆی ئـەوەوە وایان لێدێ لەوەی پەنهانیان کردبوو لە دەروونی خۆیاندا پەشیمان دەبنـەوە ئەوسا ئەوانەی بڕوایان هێناوە دەڵێن ئایا ئەو کەسانە ئەوانەن کە سوێندیان بەخوا ئـەخوارد بەتوندترین سوێندیان کەبەڕاستی ئـەوان لـە گـەڵتانن کردەوەکانیـان پوچـەڵ بویـەو بەهۆی ئەوەوە زەرەرمەندو ڕەنجەڕۆ بوون ئەی ئەوانـەی کـە باوەڕتـان هێنـاوە هـەر کەس لە ئێوە هەڵگەڕێتەوە لە ئاینەکەی ئەوە بـە زوویـی خـوا لـەباتی ئـەوان گـەل و کۆمەڵێکی تر ئەهێنێ خوا ئەوانی خۆش ئەوێ و ئەوانیش خوایان خۆش ئەوێ بەسۆزو بەزەین بەرانبەر بڕواداران بەهێزو توندن بەرانبەر بێ بڕوایـان تـێ کۆشـان دەکـەن لـە

ڕێی خـوادا و ناترسـن لـه سـه‌ر زه‌نشتی سـه‌ر زه‌نشـتكاران ئـه‌وه‌ی باسـكرا چاكه‌و به‌هره‌ی خوایه‌ ئه‌یبه‌خشێ به‌ هه‌ر كه‌س كه‌ خۆی بیه‌وێت و خوا ده‌سته‌ڵات فراوانـی زانایـه‌ بێگومـان دۆسـت و یارمـه‌تی ده‌ری ئێـوه‌ تـه‌نها خـواو پێغه‌مبه‌ره‌كه‌یـه‌تی و بڕواداران ئه‌وانه‌ی كه‌ به‌ ڕێك و پێكی نوێـژه‌كانیان بـه‌جێ ئـه‌هێنن و زه‌كات ئـه‌ده‌ن به‌رده‌وام ملكه‌چن بۆ فه‌رمانی خوا و هه‌ر كه‌س خواو پێغه‌مبه‌رو ئیمانداران بكات بـه‌ پشتیوانی خۆی ئه‌وه‌ بێگومان هه‌ر كۆمه‌ڵی خوا زاڵ و سه‌ركه‌وتوون[١]

---

(١)_ ئه‌م ئایاتانه‌ له‌ سوره‌تی پیرۆزی (المائدة)یه‌، جیابونه‌وه‌ی تێدایه‌ لـه‌ نێـوان دۆستانی خواو دۆستانی شـه‌یتاندا، خـوای گـه‌وره‌ ده‌فـه‌رموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ قسه‌ی له‌گه‌ڵدا كردن و به‌ ئیمانداران ناوی بردن، چونكه‌ ئیمان و بڕوابوون وا پێویست ده‌كات كه‌ ملكه‌چی فه‌رمانی خوای گه‌وره‌ بن و، گوێدێری بانگه‌وازیه‌كه‌ی بـن، پاشـان قه‌ده‌غـه‌یكردن و فـه‌رمووی : ﴿لا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاءَ﴾ واتـه‌: دۆسـتایه‌تی جوله‌كـه‌و گـاوران مه‌كـه‌ن، خۆشـتان بـوێن و سـه‌ریان بخـه‌ن و بـه‌رگریان لـێ بكـه‌ن، جووله‌كه‌ ئه‌وانه‌ن كه‌ ته‌وراتیان بـۆ دابـه‌زیوه‌و، ئوممـه‌تی (موسی) پێغه‌مبـه‌رن _ علیه السلام _، به‌ڵام گاوران ئه‌وانه‌ن كه‌ ئینجیلیان بۆ دابه‌زیوه‌و، ئوممه‌تی (عیسا)ی كـوڕی (مریم)ن _ علیه السلام _، بـه‌ڵام ئـه‌و دوو ئوممه‌تـه‌ لـه‌ ڕێبـازه‌ ڕاسـته‌كه‌ی (موسی) و (عیسا) لایانداو دوركه‌وتنه‌وه‌، كـاتێكیش موحه‌ممـه‌د ﷺ وه‌كـو پێغه‌مبـه‌رێك نێـردرا، كوفریان كردو شوێنی نه‌كه‌وتن، جووله‌كه‌ بـه‌ (عیسا) و بـه‌ (موحه‌ممـه‌د)یش كوفریـان كرد، گاورانیش به‌ (موحه‌ممه‌د ﷺ) كوفریان كرد، هـه‌ر كه‌سیش بـه‌ یـه‌ك پێغه‌مبـه‌ر كوفر بكات، ئه‌وا به‌ خوای گه‌وره‌و و به‌ هـه‌موو پێغه‌مبـه‌رانی كـوفری كـردووه‌، خـوای گه‌وره‌ لـه‌ سـوره‌تێكی دیكـه‌دا ده‌فـه‌رموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيُرِيدُونَ أَنْ يُفَرِّقُوا بَيْنَ اللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَنْ يَتَّخِذُوا بَيْنَ ذَلِكَ

---------------------------------------------
---------------------------------------------
---------------------------------------------

سَبِيلاً(١٥٠) أُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقّاً(١٥١)﴾ [النساء: ١٥٠-١٥١]، واتە: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ﴾ بە ڕاستی ئەوانەی بێباوەڕن ﴿بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ﴾ بە خواو پێغەمبەرەکانی ﴿وَيُرِيدُونَ أَنْ يُفَرِّقُوا﴾ وە دەیانەوێ جیاوازی بخەنە ﴿بَيْنَ اللَّهِ وَرُسُلِهِ﴾ نێوان خواو پێغەمبەرەکانی ﴿وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ﴾ وە دەڵێن باوەڕ بە هەندێك (لە پێغەمبەران) دەهێنین ﴿وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ﴾ وە باوەڕ ناهێنین بەهەندێکی تریان ﴿وَيُرِيدُونَ﴾ و دەیانەوێ ﴿أَنْ يَتَّخِذُوا بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً﴾ لەو نێوانەدا ڕێگەیەك بدەنەبەر ﴿أُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقّاً﴾ ئا ئەوانە بە ڕاستی بێ باوەڕی تەواون . ئەوە هیچ گومانێکی تێدا نیە، چونکە هەر کەسێك باوەڕ بە یەك پێغەمبەر نەکات، ئەوا بە هەموو پێغەمبەران باوەڕی نەهێناوەو، لە هەمان کاتیشدا باوەڕی بە خوای گەورە نییە کە پێغەمبەرانی ناردووە، خوای گەورە ئیمان و باوەڕی ئەو کەسانەی بە پێغەمبەرانی خۆیان پووچ کردەوە کاتێ کە باوەڕیان بە پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ نەکرد، وە ئیمان و باوەڕی جوولەکەی بە (موسی) پێغەمبەر _علیه السلام_ پووچ کردەوە کاتێ کە باوەڕیان بە (عیسی) پێغەمبەر _علیه السلام_ و (موحەممەد ﷺ) نەکرد، ئەگەر ئەمە باروحاڵی جوولەکەو گاوران بێت لە کاتێکدا کە خاوەن کتێبی ئاسمانین، ئەی باروحاڵی کەسانی دیکەی موشریك و بتپەرستان و یاخیبوان لە ئایین و خواپەرستی دەبێت چۆن بێت، ئەمانە شایستەترن بڕوایان نەبێت، ﴿لا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاءَ﴾ واتە: دۆستایەتیان مەکەن بە خۆشویستن و سەرخستن، بەڵکو با لە بەر خاتری خوای گەورە ڕقتان لەوانە بێتەوە، چونکە خوای گەورە ڕقی لەوانە دەبێتەوەو، لە سورەتێکی دیکەدا دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ﴾[الممتحنة: ١] واتە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە ﴿لاَ تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ﴾ دوژمنانی من و خۆتان مەکەن بە دۆستی

----------------------------------------------------------------
----------------------------------------------------------------
------------------------------------------------------

خۆتان. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ﴾ واتە: کافران دۆستی یەکترن، خوای گەورە دۆستایەتی لە نێوان کافران و موسڵماناندا بڕیوەو نەیهێشتووە، بەڵکو کافران دۆستی یەکترن، بۆیە کافر دۆستی کافرەو، جوولەکە دۆستی جوولەکەیەو، گاور دۆستی گاورە، نێوان ئەوان و موسڵمانانی لە یەکتر جیا کردۆتەوەو، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ﴾ دەبێ بە جوولەکە یان گاور، ئەگەر دۆستایەتیان بکات دەبێت بە یەکێك لە ئەوان، پاشان دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ ئەوە سزایەکە بۆ ئەوان، ئەو شتەی بە ستەم ناوبردووەو، هەواڵی داوە کە ڕێنموونی ئەو کەسە ناکات کە ئەو سیفەتەی تێدا هەبێت، بۆیە هەرکەسێك دۆستایەتی جوولەکە و گاوران بکات، ئەوا کەسێکی ستەمکارەو، بێگومان خوای گەورەش ڕێنموونی گەلی ستەمکاران ناکات، ئەمەش سزایەکە بۆ ئەوان، بەڵکو ڕێنموونی ئەهلی ئیمان و باوەڕ دەکات، ئەوانەی هەق قبوڵ دەکەن، بەڵام ئەو کەسەی ڕوو لە هەق وەردەگێڕێت، خوای گەورەش بێبەشی دەکات لێی، وەکو سزایەك بۆ ئەو کەسە، بێگومان خوای گەورە ڕێنموونی گەلی ستەمکاران ناکات، پاشان هەواڵی مونافقین و دووڕوانمان پێ دەدات، ئەوانەی وا ڕادەگەیەنن کە موسڵمانن، چەندیش زۆرن، خوای گەورە زۆریان نەکات، وا ڕادەگەیەنن موسڵمانن لە کاتێکدا دۆستایەتی جوولەکەو گاوران دەکەن، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَتَرَى الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ﴾ دەبینی ئەو کەسانەی دڵیان نەخۆشی دووڕوویی تێدایە ﴿يُسَارِعُونَ فِيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَى أَنْ تُصِيبَنَا دَائِرَةٌ﴾ لە دۆستایەتی جوولەکەو گاوراندا پێشبڕکێ دەکەن و دستیان لە گەڵ تێکەڵ دەکەن، ئەگەر جوولەکەو گاوران بەسەر موسڵماناندا سەرکەتن، ئەوا دەستێکیان لەوێ بەو ترسیان نییە، ئەوان گومانی خراپ بە خوای گەورە دەبەن و، گومانی ئەوە دەبەن کە خوای گەورە واز لە

---

---

---

پشتگیری و هاوکاری موسڵمانان دەهێنێت و، جوولەکەو گاوران بەرز دەکاتەوەو سەریان دەخات، بەڕاستی ئەمە بەدگومانیە بەرامبەر بە خوای گەورە، دەڵێن دەترسین بەسەر هاتی ناخۆشی ڕۆژگارمان دووچار بێت، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَعَسَى اللَّهُ أَنْ يَأْتِيَ بِالْفَتْحِ﴾ دەی نزیکە خوا سەرکەوتن و زاڵ کردنی تەواو بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ بنێرێت، بۆ ئەوەی موسڵمانان سەربخات، وتنی وشەی (عسى)ش لە لایەن خوای گەورەوە بۆ واجیب بوونە، ئەمەش پەیمانێکە لە لایەن خوای گەورەوە کە موسڵمانان سەردەخات و، سەرکەوتن و زاڵکردنیان پێ دەبەخشێت، پاشان دەفەرموێت: ﴿أَوْ أَمْرٍ مِنْ عِنْدِهِ﴾ یان لە لایەن خۆیەوە کارێکی تر بکات، بۆ ئەوەی لە ئەواندا جێبەجێی بکات، لە جوولەکەو گاوراندا، ئیتر ئەو موونافیق و دوو ڕووانە ئابڕویان دەچێت، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَيُصْبِحُوا عَلَى مَا أَسَرُّوا فِي أَنْفُسِهِمْ نَادِمِينَ﴾ ئیتر بە هۆی ئەوەوە کە لە دەروونی خۆیاندا پەنهانیان کرد بوو پەشیمان دەبنەوە، پەنا بەخوا دەگرین، ئەم شتەش ڕووی داوە، خوای گەورە ئابڕووی دووڕووانی بردوەو، جوولەکەو گاورانی سەرشۆڕ کردوەو، موسڵمانانی بەهێزو شکۆمەند کردوە، خوای گەورە لە زۆر شوێن و هەڵوێستدا ئابڕووی دوو ڕووانی بردووەو، ئەمەش تاوەکو ڕۆژی قیامەت و، تاوەکو ئاینی ئیسلام بمێنێ و، تاوەکو موسڵمانان بمێنن هەر بەردەوام دەبێت، پاشان ئەهلی ئیمان و باوەڕ بەرامبەر بەو موونافیق و دوو ڕووانە سەریان سور دەمێنێت ﴿وَيَقُولُ الَّذِينَ آمَنُوا أَهَؤُلَاءِ الَّذِينَ أَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ إِنَّهُمْ لَمَعَكُمْ﴾ ئایا ئەو کەسانە ئەوانەن کە سوێندیان بەخوا دەخوارد، بە توندترین سوێندیان، کە بەڕاستی ئەوان لە گەڵتانن، لە سورەتێکی دیکەشدا خوای تعالی دەفەرموێت: ﴿إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ (١) اتَّخَذُوا أَيْمَانَهُمْ جُنَّةً

---

---

---

فصدُوا عن سبيل اللّهِ إِنَّهمْ ساء ما كانُوا يعْملُون (٢) ذلِك بِأنَّهمْ آمنُوا ثُمَّ كفرُوا فطُبِع على قُلُوبِهِمْ فهُمْ لا يفْقهُون (٣)﴾[المنافقين: ١ ـ ٣] واته: ﴿إِذا جاءك الْمُنافِقُون﴾ کاتێك كه دوو ڕووان بێنه لات ﴿قالُوا نشْهدُ إِنَّك لرسُولُ اللّهِ﴾ دەڵێن شايەتی دەدەين كه به ڕاستی تۆ پێغەمبەری خوايت ﴿واللّهُ يعْلمُ إِنَّك لرسُولُهُ﴾ وه دياره خوايش دەزانێ كه تۆ ڕەوانەكراوی ئەوی ﴿واللّهُ يشْهدُ﴾ وەخوا شايەتی دەدات ﴿إِنَّ الْمُنافِقِين لكاذِبُون﴾ كه بێگومان دوو ڕووان درۆزنن ﴿اتَّخذُوا أيْمانهُمْ جُنَّةً﴾ سوێنده (درۆ)كانی خۆيان كرد بەقەڵغان (بۆ خۆيان) ﴿فصدُّوا عن سبِيلِ اللّهِ﴾ ئينجا ڕێگری (خەڵك)يان دەكرد له ڕێی خوا ﴿إِنَّهُمْ ساء ما كانُوا يعْملُون﴾ به ڕاستی ئەوان كارێكی خراپيان دەكرد ﴿ذلِك بِأنَّهُمْ آمنُوا﴾ ئەوەی كه( وترا) لەبەر ئەوه بوو كه به ڕاستی ئەوان باوەڕيان هێناو ﴿ثُمَّ كفرُوا﴾ له پاشان بێ باوەڕ بوون ﴿فطُبِع على قُلُوبِهِمْ﴾ ئينجا مۆر نرا بەسەر دڵياندا ﴿فهُمْ لا يفْقهُون﴾ ئيتر ئەوان هيچ تێ ناگەن. ئيتر بەهۆی ئەوەوه كه له دەروونی خۆياندا پەنهانيان كرد بوو پەشيمان دەبنەوە، پاشان خوای گەوره دەفەرموێت: ﴿حبِطتْ أعْمالُهُمْ فأصْبحُوا خاسِرِين﴾ دوو ڕووی كار و كردەوەی پووچ كردنەوە، پەنا بەخوا، كاروكردەوه ديارەكانيان چوو به هەوا داو، بو به تۆزو خۆڵی بڵاوبۆوەو، هيچ نرخ و بەهايەكی نەما، پاشان خوای گەوره دەفەرموێت: ﴿يا أيُّها الَّذِين آمنُوا منْ يرْتدَّ مِنْكُمْ عنْ دِينِهِ﴾ وەكو چۆن ئەو دوو ڕووانه هەڵگەڕانەوە ﴿فسوْف يأْتِي اللّهُ بِقوْمٍ يُحِبُّهُمْ ويُحِبُّونهُ﴾ خوای گەوره بڕوادارانی خۆش دەوێ و، ئەمەش دۆستايەتيە، ئەو دۆستايەتيە بريتيه لەوەی كه خوای گەوره خۆشی دەوێن و بڕوادارانيش ئەويان خۆش دەوێت، خوايان خۆش دەوێت و خواش ئەوانی خۆش دەوێت ﴿أذِلَّةٍ على الْمُؤْمِنِين﴾ بۆ برا بڕوادارەكانيان نەرم ونيانی دەنوێنن، بۆ براكانيان نەرم ونيانی دەنوێنن و بەزيیان پێياندا دێتەوەو دەيانپارێزن، ئەمه نەريتی

موسڵمانانە، وەکو دیواری بینان تێهەڵکێشن و هەندێکی هەندێکی تری دەبەستێت، وەکو یەك جەستەن ئەگەر ئەندامێکی ئازاری هەبێ هەموو ئەندامەکانی تر دەناڵێنن لە بەر بێخەوی و گەرمە تا ﴿أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ بەسەر کافراندا بەهێزن، وشەی (العِزَّة) مانای هێز دەبەخشێت، ئەوان بەرامبەر بە موسڵمانان نەرمونیانی دەنوێنن و، بێبەزی و توندیشن بەرامبەر بە کافران و نەرم و نیانیان بۆ نانوێنن، ﴿يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ بەرامبەر بە کافران و دوژمنانی خوا تێدەکۆشن، بە زمان و بەدەست و بە هەموو جۆرەکانی تری تێکۆشان بەرامبەریان تێدەکۆشن ﴿وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَائِمٍ﴾ لە سەرزەنشتی سەرزەنشتکاران نا ترسن، چونکە تێکۆشان بناغەو پشتیوانی دینەو، بەبێ تێکۆشان لە پێناوی خوا دا دین هەڵناسێت و ڕاست نابێتەوە، تێکۆشانە کە دۆستانی شەیتان سەرکوت دەکاو کافران سەرکوت دەکات ﴿ذَٰلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ﴾ ئەوە چاکەو بەهرەی خوایەو دەیبەخشێ بە هەر کەس کە خۆی بیەوێت، ئەم ئیمان و باوەڕە، ئەم بە هێزیە لە دینی خوا دا، ئەم ڕەحم و بەزەییە بەرامبەر بە ئیمانداران و دۆستایەتی ئیمانداران، بێگومان فەزڵ و چاکەو بەهرەی خوای گەورەیە، بە ویستی خۆی ڕێنومایی ئەو بەندانەی بۆ دەکات کە خۆی دەیەوێت، ئەو بەندانەی هەق قبوڵ دەکەن و، هەقیان دەوێت، بەڵام هەر کەس ڕوو لە هەق وەرگێڕێت، خوای گەورە لەوە بێبەشی دەکات ﴿وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ خوا ڕەحمەت و بەزەیی فراوانە، ڕۆزی فراوانە، موڵك و دەسەڵات فراوانە، فراوانە بە هەموو جۆرەکانی فراوانی، وە بە هەمووشتێك زانایەو، دەزانێ چ کەسێك ئیمانداری ڕاستەقینەیەو چ کەسێك دوو ڕووە، هیچ شتێکی لێ پەنهان نابێت، خوای گەورە پاش ئەوەی باسی ئەو کەسانەمان بۆ دەکات کە دۆستایتی جولەکەو گاوران دەکەن لە کاتێکدا وا ڕا دەگەیەنن کە موسڵمانن دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەوانەی پێویستە

---

---

---

دۆستایەتیان بکەین یەکەم خوای گەورەیە بە خۆشویستنی، بە گوێڕایەڵیی کردنی، بە لێ ترسانی، بە هیوا بوونی، بە پەرستنی بەهەموو جۆرەکانی پەرستن، دووەم پێغەمبەرەکەیەتی بە گوێ دێریکردنی، بەشوێنکەوتنی، بە خوشویستنی، بە دەستگرتن بە سونەت ەکەیەوە _ علیه الصلاة والسلام _ سێ یەمیش بڕواداران، ئەوان براتانن، ئەوان دۆستی ئێوەن و، ئێوەش دۆستی ئەوانن، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ﴾ ئەمە نەریتی ئیماندارانە دۆستی یەکترن، جوولەکەش دۆستی یەکترن ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا﴾ مەبەستی ئەوەیە کە جگە لە خواو پێغەمبەری خواو ئیمانداران دۆستایەتی هیچ کەسیتر مەکەن، ئەگەر خاوەن کتێب بن یان خاوەن کتێب نەبن، بە خۆشویستن و سەرخستن دۆستایەتیان مەکەن، ﴿الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ﴾ ئەمە سیفاتی دۆستانی خوایە، سیفاتی دۆستانی خوا بریتیە لەوەی کە نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن و گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی دەبن ﴿وَهُمْ رَاكِعُونَ﴾ بەردەوام نوێژ دەکەن، خوای گەورە لە جیاتی نوێژ ڕکووعی بەکارهێناوە، چونکە ڕکووع گەورەترین پایەکانی نوێژە، سجوودیش دەچێتە ئەو چوارچێوەیەوە، بە ڕکووعیش ناو نراوە، چونکە ملکەچ بوونە بۆ خوای گەورە، پاشان خوای گەورە ئەوەی بۆ ڕوون کردوینەتەوە کە سەرکەوتن و زاڵ بوون بۆ کێیە، ئایا سەرکەوتن و زاڵ بوون بۆ دۆستانی شەیتان و دۆستانی جوولەکەو گاور دەبێت، یاخود سەرکەوتن و زاڵ بوون بۆ دۆستانی خوا دەبێت و، دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ يَتَوَلَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا فَإِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْغَالِبُونَ﴾ هەرکەس خواو پێغەمبەرو ئیمانداران بکات بە دۆست و پشتیوانی خۆی ئەوە بێگومان هەر حیزبی خوا زاڵ و سەرکەوتوون، بە حیزب و کۆمەڵی خۆی ناوی بردوون، کەوابوو تاقمی دووەم حیزب و کومەڵی سەر بە

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

----------------------------------------------------

کێن؟ حیزب و کۆمەڵی شەیتانن، ﴿هُمُ الْغَالِبُونَ﴾ کۆمەڵی خوا زاڵ و سەرکەوتوو دەبن، بەڵی لەوانەیە هەندێ نوشوستی و بەڵاو کارەساتیان تووش بێت، بەڵام ئەگەر کەم و کوڕیەکانیان چاك کردەوە، خوای گەورە سەرکەوتن و زاڵ بونیان پێ دەبەخشێت، ئاکام و دەرەنجامی باشیش تەنها بۆ بڕوادارانە. لە ڕوانگەی ئەم ئایەتانەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ئەولیاو دۆستانی خوا ئەهلی ئیمانە، ئەوانەی هەندێکیان دۆستایەتی یەکتر دەکەن، ئەولیاو دۆستانی شەیتانیش کافران و دووڕوانن، ئەوانەی خۆیان مەڵاس دەدەن و، لە نێوان ئەمان و ئەواندا دوودڵی دەنوێنن، نە لە گەڵ ئیمانداراندان و نە لە گەڵ کافرانیشدان، دودڵن و دڵەڕاوکێیانە لە نێوان کوفرو ئیماندا، نەلای ئیماندارانن و نەلای بێ باوەڕانیشن، ئەمانە دۆستانی شەیتانن، ئەمەیە جیاکاری لە نێوان دۆستانی خواو دۆستانی شەیتاندا.

دیسـان خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿هُنَالِكَ الْوَلَايَةُ لِلَّهِ الْحَقِّ هُوَ خَيْرٌ ثَوَابًا وَخَيْرٌ عُقْبًا﴾[الكهف: ٤٤]، واتـە:﴿هُنَالِكَ الْوَلَايَةُ لِلَّهِ الْحَقِّ﴾ لـەو شـوێنانەدا پشـتیوانی و یاریدەر هـەر خـوای ڕاسـت و هەقـە ﴿هُوَ خَيْرٌ ثَوَابًا﴾ هـەر ئـەویش چاکترین پاداشت دەداتەوەو ﴿وَخَيْرٌ عُقْبًا﴾ سەرەنجامەشی باشترە[1]

---

(١)_ لـە ڕۆژی دوایـدا هـیچ دۆسـتایەتی و خۆشویسـتنێك نامێنێـت، جگـە لـە دۆسـتایەتی و خۆشویسـتنی خـوای گـەورە، (الوَلايَةُ) بفتح الواو: واتـای دۆسـتایەتی و خۆشەویستی دەگەیەنێت و، (الوِلايَةُ) بكسر الواو: واتـای ئەمیرایـەتی و کاروبـار گرتنـە دەست دەگەیەنێت، دۆستایەتی و خۆشویستنی خـوای هـەق، جگـە لـە خـوای گـەورە هیچی تر نامێنێت، هەموو شتێکی تریش لە ناو دەچێت و نامێنێت، بەڵێ، هەر ئەویشە کە چاکترین پاداشـت و سـەرکەوتنی بـاش بـە ئیمانـداران دەدات، بـەڵام ئـەو کەسـەی دۆستایەتی شەیتانی کردبوو، بەدڵنیایی عاقیبەت و دەرەنجام خراپی دەبینێـت و، لـە جیاتی پاداشتیش سزا دەبینێت .

## دۆستانی شەیتان:

هەروەها باسی ((دۆستانی شەیتان))ی کردووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ (٩٨) إِنَّهُ لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ (٩٩) إِنَّمَا سُلْطَانُهُ عَلَى الَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُ وَالَّذِينَ هُمْ بِهِ مُشْرِكُونَ (١٠٠)﴾[النحل: ٩٨ _ ١٠٠] واتە: ﴿فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) کاتێ ویستت قورئان بخوێنی ﴿فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾ پەنا بگرە بەخوا لە شەیتانی دەرکراو لە بەزەیی خوا ﴿إِنَّهُ لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ﴾ بە ڕاستی ئەو (شەیتان) دەسەڵاتی نییە ﴿عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا﴾ بەسەر ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە ﴿وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ و تەنها پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن ﴿إِنَّمَا سُلْطَانُهُ عَلَى الَّذِينَ﴾ تەنها دەسەڵاتی بە سەر ئەوانەدا هەیە ﴿يَتَوَلَّوْنَه وَالَّذِينَ هُمْ بِهِ مُشْرِكُونَ﴾ کە ئەو (شەیتان) دەکەنە دۆست و پشتیوانی خۆیان و ئەوانەی بەهۆیەوە بوونەتە هاوەڵ دانەر[(١)]

---

(١)_ ئەمە سیفاتی دۆستانی ڕەحمانە ﴿فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ﴾ واتە ئەگەر ویستت قورئان بخوێنی، ئەمە بەهاوشێوەی ئایەتێکی ترە کە خوای تعالی تیایدا دەفەرموێت: ﴿إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ﴾[المائدة: ٦] واتە ئەگەر ویستتان هەستن بۆ نوێژکردن، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾ بە (أعوذُ باللهِ من الشيطانِ الرَّجيم) دەست پێ دەکەی، بۆ؟ بۆ ئەوەی شەیتانت لێ دورکەوێتەوە، بۆ ئەوەی خوێندنەکەت لێ تێک نەدا، بۆ ئەوەی ڕێگریت لێ نەکات و نەهێڵێت سەرنج لە سەرەنجامەکانی بدەیت و بیری لێکەبیتەوە، بە ئەندێشەو خەیاڵات و بیرکردنەوە سەر قاڵت بکات و، نەتوانی بەباشی کتێبی خوای گەورە بخوێنیتەوەو بیری لێ کەیتەوە، لە ئادابی خوێندنەوەی قورئان ئەوەیە کە خوێنەر پێش دەستپێکردنی خوێندن (أعوذُ باللهِ من الشيطانِ الرَّجيم) بڵێت، لە سەرەتای سورەتەکەدا بێت یان ناوەڕاستیدا بۆ ئەوەی شەیتان لە خۆی دورخاتەوە، چونکە ئامادە دەبێ بۆ ئەوەی سەر لە خوێنەر

--------------------------------------------------------------------------------
--------------------------------------------------------------------------------
--------------------------------------------------------------------------------
--------------------------------------------------------------------------------
-----------------------------------------------------------------------

تێك بدات و، ڕێگری لێ دەكات و ناهێڵێت سەرەنجی سەرەنجامەكانی بدات و بیری لێ بكاتەوەو، سوود لە قورئان خوێندنەكە وەربگرێت، بۆیە ئەگەر (أعوذُ باللهِ من الشيطانِ الرَّجيم)ی گوت، ئەوا خوای گەورەش پەنای دەداو شەیتانی لێ دور دەخاتەوە، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّهُ لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ ئەمانە واز لە دۆستایەتی شەیتان دێنن و بۆ دۆستایەتی ڕەحمان دەگەڕێنەوە ﴿لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ﴾ بەسەر ئەوانەدا كە ئیمانیان هێناوەو پشتیان بە خوای گەورە بەستووە هیچ دەستەڵاتێكی نییە، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا سُلْطَانُهُ﴾ دەسەڵاتی شەیتانی بەسەر چ كەسانێكدا سنوردار كردووە ؟ ﴿عَلَى الَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُ وَالَّذِينَ هُمْ بِهِ مُشْرِكُونَ﴾ ئەو كەسانەی شەیتان دەكەنە دۆست و پشتیوانی خۆیان و ئەوانەی بەهۆی ئەوەوە بوونە بە موشریك و هاوەڵ دانەر، بەسەریاندا زاڵ دەبێ و دەستیان بە سەردا دەگرێ و، دەبن بە حیزب و كۆمەڵی ئەو، حیزب و كۆمەڵی شەیتان، چونكە گوێڕایەڵی بوون، دۆستایەتی و پشتیوانیان كردو، خۆشیان ویست و گوێڕایەڵی بوون، ئیتر شەیتان بوو بە دۆست و پشتیوانیان و، ئەوانیش بوون بە حیزب و كۆمەڵی شەیتان، ئەم ئایەتانە جیابوونەوەی تێدایە لە نێوان دۆستانی خواو دۆستانی شەیتاندا، دۆستانی خوا پشتیوانی و دۆستایەتی خوای گەورە دەكەن، شەیتان بەسەر ئەوانەدا كە ئیمانیان هێناوەو پشتیان بە خوای گەورە بەستووە هیچ دەستەڵاتێكی نیە، ئەمە سیفاتی دۆستانی خوایە، بەڵام ئەوانەی دۆستایەتی شەیتان دەكەن، ئەوا شەیتان دەستەڵات و بەهانەو هێزی بەسەریاندا دەبێ.

دیسان خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ فَقَاتِلُوا أَوْلِيَاءَ الشَّيْطَانِ إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفاً﴾[النساء: ٧٦]راوی واتە: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەو کەسانەی باوەڕیان هێنـاوە ﴿يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ لە پێناوی خوادا دەجەنگێن ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا﴾ وە ئەوانەی بێ باوەڕن ﴿يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ﴾ لـە پێنـاوی نـاڕەوا (یـان شـەیتان)دا دەجـەنگێن ﴿فَقَاتِلُوا أَوْلِيَاءَ الشَّيْطَانِ﴾ کەواتە: شەڕ بکەن لە گـەڵ دۆسـتەکانی شـەیتاندا ﴿إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفاً﴾ بە ڕاستی پیلانی شەیتان هەر لاواز بووە(١)

---

(١)_ خوای گەورە لە ئایەتێکی دیکەدا دەفەرموێت: ﴿وَمَا لَكُمْ لاَ تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنْ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ وَلِيًّا وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ نَصِيرًا﴾[النساء: ٧٥] واتـە: ئـەوە چیتانە (بە چ بیانویەك) جەنگ ناکەن لە پێناوی خوا دا و لە پێناوی چەوساوەکان لـە پیاوان و ئافرەتان و منداڵان ئەوانەی کە دەڵێن ئەی پەروەردگارمان ڕزگارمان بکە لەم شارە کە خەڵکەکەی ستەمکارن لە لایەن خۆتەوە دڵسۆزێکمان بۆ بـەدی بهێنـە وە لـە لایەن خۆتەوە بە دی بهێنـە بۆمـان یارمـەتی دەرێك. تەماشـای ئایەتەکـەی سـەرەوە بکەن، ئەوانەی خـوای گـەورە باسیان دەکات لـە وەڵات و شـوێنی خۆیانـدا بـوون و، بەربیوونی خۆیان لە کافران دەربڕی و، لە خوای گـەورەیان داواکـرد دۆسـتانێکیان لـە ئیمانداران بداتێ و، دەیانگوت: پەروەردگارا لە لایەن خۆتەوە دڵسـۆزێکمان بـۆ بـەدی بهێنـەو، لـە لایـەن خۆتـەوە یارمـەتی دەرێکمـان بـۆ بـەدی بێنـە، خـوای گـەورە دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ ئەوانەی باوەڕیـان هێنـاوە لـە پێنـاوی خوادا دەجنگێن، بەڵام کافران دەجنگن، کافران دەجنگن و، نەفس و ماڵ و سـەروەت و سامانیان پێشکەش دەکـەن، خۆیـان دەخەنـە مەترسیەوە، خۆیـان تووشـی مـردن دەکەن، بۆ سەرخستنی چ لایەنێك ؟ بۆ سەرخستنی شەیتان، پەنامان

---

---

---

بەخوا، ئەمە شتێکی سەرسوڕمێنە، تەماشاکەن چۆن بۆ بەرگریکردن لە کوفرو لە شەڕەکەیان هیچ سڵێك ناکەنەوە، بەڵام ئیمانداران لە پێناوی خوادا دەجنگن، بۆ سەر خستنی دینی خواو بۆ بەرز ڕاگرتنی گوفتاری خوا دەجەنگن، ئەوە سیفەتی دۆستانی خوایە، لە پێناوی خوا دا دەجنگن، بۆ ڕووپامایی و، ناوو شورەت و، تەماعکردنی ماڵ و سامان و، تەماعکردنی موڵك و دەسەڵات ناجەنگن، بەڵکو لە پێناوی بەرز ڕاگرتنی وشەی خوای گەورەدا دەجەنگن، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ﴾ ئەوانەی بێ باوەڕن لە پێناوی ناڕەوایی و شەیتاندا دەجەنگن، دەجەنگن و نەفس و سەروەت و سامانی خۆیان بۆ بەرگری کردن لە شەیتان پێشکەش دەکەن، پەنامان بە خوا، ئەوە دۆستایەتیە، ئەوە ئەوپەڕی دۆستایەتیە بۆ شەیتان، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَقَاتِلُوا أَوْلِيَاءَ الشَّيْطَانِ﴾ کەواتە لە گەڵ دۆستانی شەیتاندا شەڕبکەن، جیهادیان بەرامبەر دەکرێت لە گەڵ بوونی تواناد‌ا، موسڵمانانی دۆستانی خوا دژ بە دۆستانی شەیتان دەجەنگن، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفاً﴾ بەڕاستی پیلانی شەیتان هەر لاواز بووە، پیلانەکانی شەیتان هەر چۆنێك بێت هەر لاوازە، هەر کاتێك ئەهلی ئیمان هەستاون بە جیهاد لە پێناوی خوادا ئەوەیان بەڕوونی بۆ دەرکەوتووە، ئەو پیلان لاوازیەی شەیتان هاتەدی، کاتێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی جیهادیان دەکردو، کاتێکیش لە پاشخۆی هاوەڵانی جیهادیان کرد، ئەوەبوو شەیتان و حیزبەکەی شکستیان هێناو، ئیسلام دەرکەوت و، لە ژێر ئاڵای ئیسلامدا وەڵاتانی کوفر کەوتن، چونکە پیلانەکانی شەیتان لاوازە، هێزو هەیبەتیان ج بۆ کردن؟ فارس و ڕۆمەکان بەرامبەر بە سەربازانی خوای گەورە شکستیان هێنا، ئەم ئایەتە سیفەتی دۆستانی خوای بۆ ڕوون کردوینەتەوە کە لە پێناوی خوادا دەجەنگن، وە سیفەتی دۆستانی شەیتانیشی بۆ دەرخستوین کە لە پێناوی شەیتاندا دەجەنگن.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلآئِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ الْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ أَفَتَتَّخِذُونَهُ وَذُرِّيَّتَهُ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِي وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّ بِئْسَ لِلظَّالِمِينَ بَدَلًا﴾[الكهف: ٥٠]بۆ ستەمکاران(١)

---

(١)_ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلآئِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا﴾ کاتێك خوای گەورە ئادەمی _ عليه السلام _ دروست کرد، بە دەستەکانی خۆی دروستی کرد، لە قوڕ دروستی کرد، ئەمە ڕێزگرتنە لە ئادەم کە خوای گەورە بە دەستەکانی خۆی دروستی کردووە، پاشان ناوی هەموو شتەکانی فێرکرد، بۆیە بەزانستەوە بەسەر فریشتەکاندا دەرکەوت، پاشان خوای گەورە فەرمانی دایە فریشتەکان سوژدە بۆ ئادەم بەرن، سوژدەی ڕێزلێنان، نەك سوژدەی پەرستن، سوژدەی سڵاوکردن و ڕێزگرتن، ئەمەش پەرستنە، پەرستنی خوای گەورەیە، پەرستنی خوای گەورەیە بە ملکەچ بوون بۆ فەرمانەکانی، ئەمەش ڕێزگرتنی ئادەمە، فریشتەکان دوودڵیان نەنواند، دۆستانی خوا دوودڵیان نەنواند، بەڵکو سوژدەیان برد، ملکەچی خوای گەورە بوون، ئەمەش ئەو پەڕی پەرستنی خوای گەورەیە، هەر هەموویان سوژدەیان برد، ﴿إِلَّا إِبْلِيسَ﴾ جگە لە ئیبلیس کە سەرکردەی سەراپای شەیتانەکانە، (أستثناء)کردن واتە: جیاکردنەوەی ئیبلیس لە فریشتەکان، ئایا لە ڕەگەزی ئەوانە، ئەگەر لە ڕەگەزی فریشتەکان بێت ئەوا لەم بارەدا دەبێ بە (أستثناء متصل)، واتە لە ڕەگەزی فریشتەکان بوو، پاشان کاتێ کە ڕازی نەبوو سوژدە بەرێ و خۆی بەگەورە نواند، خوای گەورە سەرشۆڕی کردو، نەفرەتی لێکردو، دوری خستەوە، یاخود لە ڕەگەزی فریشتەکان نەبوو، لەم بارەدا دەبێ بە (أستثناء منقطع) بەمانای (لکن) واتە بەڵام، واتە هەموو فریشتەکان سوژدەیان برد بەڵام ئیبلیس سوژدەی نەبرد، _ والله أعلم _ ڕای ڕێتێچووتر ئەوەیە کە لە ڕەگەزی فریشتەکان نەبوو، بەڵکو خواپەرستی لە گەڵدا دەکردن، بەبەڵگەی ئەوەی کە خوای گەورە

---------------------------------
---------------------------------
---------------------------------

دەفەرموێت: ﴿كَانَ مِنَ الْجِنِّ﴾ واتە لە پێڕی جنۆکەکان بوو، چونکە ئەگەر لە ڕەگەزی فریشتەکان بوایە خوای گەورە نەیدەفەرموو ﴿كَانَ مِنَ الْجِنِّ﴾، بۆیە ئیبلیس لە جیهانی جنۆکەکان بوو، جیهانی جنۆکەش سەرکەش و یاخیبوانیان تێدایە، هەر یەکێك لە جیهانی جنۆکە یاخی و سەرکەش بێت دەبێ بە شەیتان و سەرۆکەکەشیان ئیبلیسە، کە سەرکردەی هەموو شەیتانەکانی جنۆکەیە، جیهانی ئادەمیزادیش شەیتانی تێدایە، خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿شَيَاطِينَ الْإِنسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُوراً﴾[الأنعام: ١١٢] واتە: ﴿شَيَاطِينَ الْإِنسِ وَالْجِنِّ﴾ لە شەیتانەکانی مرۆڤ وجنۆکە ﴿يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ﴾ کە بەنهێنی بەیەکتر ڕادەگەیەنن ﴿زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُوراً﴾ وتەی ڕازاوەو بریقەدار بۆ فریودانیان. جنۆکەش جیهانێکن ئێمەی ئادەمیزاد توانای بینینی ئەوانمان نییە، بۆیە بە (جن) ناونراون، وشەی (جن)یش لە زمانی عەرەبیدا لە (الإجتنان)ەوە هاتووە، کە واتای پەنهان بوون دەگەیەنێت، ئەوان جیهانی جنۆکەن کە ئێمە نایانبینین، بەڵام خوای گەورە لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿إِنَّهُ يَرَاكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُ مِنْ حَيْثُ لاَ تَرَوْنَهُمْ﴾[الأعراف: ٢٧] واتە ﴿إِنَّهُ يَرَاكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُ﴾ بەڕاستی شەیتان خۆی و دەستەکەی دەتانبینن ﴿مِنْ حَيْثُ لاَ تَرَوْنَهُمْ﴾ لە جێگایەکەوە کە ئێوە ئەوان نابینن . بۆیە بە (جن) ناونراون، ﴿كَانَ مِنَ الْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ﴾ واتە سەرپێچی فەرمانی پەروەردگاری کرد، کاتێ خوای گەورە بەفریشتەکانی فەرموو: سوژدە بەرن و ئیبلیسیشیان لە گەڵدا بوو، هەموویان سوژدەیان برد، بەڵام ئیبلیس قایل نەبوو و، لە فەرمانی خوای گەورە یاخی بوو، ئەم کارەی ئیبلیس واتای (فِسق) دەگەیەنێت، ﴿أَفَتَتَّخِذُونَهُ﴾ ئەم شێوازە لە زمانی عەرەبیدا (إستفهام إنكاري)ە، واتە خوای گەورە دەپرسێت بەڵام مەبەستی نکۆڵیکردنە لەو شتەی کە لە بارەیەوە دەپرسێت،

------------------------------------------------------------
------------------------------------------------------------
------------------------------------------------

﴿أَفَتَتَّخِذُونَهُ وَذُرِّيَّتَهُ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِي وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّ﴾ ئایا شەیتان و نەوەکانی دەکەن بە دۆست لە کاتێکدا خوای گەورە دەیەوێ دۆستی خوا بن، ئەمە نکۆڵیکردنە لە لایەن خوای گەورەوە، دوژمنەکەی خۆتان خۆش دەوێ و، لە گەڵ دوژمنەکەی خۆتاندا دۆستایەتی دەکەن؛ ئەمە یەکێکە لە شتە سەرسوڕمێنەکان، شکستهێنانی متمانەیە، خوای گەورە لەئایەتێکی دیکەدا دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا بِمَا جَاءَكُم مِّنَ الْحَقِّ يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَن تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ رَبِّكُمْ إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَادًا فِي سَبِيلِي وَابْتِغَاءَ مَرْضَاتِي تُسِرُّونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ وَأَنَا أَعْلَمُ بِمَا أَخْفَيْتُمْ وَمَا أَعْلَنتُمْ وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ (١) إِن يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُوا لَكُمْ أَعْدَاءً وَيَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُم بِالسُّوءِ وَوَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ (٢)﴾[الممتحنة: ١_٢] واتە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە ﴿لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ﴾ دوژمنانی من و خۆتان مەکەن بەدۆستی خۆتان ﴿تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ﴾ دۆستایەتی خۆتانیان بۆ بنێرن ﴿وَقَدْ كَفَرُوا﴾ لە کاتێکدا دڵنیاشن ئەوان بێ باوەڕن ﴿بِمَا جَاءَكُم مِّنَ الْحَقِّ﴾ بەو ئایینە ڕاستەی کە بۆتان هاتووە ﴿يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ﴾ پێغەمبەر ﷺ و ئێوەش دەردەکەن ﴿أَن تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ رَبِّكُمْ﴾ (لەبەر ئەوەی) کە باوەڕ دەهێنن بە خوای پەروەردگارتان ﴿إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ﴾ جا ئەگەر دەرچوون لە وڵاتی خۆتان ﴿جِهَادًا فِي سَبِيلِي﴾ بۆ جەنگ کردن لە ڕێی منا ﴿وَابْتِغَاءَ مَرْضَاتِي﴾ وە بۆ بەدەستهێنانی خۆشنوودی من (دۆستایەتی ئەوان مەکەن) ﴿تُسِرُّونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ﴾ ڕازو نهێنیان پێ دەڵێن بە دۆستایەتی ﴿وَأَنَا أَعْلَمُ﴾ لە کاتێکدا من پێی ئەزانم ﴿بِمَا أَخْفَيْتُمْ وَمَا أَعْلَنتُمْ﴾ بەوەی شاردتانەوەو بەوەی ئاشکراتان کرد ﴿وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ﴾ وە هەر کەسێك لە ئێوە دۆستایەتیان بکات ﴿فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ﴾ ئەوە بێ گومان ڕێ ی ڕاستی ون

--------------------------------------------------------------------------------
--------------------------------------------------------------------------------
--------------------------------------------------------------------------------

کردووه ﴿إِنْ يَثْقَفُوكُمْ﴾ ئەگەر تووشتان ببن ﴿يَكُونُوا لَكُمْ أَعْدَاءً﴾ ئەبن بە دوژمنی ئێوە ﴿وَيَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ﴾ وە درێـژ ئەکـەن بۆتـان ﴿أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُمْ بِالسُّوءِ﴾ دەسـتیان و زمانیان بە خراپی ﴿وَوَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ﴾ ئاواتە خوازن کـە ئێـوە بـێ باوەڕ بوونایـە. ئا ئەمە نەریتی کافرانە بەرامبەر بە موسڵمانان بە بـەردەوامی و بـە هـەتا هـەتایی، کـەوا بوو چۆن متمانەیان پێ دەکەن و لێیـان دڵنیـا دەبن، چۆن دۆستـایەتیان دەکـەن لـە کاتێکدا ئەوان لە دڵـی خۆیانـدا دوژمنایـەتیان شـاردۆتەوە بەرامبـەر بـە ئێـوە، خـوای گـەورە لـە ئایـەتێکی دیکـەدا دەفـەرموێت: ﴿هَأَنْتُمْ أُولَاءِ تُحِبُّونَهُمْ وَلَا يُحِبُّونَكُمْ وَتُؤْمِنُونَ بِالْكِتَابِ كُلِّهِ وَإِذَا لَقُوكُمْ قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْا عَضُّوا عَلَيْكُمُ الْأَنَامِلَ مِنَ الْغَيْظِ﴾[آل عمران: ١١٩] واتە: ﴿هَأَنْتُمْ أُولَاءِ تُحِبُّونَهُمْ﴾ بێدارببن ئا ئەوە ئێوەن کە ئەوانتان خۆش دەوێـت ﴿وَلَا يُحِبُّونَكُمْ﴾ وەئەوان ئێوەیان خۆش ناوێ ﴿وَتُؤْمِنُونَ﴾ وەباوەڕتان هەیـە ﴿بِالْكِتَابِ كُلِّهِ﴾ بە هەموو نامە ئاسمانیەکان﴿وَإِذَا لَقُوكُمْ﴾ کاتێ ئەوان پێتان بگـەن ﴿قَالُوا آمَنَّا﴾ دەڵێن بڕوامان هێنـاوە ﴿وَإِذَا خَلَوْا﴾ وە کـاتێ تـەنها بوونـەوە ﴿عَضُّوا عَلَيْكُمُ الْأَنَامِلَ﴾ سەرە پەنجەکانی خۆیان ئەگەزن لێتان ﴿مِنَ الْغَيْظِ﴾ لە ڕقدا . ئەمە سروشتی ئەوانـە، هەرگیز کافران دەست لەم شتە هەڵناگرن، هەر چەندە خۆیان وا پیشان بدەن و، هـەر چەندە بڵێن و بڵێن، ئەوان دوژمنن، کافرن، ﴿أَفَتَتَّخِذُونَهُ وَذُرِّيَّتَهُ﴾ ئـەم ئایەتـە ئاماژەیـە بۆ ئەوەی کە ئیبلیس نەوەی هەیە وەکو چۆن ئادەم نـەوەی هەیـە ﴿أَفَتَتَّخِذُونَهُ وَذُرِّيَّتَهُ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِي وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّ بِئْسَ لِلظَّالِمِينَ بَدَلًا﴾ ئایا ئیبلـیس و نـەوەکانی دەکـەن بـە دۆستی خۆتان لە جیاتی من لە کاتێکدا ئەوان دوژمنی ئێوەن، ئـای چ گۆڕینەوەیـەکی خراپە بۆ ستەمکاران، بـەڵێ ئـەو کەسـەی دۆستایەتی خـوای گـەورە بـە دۆستایەی شەیتان دەگۆڕێتەوە، ئەوە هـەرگیز گۆڕینەوەیـەکی چاکی ئـەنجام نـەداوە، داواکـارم خوای گەورە بمانپارێزێت.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ يَتَّخِذِ الشَّيْطَانَ وَلِيًّا مِنْ دُونِ اللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُبِينًا﴾[النساء: ١١٩] واتە: هەر کەسێك شەیتان بکات بە دۆستی خۆی بێجگە لە خوا ئەوە بێ گومان زیانی لێ کەوتووە بەزیانێکی دیارو ئاشکرا[1]

---

(١)_ ئایەتەکەی پێشوو بەوە تەواو دەبێ کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿بِئْسَ لِلظَّالِمِينَ بَدَلًا﴾ واتە: ئای چ گۆڕینەوەیەکی خراپە بۆ ستەمکاران، ئەم ئایەتەش خوای گەورە بەم شێوە کۆتای پێ دێنێت: ﴿فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُبِينًا﴾ واتە ئەوە بێگومان زیانی لێ کەوتووە بەزیانێکی دیارو ئاشکرا، ئەو کەسەی شەیتان دەکات بە دۆستی خۆی وادەزانێت قازانج دەکات، کەسایەتیەکی دیبلۆماسی بۆ خۆی دروست دەکات، لە گەڵ خەڵکدا چاکە دەکات، توندی و زبری بەکار ناهێنێت، لە گەڵ خەڵکدا تێکەڵ دەبێت، لە گەڵ خەڵکدا دەچێتە ژورەوە، ئەمە سیفەتی دووڕووانە، ئێمە ناڵێین دەست درێژی لە کافران بکەن، نەخێر، ستەمکردن جایز نیە، دەست درێژی کردن و شەڕفرۆشتن جایز نیە، ناشڵێین لە گەڵ کافراندا پەیمان مەبەستن، یاخود ڕێکەوتن و ئاشتبونەوەیان لە گەڵدا مەبەستن، یاخود سوود وەرگرن، یاخود کڕین و فرۆشتنیان لە گەڵ بکەن، لە کاروباری دونیادا، یاخود چاکە لە گەڵ ئەوانەیاندا بکەن کە چاکەیان لە گەڵدا کردوون، خوای گەورە قەدەغەی ئەمەتان لێ ناکات، ئێمە ئەم شتانە ناڵێین، دەڵێین ئەو شتانە ئەنجام بدەن، چونکە هەموو ئەو شتانە ناچنە چوارچێوەی دۆستایەتیەوە، بەڵکو دەچنە چوارچێوەی گۆڕینەوەی بەرژەوەندیەکانەوە لە نێوان یەکتر دا، دەچێتە بواری پاداشت دانەوە لە سەر چاکەکاری لە نێوان یەکتردا، موسڵمانانیش بەوەفان، ئیمانداران بە وەفان بەرامبەر بە بەجێهێنانی پەیمان و، مامەڵەکردنی چاك، ئەمە سیفەتی ئیماندارانە، ئەمە ناچێتە چوار چێوەی دۆستایەتیەوە، وەکو ئەوەی کەسانێکی نەفام لێی تێگەیشتوون، بەڵکو ئەو شتانە دەچێتە بواری گۆڕینەوەی بەرژەوەندیەکانەوە، والله أعلم، وصلى الله على نبينا موحەممەد وعلى أله و صحبه وسلم.

هەروەها خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَاناً وَقَالُواْ حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ (١٧٣) فَانقَلَبُواْ بِنِعْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوءٌ وَاتَّبَعُواْ رِضْوَانَ اللَّهِ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ (١٧٤) إِنَّمَا ذَلِكُمُ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءهُ فَلاَ تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾[آل عمران: ١٧٣ _ ١٧٥] واتـە: ئەوانـەی کە خەڵکی پێیان دەووتن بە ڕاستی خەڵکی ( بێ باوەڕ) لەشکرو کۆمـەڵی زۆریـان کـۆ کردۆتەوە لە دژتان کەواتە بترسن لێیان کەچی ئەوان (ئیمانداران) بەمە باوەڕیان زیـاد بوو وە ووتیان هەر خوامان بەسە چاکترین پشت و پەنامان هەر ئەوە ئینجا گەڕانـەوە (بۆ مەدینە) بە بـەهرەی گـەورەوە (کـە سـەلامەتی یـە) و فـەزڵ و پاداشـت لـە لایـەن خواوە هیچ زیان و ناخۆشیەکیان تووش نەبوو ئەوانە شوێنی ڕەزامەنـدی خـوا کـەوتن وە خوا خاوەن بەهرەی گەورەیـە بـە ڕاسـتی ئـەوەی ئێـوە (سـارد دەکاتـەوە) تـەنها شەیتانە کە دۆست و (برادەرانی) خۆی دەترسێنێ جا ئێـوە لێیـان مەترسـن و لـە مـن بترسن ئەگەر ئێوە بڕوادارن[1]

---

(١)_ ئەم ئایەتانـە لـە سـوڕەتی (آل عمران)ە، خـوای گـەورە بـەوردی ڕووداوی جەنگی ئوحودی تێدا باس دەکات، ئەم ئایەتانە لـە کۆتایەکەیـدا هـاتووەو، دۆسـتانی خواو دۆستانی شەیتانی تێدا ڕووندەکاتەوە، سەبارەت بە دۆستانی خوا دەفـەرموێت: ﴿الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَاناً وَقَالُواْ حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ (١٧٣) فَانقَلَبُواْ بِنِعْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوءٌ وَاتَّبَعُواْ رِضْوَانَ اللَّهِ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ﴾، پاشان دۆستانی شەیتان باسدەکات و دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا ذَلِكُمُ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءهُ فَلاَ تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾، جەنگەکە لە ئوحـود ڕوویـداو، ژمارەیـەکی زۆر لـە موسـڵمانان شـەهید بـوون و، ژەمارەیـەکی زۆریشـیان برینـدار بـوون، چـونکە هەندێکیان سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەری خوایان ﷺ کرد، کاتێـک سەرپێچیان کـرد سزاکە هەمووی گرتنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگەکەدا

موسڵمانانی ڕێکخست بوو، پشتی کرد بوون لە شاخەکە، بەسەر شاخەکەشەوە کۆمەڵێك تیرهاوێژی دانا بوو، بۆ ئەوەی بەرگری لە پشتی موسڵمانان بکەن، ئیتر ئەو شاخە بە (جبل الرّماة) واتە شاخی تیرهاوێژەکان ناو نرا، ئەوە بوو گوێڕایەڵ بوون، شاخەکەیان بە توندی گرت و موشریکەکان هەلیان دەست نەکەوت بۆ ئەوەی لەپشتەوە هێرش بەرنەسەر موسڵمانان، ئیتر موسڵمانان خۆیان بۆ شەڕ کردن تەرخانکردو، کوشتنێکی زۆریان لێکردن و، ئەوەندەی نەما بوو دوژمن بە تەواوی شکست بێنێت، موسڵمانانیش دەستیان بە کۆکردنەوەی دەستکەوتەکانی جەنگ کرد، کاتێ هەندێ لە تیرهاوێژەکانی سەر شاخەکە سەرکەوتنی موسڵمانانیان بینی و، دەستیان بە کۆکردنەوەی دەستکەوتەکان کرد، وا تێگەیشتن جەنگەکە کۆتایی هات، گوتیان دا دەبەزین و لە کۆ کردنەوەی دەستکەوتەکاندا یارمەتی براکانمان دەدەین، بەڵام سەرکردەکەیان عەبدوڵلای کوڕی جوبەیر پێی فەرموون: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووین: شاخەکە بەجێ مەهێڵن ئەگەر سەرکەوتین یا شکستمان هێنا، ئەوەی بیرخستنەوە، بەڵام ئەوان سوور بوون لەسەر دابەزین، ئەوە بوو هەندێکیان دابەزین و، هەندێکیشیان مانەوەو لەوانەش عەبدوڵلای ی کوڕی جوبەیری رضي الله عنه سەرکردەیان بو، تا موشریکەکان لە پشتەوە هاتن و، بینیان ژمارەی تیرهاوێژەکان لەسەر شاخەکە کەم بونەتەوە، ئیتر لەگەڵ تیرهاوێژەکانی تردا بەشەڕ هاتن تا هەموویان کوشتن، پاشان لە پشتەوە پەلاماری موسڵمانەکانیان داو، موسڵمانانیش هەستیان بە هیچ نەکرد، تا لە ناکاودا بینیان لە پێش و لە پاشەوە چوار دەوریان دراوە، تا مەینەتیەکە ڕوویدا، چونکە سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەری خوایان ﷺ کرد، بۆیە خوای گەورە لە ئایەتێکی تری ئەم سورەتەدا دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمَّا أَصَابَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُم مِّثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّىٰ هَٰذَا قُلْ هُوَ مِنْ عِندِ أَنفُسِكُمْ﴾[آل عمران: ١٦٥] واتە: ﴿أَوَلَمَّا أَصَابَتْكُم﴾

ئایا بۆچی کاتێك دووچارتان بوو ﴿مُصِيبَةٌ﴾ ناخۆشیەك (لە ئوحودا) ﴿قَدْ أَصَبْتُمْ مِثْلَيْهَا﴾ بێگومان ئێوە دووقاتی ئەوەتان دووچاری ئەوان کرد (لەبەدردا) ﴿قُلْتُمْ﴾ ووتان ﴿أَنَّىٰ هَٰذَا﴾ ئەمە لە کوێوە هات ﴿قُلْ﴾ بڵێ ﴿هُوَ مِنْ عِنْدِ﴾ ئەوە لەلایەن ﴿أَنْفُسِكُمْ﴾ خۆتانەوە بوو (کە فەرمانی پێغەمبەرتان شکاند). خوای گەورە کاتێ دەفەرموێت: ﴿هُوَ مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِكُمْ﴾ واتە هۆکاری شکستیەکە خۆتان بوون، لەئایەتێکی پێشتریشدا دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ اللَّهُ وَعْدَهُ إِذْ تَحُسُّونَهُمْ بِإِذْنِهِ﴾[آل عمران: ١٥٢] واتە﴿وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ اللَّهُ﴾ سوێندبێ بێگومان خوا بەجێی هێنا بۆتان ﴿وَعْدَهُ﴾ بەڵێنەکەی ﴿إِذْ تَحُسُّونَهُمْ﴾ کاتێك (سەرەتای جەنگی ئوحود) هەستتان لێ برین (دەتان کوشتن) ﴿بِإِذْنِهِ﴾ بەفەرمانی خوا. خوای گەورە کاتێ دەفەرموێت: ﴿إِذْ تَحُسُّونَهُمْ بِإِذْنِهِ﴾ واتە بە فەرمانی خوا دەتانکوشتن . پاشان خوای گەورە لە هەمان ئایەتی (١٥٢)ی (آل عمران)دا دەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَازَعْتُمْ فِي الْأَمْرِ وَعَصَيْتُمْ مِنْ بَعْدِ مَا أَرَاكُمْ مَا تُحِبُّونَ مِنْكُمْ مَنْ يُرِيدُ الدُّنْيَا وَمِنْكُمْ مَنْ يُرِيدُ الْآخِرَةَ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ وَلَقَدْ عَفَا عَنْكُمْ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾ واتە ﴿حَتَّىٰ إِذَا فَشِلْتُمْ﴾ هەتا کاتێ (لە ناکاو) سست بوون ﴿وَتَنَازَعْتُمْ﴾ ئاژاوەو دوو بەرەکیتان کرد ﴿فِي الْأَمْرِ﴾ لەکاری جەنگدا ﴿وَعَصَيْتُمْ﴾ وەبێ فەرمانیتان کرد ﴿مِنْ بَعْدِ مَا أَرَاكُمْ﴾ لە پاش ئەوەی کە خوا نیشانی دان ﴿مَا تُحِبُّونَ﴾ ئەوەی (لە جەنگەکەدا) پێتان خۆش بوو (کە سەرکەوتن لە سەرەتای جەنگەکەدا) ﴿مِنْكُمْ﴾ هەندێك لە ئێوە ﴿مَنْ يُرِيدُ الدُّنْيَا﴾ (دەستکەوتی دنیایی دەویست ﴿وَمِنْكُمْ مَنْ﴾ وە هەندێکتان ﴿يُرِيدُ الْآخِرَةَ﴾ پاداشتی ڕۆژی دوایی دەویست ﴿ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ﴾ پاشان (خوا) ئێوەی گێڕایەوە (لە جەنگی) ئەوان (وتێکشکان) ﴿لِيَبْتَلِيَكُمْ﴾ تا تاقیتان بکاتەوە (لەخۆ ڕاگرتندا) ﴿وَلَقَدْ عَفَا عَنْكُمْ﴾ سوێندبێ بێگومان خوا لێتان بووری.

---

---

---

خوای گەورە کاتێ دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ عَفَا عَنْكُمْ﴾ واتە خوای گەورە موژدەی پێدان کە دەبورێت لەو سەرپێچییەی ئەنجامیان دا، بۆ ئەوەی دڵنیاو ئارامیان بکاتەوە .

پاشان جەنگەکە کۆتایی هات، موسڵمانان شەهیدانی خۆیان لە (مقبرة الشهداء) واتە: گۆرستانی شەهیدانی لای شاخی ئوحود بەخاك سپاردو، بریندارەکانی خۆشیان هەڵگرت و بۆ مەدینەی پیرۆز گەڕانەوە، موشریکەکانیش بەرەو مەککە گەڕانەوە.

پاشان موشریکەکان سەرزەنشتی یەکتریان کردو وتیان بۆ نەگەڕێینەوەو باقیمەنیشیان لە ناو بەرین، بۆیە نوێنەرێکی خۆیان بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ناردو، پێی گوت دەگەڕێینەوەو هەمووتان لە ناو دەبەین، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانیدایە هەموو ئەو کەسانەی ئامادەی جەنگەکە بوون تەنانەت بریندارەکانیش خۆیان ئامادەکەن و کەس دوا نەکەوێت، فەرمانیشیدا جگە لەوانەی کە ئامادەی جەنگەکە بوو بون هیچ کەسێکی دیکەیان لەگەڵدا دەرنەچێت، بۆیە بە برینەکانی خۆیانەوە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ شوێنی بێباوەڕان کەوتن، تا لە شوێنێك دابەزین بەناوی (حمراء الأسد)، کاتێ بێباوەڕان هەواڵیان پێگەشت کە موسڵمانان شوێنیان کەوتوون تۆقین و، وتیان: ئەگەر بەهێز نەبوایەن دەرنەئەچوون، ئەوە بوو خوای گەورە شکستی پێ هێنان و نەگەڕانەوە، بۆ جەنگی موسڵمانان نەگەڕانەوە، بەڵکو ترسان و، بۆ مەککە گەڕانەوە، خوای گەورە شەڕی بێباوەڕانی لە موسڵمانان دور خستەوە، بەلام دوای چ شتیك؟ دوای تاقیکردنەوە، دوای بەدەرخستنی هێزو ئیمان، ﴿الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ﴾ نوێنەرێك لە بێباوەڕان پێی گوتن ﴿إِنَّ النَّاسَ﴾ بێباوەڕان ﴿قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ﴾ کۆبونەتەوە دەیانەوێ بگەڕێنەوە، ئەم شتەیان لە کاتێکدا پێ گوترا کە بەو نزیکانە لە جەنگەکە بوو بوونەوەو، خوێناوی و بریندار بوون، ﴿فَاخْشَوْهُمْ﴾ کەواتە: لێیان بترسن، ﴿فَزَادَهُمْ إِيمَاناً﴾ بەلام ئیمانداران

------------------------------------------------------------

------------------------------------------------------------

------------------------------------------------------------

نەترسان، بەڵکو ئەو شتە ئیمانی زیاتر کردن، چونکە بڕوایان بەخوای گەورە بوو، ئا ئەوانە ئەولیاو دۆستانی خوان، ﴿وَقَالُواْ حَسْبُنَا اللَّهُ﴾ وتیان خوامان بەسە، ﴿وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ پشت پێ بەستراوێکی چاکەو کاروبارمان سپێردراوەتە دەستی، بەهێزی بڕواو ئیمانی خۆیان بەرامبەر بەو هەڕەشانە لاوازییان نەنواندو، لە بێباوەڕانیش نەترسان، ﴿حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ ئەمەیان فەرموو، بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوون، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَانقَلَبُواْ﴾ واتە: بەساغ و سەلامەتی گەڕانەوە ﴿بِنِعْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوءٌ﴾ ئینجا بە بەهرەی گەورەوە کە سەلامەتیەو، فەزڵ و پاداشت لە لایەن خواوە بۆ مەدینە گەڕانەوەو، هیچ زیان و ناخۆشیەکیان تووش نەبوو، ئەمە ئەنجامی چ بوو؟ ئەنجامی ئیمان و خۆ ڕاگرتن بوو، ئەنجامی ئەوە بوو کە دەیانگوت ﴿حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾، بۆیە خوای گەورە بە فەزڵ و چاکەی خۆی پاداشت و سەلامەتی پێ بەخشین و، دڵی بەهێز کردن و، هیچ لاوازیەکیان نەنواند، پێشەوا ئیبن وعەبباس فەرموویەتی: ئەم گوفتارە ﴿حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾، ئیبراهیم _علیه السلام_ کاتێ خرایە نێو ئاگرەکەوە فەرمووی، خوای گەورەش فەرمووی: ﴿يَا نَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلاَمًا عَلَى إِبْرَاهِيمَ﴾[الأنبياء: ٦٩] واتە: ﴿يَا نَارُ﴾ ئەی ئاگر ﴿كُونِي بَرْدًا وَسَلاَمًا﴾ سارد بەرەوەو بێ زیان بە ﴿عَلَى إِبْرَاهِيمَ﴾ بۆ ئیبراهیم، موحەممەدیش ﷺ ئەوەی فەرموو کاتێ پێیان گوت: ﴿الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَاناً وَقَالُواْ حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ ئەنجامەکەی ئەوە بوو کە ﴿فَانقَلَبُواْ بِنِعْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوءٌ﴾، ئائەوانە ولی و دۆستانی خوان بە بەردەوامی و بە هەتا هەتایی، خوایان لەگەڵ دەبێ، پاشان باسی وەلی و دۆستانی شەیتان دەکات و دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا ذَلِكُمُ الشَّيْطَانُ﴾ واتە: ئەو دەنگۆیەی کە گوێبیستی بوون، ئەو قسەیەو، ئەو هەڕەشەیە، لە ڕاستیدا تەنها

---

---

---

لەلایەن شەیتانەوەیە ﴿يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءَهُ﴾ کە دۆستانی خۆی پێ دەترسێنێت، لێرەدا فەرمایشتی خوای گەورە: ﴿يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءَهُ﴾ بەدوو ڕوو لێك دەدرێتەوە، لەڕووی یەکەمدا گوتراوە (مفعول)ی یەکەم (محذوف)ەو تقدیرەکەی (یخوفکم أولیاءه) واتە ئەی موسڵمانان شەیتان بە دۆستەکانی خۆی لە کافران و موشریکەکان دەتانترسێنێت، لە ڕووی دووەمیشدا سەبارەت بەفەرمایشتی خوای تعالی: ﴿يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءَهُ﴾ دەگوترێت: دووڕووە ئیمان لاوازەکان ئەوانەی کە دۆستانی شەیتانن دەترسێنێت، ﴿فَلاَ تَخَافُوهُمْ﴾ ئەمە ئاماژەیەکە لەلایەن خوای گەورەوە کە دۆستەکانی خۆی لە دۆستانی شەیتان دەترسن، بەڵام خوای گەورە لە سورەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿فَقَاتِلُوا أَوْلِيَاءَ الشَّيْطَانِ إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفاً﴾[النساء: ٧٦] لەگەڵ دۆستانی شەیتاندا بجەنگن، بەڕاستی پیلان و دەسیسەکانی شەیتان هەر لاواز بووە، ﴿وَخَافُونِ﴾ ئەم وشەیە سووك کراوەتەوە چونکە لە بنەڕەتدا (وَخَافُونِي)ە، بەڵام بۆ سووکردنەوە (یاء)ەکەی لابراوە، ﴿وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ تەنها لە من بترسن ئەگەر ئێوە بڕوادارن، چونکە بڕواداری ڕاست تەنهاو تەنها لە خوای تعالی دەترسێت، هەر چەند هەڕەشەی لێ بکرێ و، هەر چەند و هەر چەند، ئەو تەنهاو تەنها لەخوای گەورە دەترسێت، دڵی بە خوای گەورەوە پەیوەستەو، جگە لە خوای گەورە لە هیچی تر ناترسێت، ئەم ئایەتانە سیفاتی دۆستانی خواو دۆستانی شەیتانی تێدایە.

**هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿إِنَّا جَعَلْنَا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاء لِلَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ(٢٧) وَإِذَا فَعَلُواْ فَاحِشَةً قَالُواْ وَجَدْنَا عَلَيْهَا آبَاءنَا وَاللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا قُلْ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاء أَتَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ (٢٨) قُلْ أَمَرَ رَبِّي بِالْقِسْطِ وَأَقِيمُواْ وُجُوهَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَادْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ (٢٩) فَرِيقًا هَدَى وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ الضَّلاَلَةُ إِنَّهُمُ اتَّخَذُوا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاء مِن دُونِ اللَّهِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ﴾[الأعراف: ٢٧ _ ٢٨] **واتە: بە ڕاستی ئێمە شەیتانەکانمان گێڕاوە بە دۆست و خۆشەویست بۆ ئەوانەی کە بڕوا ناهێنن وە کاتێ کردەوەیەکی زۆر بەدو ناشیرینیان دەکرد (کە بە ڕووتی تەواف کردن نموونەکەیەتی) دەیان گووت: لە باو و باپیرانمانەوە بۆمان ماوەتەوە وە خوا فەرمانی ئەو (کردەوەی) پێ داووین (ئەی موحەممەد ﷺ) بلێ بێ گومان خوا فەرمان نادا بەکردەوەی بەدو خراپ ئایا بە دەم خواوە شتێ دەڵێن کە نایزانن و بێ ئاگان لێی بلێ پەروەردگارم فەرمانی بە دادپەروەری داوە وە لە کاتی هەموو نوێژێکدا ڕاست ڕوو بکەنە خوا و دڵسۆزانە هاواری لێ بکەن و بیپەرستن هەرچۆنی لە یەکەم جارەوە (خوا) دروستی کردوون بەو شێوەیە دەگەڕێنەوە (بۆ لای خوا) دەستەیەکی ڕێنموونی کردوە دەستەیەکیش گومڕایی بەسەریاندا چەسپا بە ڕاستی ئەوانە شەیتانەکانیان کرد بە دۆست و پشتیوانی خۆیان لە جیاتی خوا وە وا گومان دەبەن کە ڕێنموونیی کراون[1]**

---

**(١)_ خوای گەورە شەیتانەکانی زاڵکردووە بەسەر ئەو کەسانەدا کە ئیمان ناهێنن، لە ئایەتێکی دیکەدا خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّا أَرْسَلْنَا الشَّيَاطِينَ عَلَى الْكَافِرِينَ تَؤُزُّهُمْ أَزًّا﴾[مريم: ٨٣] **واتە** ﴿أَلَمْ تَرَ﴾ **ئایا نەتدیوە (سەرنجت نەداوە)** ﴿أَنَّا أَرْسَلْنَا الشَّيَاطِينَ﴾ **کە بێگومان ئێمە شەیتانەکانمان زاڵ کردووە** ﴿عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ **بەسەر بێ باوەڕاندا** ﴿تَؤُزُّهُمْ أَزًّا﴾ **چاك هانیان دەدەن (بۆ کوفرو تاوان) . شەیتانەکان دۆستی کافرەکانن،** ﴿إِنَّا جَعَلْنَا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاء لِلَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ﴾ **بەڕاستی خوای**

گەورە شەیتانەکانی گێڕاوە بەدۆستی ئەو کەسانەی کە بڕوا ناهێنن، هۆکارەکەی ئەوەیە کە بڕوایان نەهێناوە، لە بەر ئەوەی بڕوا ناهێنن، خوای گەورە شەیتانی بەسەردا زاڵ کردن و، کردنی بە دۆستیان، خوای گەورە لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت:

﴿اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُمْ مِنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾[البقرة: ٢٥٧] خوا دۆست و کارسازی ئەوانەیە کە بڕوادارن دەریان دەهێنێت لە تاریکستانی بێ بڕوایی بۆ ڕووناکی باوەڕو ڕێنموونیی و ئەوانەی کە بێ بڕوان شەیتان دۆستیانە دەریان دەهێنێ لە ڕووناکی و بیروباوەڕەوە بۆ تاریکستانی، ئەوانە هاوڕێی دۆزەخن تیایا دەمێننەوە بە هەتا هەتایی. ﴿إِنَّا جَعَلْنَا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ لِلَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ﴾ خوای گەورە شەیتانەکانی گێڕاوە بەدۆستی ئەو کەسانەی کە بڕوا ناهێنن، ئەوە هۆکارەکەیە کە بڕوا ناهێنن، ئەم ئایەتە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەو کەسانەی بڕوا دەهێنن شەیتانیان لێ دور دەکەوێتەوە، خوای گەورە دەبێ بە دۆستیان . پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا فَعَلُواْ فَاحِشَةً﴾ ئەو کردەوە بەدو ناشیرینە بریتی بوو لەوەی کە بە ڕووتی بە دەوری کەعبەدا دەسوڕانەوەو، عەوڕەتی خۆیان دەخستەدەر، خستنە دەری عەوڕەتیش (فَاحِشَة)یە، خوای گەورە بە (فَاحِشَة)ی ناو بردووە، وشەی (فاحشة)ش واتای ئەوپەڕی بەدی و ناشیرنی دەگەیەنێت، بۆیە عەوڕەت خستنەدەرو، سفوری ئافرەتان، (فَاحِشَة)یە، ئەوەش کە فەرمانی پێدەکات شەیتا و، سەربازانێتی لە ئینس و جن و بانگەوازکارانی فیتنەو بەرەڵاین، ئەوانەی ئەمڕۆ بۆ فڕێدانی باڵا پۆشی و حیجاب و، پۆشینی جل و بەرگی تەنك و سفور بانگەوازی دەکەن، ئەم تاقمە بە هاوشێوەی ئەو تاقمەن کە لە زەمەنی یەکەمدا بانگەوازیان دەکرد بۆ ئەوەی خەڵك بە ڕووتی بە دەوری ماڵی خوادا تەواف بکەن، هەر دوو تاقمەکە یەکسانن و هیچ

---

---

---

جیاوازیەکیان لەو بارەوە نیە، ﴿قَالُواْ وَجَدْنَا عَلَيْهَا آبَاءنَا﴾ بەلگەو بەهانە دەهێننەوە بەوەی کە باو و باپیرانیان بینیوە کە بەو جۆرە کرداریان کردووە، کەچی دەستەواژەکانی خوا فەرمووی، پێغەمبەرەکەی فەرمووی بە بەلگەو بەهانە ناکەن، بەلْکو تەنها کرداری باو و باپیرانی خۆیان دەکەنە بەلگە، ئەمەش بەلگەو بەهانەیەکی پووچەو، چەندین جار لەوانەوە دووبارە بۆتەوە لە کاتێکدا کە پووچە، ﴿وَاللّهُ أَمَرَنَا بِهَا﴾ ئەمە سەختترە، ئەوەیان داوەتەپاڵ خوای گەورە کە فەرمانی پێ کردوون بە رووتی بەدەوری ماڵی خوادا تەواف بکەن، درۆیان بەدەم خوای گەورەوە هەڵبەستووە، بەلام خوای گەورە بەر پەرچی قسە پووچەکانی داونەتەوەو، بەپێغەمبەرەکەی خۆی دەفەرمووێت: ﴿قُلْ إِنَّ اللّهَ لاَ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاء﴾ ئەمە لە گەڵ شەرعی خوا دا رێك ناکەوێ، ﴿لاَ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاء﴾ (أمر تشريع)ە، بەلام (الأمر الكوني والقدري) خوای گەورە تەقدیری دەکات وەکو سزایەك بۆ هەندێ لە بەندەکانی خۆی، بەلام سەبارەت بە(أمر تشريع)، مەحاڵە خوای گەورە عەورەت خستنەدەر بۆ بەندەکانی خۆی بە شەرع دابنێ، چونکە کردەوەیەکی زۆر بەدو ناشیرینەو، خوای گەورە فەرمان بە ئەنجامدانی کردەوەی بەدو ناشیرین ناکات، وەکو ئەوەو هیتریش، ﴿أَتَقُولُونَ عَلَى اللّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ ئایا بەدەم خواوە شتانێك دەڵێن کە نایزانن و لێی بێئاگان، کاتێ کە دەڵێن: ﴿وَاللّهُ أَمَرَنَا بِهَا﴾ ئەوە بەبێ زانین قسان بەدەم خواوە دەکەن، بەبێ عیلم و زانین بەدەم خواوە قسەکردنیش لە شیرك و هاوەڵ بریاردان سەختترە، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ أَمَرَ رَبِّي بِالْقِسْطِ﴾ بلێ پەروەردگارم فەرمانی بە دادپەروەری کردووە ﴿وَأَقِيمُواْ وُجُوهَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ﴾ ئا ئەمەیە کە خوای گەورە فەرمانی پێکردووە، ﴿وَأَقِيمُواْ وُجُوهَكُمْ﴾ واتە: نیەت و مەبەستتان راست بکەنەوەو بە دڵسۆزی بۆ خوای گەورەی ئەنجام بدەن،

﴿قُلْ أَمَرَ رَبِّي بِالْقِسْطِ﴾ بلێ پەروەردگارم فەرمانی بە دادپەروەری کردووە، عەورەت خستنەدەریش هیچ دادپەروەریەکی تێدا نییە، ﴿قُلْ أَمَرَ رَبِّي بِالْقِسْطِ وَأَقِيمُواْ وُجُوهَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ﴾ لە نوێژو تەواف کردنتاندا ڕاستگۆ بن و بە دڵسۆزی بۆ خوای گەورەی ئەنجام بدەن، چونکە ماڵی خوا مزگەوتەو، عەورەت خستنەدەریش هیچ ڕاستگۆیی و دڵسۆزیەکی تێدا نییە، بەڵکو بەشێکە لە ستەم کردن، ڕوو وەرگێڕانە لەخوای گەورە، ئەو کارە لەشەیتانەوەیە، ﴿وَادْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ﴾ دوعاو نزاو هاوار لێکردن، دوعاو نزاو هاوار لێکردنی بە پەرستن ناو بردووە، لە فەرموودەشدا هاتووە (الدُّعاء هو العبادة) دووعاو نزا گەورەترین جۆرەکانی پەرستنە، گەورەترین دینە، ﴿كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ﴾ وەکو چۆن یەکەم جار خولقاندنی، بەو شێوەیەش لە ڕۆژی قیامەتدا دەتانگەڕێنێتەوە، لە دیدو بۆچۆنی عەقلیشدا دوبارە دروستکردنەوە لە دەست پێکردنی بەدیهێنان ئاسانترە، خوای گەورە لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ وَلَهُ الْمَثَلُ الْأَعْلَى فِي السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾[الروم: ٢٧] واتە: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَبْدَأُ الْخَلْقَ﴾ ئەو (خوا) بەدی هێنانی دەست پێکردووە ﴿ثُمَّ يُعِيدُهُ﴾ لە پاشان (دوای مردنی) دوبارە دروستی دەکاتەوە ﴿وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ﴾ ئەم (دروستکردنەوەی دووەم) لای خوا ئاسانترە ﴿وَلَهُ الْمَثَلُ الْأَعْلَى فِي السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ و هەر بۆ ئەوە (خوا) سیفەتی هەرە بڵند لە ئاسمانەکان و زەویدا ﴿وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ و هەر ئەوە زاڵی کار دروست.

﴿كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ﴾ وەکو چۆن یەکەمجار خوای گەورە لە نەبونەوە دروستی کردن، لە کاتی زیندوبونەوەشدا بەو جۆرەو لەسەر شێوەی دەتانگەڕێنێتەوە، خوای گەورە لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَعُرِضُوا عَلَى رَبِّكَ صَفًّا لَقَدْ جِئْتُمُونَا كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾[الكهف: ٤٨] واتە: ﴿وَعُرِضُوا عَلَى رَبِّكَ صَفًّا﴾ و هەموو (ئادەمی)

---

---

---

لە بەردەم پەروەردگارتدا ڕیز دەکرێن ﴿ولقَدْ جِئْتُمُونَا﴾ سوێند بەخوا بێ گومان هاتنەوە بۆ لامان ﴿كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ هەر بەو شێوەیەی کە یەکەم جار دروستمان کردن . پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَرِيقًا هَدَى﴾ خوای گەورە دەستەیەکی ڕێنموونی کردووە ﴿وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ الضَّلاَلَةُ﴾ دەستەیەکیش گومڕاییان بەسەردا چەسپا، چونکە کوفریان کردو شەیتانیان کرد بە دۆستی خۆیان، هۆکارەکەی چ بوو؟ بۆچی دەستەیەك گومڕاییان بەسەردا چەسپا؟ بۆچی؟ ئایا خوای تعالی ستەمی لێکردن؟ نەخێر، بەڵکو ﴿إِنَّهُمُ اتَّخَذُوا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ اللَّهِ﴾ ئائەمە هۆکارەکەیە، ئەوان شەیتانیان کرد بە دۆست و پشتیوانی خۆیان لە جیاتی خوای گەورە، دەستبەرداری دۆستایەتی خوای گەورە بوون و، دۆستایەتی شەیتانیان هەڵبژارد، پەنامان بە خوا، دۆستایەتی ئەو شەیتانەیان هەڵبژارد، کە بۆ شیرك و هاوەڵ پەیداکردن و عەورەت بە دەرخستن و گومڕایی و سفور بانگیان دەکات، بە دۆستی خۆیانیان هەڵبژاردو، کردیان بە پشتیوانی خۆیان و خۆشیانویست و شوێنیکەوتن لە جیاتی خوای گەورە، ﴿وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ﴾ کارەساتی سەختیش ئەوەیە واگومان دەبەن کە ڕێنموونی کراون، شەیتان شتەکانیان بۆ دەڕازێنێتەوە، بۆیە دەڵێن ئەمە ڕاستەکەیە، ئەمە پێشکەوتنە، ئەمە شارستانیەتە، ئایین دواکەوتنە، کۆنەپەرستیەو تا دوای لەو جۆرە قسانەی کە دەیڵێن، ئەگەر بیانزانیبا خۆیان لە گومڕاییدان، شتەکە ئاسانتر دەبوو، چونکە ئومێدی گەڕانەوەو پەشیمان بوونەوەیان لێ دەکرا، بەڵام کێشەکە ئەوەیە ئەوان وا گومان دەبەن ڕێنموونی کراون، بۆیە ناگەڕێنەوەو پەشیمان نابنەوە، ئا ئەمە تووشبوونە بە موسیبەتێکی تەواو، پەنا بە خوا، وا گومان دەبن خۆیان لەسەر هەقن، ئەمە پەنجە بۆ ئەوە ڕا دەکێشێت کە هەرکەسێك سەرپێچی هەق بکات لە کاتێکدا بزانێت کە هیچ

-----------------------------------------------------------
-----------------------------------------------------------
-----------------------------------------------------------
-----------------------------------------------------------

شتێك بەسەر هەقدا بەرز نابێتـەوە، بـەڵام سـور بێـت لەسـەر ئـەوەی کـە ئـەو شتەی پیادەی دەکات هەقە ئەگەرچی پێچەوانەی سرووشی خوای گەورەش بێت، بـا بزانێت کردارەکەی هەر پووچە، ئەگەر چی بە هەقیشی دابنێت بەڵام هەر پووچ و ناڕەوایە، وا گومان دەبەن کە ڕێنموونی کراون، شـەیتانیان کـرد بـە دۆسـتی خۆیـان، بەوەشـەوە نەوەستان بەڵکو وا دەزانن ئـەوە هەقـە، ئـەوە پێشـکەوتنە، ئـەوە شارسـتانیەتە، تـا کۆتایی ئەو بێ هوودە قسەکردن و هیچانە، لەگەڵ پیا هەڵدانی ئەهلی شیرك و ئیلحادو و کوفرو پیا هەڵدانی گومڕاییـدا . کەسانێك وای بـۆ دەچـن کـە هـەر کـەس وا بزانێت لەسەر هەقە ئیتر بەهانەدارو بەخشراوە، ئەو کەسەی وا بزانێت لە سـەر هەقـە، لەبەر ئەوەی سروشی خوای پێ نەگەیشتووە، تا ماوەیەك بەهانەدارو بەخشراو دەبێ تا ئەو کاتەی بۆی ڕوون دەبێتەوە، بەڵام پاش ئەوەی سروشی پێـدەگات سەرپێچی بکـات و سوور بێ کە تەنها خۆی لە سەر هەقە، ئەم کەسە بەهانـەدارو بەخشـراو نـابێ، بـەڵکو بەڵگەکانی لە سەر دامەزراوە، ئەگەرچی وابزانێت لە سـەر هەقـە، لـە سـەر هـەق نیـە، چونکە سەرپێچی سروش دەکات و، بەڵگـەی لەسـەر دامـەزراوە، لـە سـەر هـەق نیـە، بەهانەدار نییەو نەبەخشراوە.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ﴾ [الأنعام: ١٢١] و بێگومان شەیتانەکان بە نهێنی شت بە دۆستەکانیان دەڵێن ﴿لِيُجَادِلُوكُمْ﴾ بۆ ئەوەی موجادەلەو دەمە دەمێتان لە گەڵ بکەن[1]

---

(١)_ ئەم ئایەتە لە سورەتی (الأنعام)ە، خوای گەورە لە میانەی بە حەلاڵ دانانی ئاژەڵی مردارەوە بوودا دەیلێت، چونکە موشریکەکان مردارەوەبوو بە حەلاڵ دادەنێن، بە حەلاڵیان دادەناو دەیانگوت: خودی خوا ئەو ئاژەڵەی سەربڕیوە، ئیتر چۆن لەوە نەخۆین کە خوا سەری بڕیوەو، لەوە بخۆین کە ئێوە سەرتان بڕیوە، ئەمە قسەی موشریکەکانە، دەڵێن: بەڕاستی مردارەوە بوو خوا خۆی سەری بڕیوە، بەلام ئاژەڵە سەربڕاوەکان ئێوە سەرتان بڕیوە، ئەم قسەیە شەیتانەکانی فارسە ئاگرپەرستەکان بەنهێنی پێیان گوتن، بە نهێنیّ بە دۆستە موشریکە عەرەبەکانی خۆیان گوت، ئەم بوختان و درۆو دەلەسەیان پێگوتن، وتیان: ئەوانەی کە خوا سەری بڕیوە، کە مردارەوە بووە، لەوە شایستەترە کە ئێوە سەرتان بڕیوە . خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ﴾ واتە: شەیتانەکانی ئینس، ﴿لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ﴾ بە نهێنی ئەم بەهانە پووچەیان پێدەڵێن، ﴿لِيُجَادِلُوكُمْ﴾ بۆ ئەوەی موجادەلەو دەمە دەمێتان لەگەڵ بکەن ئەی ئیمانداران، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾ ئەگەر ملکەچیان بن لە بە حەلاڵ دانانی ئەوەدا کە خوای گەورە بەحەرامی داناوە، دڵنیا بن هاوەڵتان بۆ خوای گەورە بڕیارداوە، چونکە حەلاڵ کردن و حەرام کردن مافی خوای گەوەیە، ئەمە هەقی خوای گەورەیەو، هەر خۆی حەلاڵ دەکاو حەرام دەکاو، بۆ هیچ کەسێك نییە لە جیاتی خوای گەورە حەلاڵ بکات و حەرام بکات، ئەو هاوەڵ بڕیاردانەش (شِرك الطاعة)یە ﴿وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾ کە جۆرێکە لە جۆرەکانی شیرك. شاهێدیش لە ئایەتەکە ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ﴾ ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە هەر کەسێك

---

---

---

ئەو شتە بە حەلاڵ دابنێت کە خوای تعالی حەرامی کردووە، لە دۆستانی شەیتانە، چونکە ئەو شتە بە حەلاڵ دادەنێ کە خوا حەرامی کردووەو، ئەو شتە بە حەرام دادەنێ کە خوا حەلاڵی کردووە، بۆیە دەبێ بەدۆستی شەیتان، کەچی ئەو کەسەی حەلاڵ کراوەکانی خوا بە حەلاڵ دابنێ و حەرام کراوەکانیشی بە حەرام دابنێ، با دڵنیابێ کە دۆستی خوایە.

(ابراهيم الخليل) _ عليه السلام _ بە بابی دەفەرموێت: ﴿يَا أَبَتِ إِنِّي أَخَافُ أَنْ يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِنَ الرَّحْمَٰنِ فَتَكُونَ لِلشَّيْطَانِ وَلِيًّا﴾[مريم: ٤٥]. واتــە: ئــەی بــاوکی خۆشەویستم بە ڕاستی دەترسم (گەر بە کافری بمری) تووشی سزایەك ببی لە لایەن خوای بە بەزەییەوە ئیتر ببیتە هاوڕێ و هاودەمی شەیتان (لە دۆزەخدا)(١)

---

(١)_( إبراهيم ) پێغەمبەر _ عليه السلام _ خوای گەورە بە نوور ڕووناکی ئیمان و یەك خواپەرستی دڵی ڕۆشن کردەوە، لە نێوان قەومەکەیدا کە هەسارەکانیان دەپەرست و، لە جیاتی خوای گەورە بە خواوەندیان دادەنان، بتیان لەشێوەی هەسارەکان دروست دەکردو، لە جیاتی خوای گەورە دەیانپەرستن، بۆیە خوای گەورە خەلیلی خۆی (إبراهيم) _ عليه السلام _ی بۆ ناردن، بۆ یەکتاپەرستنی خوای گەورە بانگی دەکردن و، نکۆڵی پەرستنی هەسارەکان و بتەکانی لێدەکردن، (إبراهيم) _ عليه السلام _ لە بابیەوە دەستی بە بانگەوازیەکەی کرد، ئەمە بەڵگەیە کە ئەو کەسەی بانگەوازی بۆ ڕێگە ڕاستەکەی خوای گەورە دەکات، پێویستە سەرەتای دەست پێکردنەکەی لە خزم و کەسوکاری خۆیەوە بێت، چونکە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ﴾[الشعراء: ٢١٤] واتــە: خزم و کەسە زۆر نزیکەکانت بترسێنە. بەڵام ئەهلی ماڵەکەی خۆت و خزم و کەسوکارە گومڕاکانت بەجێبێڵیت و، سەفەر بکەیت و دور کەویتەوەو بانگی خەڵکانی تر بکەی بۆ ڕێگە ڕاستەکەی خوای گەورەو کەسوکاری خۆت و شارەکەی خۆتت بیر چێتەوە، ئەمە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرانە _عليهم الصلاة والسلام_ چونکە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ الْكِتَابَ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾[البقرة: ٤٤] واتــە: ﴿أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ﴾ ئایا فەرمان بەسەر خەڵکیدا دەدەن بە چاکە ﴿وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ﴾ و خۆتان فەرامۆشدەکەن ﴿وَأَنتُمْ تَتْلُونَ الْكِتَابَ﴾ (لە گەڵ ئەمەشدا) کە ئێوە دەوری پەڕاوەکە (تەورات) دەکەنەوە

﴿أَفَلاَ تَعْقِلُونَ﴾ دەی ئایا ژیر نابن و تێناگەن . بۆیە (إبراهیم) ــ علیه السلام ــ لەبابیەوە دەستیپێکرد، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّهُ كَانَ صِدِّيقًا نَبِيًّا﴾[مریم: ٤١] واتە ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِبْرَاهِيمَ﴾ وە (ئەی موحەممەد ﷺ) لە قورئاندا باسی ئیبراهیم بکە ﴿إِنَّهُ كَانَ صِدِّيقًا نَبِيًّا﴾ بەراستی ئەو (ئیبراهیم) زۆر راستگۆ و پێغەمبەر بوو. وشەی (الصِّدِّيق)ی نێو ئایەتەکە مانای زێدەڕۆیی دەگەیەنێت لە راستگۆییدا، (الصِّدِّيق) واتە ئەو کەسەی کە لەراستگۆییدا زێدەڕۆیی دەکات و کردەوەکانی پشتگیری قسەکانی دەکات، هیچ کەسێکی دیکەش لەپێغەمبەر (إبراهیم) ــعلیه السلامــ راستگۆتر نەبوو، ﴿إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ يَا أَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مَا لاَ يَسْمَعُ وَلاَ يُبْصِرُ وَلاَ يُغْنِي عَنْكَ شَيْئًا﴾[مریم: ٤٢] واتە: ﴿إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ﴾ کاتێ بەباوکی ووت ﴿يَا أَبَتِ﴾ ئەی باوکی خۆشەویستم ﴿لِمَ تَعْبُدُ﴾ بۆ دەپەرستی ﴿مَا لاَ يَسْمَعُ وَلاَ يُبْصِرُ﴾ شتێ کە نابیستێ و نابینێ ﴿وَلاَ يُغْنِي عَنْكَ شَيْئًا﴾ و هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنێت . تەماشاکە پێغەمبەر (إبراهیم) ــعلیه السلامــ لەگەڵ بابیدا دەدوێ و دەفەرموێت: ﴿إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ يَا أَبَتِ﴾ لە ڕووی بەزەیی پێدا هاتنەوەوە لەگەڵ بابیدا دەدوێت، ئینجا بە بابی دەفەرموێت: ﴿لِمَ تَعْبُدُ مَا لاَ يَسْمَعُ وَلاَ يُبْصِرُ﴾ لە ڕووی عەقڵ و ژیریەوە لەگەڵ بابیدا دەدوێت و پێی دەفەرموێت: ئەو بتەی تۆ دروستی دەکەی ـ چونکە بابی پێغەمبەر (إبراهیم) ــعلیه السلامــ بتی دروست دەکرد ـ نابیستێ و نابینێ و هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنێ، کەواتە بۆ دەیپەرستی؟ لە ڕووی عەقڵ و ژیریەوە لەگەڵیدا دەدوێ، ئەم شتە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە خوای گەورە سیفاتەکانی بیستن و بینینی هەیە، چونکە ئەگەر خوای گەورە سیفاتەکانی بیستن و بینینی نەبوایە بابی پێغەمبەر (إبراهیم)یش ــعلیه السلامــ بە (إبراهیم)ی دەگوت: هەروەها تۆش خوایەک دەپەرستی کەنابیستێ و نابینێ، ئەمە جێگیرکردنی

---------------------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------------------
------------------------------------------------------------------

سیفاتەکانی بیستن و بینینە بۆ خوای گەورە، ﴿وَلاَ يُغْنِي عَنْكَ شَيْئًا﴾ هیچ سوودێکت پێناگەیەنێت، ئەگەر تووشی نەخۆشیەك بووی، ئەگەر تووشی ناڕەحەتی و تەنگانەیەك بووی بەرگریت لێ ناکات، ئەمە بەردەو هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنێت، ﴿يَا أَبَتِ إِنِّي قَدْ جَاءَنِي مِنَ الْعِلْمِ مَا لَمْ يَأْتِكَ فَاتَّبِعْنِي أَهْدِكَ صِرَاطًا سَوِيًّا﴾[مريم: ٤٣] واتە: ﴿يَا أَبَتِ إِنِّي قَدْ جَاءَنِي مِنَ الْعِلْمِ﴾ ئەی باوکی خۆشەویستم بە ڕاستی دڵنیابە زانست و زانیاریەکم بۆ هاتووە ﴿مَا لَمْ يَأْتِكَ﴾ کە بۆ تۆ نەهاتووە ﴿فَاتَّبِعْنِي﴾ کەواتە شوێنمکەوە و گوێڕایەڵیم بکە ﴿أَهْدِكَ صِرَاطًا سَوِيًّا﴾ ڕێنموونیت دەکەم بۆ ڕێبازی ڕاست. تەماشاکە پێغەمبەر (إبراهيم) ـعليه السلامـ بە بابی دەفەرموێت: ﴿يَا أَبَتِ إِنِّي قَدْ جَاءَنِي مِنَ الْعِلْمِ﴾ واتە: لە ڕوانگەی زانست و زانینی تەواوەوە بۆ ڕێبازی ڕاستی خوای گەورە بانگی بابی دەکات، نەك تەنها بە بەزەیی و سۆزەوە، بەڵکو لە ڕوانگەی زانست و زانینی تەواوەوە، بانگی ناکات و خۆی نەفام بێت، ﴿يَا أَبَتِ لاَ تَعْبُدِ الشَّيْطَانَ إِنَّ الشَّيْطَانَ كَانَ لِلرَّحْمَنِ عَصِيًّا﴾[مريم: ٤٤] واتە: ﴿يَا أَبَتِ لاَ تَعْبُدِ الشَّيْطَانَ﴾ ئەی باوکی خۆشەویستم شەیتان مەپەرستە ﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ﴾ بەڕاستی شەیتان ﴿كَانَ لِلرَّحْمَنِ عَصِيًّا﴾ هەمیشە سەرپێچیکەرو یاخی یە لە خوای بە بەزەیی. چونکە بتپەرستی شەیتانپەرستی یە، شەیتان فەرمانی پەرستنی بتەکانی پێداوە، بتەکان فەرمانی ئەوەیان نەداوە، بت بەردە فەرمانی نەداوە کە بیپەرستن، کەوا بوو کێ فەرمانی پەرستنی بتەکانی پێداوە؟ شەیتان، ئەمە لەو کاتەوە کە خوای گەورە باوکە ئادەمی خوڵقاندووەو تا ئێستاش هەر بەردەوامە، شەیتان لەفەرمانی پەروەردگاری یاخیبوو، سەرپێچی فەرمانی پەروەردگاری خۆیکرد، کاتێ کە فەرمانی پێدا بۆ باوکە ئادەم سوژدەبەرێت، سەرپێچیکردو قایلنەبوو، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَبَتِ إِنِّي أَخَافُ أَنْ يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِنَ الرَّحْمَنِ﴾[مريم: ٤٤] ئەی

باوکی خۆشەویستم بەڕاستی دەترسم گەر بە کافری بمری لەلایەن خوای بەبەزەیەوە تووشی سزایەك ببی، چونکە خودی خوای گەورەیە کە نەخۆش دەخات و شیفا دەبەخشێت، دەمرێنێت و دەژێنێت، چارەسازی و کارسازی کاروبارەکان دەکات، بەلام بت بەردە، هیچ شتێکی نییە، نەفەرماندان و نەقەدەغەکردن و نەزیان گەیاندن و نە سوود بەخشین، نابیستێت و نابینێت، ﴿فَتَكُونَ لِلشَّيْطَانِ وَلِيًّا﴾ ئیتر ببیتە هاوڕێ و هاودەمی شەیتان و، خوای گەورەش وازت لێبێنێت و، تەنها بۆ شەیتان بمێنیتەوە، شەیتانیش توانای نیە لەسزای خوای گەورە ڕزگارت بکات، ئەمە گوتەیەکی پاراو و بەرزە، دەچێتە دڵەوە، بەلگەیەکی ڕوونە، بەلگەی سەلماندن، ﴿يَا أَبَتِ إِنِّي أَخَافُ أَنْ يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِنَ الرَّحْمَنِ فَتَكُونَ لِلشَّيْطَانِ وَلِيًّا﴾ شەیتان ببیٚ بە هاوڕیٚ و هاودەمی تۆ لە کاتێکدا کە ناتوانێت لەسزای خوای گەورە ڕزگارت بکات، یاخود نایەوێت ڕزگارت بکات، چونکە شەیتان دوژمنەو، هەرگیز خێرو خۆشی تۆی ناویٚ، ئیتر دەبی بە دۆست و هاودەمی شەیتان و خوای گەورە وازت لێدێنێت و، نابی بە دۆستی خوای گەورە، ئەمەیە سیفاتی دۆستانی شەیتان کە شتی دیکەی جگە لە خوای گەورە دەپەرستن وەکو درەخت و بەردو گۆڕو و ئەولیاو پیاو چاکان، دڵنیا بن هەموو ئەمانە کاری شەیتانەو، ئەو فەرمان بەوە دەکات، بۆیە هەر کەسێك ئەو شتە ئەنجام بدات و، دەستی لیٚ هەلٚ نەگرێت، با زۆر دڵنیابیٚ کە دەبیٚ بە دۆستی شەیتان، نسأل الله العافية.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ قَدِ اسْتَكْثَرْتُم مِّنَ الْإِنسِ وَقَالَ أَوْلِيَاؤُهُم مِّنَ الْإِنسِ رَبَّنَا اسْتَمْتَعَ بَعْضُنَا بِبَعْضٍ﴾[الأنعام: ١٢٨] واتە: ئەی دەستەو کۆمەڵی جنۆکە بێگومان ئێوە زۆر کەستان لە ئادەمیەکان گومڕا کرد وە دۆستەکانتان لە ئادەمی دەڵێن ئەی پەروەردگارمان هەندێکمان سوودو کەڵکمان لە هەندێکمان وەرگرت[(١)]

---

(١)_ دواتر بە تەواوی ئەم ئایەتە تەفسیر دەکرێت، وەرگێڕ.

هەروەها خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا بِمَا جَاءَكُم مِّنَ الْحَقِّ يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَن تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ رَبِّكُمْ إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَادًا فِي سَبِيلِي وَابْتِغَاءَ مَرْضَاتِي تُسِرُّونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ وَأَنَا أَعْلَمُ بِمَا أَخْفَيْتُمْ وَمَا أَعْلَنتُمْ وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ (١) إِن يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُوا لَكُمْ أَعْدَاءً وَيَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُم بِالسُّوءِ وَوَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ (٢) لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (٣) قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَا أَمْلِكُ لَكَ مِنَ اللَّهِ مِن شَيْءٍ رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ (٤) رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا وَاغْفِرْ لَنَا رَبَّنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ (٥)﴾[1][الممتحنة: ١_٥]

واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە دوژمنانی من و خۆتان مەکەن بە دۆستی خۆتان دۆستایەتی خۆتانیان بۆ بنێرن لە کاتێکدا دڵنیاشن ئەوان بێ باوەڕن بەو ئایینە ڕاستەی کە بۆتان هاتووە پێغەمبەر ﷺ و ئێوەش دەردەکەن (لەبەر ئەوەی) کە باوەڕ دەهێنن بە خوای پەروەردگارتان جا ئەگەر دەرچوون لە وولاتی خۆتان بۆ جەنگ کردن لە ڕێگای مندا و بۆ بە دەست هێنانی خۆشنوودی من (دۆستایەتی ئەوان مەکەن) ڕازو نهێنی یان پێ دەڵێن بە دۆستایەتی لە کاتێکدا من پێی ئەزانم بەوەی شاردتانەوەو بەوەی ئاشکراتان کرد و هەر کەسێك لە ئێوە دۆستایەتیان بکات ئەوە بێ گومان ڕێی ڕاستی

---

(١)_ ئەم ئایەتانە لە سەرەتای سوڕەتی (المُمتحنة) دایە، هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم سوڕەتە ئەوە بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ ویستی مەککە ڕزگار بکات و، غەزای بێباوەڕان لە مەککە بکات، چونکە ناپاکییان کردو، ئەو پەیمانەیان شکاند کە لە نێوان ئەوان و پێغەمبەری خوا دا بوو، ڕێکەوتنامەی (الحُدیبیة)یان هەڵوەشاندەوە،

ڕوون کردووه ئەگەر تووشتان ببن ئەبن بە دوژمنی ئێوه وه درێژ ئەکەن بۆتان دەستیان و زمانیان بە خراپی ئاواتەخوازن کە ئێوه بێ باوەڕ بوونایە نە خزمانتان و نەمناڵانتان سوودتان پێ ناگەیەنن لە ڕۆژی دوایی دا (خوا ئێوەو خزمەکانتان) لە یەك جیادەکاتەوە و خوا بینایە بەوەی کە دەیکەن بە ڕاستی بۆ ئێوه هەیە سەرمەشقێکی جوان و چاك لە ئیبراهیم و ئەوانەی لە گەڵیدا بوون کە بە گەلەکەی خۆیانیان ووت بە ڕاستی ئێمە بێزارو بەرین لە ئێوه و لەو شتانەی کە دەیان پەرستن لە جیاتی خوا ئێمە باوەڕمان نی یە بە (ئایینی) ئێوه وه پەیدا بوو لە نێوان ئێمەو ئێوەدا دوژمنایەتی و کینە بۆ هەمیشە تا کاتێك کە بڕوا بەخوایتەنیا دەهێنن جگە لەو قسەیەی ئیبراهیم کە بە باوکی گووت بێگومان داوای لێخۆشبوونت بۆ ئەکەم و من هیچم بە دەست نییە لە بەرانبەر خوادا بۆ تۆ ئەی پەروەردگارمان تەنها پشتمان بەتۆ بەستووه و هەر بۆ لای تۆ گەڕاوینەتەوه سەر ئەنجامیش هەر بۆ لای تۆیە ئەی پەروەردگار نەمان کەیت بە مایەی گومڕایی ئەوانەی بێ باوەڕ بوون وه لێمان خۆشبە ئەی پەروەردگارمان بە ڕاستی هەر تۆیت زاڵی کار بەجێ.

---

ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری غەزاکردنیدان، بەڵام شتەکەی لە دڵی خۆیدا هێڵایەوەو ئاشکرای نەکردو، ڕێڕەوی خۆی بۆ هاوەڵانی ئاشکرانەکرد، چونکە ئەوه نهێنی جەنگەو نابێ بۆ خەڵك ئاشکرا بکرێت، ئەوەبوو لە مانگی ڕەمەزاندا بەرەو مەککە بەڕێکەوت، هاوەڵی بەڕێز (حاطب)ی کوڕی (أبي بَلْتَعَة)ش رضي الله عنه لەنێو کۆمەڵی هاوەڵاندا بوو، کە یەکێك بوو لە هاوەڵە گەورەکان و، لەوانەش بوو کە ئامادەی جەنگی بەدر بوو بوو، بەڵام ئیجتهادێکی کردو، هەڵەی کرد، ئەوەبوو نامەیەکی نهێنی بۆ موشریکەکان نووسی و، پێی ڕاگەیاندن کە موحەممەد ﷺ بە نیازە غزایان بکات و، نامەکەشی لەگەڵ ژنێکدا نارد، بەڵام خوای گەورە وەحی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ناردو، شتەکەی پێ ڕاگەیاند، ئەویش هەر دوو هاوەڵی بەڕێز خالیدی کوڕی وەلیدو، عەلی کوڕی ئەبی تالیبی رضي الله عنه بەشوێن ژنەکەدا ناردو، پێی فەرموون کە لە فلان جێگە

قسەکانی نەگۆڕی، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ باوەڕپێکرد، بەڕاستی وەڵامی دایەوە، بۆیە خوای گەورە بەهانەکەی قبوڵ کردو، پێغەمبەری خواش ﷺ بەهانەکەی قبولکرد، تەماشاکەن خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ واتە: وەسفی ئەو هاوەڵەی بە ئیماندار کردووە، ئەمە پەنجە ڕادەکێشێت بۆ ئەوەی کە ئیمانی ئەم هاوەڵە لەق نە بوو بوو، نیفاق و دوو ڕوویی نەنواند بوو، بەڵکو خوای گەورە بە ئیماندار وەسفی دەکات لەگەڵ تێکڕای براکانیدا لە کۆچکردووان و پشتیوانان، بەڵام خوای گەورە قەدەغەی ئەم جۆرە ڕەفتارانە دەکات و دەفەرموێت: ﴿لا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ﴾ دوژمنانی من و خۆتان مەکەن بە دۆستی خۆتان، وشەی (الموالاة)یش لە زمانی عەرەبیدا واتای خۆشویستن و سەرخستن دەگەیەنێت، (حاطب)یش خۆشی نەدەویستن بەڵکو ویستی بەو ڕفتارەی خۆی هەستێکیان بۆ دروست بێت کە ئەم کارێکی بۆ کردوون، بۆ ئەوەی ئازاری کەسوکارەکەی نەدەن، لە ڕاستیدا ئەم ڕەفتارەش دۆستایەتی نواندنە، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا بِمَا جَاءَكُم مِّنَ الْحَقِّ يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ﴾ دۆستایەتی خۆتانیان بۆ بنوێنن لە کاتێکدا دڵنیاشن ئەوان بێباوەڕن بەو ئایینە ڕاستەی کە بۆتان هاتووەو، پێغەمبەری خوا ﷺ و ئێوەش دەردەکەن، ئایا پێغەمبەری خوایان دور نەخستەوەو، موسڵمانانیشیان دەر بەدەر نەکرد، تا ئەو ئاستەی ناچاری کۆچکردنیان کردن، ﴿يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ﴾ پێغەمبەر ﷺ و ئێوەش دەردەکەن، بەبێ هیچ هۆیەك، بەڵکو تەنها لە بەر ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَن تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ رَبِّكُمْ﴾ لەبەر ئەوەی کە بە خوای پەروەردگارتان باوەڕدەهێنن، ئائەمە ئەو هۆکارەیە کە لەپێناویدا دەریانکردن، ﴿إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَادًا فِي سَبِيلِي وَابْتِغَاءَ مَرْضَاتِي تُسِرُّونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ وَأَنَا أَعْلَمُ بِمَا أَخْفَيْتُمْ وَمَا أَعْلَنتُمْ وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ﴾

دەبینن، ئەوانیش لەهەمان ئەو جێگەیەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی دیاری کرد بوون پێیگەیشتن و، نامەکەیان بردە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، تەماشایان کرد لە (حاطب)ی کوڕی (أبي بَلْتَعَة)وەیە ﷺ بۆ خەڵکی مەککە، پێغەمبەری خوا ﷺ پەلەی لە شتەکەدا نەکرد، ئەگەر چی شتێکی زۆر سەخت بوو بەڵام پەلەی نەکرد، (حاطب)ی کوڕی (أبي بَلْتَعَة)ی بانگ کردو، پێی فەرموو ئەی (حاطب) ئەمە چییە؟ (حاطب)یش فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پەلەم لێ مەکە، بەڕاستی هەر یەکێك لە هاوەڵانت خزم و کەسوکاری لە مەککە هەیە، بەڵام من خزم و کەس وکارم لەوێ نییە، دڵنیاشم خوای گەورە بەسەریاندا سەرت دەخات، دەترسێم تۆڵە لە کەسوکارەکەم بکەنەوە لە مەککە چونکە هیچ کەسێکیان نییە بەرگریان لێبکات، بەڵام هەر یەکێك لە هاوەڵانت خزم و کەسوکاری هەیە کە بەرگری لە کەسوکارەکانی تریان لە مەکک دەکەن، بۆیە من شتێکم ویست کە زیان بە تۆ ناگەیەنێ، چونکە خوای گەورەت لەگەڵدایە لە کاتێکدا کە بۆ من سوود بەخشە، ئەم کردەوەشم لە ڕووی نیفاق و دوو ڕوویەوە ئەنجام نەداوە، بەڵکو دڵنیام خوای گەورە بەسەریاندا سەرت دەخات، تەنها ویستم خزم و کەسوکارم لە مەککە بپارێزم، چونکە لە بنەڕەتدا من خەڵکی مەککە نیم، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ڕاستی پێ گوتن، ئیتر وازی لێهێنا، هاوەڵان لە(حاطب) تووڕە بوون، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بەرامبەر بەو هاوەڵە میهریان بوو و، لێی خۆش بوو، بەڵام هاوەڵان لەم ڕەفتارە تووڕە بوون و، ئیمامی عومەر ﷺ داوای لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد ڕێگەی کوشتنی (حاطب)ی پێ بدات، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئەی عومەر خوای گەورە تەماشای ئەهلی بەدری کردو پێی فەرموون: بە ئارەزووی خۆتان کردار بکەن من لەئێوە خۆش بووم، ئەمیش یەکێکە لە ئەهلی بەدر، کەسێکی ڕاستگۆیەو، لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیدا ڕاستگۆبووە،

جا ئەگەر لە ولاتی خۆتان بۆ جەنگ کردن و لە ڕێی منداو بۆ بەدەست هێنانی خۆشنوودی من دەرچوون، دۆستایەتی ئەوان مەکەن، ڕازو نهێنی یان پێ مەڵێن بە دۆستایەتی لە کاتێکدا من بەوەی کە شاردتانەوەو بەوەی کە ئاشکراتان کرد دەزانم و هەر کەسێك لەئێوە دۆستایەتیان بکات بێگومان ڕێی ڕاستی ون کردووە، ئەمە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هەر کەسێك دۆستایەتی بێباوەڕان بکات ڕێگەی ڕاستی ونکردووە. تا کۆتای ئایەتەکان کە سەرزەنشت و گلەیی کردن دەردەخەن، هەروەها ئاگادارکردنەوەی موسڵمانانی تێدایە بۆ ئەوەی کە هیچ کەسێك لە ئاییندەدا ئەو ڕەفتارە ئەنجام نەدات، هەروەها ئەوەی تێدایە کە هۆی دوژمنایەتی ئێمە بەرامبەر بە ئەوان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دوژمنی خوان و دوژمنی ئیماندارانن، ئائەمە هۆکارەکەیە، دوژمنایەتی ئێمە بەرامبەر بەوان ئەوەیە کە دوژمنی خوان، ئێمەش دوژمنایەتی دەردەبڕین بەوانەی کە دوژمنی خواو پێغەمبەری خوان، ئەمە هۆکارەکەیە، لەبەر دونیا یاخود لەبەر سۆز یان لەبەر هەر شتێکی دیکە دوژمنایەتیان ناکەین، بەڵکو لەبەر خاتری خوای گەورە دوژمنایەتی و دۆستایەتی دەکەین.

## بەشێك

## سەبارەت بە پێویستێتی جیاکردنەوە لە نێوان دۆستانی خواو دۆستانی شەیتاندا

## (سیفاتی دۆستانی خواو دۆستانی شەیتان)[1]

هەر کات زانرا خەڵك دۆستانی خواو دۆستانی شەیتانیان تێدایە[2]، ئیتر پێویستە جیاوازی لە نێوان ئەوان و ئەماندا بکرێت[3]، وەکو چۆن خواو پێغەمبەرەکەی جیاوازی لە نێواندا کردوون[4].

---

(١)_پاش ئەوەی شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێ بێت _ ئەو ئایەتە پیرۆزانەی لەسەرەتای ئەم کتێبەدا هێنایەوە، کە وەسفی دۆستانی خواو وەسفی دوژمنانی خوای تێدایە، ئینجا ئەم بەشەی نووسی، بۆ ئەوەی ئەنجامی ئایەتەکانی پێشەوە ڕوون بکاتەوە.

(٢)_ لە چ شتێکەوە ئەوەمان زانی؟ لە ئایەتەکانی پێشەوە کە شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێ بێت _ هێناویەتیەوە، ئا ئەمە ئەنجامەکەیە.

(٣)_پێویستە جیاوازی لە نێوان دۆستانی خواو دۆستانی شەیتاندا بکرێت و، ئەم شتە بە ئاسایی تەماشا نەکەین و، بڵێین: هەموویان نەوەی ئادەمن، هەموویان لە ڕووی مرۆڤایەتیەوە برامانن و، هەموویان نەوەی ئادەمن، نەخێر، مەسەلەکە مەسەلەی کوفرو ئیمانە، مەسەلەی مرۆڤایەتی و مەسەلەی هەست و سۆز نییە، لە ڕاستیدا شتەکە بریتیە لە کوفرو ئیمان.

(٤)_خوای گەورە جیاوازی لە نێواندا کردوون وەکو ئەوەی کە گوێبیستی ئایەتەکانی پێشەوە بوون.

((دۆستانی خوا)): بریتین لە ئیماندارە لە خواترسەکان[1]، وەکو ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (٦٢) ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ(٦٣)﴾[یونس: ٦٢_ ٦٣] واتە: ئاگادار بن بێ گومان دۆستانی خوا ترسیان لە سەر نی یە خەفەتیش ناخۆن ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و هەمیشە خۆیان دەپارێزن و لە خوا دەترسن.

وفي الحديث الصحيح الذي رواه البخاري وغيره عن أبي هريرة رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال: ((إِنَّ اللهَ تَعَالَى قَالَ: مَنْ عَادَى لِي وَلِيًّا فَقَدْ بَارَزَنِي بِالمحَارَبَةِ _ أَوْ فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالحَرْبِ))[2].

---

(١)_ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ پاشان ئەو دۆستانەی خوامان زیاتر بۆ ڕوون دەکاتەوەو، دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ﴾ هەر موسڵمانێکی لە خواترس بە دڵنیایی دۆستی خوایەو، هەر بێباوەڕو هاوەڵ پەرستێکیش بەدڵنیایی دوژمنی خوایە.

(٢)_ بەڵێ ئەم فەرموودەیە ئیمامی بوخاری لە(صحيح)ەکەیدا دەیگێڕێتەوە، کەسانی دیکەش دەیگێڕنەوەو، چەندین ڕێگەی گێڕانەوەی دیکەشی هەیە کە یەکتر بەهێز دەکەن و، پێی دەگاتە پلەی (صحيح)، بۆیە ئیمامی بوخاری لە(صحيح)ەکەیدا دەیگێڕێتەوە، کەوا بوو ناوڕ لەقسەی ئەو کەسانە نادرێتەوە کە سەبارەت بەم فەرموودە قسە دەکەن و، لە بوخاری گلەیی دەکەن، ئیمامی بوخاری لەم کەسانە زاناترەو، لە هەمووشیان شارەزاترە بەناسینی فەرموودەی (صحيح)، بە لای تێکڕای موسڵمانانەوە بەحوجەت و بەڵگەی ڕاست دانراوە، بۆیە هەرگیز گومان لە (صحيح)ەکەی یاخود چەند فەرموودەیەک لە(صحيح)ەکەیدا ناکرێ، ئەم فەرموودە فەرموودەیەکی قودوسیە، چونکە لەگوفتارەکانی خوای گەورەیەو، پێغەمبەرکەی ﷺ لێوەی دەگێڕێتەوە، کە خوای تعالی دەفەرموێت، لێرەدا ئەوەش جێگیر دەبێ کە خوای تعالی قسە دەکات، گوفتارەکەش گوفتاری خوای گەورەیە (مَنْ عَادَى لِي وَلِيًّا فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالحَرْبِ) لێرەدا خوای گەورە پێی ڕاگەیاندوین کە ئەو کەسەی دوژمنایەتی

ئیمانداران دەکات بە دڵنیایی دوژمنایەتی خوای گەورەی کردووەو، خوای گەورەش جەنگی دژ بەو جۆرە کەسانە ڕاگەیاندووە، هەروەکو چۆن جەنگی دژ بە سووخۆران ڕاگەیاندووە ﴿فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا فَأْذَنُوا بِحَرْبٍ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾[البقرة: ٢٧٩] واتە: ﴿فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا﴾ ئینجا ئەگەر دەستان لێ هەڵ نەگرت ﴿فَأْذَنُوا﴾ کەواتە بزانن و ئاگاداربن ﴿بِحَرْبٍ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ بە جەنگێك لە لایەن خواو پێغەمبەری خواوە. ئایا لە توانای کەسێکدا هەیە دژبە خوای تعالی بجەنگێ؟ (فَقَدْ آذَنْتُهُ) واتە: ئاگادارم کردوە کە من دژبە ئەو دەجەنگم، پەنا بە خوا، چونکە خوای گەورە یارمەتی دۆستانی خۆی دەداو بەرگریان لێدەکات، ئەو کەسانەی ئێستا لە مەجلیسەکانداو لە پاشم لە قسە بەزانایان دەڵێن و گاڵتەیان پێدەکەن و غەیبەتیان دەکەن لەم جۆرەن، لەو کەسانەن کە دوژمنایەتی دۆستانی خوا دەکەن، بۆچی؟ چونکە زانایان میراتبەری پێغەمبەرانن، وەکو ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((وَإِنَّ الْعُلَمَاءَ وَرَثَةُ الأَنْبِيَاءِ)) بۆیە ئەوان میراتبەری پێغەمبەرانن، کاتێ کەسانێك لە زەمەنی پێغەمبەری خوادا گوتیان: (ما رأينا مثل قُرَّائنا هؤلاء، أرْغَبَ بطوناً، ولا أكذبَ ألسناً، ولا أجْبَنَ عند اللّقاء) واتە: دەیگوت: (هیچ کەسێکی دیکەمان وەکو خوێنەرانی خۆمان _ مەبەستی پێغەمبەرو هاوەڵانی بوو _ نەبینوە، زۆر خۆر بن، و زمان درۆزن بن، و لە کاتی ڕووبەڕوو بونەوەدا ترسنۆك بن)، خوای گەورە سەبارەت بەئەوان فەرمووی: ﴿لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ﴾[التوبة: ٦٦] واتە: ﴿لَا تَعْتَذِرُوا﴾ بەهانە مەهێننەوە ﴿قَدْ كَفَرْتُمْ﴾ بەڕاستی ئێوە بێ بڕوا بوونەوە ﴿بَعْدَ إِيمَانِكُمْ﴾ پاش بڕوا هێنانتان. جایز نییە بۆ هیچ کەسێك قسە بە زانایانی میرات بەری پێغەمبەران بڵێت، با کەسانێك لەو زانایانە بەبێ قەست هەڵەش بکەن، باخەڵکی هەڵەکانی نەکەن بەهۆیەك بۆ تانە لێدانی و، ڕێگە بە نەفسی خۆیان بەن بۆ ئەوەی بەسەر زانایان و خەڵکدا زمان درێژی بکەن، دەبێ

هەمووان وریای ئەم شتە بن، بەتایبەت ئەو کەسانەی لەپاشملە قسە بەزانایان دەڵێن و، مەجلیسەکانی خۆیانی پێ ئاوەدان دەکەنەوەو، لەسەر ئەم شتە دۆستایەتی و دوژمنایەی دەکەن _لا حول ولا قوة إلا بالله_ تا ئەو ئاستەی دوویەرەکی و جیاوازییان تێکەوت و، لەنێوان خۆیاندا بوون بە دوژمن لە کاتێکدا خۆیان بە قوتابی زانست دەزانن و، کەسانێکیشیان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە شێخن و یەکێکن لە زانایان، بەڵام ئەم با بزانێت ئەو ڕەفتارەی ئەو تەنها لەلایەن شەیتانەوەیە، لە ڕاستیدا تەنها پیلان و دەسیسەی شەیتانە، (مَنْ عَادَى لِي وَلِيّاً فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالحَرْبِ) خوای گەورە جەنگی دژ بەو کەسە ڕاگەیاندووە، هەر کەسێکیش خوای گەورە جەنگی لەگەڵ بکات بە دڵنیایی سەر شۆڕەو، هەرگیز سەرکەوتوو نابێ، ئەمە ئاگادارکردنەوەی تێدایە بۆ ئەو کەسانەی دوژمنایەتی دۆستانی خوای گەورە دەکەن.

(مَنْ عَادَى لِي وَلِيّاً فَقَدْ بَارَزَنِي بِالمُحَارَبَةِ _ أَوْ فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالحَرْبِ) واتە: جەنگم دژی ڕاگەیاندووە، هەردوو ڕیوایەتەکەش یەك مانایان هەیە، هەر کەس دوژمنایەتی دۆستانی خوا بکات، با دڵنیابێت کە جەنگ دژ بە خوای گەورە دەکات و، خواش جەنگی لەگەڵ دا دەکات.

وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِيْ بِشَيءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ(١).

---

(١)_ ((وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِيْ بِشَيءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ)) ئەمە لە سیفاتی دۆستانی خوایە کە خۆیان لە خوای تعالی نزیك دەكەنەوە، کاتێ باسی وریاکردنەوە لە دوژمنایەتی دۆستانی خوا دەکات، باشە دۆستانی خوا کێن؟ دۆستانی خوا ئەوانەن کە لە ڕێگەی بەجێهێنانی فەرزەکانەوەو، پاشان نوافل و سوونەتەکانیشەوە خۆیان لە خوای گەورە نزیك دەكەنەوە، ((وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِيْ بِشَيءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ)) ئەمە هاندانی تێدایە بۆ بەجێهێنانی ئەو فەرزانەی کە خوای گەورە فەرزی کردوون، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((إِنَّ اللهَ فَرَضَ فَرَائِضَ فَلا تُضَيِّعُوهَا)) واتە: ((خوای گەورە چەندەها پەرستشی فەرز کردووە بە هیچ شێوەیەك پشتگوێی مەخەن))، و لە بەر ئەوەی فەرزەکان بنەڕەت و بنچینەن، بۆیە هەر کەس فەرزەکانی پشتگوێ خست، نوافل و سونەتەکان هیچ سوودێکیان بۆی نابێت، چونکە لەسەر بێ بنەڕەتی و بێ بناغەیی بینا دەکات، بۆ نموونە ئەگەر کەسێك بە درێژایی شەو شەونوێژ بکات، هەموو شەوەکە هەستێت، شەونوێژ بکات و هاوار بکات و بگری، بەڵام فەرزەکانی نەپاراست، فەرزەکان و پێنج نوێژە فەرزەکەی پشت گوێ خست، هەموو کردەوەی ئەم کەسە دەبێ بە خۆڵ و تۆزێکی بڵاوە بوو، و ماندوبونێکی بێ سوود، کەوا بوو ئەگەر پارێزگاری لە فەرزەکانکرد، ئینجا نوافل و سوونەتەکانیش بەجێ دێنێ، چونکە سەرەتا بنەڕەت و بناغەکەی بەجێ هێنا کە پاشتر بینای لەسەر دەکرێ، بەلای خوای گەورەوە فەرزەکان لە نوافل و سوونەتەکان خۆشەویسترن، ئەگەر خوازیاری بە دەست هێنانی خۆشەویستی خوای گەورەیت، ئەو شتانە ئەنجام دەدەی کە خۆشی دەوێ و، بریتیە لەو فەرزانەی کە لەسەر بەندەکانی خۆی نوسیویەتی و واجبی کردووە.

وما يزالُ عبدي يتقرّبُ إليّ بالنّوافلِ حتّى أُحِبَّهُ[1]،

---

(١) ((وما يزالُ عبدي يتقرّبُ إليّ بالنّوافِلِ حتّى أُحِبَّهُ)) ئەمە هاندانی تێدایە بۆ بەجێهێنانی نوافل و سوننەتەکان بەڵام پاش بەجێهێنانی فەرزەکان، ((حَتَّى أُحِبَّهُ)) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پاراستنی فەرزەکان و بەجێهێنانی نوافل و سوننەتەکان هۆکارێکی کاران بۆ بەدەستهێنانی خۆشەویستی خوای تعالی بۆ بەندەکەی، ئەمەش بەشێکە لەدۆستایەتی، چونکە دۆست بریتیە لە خۆشویستراو، خوا ئەو کەسانەی خۆشدەوێ کە هەڵگری ئەم سیفاتانەن، فەرزەکان دەپارێزن و، پاشان نوافل و سوورننەتەکانیش ئەنجام دەدەن، نوێژ سوننەت ی هەیە، زەکات سوورننەتی هەیە، بۆژوو سوننەتی هەیە، حەج سوننەتی هەیەو، هەموو شتێك لە فەرزەکان سونەتێکی لە ڕەگەزی خۆی هەیە، بەڵام بنەڕەت و بناغە بریتیە لەفەرزەکان، بەڵام دۆستانی خوا کێن؟ بەو گوفتارەی خۆی بۆی ڕوون کردوینەتەوە کە دەفەرموێت: ((وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِيْ بِشَيءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ. ومَا يَزَالُ عَبْدِيْ يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ)) ئەمە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە دۆستی خوا بریتیە لەو کەسەی کە لە ڕێگەی بە جێهێنانی پەرستشەکانەوە خۆی لە خوای گەورە نزیك دەکاتەوە، فەرزەکانی و سوورننەتەکانی، ئەمەش چوونیەکی ئەم ئایەتەیە کە خوای تعالی تیایدا دەفەرموێت: ﴿أَلآ إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ (٦٢) الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ﴾[يونس: ٦٢_٦٣]، بۆیە دۆستایەتی تەنها بانگەشە کردن نییە، ئەم کەسە دۆستی خوایە چونکە کردەوەی نائاسایی و لە سروشت بەدەر ئەنجام دەدات، تاوەکو تەماشای کارو کردەوەی کەسەکە نەکرێت، ئایا کارو کردەوەکەی چاکەو گونجاوی شەرعە ؟ ئەگەر بەو جۆرە بوو ئەوا بێگومان وەلی و دۆستی خوایە، فەرموودەکەش ئەم مەسەلە یەکلا دەکاتەوە، ((لایزال عبدي يتقرّب إلي بالفرائض)) واتە: بە واجیباتەکان ((حَتَّى أُحِبَّهُ)) ئەوەی تێدایە کە خوای تعالی دۆستەکانی خۆی خۆش دەوێ، خۆشویستنیش لە

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

-------------------------------------------------------

سیفاته جێگیرەکانی خوای گەورەیە، خوای گەورە خۆشیدەوێ، ڕقی دەبێتەوە، دەبیزێنێت، تووڕە دەبێت، ڕازی دەبێت، ئەمە لە سیفاتەکانی خوای گەورەیە، بە خۆیەوە شایستەیە، لە سیفاتی مەخلوقات ناچێت، وەکو هەموو سیفاتەکانی تر.

فإذا أحببته كنت سمعه الذي يسمع به، وبصره الذي يبصر به، ويده التي يبطش بها، ورجله التي يمشي بها[1].

---

(١)_ ((فإذا أحببته كنت سمعه الذي يسمع به، وبصره الذي يبصر به، ويده التي يبطش بها، ورجله التي يمشي بها)) ئەوەی تێدایە کە خوای گەورە پاڵپشتیان دەکات و سەریان دەخات و ڕێگەی ڕاستیان پیشان دەدات، لە هەموو شتێکدا، لە جوڵانەوەیاندا، لە هەستەکانیاندا، لە ئەندامەکانیاندا، بۆیە هەر هەموو ئەوانە لە گوێڕایەڵی خوای گەورەدا بەکاردێنن. لێرەدا کە دەفەرموێت: ((فبي يسمع، وبي يبصر)) تەفسیر کردنە بۆ فەرمایشتەکەی دیکەی کە دەفەرموێت: ((كنت سمعه الذي يسمع به، وبصره الذي يبصر به، وَيَدَهُ الَّتِي يَبْطِشُ بِهَا، وَرِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِي بِهَا)) سەبارەت بەوەی کە ئامادە نییە شتێتری گوێبیست بێت جگە لەوەی سوودی پێدەگەیەنێت، گوێبیستی زیکرو یادکردنەوە دەبێ، گوێبیستی زانست دەبێ، چونکە خوای گەورە لە بواری بیستندا ڕێگەی ڕاستی پیشان داون، بۆیە خۆی لە حەرام کراوەکان بەدور دەگرێت و، گوێبیستی قسەی پڕوپوچ و ڕابواردن و گۆرانی و میزمار ( زوڕنا و ئامێرە موسیقیەکان )و غەیبەت و دووزمانی نابێ، گوێبیستی هیچ شتێك نابێ کە خوای گەورە تووڕە بکات، هەروەها تەماشای هیچ شتێك ناکات جگە لەوەی سوودی بۆ دەبێ، بۆیە تەماشای مەخلوقاتی خواو نیشانەو بەڵگەو شتە سەرسوڕمێنەکانی دەکاو، بیردەکاتەوەو، لەو شتانە ڕادەمێنێ و، دەیانکات بە بەڵگە بۆ تواناو، تاکێتی خوای گەورەو، شایان بوونی بە پەرستن، و تەماشای حەڕام کراوەکان ناکات، تەماشای ژنان ناکات، تەماشای دیمەنی قیزەون ناکات، تەماشای عەوڕەت ناکات، ئامادە نییە تەماشای ئەو شتانە بکات کە دەبنە هۆی تووڕەبوونی خوای گەورە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ﴾[النور: ٣٠] واتە: ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بلێ بە

---

---

---

پیاوانی ئیماندار ﴿يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ﴾ چاوی خۆیان (لە سەیر کردنی نا مەحرەم) داخەن و بپارێزن ﴿وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ﴾ وە عەورەتیان (لە داوێن پیسی) بپارێزن.

هەروەها خوای تعالی دەفەرموێت: ﴿إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولًا﴾[الإسراء: ٣٦] واتە ﴿إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ﴾ بە ڕاستی گوێ و چاو و دڵ ﴿كُلُّ أُولَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولًا﴾ هەموو ئەوانە (خاوەنیان) پرسیار لێکراوە. گوێ و چاوەکانی لەو بوارانەدا بەکار دێنێ کە کەڵکیان بۆ هەبێ و سوودی پێبگەیەنن، واز لە هەموو ئەوانە دێنێ کە زیانی پێ دەگەیەنن و، ئایین و ڕەوشتی خراپ بکەن. هەروەها ڕێناکات تەنها بۆ ئەو جێگایانە نەبێ کە بەرژەوەندی بۆ دەستەبەر دەکات، هیچ شتێك بە دەستەکانی هەڵناگرێ و، هیچ شتێك بەدەستەکانی نابەخشێ مەگەر لەو بوارانەدا کە بەرژەوەندی خۆی تێدایە، بۆیە شتی حەڕام هەڵناگرێ و، بە دەستەکانی لە هیچ کەس نادات، ستەم لە هیچ کەس ناکات، دەستەکانی لە حەڕام و ستەمدا بەکار ناهێنێ، لە ڕاستیدا تەنها لە پێناوی خوا دا دەباو دەبەخشێ، دەستەکانی لە گوێڕایەڵی خوای گەورەدا بەکار دێنێ، هەروەها ڕێناکات تەنها بۆ ئەو شوێنانە نەبێ کە جێگەی ڕەزامەندی خوای گەورەیە، وەکو ڕێکردن بۆ مزگەوتەکان، بۆ ئەڵقەکانی زیکرو یاد کردنەوە، ڕێکردن بۆ گوێڕایەڵی خوای گەورە لە هەر جێگەیەك بێت، ڕێناکات تەنها بۆ ئەو شوێنانە نەبێ کە گوێڕایەڵی خوای گەورەی تێدایە، ڕێناکات بۆ ئەو شوێنانەی کە خوای گەورە حەڕامی کردون، بۆ شانۆکان و، جێگەکانی ڕابواردن و، داوێن پیسی و، سینەما ڕێناکات، خۆی لەو شوێنانە دور دەخاتەوە، بەڵکو بۆ ئەو شوێنانەی کە گوێڕایەڵی و، خەیرو، زیکرو، فێر بوونی زانستی بە سوودی تێدایە پێ دەکات.

وَلَئِنْ سَأَلَنِيْ لأُعطِيَنَّهُ، وَلَئِنْ اسْتَعَاذَنِيْ لأُعِيْذَنَّهُ))[١].

وفي رواية: ((فَبِي يَسْمَعُ، وَبِي يُبْصِرُ، وبِي يَبْطِشُ، وَبِي يَمْشِي، وَلَئِنْ سَأَلَنِي لأُعْطِيَنَّهُ، وَلَئِنْ اسْتَعَاذَنِي لأُعِيذَنَّهُ، وَمَا تَرَدَّدْتُ عَنْ شَيْءٍ أَنا فَاعِلُهُ تَرَدُّدِي عَنْ قَبْض نَفْسِ عَبْدِي المؤمِنِ[٢]،

---

(١)_ ((وَلَئِنْ سَأَلَنِيْ لأُعطِيَنَّهُ، وَلَئِنْ اسْتَعَاذَنِيْ لأُعِيْذَنَّهُ)) ئەمەش دیسان لە کۆی بەروبومەکانی دۆستایەتیکەیەتی بۆ خوای گەورە، بۆیە خوای گەورە دوعاکانی قبوڵ دەکاو، لە دوژمنان و شەیتانەکانی جین و ئینس کە جێگەی مەترسین بۆی پەنای دەدات، چاودێری دەکاو دەیپارێزێ، ئەمە بەهۆی ئەوەوەیە کە دۆستی خوای گەورەیە.

(٢)_ ((وَمَا تَرَدَّدْتُ عَنْ شَيْءٍ أَنا فَاعِلُهُ تَرَدُّدِي عَنْ قَبْض نَفْسِ عَبْدِي المؤمِنِ)) لە هیچ شتێکی دیکەدا ڕاڕاو دوو دڵ نەبووم بە ئەندازەی ڕاڕای و دودڵیەکەم بەرامبەر بەکێشانی نەفسی بەندە ئیماندارەکەم، ئایا خوای گەورە ڕاڕاو دوو دڵ دەبێ؟ ئەمەی بەوە تەفسیر کردووە کە دەفەرموێت: ((يَكْرَهُ الموتَ وأَكْرَهُ مَسَاءَتَهُ )) حەزی بەمردن نییەو، منیش حەزم بەئازاردانی نییە، ڕاڕایی و دودڵیی خوای تعالى مانای حەز لێنەکردنی ئەو شتە دەبەخشێت، بەڕاستی خوای گەورە حەزی لەو شتانە نییە کە دۆستەکەی حەزی لێ نییە، دۆستی خوا حەزی لە مردن نییەو، خوای گەورەش حەزی لەو شتە نییە کە دۆستەکەی حەزی لێ نییە، ئەمەیە مانای ڕاڕای و دودڵی خوای گەورە، مەبەستی ئەوەیە کە بفەرموێت: من حەزم لەو شتانە نییە کە دۆستەکەم حەزی لێ نییە.

يَكْرَهُ الموتَ وأَكْرَهُ مَسَاءَتَهُ، وَلابُدَّ لَه مِنْهُ[1].

واته: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((خوای تعالی دەفەرموێت: هەر کەس دوژمنایەتی لەگەڵ دۆستێکی من بکات بەڕاستی شەڕی لەدژ ڕاگەیاندووم _ یاخود بە ڕاستی شەڕم لە دژی ڕاگەیاندووە _ و بەندەکەم بە هیچ شتێك لێم نزیك نەبۆتەوەو خۆشەویستر بێت بەلامەوە بەئەندازەی ئەو فەرزانەی کە بەسەریدا سەپاندوومە، و بەندەکەم بەردەوام بە سوونەت و نافیلەکان لێم نزیکدەبێتەوە تا خۆشم دەوێ، کاتێ خۆشم ویست گوێیەکانی دەپارێزم کە پێی دەبیستێ، چاوەکانی کە پێی دەبینێ، دەستەکانی کە زەبرو زەنگی پێ دەکات، پێیەکانی کە ڕێی پێدەکات)).

لە (ریوایە)تێکی دیکەشدا ((لە پێناوی مندا دەبیستێ، لە پێناوی مندا دەبینێ، لە پێناوی مندا زەبر و زەنگ دەکات، لە پێناوی مندا ڕێدەکات، بە دڵنیاییی هەر کات داوام لێبکات پێی دەبەخشم، هەر کات پەنام پێ بگرێت پەنای دەدەم، و لە هیچ شتێکی دیکەدا ڕاڕاو دوو دڵ نەبووم بە ئەندازەی ڕاڕای و دوو دڵیەکەم بەرامبەر بە کێشانی نەفسی بەندە ئیماندارەکەم، حەزی بە مردن نییە و، منیش حەزم بە ئازاردانی نییە، بەڵام ئەو مردنە دەبێ هەر ڕووبدات)).

---

(١)_ ((وَلابُدَّ لَه مِنْهُ)) خوای تعالی دەفەرموێت: ﴿كل نفس ذائقة الموت﴾ خوای گەورە بڕیاری داوە کە هەموو نەفسێك دەبێ مردن بچێژێت، دۆستانی خواو، هەموو ئەو شتانەی کە موڵکی ئەوە وەکو ژیان و ڕوح، خوای گەورە بڕیاری مردنی بۆ داون ﴿كل من عليها فان ويبقى وجه ربك ذو الجلال والإكرام﴾ دەبێ بمرێت بەڵام خوای گەورە ئەوەی پێ ناخۆشە، لەگەڵ ئەوەشدا دەیمرێنێت، بۆ جێبەجێکردنی ئەوەی قەزای کردوەو بە قەدەرەی داناوە.

ئەمە (صحیح) ترین فەرموودەیەکە کە سەبارەت بە دۆست و ئەولیا ڕیوایەت کرا بێ[1].

لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوونیکردۆتەوە کە هەرکەس دوژمنایەتی لەگەڵ دۆستێکی خوا دا بکات، بە ڕاستی شەڕی دژ بەخوا ڕاگەیاندووە[2].

وفي حديث آخر: ((وَإِنِّي لآثَأَرُ لأَولِيَائِي كَمَا يَثْأَرُ اللَّيثُ الحَرِبُ))[3] واتە: ((بۆ دۆستانم تۆڵە دەکەمەوە لەو کەسانەی کە دوژمنایەتیان دەکەن وەکو چۆن شێری توورە بوو تۆڵە دەکاتەوە))[4]،

---

(١)_ ئەمە (صحیح)ترینی ئەو فەرموودانەیە کە سەبارەت بە دۆستانی خوا ڕیوایەت کراوە، ئەم گوفتارەی پێشەوا ئیبن وتیمیە بەرپەرچدانەوەیە بۆ ئەو کەسانەی کە دەربارەی ئەم فەرموودە قسە دەکەن و، بە لاوازی دادەنێن، لە کاتێکدا کە لە (صحیح)ی ئیمامی بوخاریدایە.

(٢)_ مەبەستی ئەوەیە کە خۆی تووشی توورە بوونی خوای گەورەو سزادانی کردووە.

(٣)_ خوای گەورە پشتگیری دۆستانی خۆی دەکات، وشەی (يثأر)ی نێو فەرموودەکە واتە خوای گەورە پشتگیری دۆستانی خۆی دەکات و، لە دوژمنەکانیان تۆڵەیان بۆ دەکاتەوەو، سەریان دەخات بەسەر ئەو کەسانەدا کە ستەمیان لێدەکەن و، دەست درێژیان لێ دەکەن، ((كَمَا يَثْأَرُ اللَّيثُ الحَرِبُ)) مەبەستی شێرە تووڕ بووە کاتێ کە پەلاماری نێچیرەکەی دەدا، ئەمە تەشبیە و چواندنی مەخلوق نییە بەخوای گەورە، بەڵکو تەشبیە و چواندنی تۆڵەیە بە تۆڵە، کردارە بە کردار، نەک چواندنی خوای گەورەبێ بە مەخلوقەکانی خۆی.

(٤)_ بەڵێ، شێری درندە ئەگەر ئازاردراو دەست درێژی کرایە سەر ئەوا پەلاماری ئەو کەسە دەدات کە ئازاری داوە، تۆڵە بۆ خۆی دەکاتەوە.

ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە دۆستانی خوا بوون ئیمانیان پێ هێناو، بوون بە دۆستی، ئەوەیان خۆشویست کە ئەو خۆشی دەوێ و ڕقیاندبۆوە لەوەی کە ئەو ڕقی لێدەبێتەوە[1]، وە ڕازیبوون بەوەی کە ئەو پێی ڕازیە، وە ڕقیان دەبۆوە لەوەی ئەو ڕقی لێیەتی[2]، فەرمانیان بەوە دەکرد کە ئەو فەرمانی پێدەکات، وە قەدەغەی ئەوەیان دەکرد کە ئەو قەدەغەی کردووە[3]،

---

(١)_ ئا ئەمانەن دۆستانی خوا، ئەوەیان خۆش دەوێ کە خوا خۆشی دەوێ و، ڕقیان دەبێتەوە لەوەی کە خوا ڕقی لێ دەبێتەوە، لەگوفتارو، کردارو، کەسان، ئەوان ئەوەیان خۆشدەوێ کە خوا خۆشی دەوێ و، ڕقیان دەبێتەوە لەوەی خوا ڕقی لێدەبێتەوە، بەگوێرەی هەواو ئارەزوو شتیان خۆش ناوێ و، بە گوێرەی هەواو ئارەزووش ڕقیان نابێتەوە، بەڵکو تەنها لە پێناوی خوادا دۆستایەتی و دوژمنایەتی دەکەن.

(٢)_ ڕازی دەبن بەوەی خوا پێی ڕازیەو ڕقیان دەبێتەوە لەوەی کە جێگەی ڕق هەستانی خوایە، ئەمە مانای ویلایەت و دۆستایەتی ڕاستەقینەیە.

(٣)_ فەرمان بەوە دەدەن کە خوای گەورە فەرمانی پێداوە، قەدەغەی ئەوە دەکەن کەخوای گەورە قەدەغەی کردووە، لە خۆیانەوە هیچ شتێك ئەنجام نادەن، بۆیە فەرمان بەشتێك ناکەن کە خوا فەرمانی پێنەکردبێ یان قەدەغەی شتێك ناکەن کە خوا قەدەغەی نەکرد بێ، بە هاوشێوەی ئەو بیدعەچیانەی کە فەرمان بە شتانێك دەکەن کە خوای تعالی وەکو شەرع داینەناوە، قەدەغەی شتانێکیش دەکەن کە خوای تعالی بۆ بەندەکانی بەشەرعی داناوە، ئائەمانە بیدعەچین، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو رد)) واتە: ((هەر کەسێك لەم کارەماندا شتێك داهێنێت کە تیایدا نەبێت ئەوە ڕەتکراوەتەوە)).

بەوەیان دەبەخشی کە ئەو حەز دەکات پێی ببخشرێت و، بەوەیانیش نەدەدا کە ئەو پێی ناخۆش بوو پێی بدرێت[1]، پێشەوا (الترمذي) و کەسانی دیکەش لەپێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: ((أَوْثَقُ عُرَى الإِيمَانِ: الحُبُّ فِي اللهِ، وَالْبُغْضُ فِي اللهِ))[2] واتە: ((توندترین گرێکانی ئیمان: خۆشەویستیە لە پێناوی خواداو، ڕقبونەوەیە لە پێناوی خوادا)).

---

(١)_ بەوەیان دەبەخشی کە خوای گەورە پێی خۆشە پێیان ببخشرێت، وەکو هەژران و دەست کورتان و کەسانی نزیك و ئەوانەش کە خوای گەورە فەرمانی کردوە پێیان ببخشرێت، بەوانەشیان نە دەبەخشی کە خوای تعالی قەدەغەی بەخشینی لێکردوون، وەکو دوژمنانی خواو ئەوانەی ئەو بەخشینانە وەکو هۆیەك بەکاردێنن بۆ دوژمنایەتیکردنی خواو پێغەمبەرەکەی.

(٢)_ ((أَوْثَقُ عُرَى الإِيمَانِ)) واتە: بەهێزترین گرێکانی ئیمان خۆشویستنە لە پێناوی خواداو ڕق بونەوەیە لە پێناوی خوادا، لە باسەکانی پێشەوە فێر بوین کە خۆشویستنی خوا، خۆشەویستی بەندە بۆ خواکەی بە گەورەترین جۆرەکانی پەرستن دانراوە، هەروەها خۆشویستنی ئەوانەی کە خوای گەورە خۆشیدەوێن، وەکو پێغەمبەران و بەندە صالح و چاکەکانی، موسڵمانی چاك ئەوانی خۆش دەوێ، چونکە خوای گەورە خۆشی دەوێن، نەك لە پێناو تەماحێکی دونیایدا یان بۆ مەبەستێکی تایبەت بە نەفسی خۆی یان بۆ هەواو ئارەزوویەك، بەڵکو تەنها لەبەر ئەوە خۆشی دەوێن چونکە خوای گەورە خۆشیدەوێن، هەروەها بۆ ڕقبونەوەش، بە گوێرەی هەواو ئارەزوو یان بۆ حەزی تایبەتی خۆی ڕقی لە هیچ کەس نابێتەوە، بەڵکو تەنها ڕقی لەوانە دەبێتەوە کە خوای گەورە ڕقی لێیانە، خوای گەورە ڕقی لە کافران و دوو ڕووانە، ڕقی لەئەهلی سەرپێچی و خراپەیە، بۆیە موسڵمانی چاکیش ڕقی لێیانەو دوژمنایەتیان دەکات، دۆستایەتی ئەوانە دەکات کە دۆستایەتی خوا دەکەن و،

----------------------------------------------------------------
----------------------------------------------------------------
----------------------------------------------------------------

دوژمنایەتی ئەوانە دەکات کە دوژمنایەتی خوا دەکەن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لا تتخذوا عدوی و عدوکم أولیاء)، هەروەها دەفەرموێت: ﴿إنما ولیکم الله و رسوله﴾، ئەوان دۆستایەتی ئەم کەسانە دەکەن و، دوژمنایەتی کافران و دوو ڕووان دەکەن، چونکە دوژمنی خوان، دوژمنایەتیان دەکەن چونکە خوا دوژمنیانە، خوای تعالی دەفەرموێت: ﴿إن الله عدو للکافرین﴾، هەرگیز نابێ کافرانت خۆشبوێ لە کاتێکدا کە خوای تعالی ڕقی لێیانەو دوژمنایەتیان دەکات.

وفي حديث آخر رواه أبوداود قال: ((مَنْ أَحَبَّ لله، وَأَبْغَضَ لله، وَأَعْطَى لله، وَمَنَعَ لله، فَقَدِ اسْتَكْمَلَ الإِيمَانَ))[1] واته پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەس بەدڵسۆزی لەپێناوی خوادا خۆشویستن بکات، لەپێناوی خوادا ڕقی بێتەوە، لە پێناوی خوادا ببخشێت، لە پێناوی خوادا دەستی بگرێتەوە، بە ڕاستی ئیمانی تەواوە)).

---

(١)_ بەڵێ، هەر کەس بە دڵسۆزی لە پێناوی خوا دا کەسێکی خۆشویست، لە پێناوی خوا دا ڕقی بێتەوە، لە پێناوی خوادا ببخشێت، لە پێناوی خوادا دەستی بگرێتەوە، بە ڕاستی ئیمانی تەواوە، هەر کەسیش شتێك لەوانە کەم بکاتەوە ئەوا ئیمانیشی کەم دەکات، واتە ئەگەر بەندەی چاك بەپێی ئەم تەرازووە بەڕێوەبچێت و، ئەوانەی خۆشبوێت کە خوا خۆشیدەوێن و، ڕقی بێتەوە لەوانەی کە خوا ڕقی لێیانەو، بەوانە ببخشێت کە خوای گەورە حەز دەکات پێیان ببخشرێت و، دەستی بگرێتەوە لەو کەسانەی کە خوای گەورە قەدەغەی بەخشینی پێکردوون، بەڕاستی ئەم کەسە ماڵ و سامانی لە ملکەچی خوای گەورەدا بەخشیووە، بەدوژمنانی خواو ئەوانەی خوای تعالی خۆشی ناوێن نابەخشێ، ئەم کەسە ئیمانی تەواو کردووە، هەر کەسیش شتێك لەوە کەم بکاتەوە، ئەوا ئیمانیشی کەم دەبێتەوە.

(الوَلاية): واتـه: دۆسـتايەتی، لـەزمانی عەرەبیـدا پێچـەوانەی (العَداوة)یـە واتـە دوژمنایـەتی[١]، لـە زمـانی عەرەبیـدا مانـای بنچـینەیی (الوَلاية): خۆشویسـتن و نزیکبونەوەیە[٢]؛ مانای بنچینەیی (العَداوة)ش ڕق بونەوەو دور بونەوەیە.

---

(١)_ ئەمـە تەفسـیرکردنە بـۆ وشـەی (الوَلاية) بفتح الواو: واتـە دۆسـتایەتی؛ کـە پێچەوانەی وشەی (العداوة)یـە واتـە دوژمنایـەتی، وشـەی (الوَلي)، لـە زمـانی عەرەبیـدا لەوشەی (الوَلاية)وە هـاتووە، کـە مانـای نزیـك بوونـەوە دەبەخشـێت، بۆیـە لـە زمـانی عەرەبیدا دەگوترێت: (فلانٌ يَلِيْ فلاناً) واتە: فڵان کەس لە فڵان کەس نزیك دەبێتـەوە، هەروەها لە زمانی عەرەبیدا دەگوترێـت: (فلانٌ يَلِيكَ فِي الصفِ) واتـە: فـڵان کـەس لـە ڕیزەکەدا یەکسەر بەدوای تۆدا وەستاوە، واتە لێت نزیکبۆتـەوە، پێغەمبەری خـوا ﷺ دەفـەرموێت: ((لِيَلِنِي مِنْكُمْ أُولُو الأَحْلاَمِ وَالنُّهَى)) واتـە: ((بـا هۆشـیارە پێگەشـتووە عاقڵەکانتان لەمن نزیکبنەوە)). بۆیە مانای بنەڕەتی (الوَلاية) لەزمانی عەرەبیدا، نزیـك بونەوە لەشت دەبەخشێت، (وَلِيَ): لێی نزیك بویەوە. و تاعەت و گوێڕپەڵ بوونی خوای گەورە بە (وَلاية) ناودەبرێت، چونکە هۆکارە بۆ نزیك بونەوە لەخوای گەورە.

(٢)_ مانـای بنچینەیی (الوَلاية) لـە زمـانی عەرەبیـدا: خۆشویسـتنە، (وَلاهُ) واتـە خۆشیویست و لێی نزیکبویەوە، ئیمانـداریش لـە خـوای گـەورە نزیـك دەبێتـەوەو، لـە خوای گەورەوە نزیکە، کافریش لە خـوای گـەورەوە دوورە، مونـافیق و دوو ڕووش لـە خوای گەورەوە دورەوە، بۆیە ئەمانە دۆستی خوانین.

هەروەها گوتراوە: (الوَلي) واتە دۆست، بە (الوَلي) ناوبراوە چونکە لەسەر تاعەت و گوێڕایەڵبوونی خوای تعالی بەردەوامە، واتە: بە بەردەوامی ئەنجامیان دەدات[1]، مانای یەکەمیش ڕاسترە[2]. بەڵام لە ڕاستیدا مانای وشەی (الوَلي) لە زمانی عەرەبیدا (القريب) واتە: نزیکی دەبەخشێت، بۆیە دەگوترێت: (هذا يلي هذا) واتە ئەمە لە ئەمەوە نزیکە.

---

(١)_ هەروەها یەکێك لە ماناکانی (الوَلاية) بریتیە لەبەدوایکدا ئەنجامدانی تاعەت و پەرستنەکان و، بەردەوامبوون لەسەر ئەنجام دانیان بەدرێژایی تەمەن، نەك کاتی وا هەبێ ئەنجامیان بدات و، کاتی واش هەبێ پشتگوێیان بخات، بەڵکو بەپێی توانا لەسەر ئەنجام دانیان بەردەوام دەبێ، خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرموێت: ﴿وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّى يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ﴾[الحِجر: ٩٩] واتە﴿وَاعْبُدْ رَبَّكَ﴾ وە پەروەردگارت بپەرستە ﴿حَتَّى يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ﴾ هەتا مردن یەخەت پێدەگرێت . بەردەوام بوون لەسەر ئەنجام دانی کردەوەکان بەڵام بەبێ لە ڕادە چوونەدەرەوەو زیادەڕۆیی، بەڵکو بەمیانەیی و میانڕەوی، وەکو ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە، بەڵام کە سەرەتا لە تاعەت و گوێڕایەڵیدا درێغی نەکات و، پاشان لە کاتێکی تردا وازی لێبێنێت، ئەم کەسە لەسەر ئەنجامدانی پەرستنەکان بەردەوام نەبوەو، ئەم ڕەفتارەش ئاماژە بۆ کەم بوونی دۆستایەتیەکەی دەکات بۆ خوای گەورە.

(٢)_ مانای یەکەمی (الوَلاية) کە نزیکیی و تاعەت و گوێڕایەڵ بوونە لە مانای دووەمیی ڕاسترە کە بە دوای یەکدا ئەنجام دانی پەرستنەکان و کردەوەو لە سەری بەردەوام بوون دەگەیەنێت.

ومنه قوله ــ صلى الله عليه وسلم ــ: ((أَلْحِقُوا الْفَرَائِضَ بِأَهْلِهَا، فما بَقِيَ فَهُوَ لِأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ))[١] واتـه فەرموویـەتی: ((ئەوانـەی بەشـی دیاریکراویـان لـە میراتـدا هەیـە، بەشەکانیان پێبدەن، هەرچیشی کە مایەوە بۆ یەکـەم پیـاوی نێرینەیـە ))، واتـە: بۆ نزیکترین پیاو لەمردووە[٢].

---

(١)_ وشەی (أولى)ی نێو فەرموودەکە واتـە: نـزیکترین نێرینـە لـە مردوکـەوە کـە لەپشـت (عصبة)ی خۆیـەتی، ((الحقوا الفرائض)) واتـە ئـەو بەشـە دیاریکراوانـەی کـە لەقورئاندا هاتوون وەکو نیوەو، چواریەك و، هەشت یەك و، سێ یـەك و، دوو لـە سـەر سێ و، شەش یەك، ئەمە ئەو بەشە دیاریکراوانەیە کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون، کە شەشن، لە ئەمانەوە دەست بە دابەشکردنی میراتەکە دەکرێت و، بەو کەسانە دەدرێ کە بەشەکانیان بۆ دیاریکراوە، هەرچیش بمێنێتەوە پـاش دابەشـکردنی بەشـەکان بـە نـزیکترین کەسـی نێرینـەی پشـتی مردوکـە دەدرێ. ((فما بَقِيَ فَهُوَ لِأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ))، باشە سوودی ئەوە چییە کە پێغەمبەری خوا ﷺ وشەی (ذَكَر)ی پاش وشـەی (رَجُل) فەرمووە؟ گوتویانە: نەوەکو خەڵکی واتێ بگەن کە جگە لە پیاوە گـەورەکان کەسـی دیکە بە نەوەی پیاو و خزمان (عصبة)ی مردوکە دانانرێت، بەڵکو گرنگ ئەوەیە نێرینـە بێت، ئەگەر چی منداڵێکی بچوکیش بێت، ئەگەر چی لە سکی دایکیشیدا بێـت، گـرنگ ئەوەیە نێرینە بێت ئەگەر چی بچوکیش بێت، هەروەها بیرورای دیکـەش لـەم بـارەوە گوتراوە، وەکو ئەوەی دانەری کتێبەکە باسی دەکات.

(٢)_ ئەمـە (عصبة)یـە واتـە نـەوەی پیـاو خزمـانێتی، (عصبة)ش هەنـدێکیان لـە هەنـدێکیان نـزیکترن، لـە ڕووی پێشخسـتنەوە (التقديمة)، پاشـان لـە ڕووی نزیکیـەوە (القرب)، پاشان پێشخستن لە ڕووی (أجعلا)ەوە واتە بـەهێزەوە، چـونکە (عصبة) چـەند لایەکە: لایەنی باب، لایەنی کوڕ، لایەنی برا، لایەنی باپیرەو داپیرە، لایەنی مـام... هتـد، شەش لایەنە، لە نزیکترین و پاشان نزیك و... بەو شێوە دەست پێدەکرێت.

به وشەی ((الذَکَر))یش جەختی لەسەر کردۆتەوە، بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە کە حوکمێکەو بە نێرینەوە تایبەتە[1] و، نێر و مێی تێدا بەشدار نابێ، وەکو ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((فابن لبون ذکر))[2] واتە: بەچکە ووشترێکی نێر، ئەوەی کە دوو ساڵی تەواو کردبێ و پێی نابێتە نێو سێیەم ساڵەوە.

بۆیە ئەگەر دۆستی خوا ئەو کەسە بێت کە ڕێکەوتووی شوێنکەوتووی خوای گەورە بێت لە هەموو ئەوانەدا کە خۆشی دەوێ و پێی ڕازیە، حەزی پێ نییەو ڕقی لێیەتی، فەرمانی پێ دەکات و قەدەغەی لێ دەکات، کەوا بوو کەسی دوژمنی دۆستانی خوا دوژمنی خواشە[3]،

---

(١)_ ئەمە بۆچونیکەو ئەوە دەگەیەنێت کە مێینەی تێدا بەشدار نابێ، جگە لە مەسەلەی (عصبة) بە هۆی کەسێکی ترەوە یان (عصبة) لەگەڵ کەسێکی تردا، یان ئازاد کراو، کە میراتی ئەو کەسەی بەر دەکەوێت کە ئازادی کردووە، ژنانیش میراتیان بە بەشێکی دیاری کراو بەر دەکەوێ، چونکە نابن بە(عصبة) تەنها لە یەك باردا نەبێ ئەویش ئەوەیە کە ئەو ژنە ئازاد کراوبێ‌و کەسی ئازادکاریش هیچ نەوەیەکی نەبێ و میراتەکەی بەرن، واتە ژنان نابن بە (عصبة بالنفس) بەڵکو تەنها دەبن بە (عصبة) بە هۆی کەسێکی ترەوە یان لەگەڵ کەسێکی تردا.

(٢)_ ئەم گوفتارە جێگەی تێڕاوانینە، چونکە مێینەکان لەگەڵ نێرینەکاندا هاوبەشی دەکەن بۆ پێکهێنانی (عصبة بالغیر) بەهۆی کەسێکی ترەوە، وەکو کچان لەگەڵ کوڕاندا، خوشکان لەگەڵ براکانیاندا، هەروەها ئازاد کراویش.

(٣)_ ئەمە ڕێکەوتووی گوفتارەکەی خوای گەورەیە ((مَنْ عَادَى لِي وَلِيّاً فَقَدْ آذنته بالحرب أو بَارَزَنِي بِالمحَارَبَةِ))، چونکە خوای گەورە یارمەتی و پشتگیری و بەرگری لە دۆستانی خۆی دەکات، بەرانبەر بە دوژمنەکانیان.

وەکو ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاء تُلْقُونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ﴾(١) [الممتحنة:١] واتە ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە ﴿لا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاء﴾ دوژمنانی من و خۆتان مەکەن بە دۆستی خۆتان ﴿تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ﴾ دۆستایەتی خۆتانیان بۆ بنێرن.

بۆیە ئەو کەسەی دوژمنایەتی دۆستانی خوا بکات بە دڵنیایی دۆژمنایەتی خوای گەورەش، هەرکەسیش دۆژمنایەتی خوا بکات بەدڵنیایی شەڕی دژبەخوا کردووە(٢)، لەبەر ئەمەیە دەفەرموێت: ((مَنْ عَادَى لِي وَلِيّاً فَقَدْ بَارَزَنِي بِالمحَارَبَةِ )) واتە: هەر کەس دوژمنایەتی لەگەڵ دۆستێکی من بکات بە ڕاستی شەڕی لە دژ ڕاگەیاندووم.

---

(١)_ ئەم ئایەتە وەکو پێشتریش ئاماژەی پێدرا سەبارەت بە ڕووداوی حودەیبیبە دابەزی و، ئەو هەڵانەی کە لەهەندێ هاوەڵەوە ڕوویداو، خوای گەورەش بەخشینی، ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ﴾ واتە ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە کافران مەکەن بە ﴿أَوْلِيَاء﴾ دۆستی خۆتان، خۆشتان بوێن و یارمەتی و پشتگیری و بەرگریان لێبکەن ﴿تُلْقُونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ﴾ خۆشەویستی خۆتانیان بۆ بنێرن، ﴿بِالْمَوَدَّةِ﴾ ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە﴿الْمَوَدَّةِ﴾ بریتیە لە دۆستایەتی یاخود بنەڕەتی دۆستایەتیەو پاشان بە دوای دا یارمەتی و پشتگیری و بەرگری کردن دێت، هەروەها گوفتاری خوای تعالی ﴿تُلْقُونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ﴾ تەفسیرە بۆ وشەی ﴿أَوْلِيَاء﴾.

(٢)_ هەر کەس دوژمنایەتی دۆستانی خوای گەورە بکات بە دڵنیاینەوە دوژمنایەتی خوای کردووە. باشە بۆچی دوژمنایەتی دۆستانی خوا دەکات؟ ئایا هەر لە بەر ئەوە نییە کە خوا خۆشی دەوێن؟ و ئایا هەر لەبەر ئەوە نییە کە ئەم دۆستانەی خوا لە هەموو شتێکدا گوێڕایەڵی تەواوی پەروەردگاریان بوون؟ بە دڵنیاییەوە تەنها لەبەر ئەوەیە کە ڕقی لەو دۆستانەی خوا دەبێتەوە، هەر بۆیە دوژمنی خوای گەورەشە.

## چاكترینی دۆستان

چـاكترین دۆسـتانی خـوا پێغەمبـەرانن[١]، چـاكترین پێغەمبـەرانیش ئەوانـەن كـ پەیامێكیان بۆ دابەزیوە[٢].

---

(١)_ ئەولیاو دۆستان پلە پلەن، چاكترینیان پێغەمبەرانن _علیهم الصلاة والسلام_ هیچ كەسێكی تریان پێ ناگات و لەگەڵیاندا یەكسان نابێ لـەو پلەیـەدا كـە لای خـوای تعالی بە دەستیان هێناوە، چونكە هەڵبژێردراو و پوخت و پاڵاوتەن لـەنێو مـەخلوقاتی خۆیدا، هەڵبیژاردوون، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿اللَّهُ يَصْطَفِي مِنَ الْمَلَائِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ النَّاسِ﴾[الحج: ٧٥] واتە ﴿اللَّهُ يَصْطَفِي مِنَ الْمَلَائِكَةِ رُسُلًا﴾ خوا لە فریشتەكاندا نێردراو هەڵدەبژێرێت ﴿وَمِنَ النَّاسِ﴾ هەروەها لە خـەڵكیش. خـوای گـەورە هەڵیبـژاردون، بۆیە نزیكترین مەخلوقن لەخوای گەورەوە، پێغەمبـەران خۆشەویسـترین مەخلوقاتیشـن بـە لای خوای گەورەوە، ئەمەش بەر پەرچدانەوەو وەڵام دانەوەیە بۆ ئەوانـەی كـە ولـی و دۆستان لە پێغەمبەران پەسەندتر دەكەن و بە چاكتریان دائەنێن، كە صۆفیەكانن.

(٢)_ الأنبیاء والمرسلون، جیاوازی نێوان نبي و مُرسَل چییە؟ وشـەی (الأنبیاء) كـۆی وشەی (نبي)ە، وشـەی (المرسلون)یـش كـۆی وشـەی (رسول)ە، جیـاوازی نێـوان (نبي) و (رسول): گوتویانـە: (نبي) ئەوەیـە كـە خـوای گـەورە بەشـەرعی پێغەمبـەرانی پـێش خۆیەوە ناردویەتی و، پێدەچێ لە مەسـەلەو ڕوداوێكـی تایبەتـدا سـروش و وەحـی بـۆ دابەزێت، بەڵام خودی خۆی شەرعێكی سەربەخۆی بۆ دانەبەزیوە، وەكو ئەوەی كە بۆ (رسول) دابەزیوە، بەڵام (رسول) خوای گەورە شەرعی بۆ دابەزاندووە. (نبي) شەرعی بۆ دانەبەزیوەو، فـەرمانی پێكـراوە تـەنها شـوێنی شـەریعەتی پێغەمبـەرانی پـێش خـۆی بكەوێت، وەكو (نبي)ەكانی بەنو ئیسرائیل كە بـە شـەرعیەتەكەی موسا_علیە السلام_ حوكمیاندەكردو، بە تەورات كە خوای گەورە بۆ موسای دابەزاندبوو، بۆیە

------------------------------------------------------------
------------------------------------------------------------
------------------------------------------------------------

ئەوان (نبي) بوون نەك (رسول)، ئا ئەمەیە جیاوازی نێوان (نبي) و (رسول). (نبي) شەرعی بۆ دانەبەزیوەو، (رسول) شەرعی بۆ دابەزیوە. بۆیە گوتویانە: هەموو(رسول)ێك (نبي)ە، بەلام هەموو(نبي)یەك (رسول) نییە، بۆیە لەنێوانی هەردوکیاندا گشتی و تایبەت (عموم) و (خصوص) هەیە، خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ وَلَا نَبِيٍّ﴾[الحج: ٥٢] واتە ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ﴾ و ئێمە لە پێش تۆ نەمان ناردووە ﴿مِنْ رَسُولٍ وَلَا نَبِيٍّ﴾ هیچ ڕەوانەکراو یا پێغەمبەرێك. خوای تعالی لەم ئایەتەدا (نبي) و (رسول)یشی باسکردووە، وە (واو العطف)یشی خستۆتە نێوانی هەر دوو کیانەوە، کە ئاماژە بۆ جیاوازی نێوان هەر دوو کیان دەکات، بۆیە هەموو (رسول)ێك (نبي)ە، بەلام هەموو(نبي) یەك (رسول) نیە.

چاکترینی ئەو پێغەمبەرانەش کە پەیامیان بۆ دابەزیبێ بریتین لە پێغەمبەرانی (أولو العزم): نـوح و، ئیـبراهیم و، مووسـا و عیسـاو، موحەممەدن _صلوات الله علیهم أجمعین_[1]

---

(١)_ ڕێزی هەندێك لە پێغەمبەران دراوە بە سـەر هەنـدێکی تریانـدا، خـوای تعالی دەفـەرموێت: ﴿تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ مِنْهُمْ مَنْ كَلَّمَ اللَّهُ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَاتٍ وَآتَيْنَا عِيسَى بْنَ مَرْيَمَ الْبَيِّنَاتِ وَأَيَّدْنَاهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ﴾[البقرة: ٢٥٣] ﴿تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا﴾ ئـەو پێغەمبەرانـەی (کـە باسـکران) ڕێزمانـداوە ﴿بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ﴾ بـە هەندێکیان بەسەر هەندێکیاندا ﴿مِنْهُمْ مَنْ كَلَّمَ اللَّهُ﴾ لەو پێغەمبەرانە هـی وایـان بـووە کە خوا قسەی لەگەڵ کردووە (بە بێ پەردە) ﴿وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَاتٍ﴾ وە هەنـدێکیانی بەرز کردۆتەوە بە چەند پلەیـەك ﴿وَآتَيْنَا عِيسَى بْنَ مَرْيَمَ الْبَيِّنَاتِ﴾ و دامـان بـە عیسـای کـوڕی مەریـەم چـەند بەڵگەیـەکی (موعجیزەیـەکی) ئاشـکرا ﴿وَأَيَّدْنَاهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ﴾ و پشتگیریمان کرد بە فریشتەی سروش (کـە جبریلـە). بۆیـە ڕێـز دراوە بـە هەنـدێك لـە پێغەمبـەران بەسـەر هەنـدێکی تریانـدا، (رسول)یـش لـە (نبي) چـاکترە، چـاکترین (رسول)ەکانیش (أولو العزم)ن، کە پێنجن، ئەوانەی کە خـوای گـەورە لـە سـوڕەتەکانی شوری و ئەحزاب دا باسی کردوون.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰ أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ﴾[1] [الشورى: ١٣] واتە ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ﴾ ئەو ئایینەی بۆ داناوون ﴿مَا وَصَّىٰ بِهِ نُوحًا﴾ کە فەرمانیداوە بەنووح و ﴿وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ﴾ ئەوەش نیگامان کردووە بۆ تۆ و ﴿وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰ﴾ ئەوەش کە فەرمانمان داوە بە ئیبراهیم و مووسا و عیسا ﴿أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ﴾ کە لەسەر ئەو ئایینەبن بەڕێك و ڕاستی و جیاوازی تێدا مەکەن.

---

(١)_ ئەو پێغەمبەرانەی لەم ئایەتدا باس کراون پێنجن، ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِ نُوحًا﴾ ئەو ئایینەی بۆ داناون کە فەرمانیداوە بە نووح ﴿وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ﴾ ئەوەش نیگامان کردووە بۆ تۆ، کە مەبەستی موحەممەدە ﷺ ﴿وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰ﴾ ئەوەش کە فەرمانمانداوە بە ئیبراهیم و مووسا و عیسا، دووان و سیان چەند دەکات؟ پێنج، ئەمانە پێغەمبەرانی (أولو العزم)ن، خوای تعالی لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُولُو الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ﴾[الأحقاف: ٣٥] کەواتە خۆ گربە (ئەی موحەممەد ﷺ) هەر وەکو پێغەمبەرانی خۆ ڕاگری بەهێز دانیان بەخۆدا گرت، و پەلە مەکە بۆ (سزادان)یان. مانای (أولو العزم)یش واتە: خاوەن هێز. خوای گەورە فەرمانی بە موحەممەد ﷺ داوە بە هاوشێوەی ئەو فەرمانەی کە بە پێغەمبەرانی تریداوە نوح و، ئیبراهیم و، مووسا و عیسی، چونکە ئایینی پێغەمبەران یەکەو بریتیە لە یەکخواپەرستی، بەتەنها پەرستنی خوای گەورە کە هیچ هاوبەشێکی نییە، ئەگەرچی شەریعەتەکانیشیان جیاواز بێت بەڵام ئایینیان یەکە، بە بەڵگەی ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((نَحْنُ مَعَاشِر الأَنْبِيَاء أخوة لعَلاّت دِينُنَا وَاحِد، وشرائعنا مختلفة)) واتە: ((ئێمەی کۆمەڵی پێغەمبەران برای باوکین ئایینمان یەکەو، شەریعەتەکانمان جیاوازە))، باشە چ فەرمانێکی دایە ئەم پێغەمبەرانە؟

﴿أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ﴾ واتـه: لەسـەر ئـەو ئایینـە بـن بـە ڕێـك و ڕاستی و جیاوازی تێدا مەکەن، پێویستە لەسەر ئەو ئایینەبیت و بە دڵسۆزی پەرستنەکان بۆ خوای گەورە ئـەنجام بدەیت بـە گوێرەی ئـەو شـەرعەی کـە دایناوە، لێرەدا بۆمان ڕووندەبێتەوە کـە هـەر پەرستنێك پێویستی بـەدوو مـەرجی سـەرەکیە: دڵسۆزی و، ئەنجامدانی پەرستنەکان بە گوێرەی ئەوەی کە شەرع بڕیاری لە سەر داوە، شەرعیش بـە گـوێرەی ئـەو زەمەنانـەی کـە ئـەو پێغەمبەرانـەی تێـدا نێـردراون جیـاواز بـووە، بەبەڵگـەی ئـەوەی کـە خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا﴾[المائدة: ٤٨] واتە دامان ناوە بۆ هەر ئومەتێك لەئێوە شەریعەت و ڕێگەیەکی ڕوون، بۆیە پەرستنی خوای گەورە بریتیە لەپەرستنی بە گوێرەی ئـەو شـەرعەی کـە لەهەموو زەمنێکدا دایناوە، ﴿أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ﴾ لەسەر ئـەو ئایینـە بـن بـە ڕێك و ڕاستی و جیاوازی تێدا مەکەن، هـەمووتان لەسـەر یـەك ئـایین بـن، بـە بەڵگـەی ئـەوەی کـە خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿إِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً﴾[الأنبياء: ٩٢] بەڕاستی ئا ئەمەیە ئایینی ئێوە کە یەك ئایینە (کە ئایینی هەموو پێغەمبەرانە). بۆیـە جیاوازی لەئاییندا جایز نییە، چونکە ئایین یەکە، نـابێ جیـاوازی تێـدا بکرێ و، هـەر کەسێك ئایینێکی هەبێ، هەر کەسێك ڕێباوەڕێکی هەبێ، هەر کەسێك ڕێگەیەکی هەبێ، دڵنیا بن ڕێگە هەر یەکەو، ئایینیش یەکە، کە ئایینەکـەی خـوای گـەورەیـە، نـابێ هـیچ شتێك لە خۆمانەوە دابهێنین.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ النَّبِيِّينَ مِيثَاقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَاقًا غَلِيظًا (٧) لِّيَسْأَلَ الصَّادِقِينَ عَن صِدْقِهِمْ وَأَعَدَّ لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا أَلِيمًا (٨)﴾ [الأحزاب:٧_ ٨] واتە: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ النَّبِيِّينَ مِيثَاقَهُمْ﴾ ( ئەی موحەممەد ﷺ بیریان بخەرەوە) کاتێ کە پەیمانمان وەرگرت لەپێغەمبەران ﴿وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ﴾ هەروەها لەتۆ و نووح و ئیبراهیم و مووسا و عیسای کوڕی مەریەم ﴿وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَاقًا غَلِيظًا﴾ و لە هەموویان پەیمانی بەهێزو بتەومان وەرگرت (٧) ﴿لِّيَسْأَلَ الصَّادِقِينَ عَن صِدْقِهِمْ﴾ بۆ ئەوەی (خوا) پرسیار لە ڕاستگۆیان بکات دەربارەی ڕاستییان ﴿وَأَعَدَّ لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ و سزای پڕ ئێش و ئازاریشی ئامادە کردووە بۆ بێ باوەڕان[1].

چاکترین پێغەمبەرانی (أولو العزم)یش موحەممەدە ﷺ [2]،

---

(١)_ ئەمە ئایەتی دووەمە کە خوای گەروە پێغەمبەرانی (أولو العزم)ی بۆ باس کردن و، لە سورەتی ئەحزاب دایە، کە پێنجن.

(٢)_ چاکترین پێغەمبەرانی ( أولو العزم ) یش موحەممەدە ﷺ، چونکە پێشەوای پێغەمبەرانە، خوای تعالی بە چەند خەسڵەتێك جیای کردۆتەوە کە لە پێغەمبەرانی تردا نییە، یەکێك لەو خەسڵەتانە ئەوەیە کە خوای گەورە بۆ هەموو مرۆڤایەتی ناردویەتی، لە کاتێکدا هەموو پێغەمبەرانی دیکە بەتایبەت بۆ قەومەکانی خۆیان دەنێردران، بەڵام ئەم پێغەمبەرە بۆ هەموو خەڵکی نێردرا، خەسڵەتێکی دیکەی ئەوەیە کە شەریعەتی هەر پێغەمبەرێك تەواو دەبو و لادەچو بە شەریعەتی پێغەمبەرەکەی دوای خۆی، جگە لە شەریعەتی ئەم پێغەمبەرە کە تا وەکو ڕۆژی قیامەت بەردەوام دەبێ و کۆتایی نایەت، ئەمەش یەکێکە لە تایبەتمەندیەکانی ئەم پێغەمبەرە ﷺ، ئەم شتە ئاماژە دەکات بۆ ڕێزی ئەم پێغەمبەرە بەسەر پێغەمبەرانی دیکە دا، پاشان پێغەمبەر ئیبراهیمە_ علیه السلام_، پاش موحەممەد ﷺ ئیبراهیمە،

چاكترين پێغەمبەرانی (أولو العزم) یش هەر دوو خەلیلەکەن موحەممەد و ئیبراهیم _ علیهما الصلاة والسلام _، چۆن ئەم دووانە بە خلیل ناو دەبرێن؟ چونكە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَاتَّخَذَ اللَّهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلًا﴾[النساء: ١٢٥] واتە خوا ئیبراهیمی هەڵبژارد بە دۆست و خۆشەویستی خۆی، هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((إنَّ الله اتَّخَذَنِي خَلِيلاً كما اتَّخذَ ابْرَاهِيمَ خَلِيلاً)) واتە: ((بە ڕاستی خوای گەورە بەخەلیلی خۆی هەڵیبژاردم وەکو چۆن ئیبراهیمی بەخەلیلی خۆی هەڵبژارد))، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ چاكترینی هەر دوو خەلیلەکەیەو، هەر دوو خەلیلەکەش چاكترین پێغەمبەرانی (أولو العزم)ن، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە خوای تعالی دەفەرموێت: ﴿تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ﴾. بەڵام لێرەدا ئەوە تێبینی دەکرێت کە جایز نییە پتر پەسەندێتی و ڕێزی هەندێ لە پێغەمبەران بدەین بەسەر هەندێکی دیکەیاندا، لە ڕووی شانازی کردنەوە یان بۆ کەمکردنەوەو شکاندنی ڕێزی ئەو پێغەمبەرانەی کە ڕێزی پێغەمبەرانی دیکەیان بە سەردا دراوە، بەڵام جایزە باسی پتر پەسەندێتی و ڕێزی زیاتری هەندێکیان بکەیت، لەو ڕووەوە کە ئەوە نیعمەت و بەهرەیەکە و خوای گەورە پێی بەخشیون، نەك بۆ شانازیکردن یان کەم کردنەوەو شکاندنی ڕێزی پێغەمبەرانی دیکە، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((لاَ تُفَضِّلُونِي عَلَى يُونُسَ بْنِ مَتَى)) واتە: ((ڕێزی من مەدەن بەسەر یونسی کوڕی مەتای پێغەمبەردا)) لە کاتێکدا چاكترین و بەڕێزترینی پێغەمبەرانیشە، لە یونس پێغەمبەر و پێغەمبەرانی دیکەش بەڕێز ترو چاكترە، چونكە ئەگەر لەڕووی شانازیکردنەوە بێت یان بۆ کەم کردنەوەو شکاندنی ڕێزی پێغەمبەرانی دیکە بێت جایز نییە، هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((لا تفاضلوا بين الأنبياء)) واتە ((بەراوردکاری ڕێز و چاکە لەنێوان پێغەمبەراندا مەکەن))، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کردووە لەوەی بەراوردکاری ڕێزو چاکە لە نێوان پێغەمبەراندا بکەین، بۆ شانازیکرن یان بۆ کەم کردنەوەو شکاندنی ڕێزو چاکەی هەندێ لە پێغەمبەران.

كە كۆتا پێغەمبەرانە[1].

---

(١)_ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ﴾[الأحزاب: ٤٠] واتە: ﴿مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِنْ رِجَالِكُمْ﴾ موحەممەد ﷺ باوکی هیچ یەك لە پیاوەکانتان نییە ﴿وَلَكِنْ رَسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ﴾ بەڵکو ئەو نێردراوی خواو کۆتا هەمینی پێغەمبەرانە. واتای ﴿وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ﴾ ئەوەیە کە هیچ پێغەمبەرێکی دیکەی بە دوادا نایەت تا وەکو ڕۆژی قیامەت، پێویستە ئەو باوەڕەت هەبێ کە کۆتا پێغەمبەرانە، و پاش ئەو هیچ پێغەمبەرێکی دیکە ڕەوانە ناکرێت، هەرکەسیش ڕێبدات و بە جایزی دابنێت کە پێغەمبەرێکی دیکەی بە دوا دا ڕەوانە دەکرێ، کافرە، چونکە ئەو کەسە موخالیفی قورئانە کە بە ﴿وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ﴾ی ناو دەبات، و موخالیفی سوونەتی (صحیح)یشە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَنَا خَاتَمُ النَّبِيِّينَ، لا نَبِيَّ بَعْدِي)) واتە: ((مـن کۆتـا هەمینی پێغەمبەرانم، هیچ پێغەمبەرێکم بەدوادا نایەت))، هەروەها پێی ڕاگەیاندوین کەوا ((إِنَّهُ يأتي من بعدي كذّابونَ ثلاثونَ، كُلُّهُمْ يَزْعَمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ، وأنا خاتِمُ النّبيين، لاَ نبي بَعْدِي)) واتە: ((لە پاش من سی درۆزن دێن، هەموویان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە پێغەمبەرن، بەڵام من کۆتا هەمینی پێغەمبەرانم، هیچ پێغەمبەرێکی دیکەم بە دوادا نایەت))، بۆیە هەر کەسێك ڕێگە بدات و بە جایزی دابنێت کە لەپاش پێغەمبەری خوا ﷺ پێغەمبەری دیکە ڕەوانە دەکرێت، کافرە، بۆیە موسڵمانان تایفەی قادیانیەکانیان بە کافر دانا، ئەوانەی بانگەشە دەکەن کە ئەحمەدی قادیانی پێغەمبەرە، موسڵمانان بە کافریان دانان و، یەك دەنگیش بوون لە تکفیرکردنیاندا، قەدەغەشیان کردن حەج بکەن و، بچن بۆ مەککە، ئەوان کافرن.

پێشەوای لە خوا ترسانە[١]، سەروەری نەوەکانی ئادەمە[٢]، پێشەوای پێغەمبەران کاتێ کۆ دەبنەوە[٣]، گوتاربێژیانە کاتێ دەگەنەوە بەخوای گەورە[٤]،

---

(١)_ چونکە یەکەم کەسە لە زیندوو کردنەوەداو، یەکەم کەسیشە کە دەرگای بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە، لە ڕۆژی قیامەتیشدا خەڵکی لە ژێر ئاڵای ئەودا دەبن _علیه الصلاة والسلام_.

(٢)_ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ، وَلاَ فَخْرَ)) واتە: ((من سەروەری نەوەکانی ئادمم، بەبێ شانازیی))، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی فەرمووە لەڕووی باسکردنی ئەو نیعمەت و بەهرانەوە کە خوای تعالی پێی بەخشیوە، نەك بۆ شانازیکرن یان کەم کردنەوەو شکاندنی پێغەمبەرانی دیکە.

(٣)_ پێشەوای پێغەمبەرانە کاتێ کۆدەبنەوە لای خوای تعالی، بۆیە کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ بەیتولمەقدیس شەوڕەوی پێکرا، خوای گەورە هەموو پێغەمبەرانی بۆ کۆکردەوەو، نوێژی پێکردن ﷺ، بوو بە پێشەوایان.

(٤)_ گوتار بێژیانە مەبەست پێغەمبەر ﷺ ▪ کاتێ دەگەنەوە بە خوای گەورە، لەو کاتەدا ئیزنی قسەکردنی پێدەدرێ ﷺ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لاَ يَتَكَلَّمُونَ إِلاَّ مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَنُ وَقَالَ صَوَابًا﴾ واتە کەسیان قسە ناکەن مەگەر ئەوەی کە خوا ڕێی بدات و قسەی بەڕێ و جێ بکات.

خاوەنی (المقام المحمود)ە کە پێشینان و پاشینان لەسەر ئەوە ستایشی دەکەن[(١)]،

خاوەنی ئاڵای حەمد و ستایشکردنە (صاحب لواء الحمد)[(٢)]،

---

(١)_ (المقام المحمود) یش دیسان یەکێکی ترە لە تایبەتمەندیەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە لەم بوارەدا ڕێزی ئەویداوە بەسەر پێغەمبەرانی تردا، (المقام المحمود)یش بریتیە لە تکا کاریی گەورە (الشفاعة العظمی)، کاتێ لە گۆڕەپانی مەحشەردا وەستان بەسەر مەخلوقاتەوە نارەحەت دەبێ، بۆیە بەدوای یەکێکدا دەگەڕێن لای خوای گەورە تکایان بۆ بکات و، بۆ ئەوەی خوای گەورە دادگاییان بکات و، لەو وەستانە ڕزگاریان بکات، بۆیە دەچنە لای ئادەم، پاشان ئیبراهیم، پاشان موسی، پاشان عیسی، بەڵام هەر هەموویان داوای لێبوردن دەکەن، تا لە کۆتادا دەگەنە موحەممەد ﷺ ئەویش دەڵێ: من ئەوە دەکەم، لەپێش دەستی خوای گەورەدا سژود دەبات و، لە سژود بردندا بەردەوام دەبێ و، لە پەروەردگاری دەپاڕێتەوە، تا پێی دەگوترێت: سەرت بەرز کەرەوە، بڵێ دەبیسترێت، تکا بکە تکاکەت قبوڵ دەکرێت، ئەویش تکا بۆ مەخلوقات دەکات و، خوای گەورەش دادگایی و حیسابیان لەگەڵ دەکاو، لەو وەستانە درێژە ڕزگاریان دەکات، چونکە پەنجا هەزار ساڵە لەسەر پێیان وەستاون، ئا ئەمەیە (المقام المحمود)، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمِنَ اللَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِ نَافِلَةً لَكَ عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾[الإسراء: ٧٩] واتە: ﴿وَمِنَ اللَّيْلِ﴾ وە (ئەی موحەممەد ﷺ) لەبەشێکی شەودا ﴿فَتَهَجَّدْ بِهِ﴾ هەستە شەونوێژ بکە بە قورئان خوێندن تیایدا ﴿نَافِلَةً لَكَ﴾ ئەوە زیادە نوێژی تایبەت بە تۆیە ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ﴾ ئومێدەواریە پەروەردگارت بتگەیەنێتە ﴿مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ پلەو جێگەیەکی پەسەند کراو.

(٢)_ لواء: ئەو ئاڵایەیە کە سەربازانی لە ژێردا کۆ دەبێتەوە.

خـاوەنی (الحوض المورود)ە[١]، تكاكـاری مەخلوقاتـە لـە ڕۆژی قیامەتـدا[٢]، خـاوەنی (الوسیلة والفضیلة)یە[٣]، ئەو كەسەیە كە خوای گەورە بە چاكترین كتێبـەوە ناردویـەتی و، چاكترین ڕێساو یاساو شەرعی دینەكەی بۆ داناوە[٤]،

---

(١)_ وەسفی ئەم حەوزە لە فەرموودەكاندا هاتووە، كە درێژی حەوزەكـە مـاوەی ڕێكردنی مانگێكەو، پانیەكەشی ماوەی ڕێكردنی مانگێكە، ئاوەكەی لەشیر سپیترەو، لە هەنگوێن شیرینترە، هەر كەس جارێك لێـی بخواتـەوە هـەرگیز دوای ئـەوە تینـووی نابێ، ئەمە بۆ موحەممەدە ﷺ.

(٢)_ لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ مەخلوقات تكا كـاری دەكات، وەكـو پێشـتر لـە (المقام المحمود) ئامارژەی پێدرا.

(٣)_ (الوسیلة والفضیلة): پێغەمبـەری خـوا ﷺ باسـی ئـەوەی بـۆ كـردوین كـە كۆشكێكە لە بەهەشتداو دەستی كەس ناكەوێت جگە لە یەك بەندە لە بەندەكانی خوا نـەبێ، داواكـارم ئـەو كەسـەش مـن بم، ئەگـەر داواتـان لـە خـوای گـەورە كـرد، داوای وەسیلەم بۆ بكەن، كە بریتیە لە كۆشكێك لە بەهەشت.

(٤)_ لەو چـاكانەی كـە ڕێـزی پێداوە بەسـەر پێغەمبـەرانی دیكـەدا، ئەوەیـە كـە شەریعەتەكەی لە هەموو شەریعەتەكانی تر چاكترە، تەوا ترە، سەرتاپا گیرترە، خوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا﴾ [المائدة: ٣] واتە: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ ئەمڕۆ ئایینەكـەتانم تـەواو (كامل) كـردوە بۆتـان ﴿وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي﴾ و چـاكەو بـەهرەی خـۆم بـە تـەواوی ڕشتووە بەسەرتاندا ﴿وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا﴾ وڕازی بووم كە ئیسلام ئایینتان بێت. بۆیە ئەم ئایینە هەتا ڕۆژی قیامەت بەردەوام دەبێ، هەروەها ئەو قورئانـەی كـە بـۆی دابەزێنراوە، تەواوترینی هەموو ئەو كتێبانەیە كە خوای تعالی دایبەزاندوون.

ئوممەتەکەی کردووە بە چاکترین گەلێك کە بۆ خەڵکی هێنرابێتە دی[١]، هەموو ئەو فەزڵ و چاکەو باشانەی بۆ کۆکردنەوە کە لە ئوممەتانی دیکەدا بڵاویکردبونەوە[٢]، ئەوان کۆتا ئوممەتانن لە ڕووی خوڵقاندنەوە، یەکەم ئوممەتانن لە ڕووی زیندوکردنەوەوە[٣]،

---

(١)_ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾[آل عمران: ١١٠.] واتە ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ﴾ ئێوە (موسڵمانان) باشترین گەلێك بوون ﴿أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾ بۆ خەڵکی هێنرابێتە دی ﴿تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ﴾ فەرمان دەدەن بە چاکە ﴿وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ﴾ وە جڵەوگیری دەکەن لە خراپە ﴿وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾ وە بڕوا دەهێنن بە خوا. ئەوان چاکترین ئوممەتن چونکە بانگەوازی بۆ خوا دەکەن و، فێر دەکەن و، لەپێناوی خوادا جیهاد دەکەن، بۆ ئەوەی ئەم ئایینە بڵاو بکەنەوەو، مرۆڤایەتی لە تاریکستانیەوە بەرەو ڕووناکی دەرهێنن، خێری ئەم ئومەتە تەنها بە خۆیانەوە سنوردار نییە، بەڵکو هەموو مرۆڤایەتی دەگرێتەوە، ئەمەش زۆر بە ئاشکرا لە جیهادی موسڵمان و، بڵاوکردنەوەی ئەم ئایینە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا دیارە، خوای گەورە چەندین ئوممەتی لە کوفر و گومڕایی و ئاگر و نەفامی پێ ڕزگار کردن.

(٢)_ واتە: ئەوەی لە ئوممەتانی تردا بڵاوەی پێکرد بوون لەم ئوممەتەدا کۆی کردنەوە، چونکە کۆ کردنەوە پێچەوانەی بڵاوکردنەوەیە، بۆیە خوای گەورە هەموو ئەو چاکەو باشەو فەزڵانەی کە لە ئوممەتانی تردا بڵاوەی پێ کرد بوون، لەم ئوممەتەدا کۆی کردنەوە.

(٣)_ ئوممەتی موحەممەد کۆتاهەمینی ئوممەتانەو پاش ئەوە قیامەت ڕوودەدا، ئەوان یەکەمینی هەموو ئوممەتانن کاتێ کە خەڵك لە گۆڕەکانیانەوە زیندوو دەکرێنەوە، ئەوان یەکەم ئوممەتن کە زیندوودەکرێنەوە، یەکەم ئەم ئوممەتەش موحەممەدە ﷺ، لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو یەکەم کەس دەبێ کە زەوی بۆ دەکرێتەوە، ئەگەر چی ئەم ئوممەتە کۆتا ئوممەتانن لە ڕووی خوڵقاندنەوە بەڵام پێشی هەموویان زیندودەکرێنەوە.

وەکو ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەکی (صحیح) دا فەرموویەتی: ((نَحْنُ الآخِرُونَ السَّابِقُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، بَيْدَ أَنَّهُمْ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِنَا وَأُوتِينَاهُ مِنْ بَعْدِهِمْ[1]،

---

(١)_ ((نحن الآخرون)) واتە: ئێمە کۆتاهەمینی ئوممەتانین لە ڕووی خوڵقاندنەوە، ((السابقون)) پێشی هەمووان زیندوو دەکرێینەوە، ((بيد أنهم)) لەبەر ئەوەی پاش ئەوان قورئانمان بۆ دابەزی و، ئەوان پێشتر کتێبیان بۆ دابەزیبوو، بۆچی ئێمە پێشتر زیندوودەکرێینەوە؟ چونکە دوای ئەوان قورئانمان بۆ دابەزی، بڕوانە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ وَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ بِإِذْنِ اللَّهِ ذَلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ (٣٢) جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا (٣٣)﴾[فاطر: ٣٢_ ٣٣] واتە: ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ﴾ لەپاشان ئەم قورئانەمان بەخشی بە کەسانێ ﴿اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا﴾ کە لە ناو بەندەکانماندا هەڵمان بژاردن ﴿فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ﴾ ئینجا هەندێکیان ستەمکارن لە خودی خۆیان ﴿وَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ﴾ و هەندێکیان مامناوەندین ﴿وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ و هەندێکیتریان بە فەرمانی خوا پێشکەوتوون بەهۆی چاکەکانیانەوە ﴿ذَلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ﴾ ئەم (قورئان پێدانە) لە خۆیدا بەهرەیەکی گەورەیە ﴿جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا﴾ ئەوانە دەچنە ناو بەهەشتانی جێگای مانەوەی هەمیشەیی، بڕوانە ئەوانەی ستەمکارن لە خودی خۆیان و، ئەوانەی مامناوەندین و، ئەوانەش کە بە فەرمانی خوا پێشکەوتوون بە هۆی چاکەکانیانەوە، حوکمیان ئەوەیە کە هەموویان دەچنە بەهەشتەوە، سوپاس وستایش بۆ خوا. خوای گەورە کتێبی بەم ئوممەتە بەخشی، کە قورئانەو، چاودێرە بەسەر کتێبەکانی پێش خۆی و، ڕاستگۆیان بەدەر دەخات.

وَهَذَا يَوْمُهُمُ الَّذِي فُرِضَ عَلَيْهِمْ، فَاخْتَلَفُوا فِيهِ ـ يَعْنِي يَوْمَ الْجُمُعَةِ ـ [١]

---

(١)_ ئەو شتەی ئاماژە بۆ فەزڵ و چاکەی ئەم ئوممەتە دەکات ئەوەیە کە خوای گەورە ڕۆژی هەینی بۆ هەڵبژاردوون، لە کاتێکدا جوولەکە ڕۆژی شەمەیان هەڵبژاردو، گاورانیش ڕۆژی یەکشەم، خوای گەورە ڕۆژی هەینی بۆ ئەم ئوممەتە هەڵبژارد، چونکە هەموو فەزڵ و چاکەکانی تێدا کۆ بۆتەوە، لەم ڕۆژەدا ئادەم خولقێنراوە، لەم ڕۆژەدا خراوەتە بەهەشتەوە، لەم ڕۆژەدا لە بەهەشت دەرکراوە، ڕۆژی هەینی کات و سەعاتێکی تێدایە هەر کەسێکی ئیماندار ڕێکەوتی بکات و، هەرچی لە خوای تعالى داوا بکات پێی دەبەخشێ، ئا ئەمە ڕۆژی هەینیە کە خوای گەورە بۆ ئەم ئوممەتەی هەڵبژاردووە. جوولەکەو گاورەکان جیاوازیان تێکەوت سەبارەت بە دیاریکردنی ئەو ڕۆژەی کە بیکەن بە ڕۆژێك بۆ پەرستنەکان، جوولەکە ڕۆژی شەمەیان بردو، گاورانیش ڕۆژی یەکشەم، بۆ ئەو ڕۆژانەیان دیاری کرد؟ جوولەکەکان وتیان: چونکە ڕۆژی شەمە ئەو ڕۆژەیە کە خوای گەورە لە خولقاندنی ئاسمانەکان و زەمین بویەوە، گاورەکانیش وتیان: چونکە ڕۆژی یەکشەم ئەو ڕۆژەیە کە خوای گەورە دەستی بە خولقاندنی ئاسمانەکان و زەمین کرد، چونکە خوای تعالى لە شەش ڕۆژدا ئاسمانەکان و زەمینی خولقاند، سەرەتاکەی ڕۆژی یەکشەم بوو، کۆتاکەشی ڕۆژی هەینی بوو، جوولەکەکان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە خوای گەورە لە ڕۆژی شەمەدا پشوویدا، چونکە ماندوو بوو بەهۆی خولقاندنی ئاسمانەکان و زەمینەوە، پاکوبێگەردی بۆ خوای گەورە سەبارەت بەو قسانەی کە دەیکەن، بۆیە خوای تعالى دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِنْ لُغُوبٍ﴾[ق: ٣٨] واتە: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا﴾ سوێند بەخوا بێگومان دروستمان کردووە ﴿السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا﴾ ئاسمانەکان و زەوی و هەر چی لە نێوانیاندایە ﴿فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ لەشەش ڕۆژدا ﴿وَمَا مَسَّنَا مِنْ لُغُوبٍ﴾ وە هیچ ماندووبونێکمان تووش نەبوو. هەروەها خوای گەورە

---------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------
----------------------------------------------------

دەفـەرموێت: ﴿وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ﴾[الأحقاف: ٣٣] واتـە: مانـدوو نـەبوو بـە هـۆی خولّقاندنیانەوە، چونکە مانای وشەی (عَيْ) ماندووبوون دەگەیەنێ، ئـەم ئایەتانـە بـەر پەرچدانەوەیە بۆ جوولەکەکان، بانگەشەی ئەوە دەکـەن کـە گوایـە خـوای گـەورە بـە هۆی ماندوو بوونـەوە لـە ڕۆژی شـەمەدا پشوویدا، بۆیـە تیایـدا دادەنیشـن و پشـوو دەدەن، بەڵام ئەمە بانگەشەیەکی پووچە. گاورانیش ڕۆژی یەکشـەمیان بـرد، چـونکە سەرەتای خولّقاندنە. بەڵام هەینی کۆتـایی و تـەواو بـوون و کامـڵ بـوونی خولّقاندنـە، باشە کامیان لە پێشترو چاکترە؟ سەرەتای خولّقاندن یاخود تەواو بون و کامڵ بوونی خولّقاندن؟ بێگومان تەواو بوون و کامڵ بوون لـە پێشـترو چـاکترە، ئـەوە بـوو خـوای گەورە ڕۆژی هەینی بۆ ئـەم ئوممەتـە هەڵبـژارد، بۆیـە لـە هـیچ شـتێکدا ئیرەیـی مـان پێنابەن بە ئەندازەی ئیرەیی بردنیـان بـە ئێمـە سـەبارەت بـە ڕۆژی هـەینی. ئەمـەش ئاماژە بۆ فەزڵ و چاکەی ئەم ئوممەتە دەکات، کـە خـوای گـەورە چـاکترین ڕۆژی بـۆ هەڵبژاردووە، کە ڕۆژی هەینیە.

... النَّاسُ لَنا تَبَعٌ فيه، غَدًا لِلْيهودِ وبَعْدَ غَدٍ لِلنَّصارى[١] ))

واته: ((ئێمه له دونیادا دواین ئوممەتانین و له قیامەتیشدا پێشکەوتوانین، ئەگەر چی ئەوان پێش ئێمە کتێبیان بۆ هاتوەو، ئێمە دوای ئەوان بۆمان هاتووە، ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە فەرز کرایە سەریان، کەچی ئەوان لەو بارەوە جیاوازییان تێکەوت _ مەبەستی ڕۆژی هەینیە _ بەلام خوای گەورە ڕێنموونی کردین بۆ ئەو ڕۆژەو، خەلکی تیایدا دوای ئێمە دەکەون، سبەینێ بۆ جوولەکەو، دوو سبەی بۆ گاوران)).

وقال ﷺ: ((أنَا أوَّلُ مَنْ تَنْشَقُّ عَنْهُ الأَرْضُ))[٢] واتە: پێغەمبەری ﷺ فەرموویەتی: ((من یەکەم کەس دەبم کە زەویم بۆ قلیش دەبات)).

---

(١)_ واته: ڕۆژی هەینی بوبە یەکەم ڕۆژ، پاشان بە دوایدا ڕۆژانی شەممەو یەك شەممەن، واته: پێشەوەیی بۆبە هی ئەم ئوممەتە، سوپاس و ستایش بۆ خوا.

(٢)_ ڕۆژی قیامەت، لە کاتی زیندوو بونەوەدا، کە فوو بە (صور)دا کرا _ زەوی قلیش دەبات لە ئاستی ئەوانەی کە مردوون، یەکەم کەسیش کە زەوی لە ئاستیدا قلیش دەبات، پێغەمبەرمان موحەممەدە ﷺ ئەم شتە ئامازە بۆ فەزڵ و چاکێتی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ تَشَقَّقُ الْأَرْضُ عَنْهُمْ سِرَاعًا ذَلِكَ حَشْرٌ عَلَيْنَا يَسِيرٌ﴾[ق: ٤٤] واتە: ﴿يَوْمَ تَشَقَّقُ الْأَرْضُ عَنْهُمْ﴾ ڕۆژێ دێ زەوی لە ئاست ئەوانە (ی مردوون) قلیش دەبات ﴿سِرَاعًا﴾ بە پەلە (دێنە دەرەوە) ﴿ذَلِكَ حَشْرٌ عَلَيْنَا يَسِيرٌ﴾ ئەو کۆکردنەوە بە لای ئێمەوە ئاسانە.

فَهَدَانَا اللَّهُ لَهُ، النَّاسُ لَنَا تَبَعٌ فِيهِ، غَدًا لِلْيَهُودِ وَبَعْدَ غَدٍ لِلنَّصَارَى[1] ))

واتە: ((ئێمە لە دونیادا دواین ئوممەتانین و لە قیامەتیشدا پێشکەوتوانین، ئەگەر چی ئەوان پێش ئێمە کتێبیان بۆ هاتوەو، ئێمە دوای ئەوان بۆمان هاتووە، ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە فەرز کرایە سەریان، کەچی ئەوان لەو بارەوە جیاوازییان تێکەوت _ مەبەستی ڕۆژی هەینیە _ بەڵام خوای گەورە ڕێنموونی کردین بۆ ئەو ڕۆژەو، خەڵکی تیایدا دوای ئێمە دەکەون، سبەینێ بۆ جوولەکەو، دوو سبەی بۆ گاوران)).

وقال ﷺ: ((أَنَا أَوَّلُ مَنْ تَنْشَقُّ عَنْهُ الأَرْضُ))[2] واتە: پێغەمبەری ﷺ فەرموویەتی: ((من یەکەم کەس دەبم کە زەویم بۆ قڵیش دەبات)).

---

(١)_ واتە: ڕۆژی هەینی بوبە یەکەم ڕۆژ، پاشان بە دوایدا ڕۆژانی شەممەو یەک شەممەن، واتە: پێشەوەیی بۆبە هی ئەم ئوممەتە، سوپاس و ستایش بۆ خوا.

(٢)_ ڕۆژی قیامەت، لە کاتی زیندوو بونەوەدا، کە فوو بە (صور)دا کرا _ زەوی قڵیش دەبات لە ئاستی ئەوانەی کە مردوون، یەکەم کەسیش کە زەوی لە ئاستیدا قڵیش دەبات، پێغەمبەرمان موحەممەدە ﷺ ئەم شتە ئاماژە بۆ فەزڵ و چاکێتی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ تَشَقَّقُ الْأَرْضُ عَنْهُمْ سِرَاعًا ذَٰلِكَ حَشْرٌ عَلَيْنَا يَسِيرٌ﴾[ق: ٤٤] واتە: ﴿يَوْمَ تَشَقَّقُ الْأَرْضُ عَنْهُمْ﴾ ڕۆژێ دێ زەوی لە ئاست ئەوانە (ی مردوون) قڵیش دەبات ﴿سِرَاعًا﴾ بە پەلە (دێنە دەرەوە) ﴿ذَٰلِكَ حَشْرٌ عَلَيْنَا يَسِيرٌ﴾ ئەو کۆکردنەوە بە لای ئێمەوە ئاسانە.

هـەروەها پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: (( آتِي بَابَ الجَنَّةِ فَأَسْتَفْتِحُ، فَيَقُولُ الخَازِنُ: مَنْ أَنتَ ؟ فَأَقُولُ: مُحَمَّدٌ، فَيَقُولُ: بِكَ أُمِرْتُ أَنْ لاَ أَفْتَحَ لأَحَدٍ قَبْلَكَ ))[1]. واتـە: فەرموویـەتی: ((دیمـە دەرگـای بەهەشـت و داوای کردنـەوەی دەکـەم، دەرگـاوانی بەهەشتیش دەڵێت: تۆ کێی؟ دەڵێم: موحەممەد، بۆیە دەڵێت: فـەرمانم پێکراوە بۆ تۆی بکەمەوە، بۆ هیچ کەسێکی پێش تۆ دەرگاکە نەکەمەوە)).

---

(١)_ ئەم شتە بەشێکە لە فەزڵ و چاکەکانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، بەشێکە لـە فەزڵ و چاکەکانی ئەم پێغەمبەرەو، فەزڵ و چاکەکانی ئوممەتەکەی، پێغەمبەری خـوا ﷺ یەکەم کەسە کە داوای کردنـەوەی دەرگـای بەهەشـت دەکـات، خـوای گـەورەش فەرمانی بە دەرگـاوانی بـە هەشـت کـردووە کـە پـێش پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـۆ هـیچ کەسێکی دیکەی نەکاتـەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَسِيقَ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ إِلَى الْجَنَّةِ زُمَرًا حَتَّى إِذَا جَاءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَامٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَادْخُلُوهَا خَالِدِينَ﴾[الزمر: ٧٣] واتە: ﴿وَسِيقَ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ﴾ وە کەسانێ کە لە پەروەردگاریان دەترسان دەبرێن ﴿إِلَى الْجَنَّةِ زُمَرًا﴾ بۆ بەهەشت پۆل پـۆل ﴿حَتَّى إِذَا جَاءُوهَا﴾ تـا کـاتێ دێنە (نزیکی) بەهەشت ﴿وَفُتِحَتْ أَبْوَابُهَا﴾ و دەرگاکانی دەکرێنەوە ﴿وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا﴾ و دەرگاوانـەکانی بـەوان دەڵـێن ﴿سَلَامٌ عَلَيْكُمْ﴾ سـەلامتان لێبێـت ﴿طِبْتُمْ﴾ ئێـوە پاکوخاوێن بوون (لە تاوان لە دونیادا) ﴿فَادْخُلُوهَا خَالِدِينَ﴾ کەواتە: بڕۆنە ناو بەهەشت بەهەمیشـەیی. یەکـەم کـەس کـە داوای کردنـەوەی دەرگـای بەهەشـت دەکـات، پێغەمبەرمان موحەممەدە ﷺ، لە نێو پێغەمبەرانیشـدا یەکـەم پێغەمبـەر دەبێ کە دەچێتە بەهەشتەوە، لە نێو ئوممەتانیشدا ئوممەتی موحەممەد ﷺ یەکـەم ئوممـەت دەبـێ کـە دەچـنە بەهەشـتەوە، ئەگـەر چـی کۆتـا هـەمینی ئوممـەتانن لـە ڕووی خوڵقاندنەوە، بەڵام لە ڕۆژی قیامەتدا پێشی هەموو ئوممەتانی تر دەکەون.

فەزڵ و چاکەی خۆی و ئوممەتەکەی ئاشکرا کردووە[1]، و لەو کاتەوەی کە خوای گەورە ناردوویەتی، کردوویەتی بە جیاکار لە نێوان دۆستان و دوژمنانی خوا دا[2]، بۆیە هیچ کەس نابێ بە وەلی و دۆستی خوای گەورە جگە لەوانەی کە ئیمان بە موحەممەد ﷺ بێنن، و ئەوەی کە بۆی دابەزێنراوە، لە ناوەکی و ڕووکارەوە(باطناً وظاهراً) شوێنی کەوتبن[3].

---

(١)_ واتە: فەزڵ و چاکەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە پێی تاک بۆتەوە بەسەر هەموو پێغەمبەرانی دیکەو، سەرتاپای مەخلوقاتی تردا، هەروەها فەزڵ و چاکاکانی ئەو ئوممەتەی کە پێی تاک بونەتەوە بەرانبەر بە هەموو ئوممەتانی تر.

(٢)_ لەو کاتەوەی کە خوای گەورە ئەم پێغەمبەرەی ﷺ بۆ هەموو مرۆڤایەتی ناردووە، کردویەتی بەجیاکار لەنێوان دۆستانی خوا و دۆستانی شەیتاندا، خوای گەورە ئەم پێغەمبەرەی کردووە بەهۆکار بۆ جیا کردنەوەی هەق و باتڵ، هیدایەت و گومرایی، ڕێگەی ڕاست و لە ڕێی لادان، کردویەتی بەهۆکاری جیاکردنەوە بەو قورئان و سوننەتەی کە بۆی دابەزاندووە، بەو دەرخستن و ڕەوانبێژی و ئاشکراکردنەی کە پێی بەخشیوە، بەو ئامۆژگاری و ئەمانەت و دەست پاکیەی پێی داوە، بۆیە خوای گەورە پێغەمبەری ﷺ کرد بەهۆکاری جیاکردنەوەی نێوان هەق و باتڵ.

(٣)_ نابن بە وەلی و دۆستانی خوا جگە لەوانەی کە ئیمانی پێدێنن، واتە لە ناوەکی و ڕووکارەوە ئیمان بە پێغەمبەری خوا ﷺ دێنن، ئەوە بەس نییە کە تەنها بە ڕووکار ئیمانی پێ بێنن، وەکو موناfیق و دووڕووەکان، خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ﴾[المنافقون: ١] واتە: ﴿إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ﴾ کاتێك کە دووڕوان بێنەلات ﴿قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ﴾ دەڵێن شایەتی دەدەین کە بە ڕاستی تۆ پێغەمبەری خوایت ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ﴾ وە دیارە خوایش دەزانێ کە تۆ

ڕەوانەکراوی ئەوی ﴿وَاللَّهُ يَشْهَدُ﴾ و خوا شایەتی دەدات ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ﴾ کە بێگومان دوو ڕوان درۆزنن. بۆ دوو ڕوان درۆزنن؟ چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِمْ مَا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ﴾[الفتح: ١١] واتە: ﴿يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِمْ مَا﴾ ئەوەی بە زمانیان دەیڵێن ﴿لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ﴾ لە دڵیاندا نییە. هەروەها ئەو کەسانەش کە لە ناوەکیەوە ئیمانی پێدێنن و، دان بە پیامەکەیدا نانێن، وکو موشریك جولەکەو گاورەکان، ئەم تاقمانە هیچ گومانێکیان نییە کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە، بەلام لووتبەرزی و ئیرەیی و دەمارگیری نەفامی ڕێگرییان لێدەکات دان بە پەیامەکەیدا بنێن، خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُ لَيَحْزُنُكَ الَّذِي يَقُولُونَ فَإِنَّهُمْ لاَ يُكَذِّبُونَكَ وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ﴾[الأنعام: ٣٣] واتە: ﴿قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُ لَيَحْزُنُكَ الَّذِي يَقُولُونَ﴾ بە ڕاستی ئێمە دەزانین کە بێگومان ئەوەی کە ئەوان دەیڵێن غەمبارت دەکات ﴿فَإِنَّهُمْ لاَ يُكَذِّبُونَكَ﴾ بەلام بێگومان ئەوان تۆ بە درۆزن دانانێن ﴿وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللَّهِ﴾ بەڵکو ئەو ستەمکارانە ئایەتەکانی خوا ﴿يَجْحَدُونَ﴾ ئینکار دەکەن. هەروەها خوای گەورە دەربارەی جولەکەو گاوران دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمْ وَإِنَّ فَرِيقاً مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾[البقرة: ١٤٦] واتە: ﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ﴾ ئەوانەی کە پەڕاومان پێ داون ﴿يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمْ﴾ پێغەمبەر ﷺ دەناسن وەکو چۆن کوڕانی خۆیان دەناسن ﴿وَإِنَّ فَرِيقاً مِّنْهُمْ﴾ بێگومان کۆمەڵێك لەوان ﴿لَيَكْتُمُونَ الْحَقَّ﴾ ئەو ڕاستی یە دەشارنەوە ﴿وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ لە کاتێدا ئەوان دەزانن ( موحەممەد ﷺ پێغەمبەرە). بۆیە هیچ کەس بڕاوی بەم پێغەمبەر ﷺ نابێ، تاوەکو لەڕووکارو ناوەکیەوە بڕوای پێ نەهێنێ.

هەر کەس بانگەشەی خۆشویستن و دۆستایەتی خوا بکات لە کاتێکدا کە شوێنی موحەممەد ﷺ نەکەوت بێ، با دڵنیا بێ لە وەلی و دۆستانی خوا نییە، بەڵکو ئەو کەسەی سەرپێچی بکات دوژمنی خواو دۆستی شەیتانە[1]، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ﴾[آل عمران: ٣١] واتە: ﴿قُلْ﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ﴿إِنْ كُنْتُمْ﴾ ئەگەر ئێوە ﴿تُحِبُّونَ اللَّهَ﴾ خواتان خۆش دەوێت ﴿فَاتَّبِعُونِي﴾ کەواتە دوای من بکەون ﴿يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ﴾ تا خواش ئێوەی خۆش بوێ.

---

(١)_ هەر کەس بانگەشەی خۆشویستنی خواو دۆستایەتی خوا بکات و، گوایە ئەو دۆستی خوایە، لە کاتێکدا شوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ ناکەوێ، ڕاست ناکات، خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ (٣١)﴾[آل عمران: ٣١] واتە ﴿قُلْ﴾ ( ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ ﴿إِنْ كُنْتُمْ﴾ ئەگەر ئێوە ﴿تُحِبُّونَ اللَّهَ﴾ خواتان خۆش دەوێ ﴿فَاتَّبِعُونِي﴾ کەواتە: دوای من بکەون ﴿يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ﴾ تا خواش ئێوەی خۆش بوێت ﴿وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ﴾ وە لە گوناهەکانتان خۆش ببێت، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ﴾[آل عمران: ٣٢] واتە: ﴿قُلْ﴾ بڵێ ﴿أَطِيعُوا اللَّهَ﴾ فەرمانبەری خوا ﴿وَالرَّسُولَ﴾ و پێغەمبەر بکەن ﴿فَإِنْ تَوَلَّوْا﴾ ئینجا ئەگەر پشت هەڵکەن ﴿فَإِنَّ اللَّهَ﴾ ئەوە بێگومان خوا ﴿لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ﴾ بێبڕوایانی خۆش ناوێت. خوای تعالی شوێنکەوتنی ئەم پێغەمبەرەی ﷺ کردووە بەنیشانە بۆ خوشویستنی خوا، بۆیە هەر کەسێك شوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ نەکەوێت، بێگومان خوای گەورەشی خۆش ناوێت، ئەگەرچی بانگەشەی ئەوەش بکات، جولەکەو گاورەکان دەیانگوت: ئێمە کوڕان و دۆستانی خواین، بانگەشەی ئەمەیان دەکرد، بەڵام شوێنی ئەم پێغەمبەرە ﷺ نەکەوتن، بۆیە ئەوان دوژمنی خوان، هەر کەسێك ئیمان بەم پێغەمبەرە ﷺ نەهێنێ، دوژمنی خوایە، خوای گەورەی خۆش ناوێ.

حەسەنی بەصری _ڕەحمەتی خوا لێ بێت_ فەرموویەتی: ((کۆمەڵە کەسانێك بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە خوایان خۆش دەوێ، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی بۆ دابەزاندن وەکو تاقیکردنەوەیەك[1]، خوای گەورە لەم ئایەتەدا ئەوە ڕوون دەکاتەوە:

---

(١)_ خوای گەورە ئەو ئایەتەی کردوە بە تاقیکردنەوە، بۆ جولەکەو گاوران و تاقمانی دیکەی جگە لەوانیش، وەکو صۆفیەکان و گۆڕپەرستان و کەسانی تریش، بانگەشەی خۆشویستنی خواو، خۆشویستنی پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکەن، بەڵام گوێڕایەڵیی خواو، پێغەمبەرەکەی ﷺ ناکەن، بۆیە بانگەشەکەیان درۆیە، شاعیر دەڵێت:

تعصـــى الإلـــهَ وتـــزعُمُ حبَّه

هذا لعمري في القيـــاسِ شنيعُ

لـــو كـــان حبُّك صـادقاً لأطعته

إن المحبَّ لمن يحبُّ مُطيعُ واته:

سەرپێچی خواوەند دەکەیت و بانگەشە دەکەیت کە خۆشت دەوێ

سوێند بەخوا ئەمە لە قیاس کردندا ترســـناکە

ئەگـــەر خۆشویستنەکەت ڕاســـت بوایە گوێڕایەڵی دەبووی

چونکە خۆشەویست گوێڕایەڵی خۆشەویستەکەیەتی

﴿فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ﴾ بۆیە هەر کەس شوێنی ئەم پێغەمبەرە ﷺ بکەوێ، بێگومان خوای گەورە خۆشی دەوێ، هەر کەسیش شوێنی نەکەوێت، خوای گەورە ڕقی لێیەتی، دوژمنی خوایە ئەگەرچی بانگەشەی ئەوە بکات کە دۆستی خوایە، نیشانەی خۆشویستنی خوای گەورە بریتیە لە شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەروبومەکەی چیە؟ بەروبومەکەی ئەوەیە کە خوای گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرموێت: ﴿يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ ئەمە بەروبومەکەیەتی کە خوای گەورە لەتاوانی ئەو کەسانە خۆش دەبێ کە شوێنی ئەم پێغەمبەرە ﷺ دەکەون. نیشانەکەی باس کردووە کە بریتیە لە شوێن کەوتن، بەروبومەکەشی باس کردووە کە خوای گەورە خۆشی دەوێن، و لە تاوانەکانیان خۆش دەبێ. دوو بەروبومی بۆ باسکردوین کە بریتیە لە بە دەست هێنانی خۆشەویستی خواو، خۆش بوون لە تاوانەکانی.

که هەر کەسێك شوێنی پێغەمبەر ﷺ بکەوێت، با دڵنیا بێت خواش خۆشی دەوێ، وە هەر کەسێکیش بانگەشەی خۆشویستنی خوا بکات و، شوێنی پێغەمبەر ﷺ نەکەوێت، لە وەلی و دۆستانی خوا نی یە))، کۆمەڵێکی زۆری دیکەش وا دەزانن خودی خۆیان یان کەسانی تر لە وەلی و دۆستانی خوان بەڵام لە دۆستانی خواش نین[١]، جولەکەو گاورەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە دۆستی خوان و گوایە هیچ کەس ناچێتە بەهشتەوە جگە لەکەسانی سەر بەخۆیان، تا ئەو ڕادەیەی بانگەشەی ئەوە دەکەن کە کوڕان و خۆشەویستانی خوان[٢].

---

(١)_ زۆرن ئەو کەسانەی بانگەشە دەکەن کە لە دۆستانی خوان، بەڵام تەنها بانگەشەیەو هیچی تر، بانگەشەی دۆستایەتی بۆ خودی خۆیان یان بۆ کەسانی دیکە دەکەن و، دەڵێن: ئەوانە ئەولیاو دۆستانی خوان، بەڵام لە کاتی جێبەجێکردن و بەجێهێنانی کردەوەکانی خۆیاندا بە کرداری، تەماشا دەکەی شوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ ناکەون و، گوێڕایەڵی نابن، بەڵکو تەنها شوێنی کەسانی دیکەی وەکو سەرکردەو، پێشەوایان و، بانگەوازکارانی تایبەت بەخۆیان دەکەون و، گوێڕایەڵیان دەبن، ئەم جۆرە کەسانە درۆزنن کاتێ کە بانگەشەی خۆشویستنی خوا دەکەن، درۆش دەکەن کاتێ بانگەشەی دۆستایەتی خوای گەورە دەکەن، بۆیە کاتێ باسی دۆستایەتی خوا دەکرێ، بەردەوام ئەم ئایەتەی وەکو بەڵگە لەگەڵدا وەرگرە، ﴿قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾، ئەمە پێوەرەکەیە: ﴿فَاتَّبِعُونِي﴾.

(٢)_ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى نَحْنُ أَبْنَاءُ اللَّهِ وَأَحِبَّاؤُهُ﴾ وشەی ﴿أَبْنَاءُ﴾ لێرەدا مانای ئەوەیە کە ئێمە هەژارین بۆ خێری خوای گەورە، مانای کوڕی ڕەچەڵەکی ناگەیەنێ، بەلای ئەوانەوە خوای گەورە بابەو، ئەوان هەژارن بۆ خێری خوای گەورەو، بەندەی دڵسۆزی ئەون، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُمْ بِذُنُوبِكُمْ﴾ ئەگەر خۆشەویستی خوا بوایان سزای نەدەدان،، ﴿بَلْ أَنْتُمْ بَشَرٌ مِمَّنْ خَلَقَ﴾ ئێوە وەکو تێکڕای کەسانی ترن کە خوای گەورە خوڵقاندونی، خوای تعالى دەفەرموێت: ﴿يَغْفِرُ لِمَنْ يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَنْ يَشَاءُ﴾[آل عمران: ١٢٩] واتە: خۆش ئەبێ لەهەرکەس خۆی بیەوێ وە سزای هەر کەسیش ئەدات خۆی بیەوێ.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى نَحْنُ أَبْنَاءُ اللَّهِ وَأَحِبَّاؤُهُ قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُمْ بِذُنُوبِكُمْ بَلْ أَنْتُمْ بَشَرٌ مِمَّنْ خَلَقَ[1] يَغْفِرُ لِمَنْ يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَنْ يَشَاءُ وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ﴾[المائدة: ١٨] واتە: جوولەکە گاورەکان دەیانووت ئێمە کوڕان و خۆشەویستانی خواین بڵێ دەی بۆچی سزاتان دەدات بە هۆی گوناەو تاوانەکانتانەوە (نەخێر ڕاست نییە) بەڵکو ئێوە مرۆڤێکن لەو مرۆڤانەی کە خوا دروستی کردون خۆش ئەبێ لە هەر کەس بیەوێ و سزای هەر کەسیش ئەدات کە بیەوێ و هەر بۆ خوایە مولکی ئاسمانەکان و زەوی وە هەرچی وا لە نێوانیاندا وە هەر بۆ لای ئەویشە گەڕانەوە.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالُواْ لَن يَدْخُلَ الْجَنَّةَ إِلاَّ مَن كَانَ هُوداً أَوْ نَصَارَى تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ قُلْ هَاتُواْ بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ(١١١) بَلَى مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُ أَجْرُهُ عِندَ رَبِّهِ وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ(١١٢)﴾[2] [البقرة:١١١_ ١١٢] واتە: (جوولەکەو گاورەکان) ووتیان: کەس ناچێتە بەهەشتەوە مەگەر یەکێك کە جوولەکە یا گاور بێت ئەمە ئاواتیانە پێیان بڵێ: بەڵگەتان بهێنن ئەگەر ڕاست دەکەن (نەء وانییە) بەڵکو هەر کەسێك بە ڕاستی ڕوو بکاتە خوا و لە هەمان کاتدا چاکە کار بێت ئەوە بۆی هەیە پاداشت لە لای پەروەردگاریەوە نەترسیان لە بەرەو نەخەمیش دەخۆن .

---

(١)_ ئەمە وەڵامدانەوەیە بۆ ئەوان.

(٢)_ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالُوا كُونُوا هُودًا أَوْ نَصَارَى تَهْتَدُوا﴾[البقرة: ١٣٥] بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە هیچ کەس هیدایەتدرا نابێ مەگەر جوولەکە یان گاور بێت، ئەمە مانای وایە ئەم ئومەتە هیدایەت دراو نییەو، کافرە، چونکە نەجوولەکەیەو، نەگاورە، پاشان وتیان: ﴿وَقَالُواْ لَن يَدْخُلَ الْجَنَّةَ إِلاَّ مَن كَانَ هُوداً أَوْ نَصَارَى﴾ تا ئەو ئاستەی بەهەشتیشیان بۆ خۆیان گرتووەو، هیچ کەسیش ناچێتە نێوی مەگەر لەوان بێت، خوای تعالی دەفەرموێت: ﴿قُلْ هَاتُواْ بُرْهَانَكُمْ﴾ بەڵگەکانتان بێنن کە ئاماژە بۆ ئەو قسانە بکات، ﴿قُلْ هَاتُواْ بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ بەڵگەکانتان بێنن ئەگەر ڕاستگۆن لە بانگەشەکانتاندا، چونکە هەر کەس بانگەشەی

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

شتێك بكات، پێویسته بەڵگەی بۆ بێنێتەوە، تەنها بانگەشە كردن بە بێ بەڵگە قبوڵ ناكرێت، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هَاتُواْ بُرْهَانَكُمْ﴾ بەڵگەكانتان بێنن، چونكە داوای بەڵگە لە كەسی نكوڵیكار دەكرێت وەكو چۆن لە كەسی جێگیركار داوا دەكرێت، داوای بەڵگەیان لێدەكرێت، چونكە نكوڵییان كردو وتیان: ﴿لَن يَدْخُلَ﴾ واتە: ناچێتە نێو بەهەشتەوە، ﴿إِلاَّ مَن كَانَ هُوداً أَوْ نَصَارَى﴾ مەگەر جوولەكە یان گاور بێت، هەروەها هەر كەسێك شتێك جێگیر بكات پێویسته بەڵگەی بۆ بێنێتەوە، پاشان خوای تعالی دەفەرموێت: ﴿بَلَى﴾ واتە: بەڵێ كەسانی دیكەی جگە لە جوولەكەو گاور دەچنە بەهەشتەوە ﴿مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ﴾ هەر كەسێك بە دڵسۆزی پەرستنەكانی بۆ خوای گەورە ئەنجام بدات و، شیركی تێدا نەكات ﴿وَهُوَ مُحْسِنٌ﴾ و شوێنكەوتووی پێغەمبەری خوا ﷺ بێت، ئەمەیە مەرجەكانی قبوڵ بوونی كردەوە: بە دڵسۆزی ئەنجام دانی بۆ خوای گەورەو (الإخلاص لله)، شوێنكەوتنی پێغەمبەری خوا (الإتباع للرسول).

هاوەڵپەرستانی عەرەبیش بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە ئەهلی خوان، چونکە دانیشتووی مەککەو دراوسێی ماڵی خوان، وەکو ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَدْ كَانَتْ آيَاتِي تُتْلَى عَلَيْكُمْ فَكُنتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ تَنكِصُونَ (٦٦) مُسْتَكْبِرِينَ بِهِ سَامِرًا تَهْجُرُونَ (٦٧)﴾[1] [المؤمنون: ٦٦_٦٧] واتە: بێگومان (پێشتر) ئایەتەکانی من دەخوێنرایەوە بەسەرتاندا بەڵام ئێوە بەدوای خۆتاندا پاشەڵپاش دەگەڕانەوە لەبەرامبەر ئەو (قورئانەدا) خۆتان بە گەورە دەزانی شەوگارتان دەبردە سەر بە گاڵتە کردن و قسەی ناشیرین ووتن (بە ئایەتەکانی خوا).

---

(١)_ دەیانگوت: با شوێنی ئەم پێغەمبەرەش نەکەوین، تەنها ئەوەمان بەسە کە ئێمە ئاوەدان کەرەوەو، سەرپەرشتیاری ماڵی خواین، لەم ئایەتدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مُسْتَكْبِرِينَ بِهِ﴾ بەماڵی خواوە فیز زلی و لووت بەرزییان بەسەر خەڵکدا دەنواند ﴿سَامِرًا﴾ شەوگارتان لەشوێنی کۆبونەوەکانی خۆتاندا دەبردەسەر و ستایشی خۆتاندەکردو، شانازیتان بەخۆتانەوە دەکرد بەسەر خەڵکیدا ﴿تَهْجُرُونَ﴾ هەر هەموو شەوگارتان بەگاڵتەکردن و قسەی ناشیرین ووتن و دەمپیسی بەسەردەبرد. ئەمەش بەرپەرچدانەوەو وەڵامدانەوەیە بۆ ئەو بێبارەڕانە.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴾(١) [الأنفال: ٣٠] واتە: وە (بیر بکەرەوە) کاتێك ئەوانەی بێ باوەڕ بوون پیلانیان لە دژت دەگێڕا تا بەندو کۆتت بکەن یان بتکوژن یان (لە مەککە) دەرت بکەن و ئەوانە (بەردەوام) فڕو فێڵ دەکەن و خوایش لە بەرامبەر ئەواندا پیلان دەگێڕێت وە خوا چاکترینی پیلان گێڕانە (بەرامبەر پیلان گێران).

---

(١)_ لە خانەی کۆڕ بەستندا کۆبونەوە، کە شارەزایان و خاوەن ڕاو پیاو ماقوڵانیانی تێدا کۆدەبویەوە، چ شتێك بەموحەممەد بکەن، کە جنێو بە خواوەندەکانیان دەداو، بە سووك تەماشای عەقڵ و چۆنیەتی بیرکردنەوەیان دەکات، هەروەها کاتێ هاوەڵانی بۆ مەدینەی پیرۆز کۆچیان کرد، بێباوەڕان ترسان لەوەی ئەمیش کۆچ بکات و پێیان بگات و، لەوێ هێزێکی بۆ دروستبێ و، غەزایان بکەن و، دەستیان بەسەردا بگرن، بۆیە بە هەموو توانایەکیانەوە هەوڵیاندا ڕێگری لە کۆچکردنەکەی بگرن و، نەهێڵن بە هاوەڵانی بگات، لەخانەی کۆڕبەستندا کۆبونەوە بە مەبەستی ڕاوێژکردن، چ شتێکی لێبکەن؟ کەسانێکیان وتیان: بەندیدەکەین، خوای تعالی لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿لِيُثْبِتُوكَ﴾ تا بەندو کۆتت بکەن، چونکە لەزمانی عەرەبیدا وشەی (الإثبات) واتای بەندکردنیش دەبەخشێت، واتە: بەند و کۆت بکرێت تا دەمرێت، وەکو چۆن شاعیرانی دیکەی جگە لەو مردن، خوای تعالی لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَتَرَبَّصُ بِهِ رَيْبَ الْمَنُونِ﴾[الطور: ٣٠.] واتە: ﴿أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ﴾ نەء بەڵکو دەڵێن (موحەممەد ﷺ) شاعیرە ﴿نَتَرَبَّصُ بِهِ رَيْبَ الْمَنُونِ﴾ چاوەڕوانی مردنی دەکەین. چاوەڕوان دەبین تاوەکو دەمرێت، بەندو کۆت دەکرێ، بۆ ئەوەی کۆچ نەکات و، بە هاوەڵانی نەگات، پاشان خوای تعالی لە هەمان ئایەتدا دەفەرموێت: ﴿أَوْ يَقْتُلُوكَ﴾ یان بتکوژن، کۆتایی بە ژیانت بێنن و، بحەوێنەوە، ﴿أَوْ يُخْرِجُوكَ﴾ یان (مەککە) دەرت بکەن، بۆ ئەوەی وە دەری نێن و، کاروباریان لێ تێك

--------------------------------------------
--------------------------------------------
--------------------------------------------

نەدات. لەم کاتەدا شەیتان لە شێوەی مرۆڤێکدا هاتە مەجلیسەکەیان و پێی گوتن: لە هەموو هۆزەکان کۆمەڵێك لاو کۆبکەنەوەو، هەر یەکێکیان تیرێکیان بدەنێ، هەر کات موحەممەد هاتە دەرەوە، لێی دەدەن وەکو لێدانی یەك پیاو، خوێنەکەی لە نێوان هەموو هۆزەکاندا بڵاو دەبێتەوەو، هۆزەکەشی توانای جەنگی هەموو هۆزەکانی دیکەیان نابێ، گوتی: ئەمەیە ڕای ڕاست و تەواو، لاوەکانیان کۆ کردەوەو، چەکیان دانێ، چوون چاودێری هاتنە دەرەوەی پێغەمبەری خوایان ﷺ دەکرد، بەڵام خوای گەورە لەنێوان هەموویانەوە دەریچاند بێ ئەوەی ئەوان هیچ هەستێك بەدەرچوونەکەی بکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ عەلی ﷛ لە جێگەکەی خۆیدانا، تەماشایان دەکردو، وایان دەزانی پێغەمبەرە ﷛ لەنێوان هەموویانەوە چووە دەرەوە بەبێ ئەوەی هەستی پێبکەن، خوای تعالی کردیەدەرەوە، هێندێ خۆڵ و خاکی پرژان بەسەر سەیانداو، چووە دەرەوە بۆ لای ئەبوبەکر ﷛، هەر دوو کیان بەرەو ئەشکەوت (ثور) بەڕێکەوتن و، خۆیان تێدا شاردەوە، تا ڕاودونانیان تەواو بوو، پاشان بە سەلامەتی و ئارامی خوای گەورەوە چوون بۆ مەدینەی پیرۆز، تا گەشتنە ئەوێ، بە هاوەڵانی گەشت، خوای گەورە لەم ئایەتەدا بۆ پێغەمبەرەکەی ئەم ڕووداوە دەگێڕێتەوە، کە بە ڕێگەیەکی سەرسوڕمێن لە نێوانیانەوە دەریهێنا بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکەن، پاشان خوای گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرموێت: ﴿وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴾ وە خوا چاکترینی پیلان گێڕانە (بەرامبەر پیلان گێڕان)، لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِنْدَ الْبَيْتِ إِلَّا مُكَاءً وَتَصْدِيَةً فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنْتُمْ تَكْفُرُونَ (٣٥) إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يُنْفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ لِيَصُدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ فَسَيُنْفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ وَالَّذِينَ كَفَرُوا إِلَى جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ (٣٦)﴾[الأنفال:٣٥ _ ٣٦] واتە: ﴿وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِنْدَ الْبَيْتِ﴾ وە نوێژی ئەوان (بتپەرستان) لەماڵی خوادا هیچ نییە

---------------------------------------------
---------------------------------------------
---------------------------------------------

﴿إِلَّا مُكَاءً﴾ جگه له فیكه كردن ﴿وَتَصْدِيَةً﴾ و چه‌پله‌لێدان نه‌بێت ﴿فَذُوقُوا الْعَذَابَ﴾ كه‌وانه: بچێژن سزای سه‌خت (له به‌دردا) ﴿بِمَا كُنْتُمْ تَكْفُرُونَ﴾ به‌هۆی بڕوا نه‌هێنانتانه‌وه ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ به ڕاستی ئه‌وانه‌ی كه بێباوه‌ڕن ﴿يُنْفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ﴾ ماڵ و سامانیان خه‌رجده‌كه‌ن ﴿لِيَصُدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ﴾ بۆ ئه‌وه‌ی به‌رهه‌ڵستی ڕێگه‌ی خوا بكه‌ن ﴿فَسَيُنْفِقُونَهَا﴾ جا له‌مه‌و دوا (ماڵ و سامانیان) به‌خته‌ده‌كه‌ن و ده‌یبه‌خشن ﴿ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً﴾ له پاشان ده‌بێت به داخ و په‌ژاره بۆیان ﴿ثُمَّ يُغْلَبُونَ﴾ پاشان ژێر ده‌كه‌ون ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا﴾ وه ئه‌وانه‌ی كه بێ باوه‌ڕن ﴿إِلَى جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ﴾ هه‌ر له دۆزه‌خدا كۆ ده‌كرێنه‌وه. سه‌رسه‌ختی بێباوه‌ڕان گه‌شته ئه‌و ئاسته‌ی كه خوای گه‌وره له‌م ئایه‌ته‌دا ده‌فه‌رموێت: ﴿وَإِذْ قَالُوا اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ هَذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِنْدِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾[الأنفال: ٣٢] واته: ﴿وَإِذْ قَالُوا اللَّهُمَّ﴾ (بیر بكه‌ره‌وه) كاتێك (كه بێباوه‌ڕه‌كان) ده‌یانووت ئه‌ی په‌روه‌ردگار ﴿إِنْ كَانَ هَذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِنْدِكَ﴾ ئه‌گه‌ر ئه‌م قورئانه ڕاسته‌و له‌لایه‌ن تۆوه هاتووه ﴿فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً﴾ ده‌ی به‌رد به‌سه‌رماندا ببارێنه ﴿مِنَ السَّمَاءِ﴾ له ئاسمانه‌وه ﴿أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ یان سزای سه‌ختی پڕ ئازارمان بۆ بنێره. ته‌ماشاكه چۆن كوفرو سه‌رسه‌ختی و جه‌ور مرۆڤ به چ ئاستێك ده‌گه‌یه‌نێ، ناڕه‌زایی ده‌رده‌بڕن و ته‌حه‌ددای خوای تعالی ده‌كه‌ن. له ئایه‌تێكی تردا خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنْتَ فِيهِمْ وَمَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ﴾[الأنفال: ٣٣] و به ڕاستی خوا سزایان نادات له كاتێكدا تۆ (ئه‌ی موحه‌ممه‌د ﷺ) له ناویاندا بیت هه‌روه‌ها خوا تووشی سزایان ناكات له كاتێكدا ئه‌وان داوای لێبوردن بكه‌ن. له‌م ئایه‌ته‌دا خوای گه‌وره دوو شتی باسكردووه كه ڕێگرن له‌وه‌ی خوای گه‌وره سزایان بدات، یه‌كه‌م: بوونی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ له نێوانیاندا، له ڕاستیدا قه‌ومی هه‌ر پێغه‌مبه‌رێك تیا ده‌چن ئه‌گه‌ر له نێویاندا نه‌ما. دووه‌م: داوای لێخۆشبوون كردن سزا

دوور دەخاتەوە. پاشان خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ اللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَا كَانُوا أَوْلِيَاءَهُ إِنْ أَوْلِيَاؤُهُ إِلَّا الْمُتَّقُونَ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾، ﴿وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ اللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ خوا چۆن سزایان نادات لە کاتێکدا ئەوان ڕێگری لە حاجی و عەمرەکاران دەکەن بۆ ئەوەی بۆ ماڵی خوا نەچن، ﴿يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ چونکە ساڵی حودەیبیە ڕێگریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی کردو نەیانهێڵا بۆ ماڵی خوا بچن، ﴿وَمَا كَانُوا أَوْلِيَاءَهُ﴾ ئەمەیە مەحەلی شاهێد لە کاتێکدا ئەوان خۆشەویست و سەرپەرشتیاری ئەو (مزگەوتە) نین، ﴿إِنْ أَوْلِيَاؤُهُ إِلَّا الْمُتَّقُونَ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بە ڕاستی سەرپەرشتیار و خۆشەویستی ئەو (مزگەوتە) خوا ناسان و پارێزکارانن، بەڵام زۆربەیان نازانن.

تا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَا كَانُوا أَوْلِيَاءَهُ إِنْ أَوْلِيَاؤُهُ إِلاَّ الْمُتَّقُونَ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ﴾[ الأنفال: ٣٤] واتە: ﴿وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ لە کاتێکدا ئەوان بەرگری (موسڵمانان) دەکەن لە چوون بۆ مزگەوتی بەرێزو پیرۆز ﴿وَمَا كَانُوا أَوْلِيَاءَهُ﴾ لە کاتێکدا ئەوان خۆشەویست و سەرپەرشتیاری ئەو (مزگەوتە) نین ﴿إِنْ أَوْلِيَاؤُهُ إِلاَّ الْمُتَّقُونَ﴾ بە ڕاستی سەرپەرشتیارو خۆشەویستی ئەو (مزگەوتە) خواناسان و پارێزکارانن ﴿وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەیان نازانن.

خوای گەورە بۆی ڕوونکردوینەتەوە کە هاوەڵپەرستان وەلی و دۆستی ئەو نین و، وەلی و دۆستی پێغەمبەرەکەشی نین، بەڵکو لە ڕاستیدا تەنها لەخواترسان دۆستی ئەون[1].

---

(١)_ ئەمەیە سنووری جیاکار لە مەسەلەکەدا، بە ڕاستی تەنها بانگەشەی وەلایەت و دۆستایەتی بەس نییە تا بەڵگەی لەسەر دادەمەزرێنێت، کە بریتیە لە پەرستن و لە خوا ترسان، هەر کەس بانگەشەی دۆستایەتی بکات، تەماشای کردەوەکەی دەکرێت، ئەگەر کردەوەکانی صالح و چاك بوون و، لە پەروەردگاری دەترسا، ئەوە بێگومان وەلی و دۆستی خوایە، بەڵام ئەگەر بەپێچەوانەشەوە بوو، بێگومان دۆستی شەیتانەو، دۆستی خوا نییە، ئەمەیە سنووری جیاکاری لە نێوان دۆستانی خواو دۆستانی شەیتاندا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنْ أَوْلِيَاؤُهُ إِلاَّ الْمُتَّقُونَ﴾ ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دۆستانی خوا سنووردار کراوە تەنها بەو کەسانەوە کە لە خوای گەورە دەترسن، مانای وایە ئەوانەی کە لە خوا ناترسن دۆستی خوا نین بەڵکو دۆستی شەیتانن.

وثبت في (( الصحيحين )) عن عمرو بن العاص ﷺ قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول جهاراً من غير سرّ: ((إِنَّ آلَ فُلاَنٍ لَيْسُوا لِي بِأَوْلِيَاءَ ــ يَعْنِي طَائِفَةً مِنْ أَقَارِبِهِ ــ إِنَّمَا وَلِيِّيَ اللهُ وَصَالِحُ المُؤْمِنِينَ))[1]. واتـه: لـه عـهمری کـوڕی عاصـهوه ﷺ فـهرموویـهتی: گوێبیستی پێغهمبهری خوا بووم ﷺ به ئاشكراو به بێ نهێنی دهیفهرموو: ((به ڕاستی بنهماڵهی فلان ههرگیز دۆستی من نین ـ مهبهستی تایهفهیك بوو له خزم و كهسوكاری خۆی ـ له ڕاستیدا دۆستان و پشتگیرانی من تهنها خواو ئیمانداره چاكهكانه)).

---

(١)ـ ئهگهر خزم و كهسوكاری پێغهمبهری خوا ﷺ لهسهر كوفر بوون، بێگومان دۆست و پشتگیری پێغهمبهری خوا ﷺ نین، ((إِنَّمَا وَلِيِّيَ اللهُ وَصَالِحُ المُؤْمِنِينَ)) دۆست و پشـتگیرانی پێغهمبـهری خـوا ﷺ خـوای گـهورهو، موسـڵمانه چـاكهكانن. تهماشاكه فهرموویهتی: ((وَصَالِحُ المُؤْمِنِينَ))، ئائهمهیه وهلی و دۆسـت: موسـڵمانه چاكهكان، ئـهم شته ئاماژه بۆ ئهوه دهكات كه تهنها خزمایهتی و نزیكێتی له پێغهمبهری خـواوه ﷺ سوودی نییه، لهڕاستیدا ئهوهی كه سوود بهخشبێت تـهنها كـردهوهی چاكه، ئهگهر چی ئهو كهسه لـهخزمان و كهسـوكاری پێغهمبـهری خـواش ﷺ نـهبێ، ئـهبو لههـب مامی پێغهمبهری خوا ﷺ بوو، له دۆزهخیشدایه، ئهبولههـب و ئـهبوتالیب و ههموو ئهوانهی ئیمانیان به پێغهمبهری خوا ﷺ نـههێنا، لـه دۆزهخـدان، لـه كاتێكدا ئهوان مامی بوون، بهڵام بـیلال و سـهلمان و صوهـهیب و كهسـانی غـهیری ئـهوانیش بهندهو كۆیله بوون، و بوون به هـاوهڵانی بـهڕێزو گـهوره، بۆچـی؟ چـونكه ئیمانیـان بـهخوای تعالی هێناو، شوێنی پێغهمبهرهكهی ﷺ كهوتن.

ئەم گوتارەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەقاودەق ڕێکەوتی ئەو ئایەتەی خوای گەورەیە کە دەفەرموێت: ﴿إِن تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا وَإِن تَظَاهَرَا عَلَيْهِ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ مَوْلَاهُ وَجِبْرِيلُ وَصَالِحُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمَلَائِكَةُ بَعْدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ﴾[1] [التحريم: ٤] واتە: (ئەی حەفصەو عائشە) ئەگەر هەردوکتان تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خودا (جێی خۆیەتی) چونکە بە ڕاستی دڵتان لایدا (لە هەق و ڕاستی) وە ئەگەر پشتی یەکتر بگرن لەدژی پێغەمبەر ﷺ (سەرکەوتوو نابن) چونکە بێگومان پشتگیری ئەوە خواو جوبرەئیل و ئیمانداره چاکەکانیش دوای ئەوان فریشتەکانیش پشتیوانی ئەون.

وشەی ((صالح المؤمنين))ی نێو فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو چاکێك لە ئیمانداران دەگرێتەوە[2]، کە بریتین لە ئیماندارە لە خوا ترسەکانی دۆستانی خوا.

---

(١)_ ئەم ئایەتە سەبارەت بەو ڕووداویە کە لەنێوان پێغەمبەری خوا ﷺ خێزانەکانیدا ڕوویدا، بە تایبەت عائیشەو حەفصە کە هەستان بە کەمێك بێزار کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ و داوای هەندێ شتیان دەکردو، پێغەمبەری خوا ﷺ توانای جێبەجێکردنی ئەو داواکاریانەی نەبوو، ﴿إِن تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا وَإِن تَظَاهَرَا عَلَيْهِ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ مَوْلَاهُ وَجِبْرِيلُ وَصَالِحُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمَلَائِكَةُ بَعْدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ﴾ ئا ئەمانە خۆشەویست و هاوپشت و پشتگیری پێغەمبەری خوان ﷺ: خواو، فریشتەکان و، ئیماندارە چاکەکان، ئەمانە پشتگیرو خۆشەویست و هاوپشتی پێغەمبەری خوان ﷺ هەر کەسێکیش ئەوانە پشتگیرو خۆشەویست هاوپشتی بن، هەرگیز شکست ناهێنێ.

(٢)_ تەماشاکە ئەمەیە مەحەلی شاهێد، چونکە خواو ئیماندارە چاکەکان پشتگیرو خۆشەویستی پێغەمبەری خوان ﷺ، بۆیە ئیماندارە چاکەکان پشتگیری پێغەمبەرن نەك خزم و کەسوکاری بێ ئیمان.

پێشەوایان ئەبو بەکرو عومەر و عثمان و عەلی[١] و تێکڕای ئەهلی (بیعة الرضوان) ئەوانەی لە ژێر درەختەکەدا گفتیاندایە پێغەمبەری خوا ﷺ[٢] دەچنە چوار چێوەی ئەو گوفتارەی پێغەمبەرەوە ﷺ کە هەزار و چوار سەد هاوەڵ بوون و، هەمووشیان لە بەهەشتدان، ثبت في ((الصحیح)) عن النبي ﷺ أنه قال: ((لاَ يَدْخُلُ النَّارَ أَحدٌ بَايَعَ تَحتَ الشَّجَرَةَ))[٣]. واتە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەوانەی لە ژێر درەختەکەدا گفتیان دا هیچ کەسێکیان ناچنە ئاگرەوە)).

---

(١)_ یەکەم کەسان کە ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیانگرێتەوە، ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و علی و، باقیمەنی ئەو دە کەسەن کە مژدەی بەهەشتیان پێ دراوە، ئەمانە گەورە دۆستانی خوای گەورەن، هەر هەموو هاوەڵانیش دۆستی خوان، بەڵام فەزل و چاکەی هەندێکیان لە هەندێکی تریان زیاترە.

(٢)_ لە ڕۆژی حودەیبیەدا بێباوەڕان ڕێگریان لەپێغەمبەری خوا ﷺو هاوەڵانی کردو، نەیانهێڵا بە ماڵی خوا بگەن، وتوێژ لە نێوان هەر دوو لادا دەستی پێکردو، پێغەمبەری خوا ﷺ ئیمامی عوسمانی بۆ لای خەڵکی مەککە نارد، دەنگۆیەك بڵاوبویەوە کە گوایە ئیمامی عوسمان لەمەککە کوژراوە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لە سەراپای هاوەڵانیکرد پەیمانی پێ بدەن بۆ جەنگ، ئەوە بوو هەر هەموو هاوەڵان لە ژێر درەختەکەدا پەیمانی جەنگکردنیان دایە پێغەمبەری خوا ﷺ خوای تعالی لەم بارەوە لەم ئایەتەدا دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ﴾[الفتح: ١٨] واتە: ﴿لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ﴾ سوێند بە خوا بێگومان خوا ڕازی بوو ﴿عَنِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ لەو ئیماندارانەی ﴿إِذْ يُبَايِعُونَكَ﴾ کە پەیمانیان پێ دایت ﴿تَحْتَ الشَّجَرَةِ﴾ لە ژێر درەختەکەدا (لە حودەیبیە). ئەوەبوو ئەو ڕێزەی خوایان دەستکەوت کە بریتی بوو لە بە دەست هێنانی ڕەزای بوونی خوای گەورە، کە هەزاو چوار سەد کەس بوون.

(٣)_ بە ڕاستی خوای گەورە لە هەر هەموویان خۆش بوو، پێغەمبەریش ﷺ هەواڵی پێداوین کە ناچنە دۆزەخەوە، بۆیە ئەمانە دۆستی خوان بەهەقیقەت.

هاوشێوەی ئەمەش فەرموودەکەی تـرە: ((إِنَّ أَوْلِيَائِي المُتَّقُونَ أَيًّا كَانُوا، وَحَيْثُ كَانُوا))[1]. واتە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بە ڕاستی دۆستانی من کەسانی لە خواترس و هەر کەس بن و لە هەر کوێ بن)).

هەروەها کەسانێك لە کافرانیش بانگەشەی ئەوە دەکەن کە دۆستی خوان، بەڵام دۆستی خوا نین، بەڵکو دوژمنی خوان[2]،

---

(١)_ پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: بە ڕاستی پشتگیرو خۆشەویستی من تەنها کەسانی لە خوا ترسن، نەك ئەوانەی ترسی خوایان نییە، هەموو کەسێکی لە خوا ترس دۆستی خواو پشتگیرو خۆشەویستی پێغەمبەرن ﷺ لە هەر جێگەیەك بێت لەسەر ئەم زەمینە، ئەگەر چی لە مەککەش نەبێ، هەر کەسێکیش بێت، ئەگەرچی بەندەو کۆیلەش بێت، یان عەرەب بێت، یان عەجەم بێت، هەرکەسێك بن، لە خوا ترسان هەر کەسێك بن خۆشەویست و پشتگیری پێغەمبەری خوا ﷺ.

(٢)_ کەسانێك لە کافران بانگەشەی ئەوە دەکەن کە دۆستی خوان، وەکو بانگەشەکانی خەڵکی مەککە، هاوەڵ پەرستانی خەڵکی مەککە، گوایە ئەهلی ماڵی خوان و ئەهلی حەڕەمن و..... هتد، بەم شتانەوە فیز زلی و لووت بەرزیان بەسەر خەڵکەوە دەنواندو، وایان دەزانی ئەمەیان بەسەو پێویستیان بە شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ نییە، بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە دۆستی خوان، چونکە خزمەتکارو سەرپەرشتیاری ماڵی خوان، بۆیە دۆستی خوای گەورەن، بەڵام خوای گەورە بەر پەرچی دانەوە ﴿إِنْ أَوْلِيَاؤُهُ إِلاَّ الْمُتَّقُونَ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ﴾[الأنفال: ٣٤] بە ڕاستی سەرپەرشتیارو خۆشەویستی ئەو (مزگەوتە) خوا ناسان و پارێزکارانن، بەڵام زۆربەیان نازانن. ئەم شتە لە هاوەڵپەرستان و بێباوەڕاندا هەیە، هەروەها لە مونافیق و دوو ڕووان و جوولەکەو گاوران و غەیری ئەوانیشدا هەیە، بانگەشەی دۆستایەتی دەکەن و، هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە.

هەروەها مونافیق و دووڕوانیش ئیسلام دەردەخەن و، بە ڕووکار دان بە شایەتومانی (لا إله إلا الله وأن محمداً رسول الله)دا دەنێن، و بەڕاستی بۆ هەر هەموو ئینس نێردراوە، بەڵکو بۆ هەر هەموو ئینس و جن نێردراوە[1]،

---

(١)_ لەوانەی بانگەشەی وەلایەت و دۆستایەتی دەکەن سێ تایەفەن، تایەفەی یەکەم: مونافیق و دووڕوانن، ئەوانەی بە ڕووکار ئیسلام بەدەردەخەن و، لەدڵەوە کافرن، تایەفەی دووەم: صۆفیەکانن، سەرانی صۆفیە توندڕەوەکان، ئەمان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە بەخوای گەورە گەیشتوون و، پێویستیان بە پێغەمبەر ﷺ نییەو، پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوان نەنێردراوە، تایەفەی سێیەم: جوولەکەو گاورەکانن، ئەوانەی باوەڕیان بە پێغەمبەر ﷺ هێناوە، بەڵام گوتویانە پەیامەکەی بە تایبەت بۆ عەرەبەو پەیوەندی بە جوولەکەو گاورانەوە نییە. مونافیق و دوو ڕووەکان بە ڕووکار باوەڕی پێدەکەن، بەڵام لە دڵەوە دان بە پەیامەکەیدا نانێن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ (١) اتَّخَذُوا أَيْمَانَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ إِنَّهُمْ سَاءَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ (٢) ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ آمَنُوا ثُمَّ كَفَرُوا فَطُبِعَ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لاَ يَفْقَهُونَ (٣) وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ وَإِنْ يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُسَنَّدَةٌ يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ (٤) وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُمْ مُسْتَكْبِرُونَ (٥) سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ (٦) هُمُ الَّذِينَ يَقُولُونَ لاَ تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنْفَضُّوا وَلِلَّهِ خَزَائِنُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لاَ يَفْقَهُونَ (٧)﴾[المنافقون: ١ _ ٧] واتە: کاتێك کە دوو ڕوان بێنە لات دەڵێن شایەتی دەدەین کە بە ڕاستی تۆ پێغەمبەری خوایت وە دیارە خوایش دەزانێ کە تۆ ڕەوانە کراوی ئەوی و خوا شایەتی دەدات کە بێگومان دوو ڕوان درۆزنن، سوێندە (درۆ)کانی خۆیان کرد بە قەڵغان (بۆ خۆیان)

---

---

ئینجا ڕێگری (خەڵك)یان دەکرد لە ڕێی خوا بە ڕاستی ئەوان کارێکی خراپیان دەکرد ئەوە(ی کە ووترا) لەبەر ئەوە بوو کە بە ڕاستی ئەوان باوەڕیان هێناو لە پاشان بێباوەڕ بوون ئینجا مۆرنرا بەسەر دڵیاندا ئیتر ئەوان هیچ تێ ناگەن هەر کاتێك دەیانبینیت لەش و ژۆفانیان سەرسامت دەکات وە ئەگەر قسە بکەن گوێ لە قسەکانیان دەگرێت ( دوو ڕووان ) هەر وەك داری هەڵسپێردراون وا گومان دەبەن هەموو هاوارو قیڕەیەك بۆ سەر ئەوانە هەر ئەوانن دوژمن کەواتە خۆتیان لێ بپارێزە خوا بیانکوژێ (یان خوا لە ناویان بەرێ) چۆن وەردەگێڕرێن (لە حەق) کاتێك پێ یان بووترێ وەرن بۆ لای پێغەمبەری خوا تا داوای لێبوردنتان بۆ بکات ﴿لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ﴾ (سەرپێچی دەکەن) سەریان با دەدەن و دەیان بینیت ڕوو وەرئەگێڕن لە کاتێکدا کە ئەوان خۆیان بە گەورە دەزانن بۆ ئەوان یەکسانە داوای لێبوردنیان بۆ بکەیت یا داوای لێبوردنیان بۆ نەکەیت هەرگیز خوا لێ یان خۆش نابێ بە ڕاستی خوا ڕێنموونی گەلی لەڕێ لادەران ناکات ئەوان ئەو کەسانەن کە دەڵێن دارایی مەبەخشن بە ئەوانەی لە گەڵ پێغەمبەردان تا بڵاوەی لێ لە کاتێکدا هەر چی گەنجینەکانی ئاسمان و زەویی هەیە هی خوایە.

بەڵام دوو ڕووەکان نازانن. تەماشاکەن خوای تعالی لەم ئایەتەدا دەفەرموێت: وشەی سوێندەکانیان، لەزمانی عەرەبیدا مانای (الشهادة) شایەتیدان دەبەخشێت، چونکە شایەتی بریتیە لە سوێند، بۆیە کاتێ دەڵێن دەڵێن شایەتی دەدەین کە بە ڕاستی تۆ پێغەمبەری خوایت، ئەمە سوێند خواردنە، واتە: سوێندەکانیان کردووە بە قەڵغان بۆ ئەوەی کوشتن لە خۆیان دوورخەنەوەو، ئەوەیان پێنەکرێ کە بە کافرەکان کرا، بۆیە دووڕووەکان بەڕووکار موسڵمان بوون، بۆ ئەوەی ئەو موسڵمان بوونە بکەن بەقەڵغان بۆ خۆ دور خستنەوە لە کوشتن، دوو ڕووەکان بانگەشەی موسڵمان بوون دەکەن، زانراویشە کە ئیماندار دۆستی خوایە، بۆیە ئەوانیش دەڵێن: ئێمە دۆستی خواین، بەڵام خوای تعالی زانایە بەوەی کە ئەوان درۆزنن، چونکە لە دڵەوە نکۆڵیی دەکەن و بێباوەڕن.

کەچی لەدڵ و لەناوەوە بیروباوەڕێکی پێچەوانەی ئەوەیان هەیە، وەکو ئەوەی لە دڵ و لە ناوەوە دان بەوەدا نانێن کە پێغەمبەری خوایە، بەڵکو تەنها پادشایەکی ملکەچکراو بووەو، بە بیروڕاکانی خۆی خەڵکی بەڕێوە دەبرد، لە ڕەگەزی پادشایانی دیکە[1]، یان دەڵێن: بە ڕاستی پێغەمبەری خوا بووە بۆ نەخوێندەوارەکان نەک ئەهلی کیتاب، وەکو ئەوەی کەسانێکی بێشوماری جوولەکەو گاوران دەیکەن[2]،

---

(١)_ ملکەچی بوون چونکە دەسەڵاتی هەیە، ملکەچی پێغەمبەری خوا ﷺ بوون و، بە ڕووکار شایەتیان بۆ پەیامەکەیدا چونکە لە زەبرو هێزی دەترسان، ئەوان ئەم کارەیان کرد بۆ ئەوەی بە سەلامەتی و ئارامی بژین، بە بڕواو ئیمان و لەدڵەوە ئەمەیان نەکرد.

(٢)_ کەسانێك هەن لە جوولەکەو گاوران شایەتی دەدەن کە پێغەمبەری خوایە، بەڵام دەڵێن: پەیامەکەی بۆ قەومە نەخوێندەوارەکەیە، واتە بۆ عەرەبە بە تەنها و، ئەهلی کیتاب ناگرێتەوە، ئەمە شایەتیەکی باتڵ و پووچە، چونکە شایەتیدان بۆ پایەمەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ تەواو نابێ، تاوەکو شایەتی نەدرێ کە پەیامەکەی بۆ سەرتاپای مرۆڤایەتیە، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا﴾[الأعراف: ١٥٨] واتە: ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ ئەی خەڵکینە بە ڕاستی من پێغەمبەری خوام بۆ ئێوە هەمووتان. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ كَافَّةً لِلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا﴾[سبأ: ٢٨] واتە: و ئێمە تۆمان نە ناردووە مەگەر بۆ هەموو ئادەمی بە مزدەدەرو ترسێنەر. بۆیە هەرکەسێك سنووری پەیامەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها بۆ نەخوێندەوارەکان واتە: بۆ تەنها بۆ عەرەب کورت بکاتەوەو، گوایە چوار چێوەی پەیامەکەی ئەهلی کیتاب ناگرێتەوەو، دان بە پەیامەکەیدا نانێن، ئەو کەسە کوفری بە خوا کردووە. ئەمە بەرپەرچدانەوەیە بۆ ئەو کەسانەی دەڵێن: ئایینە ڕاستەکان سیانن و، پێویستە گفتوگۆ بکەن و، لە یەکتر نزیك ببنەوەو، هەر سێ ئایینەکە مرۆڤ بەخوا دەگەیەنن، با جوولەکە لەسەر ئایینی خۆیان

---------------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------------

بن، گاور لەسەر ئایینی خۆیان بن، موسڵمانان لەسەر ئایینەکەی خۆیان بن، ئەم جۆرە قسە هەڵەت و پەڵەتانە _ پەنا بە خوا _ خراپترین جۆری گومڕایی و، پوچترین بروچێتییە، چونکە ئایینە کوفرەکان دەکەن بە باوەڕو ئیمان و گوایە مرۆڤ بە خوا دەگەیەنێت، گوایە ئەو ئایینانە یەکسانن بەئیسلام، ئایینەکانی جوولەکەو گاور یەکسانن بەئایینی پیرۆزی ئیسلام؟ ئەم قسانەیان بە درۆخستنەوەی ئایەتەکەی خوای گەورەیە ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا﴾[الأعراف: ١٥٨]، هەروەها بە درۆخستنەوەی ئەو ئایەتەشە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الذينَ يَتَّبِعونَ الرَّسولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ﴾[الأعراف: ١٥٧] واتە: ئەوانەی شوێنی پێغەمبەر و نێردراوی نەخوێندەوار دەکەون (کە لە لایەن پەروەردگارەوە هاتووە) ئەو کەسەی کە (نامەدارەکان) دەیبینن بە نووسراوی لایانە لە تەورات و ئینجیلدا کە فەرمانیان پێ دەکات بە چاکە و ڕێگریان لێدەکات لە خراپە.

بان دەڵێن: بۆ خەڵکی [illegible] نێردراوە، خوا [illegible]

[illegible] نێردراوە، پێویستیەکیان پێی نییە[1]، [illegible]

جگە لە ڕێگەکەی ئەو، وەکو خدر لەگەڵ مووسادا[2].

---

(١)_ ئەمە گوفتاری سەرانی صوفیە توندڕەوەکانە، [illegible]

موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە بۆ سەرتاپای مرۆڤایەتی، بەڵام بە بۆچوونی ئەوان کەسە تایبەتەکان لە چوار چێوەی پەیامەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەردەچن و نایانگرێتەوە، بە بۆچوونی ئەوان کەسە تایبەتەکانی تەصەوف بەخوای گەورە گەیشتوون و، هیچ پێویستیەکیان بە پێغەمبەران نییە، بە بۆچوونی ئەوان پێغەمبەران تەنها بۆ خەڵکی ئاسایی نێردراوەو، هیچ پێویستیەکیان بە پێغەمبەران نییە، چونکە خوایان ناسیوەو، بە خوای گەورە گەیشتوون، بۆیە هیچ پێویستیەکیان بە پێغەمبەر ﷺ نییە تا بە خوای گەورەیان پێبناسێنێت.

(٢)_ جیاوازی نێوان مووسا پێغەمبەر _ علیه السلام _ و موحەممەد ﷺ، مووسا پێغەمبەر _ علیه السلام _ بۆ بەنی ئیسرائیل نێردرا، بۆ قەومەکەی خۆی بە تایبەت، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هەر هەموو مرۆڤایەتی نێردراوە، بەڵام خضر بەندەیەکە لە بەندەکانی خوای گەورە کە لە لایەن خۆیەوە زانست و زانینی پێدابوو، نەچووبوە چوارچێوەی بانگەوازەکەی موسا پێغەمبەرەوە _ علیه السلام _، ئەم شتە لە ئوممەتانی ڕابردودا جایزو شیاو بووە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ئایینەکەی بۆ مرۆڤایەتیەو، جایز نییە بۆ هیچ کەسێك شوێنی نەکەوێ، بەڵکو پێویستە مرۆڤایەتی بەگشتی شوێنی ئەم پێغەمبەرە بکەون، هەتا موساش _ علیه السلام _ پێویستە شوێنی بکەوێ، و ئەگەر عیسا پێغەمبەر _ علیه السلام _ لەکۆتایی زەماندا دابەزێ شوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەوێ. ئا ئەمە بوو جیاوازی نێوان خضرو پەیامەکەی مووسا و، پەیامەکەی موحەممەد ﷺ. لەو تایبەتمەندیانەی کە بە

پێغەمبەرەکەمان ﷺ دراوە ئەوەیە کە پێغەمبەرانی پێشتر بە تایبەت بۆ قەومەکانی خۆیان دەنێردران، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هەر هەموو مرۆڤایەتی نێردراوە، ئەم تایبەتمەندیە تەنها بۆ ئەوبوو، دوای ناردنی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبێ هەموو کەسێك شوێنی بکەوێ، هەر یەکێکی خەڵقی خوای تعالی دەبێ شوێنی بکەوێ. صۆفیەکان لە ئوممەتی موحەممەدن ﷺ، بەڵام ئوممەتی بانگــەواز (الدعوة)ن _ واتــە لــە تێکڕایــی مەخلوقاتن کە بانگەوازەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیانگرێتەوە، بــەڵام لــە ئوممــەتی بە گوێ کردن و وەڵامدانەوە (الإجابة)نین، واتە: لە تێکڕای ئەوانە نین کە بە یەکجاری و بە تەواوی شوێنی پێغەمبەری خوا کەوتوون و، ئاڵای شەریعەتەکەیان هەڵگرتووەو، هــەرگیز لــە ڕێگــە ڕاســتەکەی لانــادەن، بــەڵام ئوممــەتی بــە گــوێ کــردن و وەڵامدانەوە(الإجابة) لە هــی یەکــەم بەڕێزترن و بە شــوێنکەوتووی چــاکی پێغەمبەر دەژمێردرێن، بەڵام ئەم شتە هەموو صۆفیەکان ناگرێتــەوە، بــەڵکو ســەرانی تەصــەوفی توندڕەو دەگرێتەوە، کەسانێکیان قسەی هەڵەت و پەڵەت (شطحات)یان هەیە، بەڵام لە بازنەی ئیسلام ناچنە دەرەوە، بەڵام سەرانی تەصەوفی توندڕەو، ئەوانەی بەم بێ ئابڕوویەتیە گەیشتوون و، دەڵێن: ئێمە هیچ پێویستیەکمان بە پێغەمبەران نییە، گوایە ئەوان بە خوای گەورە گەیشتوون و، بە بێ پێغەمبەر هەموو شتێك دەزانن و، دەڵێن: پێغەمبەر تەنها بۆ خــەڵکی ئاساییە، تــەنها ئەوانــەیان دەگرێتــەوە. هــەموو شــتێك لــە خوای گەورەوە وەر دەگرن بەبێ هــیچ واسیتەو نێوەنــدکارێك، ئــەم قســە پڕوپوچــانە دەڵێن. سەرانی تەصەوفی توندڕەو دەڵێن: ئێمە هەموو شتێك لــە خــوای گــەورەوە وەر دەگرین بەبێ هیچ واسیتەو نێوەندکارێك، بەڵام موسڵمانەکان و تێکــڕای ئوممــەتان بــە واسیتەو نێونــدکاری پێغەمبەرانــەوە لــە خــواوە شــەریعەت وەردەگــرن، دەڵــێن: ئێمــە پێویستمان بە واسیتەو نێوەندکارێتی پێغەمبەر نیــە، چــونکە بــەخوا گەیشــتووین، تــا ئــەو ئاســتەی کەســانێکیان بانگەشــەی ئــەوە دەکــەن کــە لەگــەڵ خــوای گــەورەدا دادەنیشــێت و، تــەفاهوم دەکــەن و لەســەر هــەموو شــتەکان پێکــدێن و، لــەخواوە وەردەگرێت، تەماشای گومڕایی بکەن مرۆڤ بەچ ئاستێك دەگەیەنێ.

یاخود هەموو ئەو شتانەی کە پێویستیان پێ هەبێ یەکسەر لە خواوە وەری دەگرن و سوودی لێ وەردەگرن، بە بێ واسیتەو بە بێ هیچ کەسێکی نێوەندکار[1]، یاخود دەڵێن: بە شەریعەتە دیارەکانەوە(بالشرع الظاهر) نێردراوەو، ئەوانیش قایلن بەوە، بەڵام چەند شتێك و حەقیقەتێکی ناوەکی(الحقائق الباطنیة) تر هەیەو، ناردنی ئەوانەی پێنەدراوە[2]، یاخود خۆی نەیدەزانی[3].

---

(١)_ دەڵێن: ئێوە ئایینەکەتان لە مردوکانەوە وەردەگرن، بەڵام ئێمە لەو زاتەوە وەریدەگرین، کە هەرگیز نامرێت، دەڵێن: ئێوە ئایینەکەتان لە مردوکانەوە وەردەگرن، مەبەستیان فەرموودە ناسانە کە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕنەوە، ئەمانیش قورئان و سوونتیان بۆ شێواندن، بەڵام ئێمە ئایینەکەمان ڕاستەوخۆ لە خواوە وەردەگرین کە هەرگیز نامرێت.

(٢)_ ئەم شتە بە لای ئەوانەوە جیاوازی نێوان شەریعەت و حەقیقەتە، بە نیسبەت حەقیقەتەوە: بە بۆچونی ئەوان جگە لە خۆیان هیچ کەسی تر ئەو حەقیقەتە نازانێت، بە نیسبەت شەریعەتیشەوە: بەبۆچونی ئەوان شەریعەت بۆ چاککردنی خەڵك هاتووەو، بریتیە لەو شەریعەتە ڕووکارو دیارەی(الشرع الظاهر) کە تەنها بۆ چاککردنی خەڵك هاتووە. بەڵام جگە لە صۆفیەکان هیچ کەسیتر حەقیقەتەکان نازانێت، هەتا پێغەمبەرانیش حەقیقەتەکان نازانن مەگەر سەرانی تەصەوف، بەلای ئەوانەوە ئەمەیە جیاوازی نێوان شەریعەت و حەقیقەت.

(٣)_ ئەم گوفتارەیان ناخۆشترە، ئا ئەمەیە ڕێبازی (أهل التجهیل) واتە: ئەو کەسانەی پێغەمبەران بە نەزان لە قەڵەم دەدەن، ئەم کەسانە دەڵێن: پێغەمبەران حەقیقەتەکانیان نەدەزانی، بەڵکو چەند شتێکی ناڕاست و ناحەقیقەتیان بۆ خەڵك باس دەکرد، بۆ بەرژەوەندی خەڵك، لە پێناو بەرژەوەندیدا درۆیاندەکرد، وەکو ئەوەی شێخولئیسلام _ڕەحمەتی خوا لێ بێت_ لە کتێبی ( الرسالة التدمریة )دا ڕێبازی ڕێگەکانی (أهل التجهیل و أهل التضلیل) باس دەکات.

یاخود ئەوان لەپێغەمبەری خوا ﷺ پێی شارازاترن[(١)]، یاخود ئەو حەقیقەتە نارەکیانە دەزانن وەکو ئەو دەیزانێ لە ڕێگەیەکی دیکەوە جگە لەڕێگەکەی ئەو[(٢)].

---

(١)_ واتە: یا صۆفیەکان لە پێغەمبەران بەو حەقیقەتانە شارەزاترن.

(٢)_ ئەو حەقیقەتانە لە ڕێگەیەکی دیکەی غەیری ڕێگەکەی پێغەمبەری خواوە دەزانن، ئەو حەقیقەتانە لەڕێگەی پێغەمبەری خواوە نازانن، بەڵکو ڕاستەوخۆ لە خواوە وەریان گرتووە، گومڕایی مرۆڤ بەم ئاستە بگەیەنێت، دەبێ باروحاڵی چۆن بێت؟ _ پەنا بە خوا _.

## ئەهلی صوففە

پێدەچێ کەسانێك لەوانە بڵێن: بە ڕاستی ئەهلی صوففە پێویستیان بەپێغەمبەری خوا ﷺ نەبوو[١]، بۆ ئەوانیش نەنێر درا بوو[٢]، کەسانێکیشیان دەڵێن: بە ڕاستی خوای گەورە لە باطن و ناوەکیەوە سروش و وحی بۆ ئەهلی صوففە نارد بە هاوشێوەی ئەو سروشەی کە لە شەوی میعراجدا بۆ پێغەمبەری خوای ﷺ نارد، بۆیە ئەهلی صوففە بە پلەکەی ئەو گەیشتن[٣]، بەڵام ئەمانە _لەبەر نەفامی لە ڕادە بەدەریان_ نەیانزانیوە کە شەو ڕەویەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککەوە بوو[٤]،

---

(١)_ هەندێ لە صۆفیە توندڕەوەکان دەڵێن: ئەهلی صوففە لە ئێمەیە، شێخولئیسلامیش _ ڕەحمەتی خوا لێ بێت_ ئەوە ڕوونده‌کاتەوە کە ئەهلی صوففە کێن؟ تا ئەو ئاستەی کەسانێکیان دەڵێن: وشەی صوفی لەوشەی صوففەوە وەرگیراوە، دەڵێن: پێویستیان بەپێغەمبەری خوا ﷺ نەبوو چونکە خوایان ناسیوە، دەڵێن: کاتێك پێغەمبەر بە لایاندا تێپەڕ بوو، وتیان: بچۆ بۆ لای ئەوانەی کە تۆیان بۆ نێردراوە.

(٢)_ چونکە دەڵێن: پێویستمان پێ نییە، دەزانین و خۆمان بە خوای تعالی گەیشتووین.

(٣)_ بە پلەی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتوون، بەبۆچونی ئەوان خوای گەورە سروش و وەحی بۆ ئەوانیش نارد وەکو چۆن بۆ پێغەمبەری خوای ﷺ نارد.

(٤)_ ئەهلی صوففە لە مەدینەی پیرۆز بوون، لە پاش کۆچکردن، بەڵام شەو ڕەویەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککەوە بوو، خوای تعالی دەفەرموێت: ﴿أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِّنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾، پێش مەدینەی پیرۆز، پێش کۆچ کردنیان.

خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلًا مِّنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ﴾[الإسراء: ١] واتە: پاك و بێگەردی بۆ ئەو كەسەی كە شەو ڕەویی كرد بە بەندەی خۆی لە شەوێكدا ﴿مِّنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ لە مزگەوتی بەڕێز و پیرۆزەوە (مەككە) بۆ مزگەوتی (الأقصى) لە (بيت المقدس) كە دەوروبەریمان پیرۆزو فەردار كردووە.

بەڵام صۆففە نەبوو تەنها لە مەدینەی پیرۆز نەبێ[1]، كە جێگە(الصفة) یەكی سەرگیراو بوو[2]، لە باكوری مزگەوتەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ كە ئەو كەسە غەریبانەی تێدا دەمانەوە كە هیچ خێزان و كەسوكارو هاوڕێیەكیان نەبوو كە لایان بمێننەوە، ئیمانداران بۆ مەدینەی پیرۆز بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ كۆچیان دەكرد، ئەگەر هەر كەسێك توانای مانەوەی لە شوێنێكدا هەبوایە دەمایەوە، هەر كەسێكیش مانەوەكەی ئاستەم بوایە ئەوا لە مزگەوت دەمایەوە، هەر كات شوێنێكیشی دەستكەوتایە لە صووفە دەیگواستەوە.

---

(١)_ صوففە: بریتی بوو لە خانویەك لە مزگەوتەكەی پێغەمبەری خوادا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو خانووەی بۆ هەژارانی كۆچكردوان تەرخان كرد بوو، ئەوانەی هیچ شوێنێكی مانەوەیان نەبوو، تیایدا كۆ دەبونەوەو، دەمانەوەو، پەرستنەیان تێدا ئەنجام دەدا، زانستیان تێدا دەخوێند، لە خێرو صەدەقەش خواردنیان دەدرایە، خێرو صەدەقەیان پێدەدرا، پێغەمبەری خواش ﷺ لە هەموو ئەو شتانەی پێدەدان كە پێی دەگەشت، ئا ئەمانە بوون ئەهلی صوففە، هەژارانی كۆچكردوان بوون، ئەوانەی شوێنی مانەوەیان نەبوو، یاخود لەو كەسانە بوون كە لە هۆزەكانەوە هات بوون بۆ وەرگرت زانست و زانیاری.

(٢)_ ژورێك بوو، صوففە واتە ژوور.

ئەهلی صوففە خەڵکێکی تایبەت نەبوون و لە صوففەکەدا بمێننەوە[1] بەڵکو جار بە جار ژمارەیان کەم دەبویەوەو جار بە جاریش ژمارەیان زیادی دەکرد، ماوەیەك پیاوی تێدا دەمایەوەو پاشان دەی گواستەوە، ئەوانەی لەوێ دەمانەوە لە ڕەگەزی تێکڕای خەڵك بوون و هیچ جیاوازیەکی تایبەتیان لە زانست و ئاییندا نەبوو[2]، بەڵکو کەسانێکیان تێدا بوو لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ کوشتنی[3] وەکو ئەلعەرەنیەکان کە ئاوو هەوای شاری مەدینەی پیرۆز لەگەڵ جەستەیاندا نەدەگونجاو نەخۆش کەوتن و (تا)یان لێهات، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیدا ووشتری شیرداریان بۆ دابینبکرێ و، فەرمانیشی پێدان لە میزو لە شیرەکەی بخۆنەوە[4]، بەلاّم کاتێ چاك بوونەوە، شوانەکەیان کوشت و ووشترەکانیشیان برد، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ کەسانێکی بە دوا دانادردن، ئەوەبوو هێنانیان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیدا دەست و قاچیان ببڕدرێ و، چاوی دەرهێنان و، لە حەڕڕە بەجێی هێشتن داوای ئاویان دەکردو، هیچ کەس ئاوی نەدەدانێ[5].

---

(١)_ بەڵکو کەسانێك دەچوون و، کەسانێك دەهاتن، تایبەت نەبوو بە کەسانێکی دیاری کراوەوە، شوێنێکی مانەوە بوو بۆ ئەوانەی بۆ مەدینەی پیرۆز دەهاتن، کەسانێك دەهاتن و، کەسانێك دەچوون.

(٢)_ ئەوانەی لە صوففەکە دەمانەوە بریتی بوون لە هەژارانی کۆچکردوان، هیچ جیاوازیەکی تایبەتیان بەسەر کەسانی غەیری خۆیاندا نەبوو، بەسەر کەسانی دیکەی جگە لە ئەهلی صوففە، لە هاوەڵان، لە زانست و ئیماندا هەر هەموویان وەکو یەك بوون.

(٣)_ وەکو ئەلعەرەنیەکان کە شێخولئیسلام_ڕەحمەتی خوا لێ بێت_باسیان دەکات.

(٤)_ چونکە میز و شیری وشتر بۆ (تا) بە ئیزنی خوای گەورە چارەسەری تێدایە.

(٥)_ کاتێ ئەو کردارەیان کردو، بەبسماری گەرم کراو چاوی شوانەکەیان دەرهێنا، پێغەمبەری خوا ﷺ قەساسی کردن، هەمان شتی پێکردن کە ئەوان بە شوانەکەیان کرد بوو، ئەوان دەست و قاچی شوانەکەیان بڕیبوو، هەر دوو چاویان دەرهێنا بوو، ئینجا کوشت بوویان، پێغەمبەری خوا ﷺ قەساسی کردن و، هەمان ئەو کردەوانەی پێکردن کە ئەوان بە شوانەکەیان کرد بوو.

فەرموودەکەیان لە (الصحیحین) دایە بەگێڕانەوەی هاوەڵی بەڕێز ئەنەسی کوڕی مالیك[1]، لە فەرموودەکەدا هاتووە: لە صوففە مانەوە، تەماشا دەکەین کە کەسانێکی وەکو ئەوان لە صوففە دەمانەوە، لەچاك و هەڵبژێردراوانیش کەسانێکی وەکو سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسی تێدادەمایەوە، کە چاکترین ئەو کەسانەن کە لە صوففەکەدا مانەوە، پاشان چووە شوێنێکی تر، هەروەها هاوەڵی بەڕێز ئەبوهورەیرەو کەسانی دیکەشی تێدا دەمایەوە[2].

ئەبو عەبدولڕەحمانی ئەلسولەمی مێژووی ئەو کەسانەی کۆ کردۆتەوە کە لە صوففە مابونەوە[3].

---

(١)_ صحیح: وهو حدیث العرنیین وفیه أنهم کانوا في الصفة، وقد أخرجه البخاري (٦٨٠٤)، ومسلم (١٦٧١)، من حدیث أنس بن مالك رضي الله عنه نحو ما ذکره ابن تیمیة، ولیس عند مسلم أنهم کانوا في الصفة وإنما هذا في روایة البخاري.

(٢)_ چاکترین هاوەڵانی تێدادەمایەوە، وەکو سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس و، ئەبو هورەیرەو، هاوەڵانی چاك و بەڕێزی غەیری ئەویش _ خوایان لێ ڕازی بێت _ لەلا دەمانەوە تا پێویستیان پێی نەدەماو دەچوونە شوێنێکی دیکە.

(٣)_ ئەبو عەبدولڕەحمانی ئەلسوللەمی یەکێکە لە عابیدو خواپەرستان، کەسێکی ئەهلی تەصوفیشە، مێژووی ئەو کەسانەی کۆکردۆتەوە کە لە صوففە دەمانەوە، ناو و، ژیانامەی نووسیون و، کردویەتی بە کتێبێك.

بەڵام ((پشتیوانان)) لە ئەهلی صوففە نەبوون[1]، هەروەها گەورە کۆچکردوانی وەکو ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان و عەلی و تەڵحەو زبێرو عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف و ئەبی عوبەیدەی کوڕی ئەلجەڕاح و غەیری ئەوانیش لە ئەهلی صوففە نەبوون[2].

---

(١)_ پشتیوانان خەڵکی مەدینەی پیرۆز بوون، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِنْ قَبْلِهِمْ﴾[الحشر: ٩] واتە: ئەوانەی کە لە پێش کۆچکەراندا نیشتەجێ بوون لە مەدینە، ئەوان خەڵکی شوێنەکە بوون،ماڵیان هەبوو، کێڵگەو کشتوکاڵیان هەبوو، هیچ پێویستیەکیان بە صوففە نەبوو، صوففە تەنها بۆ پێویستیەکان بوو، نەك بۆ ئەوەی فەزڵ و چاکەیەك لە وەلایەت و دۆستایەتیدا دروست بکات، وەکو ئەوەی ئەمان بانگەشەی بۆ دەکەن، پێدەچێ ئەوانەی لە صوففە نەما بێتنەوە زۆر چاکترو خاوەن فەزڵتر بن لەوانەی کە لە صوففە مابونەوە، صوففە هیچ فەزڵ و تایبەتمەندیەکی نەبوو.

(٢)_ ئەبی بەکرو عومەرو عوسمان لە صوففە نەمانەوە، تەڵحەو زوبەیریش لە صوففە نەمانەوە، ئەو کەسەی کە لە صوففە مابێتەوە هیچ فەزڵ و تایبەتمەندیەکی نەبوو، بەڵکو تەنها لەبەر پێویستیەك لەوێ دەمایەوە، بە ئەندازەی پێویستیەکەی خۆی لەوێ دەمایەوە، نەك لەبەر ئەوەی فەزڵ و تایبەتمەندیەکی بەسەر هاوەڵانی دیکەی جگە لە خۆیدا هەبێ، پێدەچێ ئەو هاوەڵانەی کە لەوێ نەمابێتنەوە زۆر چاکتر بن وەکو گەورە کۆچکردوانی وەکو ئەبی بەکر و عومەر و عوسمان و عەلی و، تەڵحەو، زوبەیرو، ئەبی عوبەیدەی کوڕی جەڕاح و، سەعیدی کوڕی زەید، هەروەها هیچ یەکێك لە پشتیوانانیش لەصوففە نەمانەوە، کە چاکترین هاوەڵانن پاش کۆچکردوان.

## کۆمەڵێك فەرموودەی ( موضوع ) سەبارەت بە وەلایەت و دۆستایەتی

ڕیوایەت کراوە کەوا بەندەیەکی موغیرەی کوڕی شوعبە[1] لە صوففەدا بووەو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هَذَا وَاحِدٌ مِن السَّبْعَة)) واتە: ((ئەمە یەکێکە لە حەوت قوتبەکە))، ئەم فەرموودەیە بە ڕێکەوتنی ئەهلی عیلم و زانست درۆیە[2]، با ئەبو نەعیم لە کتێبی ئەلحیلیەشدا ڕیوایەتی کرد بێ[3]،

---

(١)_ أخرج أبونعيم في ((الحلية))(٢ / ٢٤)، في ترجمة هلال مولى المغيرة بن شعبة بإسناد ضعيف منقطع من طريق عطاء الخراساني، عن أبي هريرة قال: قال رسول الله ﷺ: ((لَيَدْخُلَنَّ مِنْ هَذَا البَابِ رجُلٌ يَنْظُرُ اللهُ إلَيْهِ))، قال: فَدَخَلَ _ يعني هِلالاً _ فقالَ لهُ: ((صَلِّ عَلَيَّ يا هِلال)) فقالَ: ما أحَبَّكَ على الله وأكرمكَ عليهِ)) فاسم مولى المغيرة بن شعبة هنا هو هلال وله ترجمة في (( الإصابة )) (٣ / ٥٧٥، ٥٧٦)، فليراجعها من شاء.

(٢)_ گوایە قوتبەکان حەوتن، ئەمیش لە حەوتەکەیە، واتە یەکێکە لە حەوت قوتبەکە، چونکە صوفیەکان ئەوتادو ئەقتاب و، چەندین زاراوەی شێواوی تریان هەیە، ئەم فەرموودەیە درۆیەو، پێغەمبەری خوا ﷺ نەیفەرمووە: ئەو بەندەیە لەحەوت قوتبەکەیە، چونکە حەوت نەهاتووە.

(٣)_ ئەبو نەعیم _ ڕەحمەتی خوا لێ بێت_ کتێبی (حلية الأولياء)ی داناوە، ژیانامەی ئەولیای تێدا نووسیوەتەوە، پێدەچێ هەندێ کەم و کوڕی نێو کتێبەکە جێگەی ڕەخنە گرتن بێت، چونکە هاوشێوەی ئەم ڕیوایەتەی تێدا نووسیوەتەوە، کەچی باتڵ و پووچەو (صحيح) نییە.

هەروەها هەر فەرموودەیەکی دیکەش کە سەبارەت بە ژمارەی ئەولیاء و ئەبدال و[1]، نوقەباء و، نوجەباء و ئەوتادو، اقطاب ڕیوایەت کرا بێ[1]، گوایە چوار یان حەوت یان دوانزە یان چل یان حەفتا یان سێسەد یان سێسەدو سیازدە یان بەو فۆرمانەی هاتبێ، هیچ شتێکی (صحیح) لەپێغەمبەری خواوە ﷺ لەو بارەوە ڕیوایەت نەکراوە، پێغەمبەری چاکیش هیچ شتێک لە ئەو ووشانەیان بەزاردا نەهاتووە، جگە لە ئەبدال[2].

---

(١)_ لم نقف على حديث صحيح في الأبدال، وقد ذكر الشيخ ناصر الألباني بعض طرقها في ((سلسلة الأحاديث الضعيفة)) رقم (٩٣٥)، و(٩٣٦)، وأحسن في الكلام عليها فجزاه الله خيرا، وقال هناك: واعلم أن أحاديث الأبدال لا يصح منها شيء وكلها معلولة وبعضها أشد ضعفاً من بعض.

(٢)_ هەر هەموو ئەمانە دەستەواژەی صوفیەکانن، جگە لە ئەبدال کە فەرموودەیەکی کەمێك بەهێزی لە بارەوە هاتووە، واتای ئەبدال ئەوەیە کە هەر کات یەکێك چوو یەکێکی تر جێگەی دەگرێتەوە، هەر کات یەکێکیان مرد یەکێکی تر جێگەی دەگرێتەوە، تەنها خوای گەورە بە (صحیح)ی ئەمە دەزانێ، بەلام چاکترین شتێکە کە سەبارەت بە ئەبدال ڕوایەت کرا بێ، بەلام گوتویەتی لە وولاتی شامن بۆیە شێخولئیسلامیش _ ڕەحمەتی خوای لێبێت_ موناقشەی ئەمە دەکات. هەموو فەرموودەیەك لە پێغەمبەری خواوە ﷺ سەبارەت بە ئەقتاب و، ئەبدال و، ئەوتاد ڕوایەت کرا بێ درۆیە، جگە لە فەرموودەکەی ئەبدال کە کەمێك بەهێزە.

(٣)_ بەڵێ، فەرموودەکەی ئەبدال بەهێزیی تێدایە.

فەرموودەیەك سەبارەت بە ئەبدال ڕیوایەت کراوە کە گوایە چل پیاون و، لە وڵاتی شامن، فەرموودەکە لە (مەسنەد) دایە بە گێڕانەوەی ئیمامی عەلی ﷺ[1] کە فەرموودەیەکی (منقطع)ەو جێگیر نەبووە[2].

وە زانراوە کە ئیمامی عەلی و ئەو هاوەڵانەی لەگەڵیدا بوون لەموعاویەو ئەوانەی لە وڵاتی شام لەگەڵیدا بوون چاکتر بوون[3]،

---

(١)_ ضعيف لأنقطاعه: أخرجه أحمد (١ / ١١٢) من طريق شريح بن عبيد عن علي ﷺ مرفوعا بلفظ قَالَ: ذُكِرَ أَهْلُ الشَّامِ عِنْدَ علي بن أبي طالب ﷺ وَهُوَ بِالْعِرَاقِ، فَقَالُوا: الْعَنْهُمْ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، فَقَالَ: لا، إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: ((الأَبْدَالُ يَكُونُونَ بِالشَّامِ وَهُمْ أَرْبَعُونَ رَجُلا، كُلَّمَا مَاتَ رَجُلٌ أَبْدَلَ اللَّهُ مَكَانَهُ رَجُلا، يُسْقَى بِهِمُ الْغَيْثُ، وَيُنْتَصَرُ بِهِمْ عَلَى الأَعْدَاءِ، وَيُصْرَفُ عَنْ أَهْلِ الشَّامِ بِهِمُ الْعَذَابُ)).

وهذا إسناده منقطع، شريح بن عبيد لا تعرف له رواية عن علي ﷺ، وقال الشيخ أحمد شاكر: (التعليق على المسند حديث ٨٩٦): إسناده ضعيف: شريح بن عبيد الحمصي لم يدرك علياً بل لم يدرك إلا بعض متأخري الوفاة من الصحابة.

(٢)_ واتە: ئیسنادی فەرموودەکە (مُنقطِعْ)ە.

(٣)_ چونکە گوتویەتی: ئەبدال لە وولاتی شامن، ئەمە مانای وایە کە خەڵکی شام لە ئیمامی عەلی و هاوەڵانی چاکتر بن، لە کاتێکدا کە ئیمامی عەلی و هاوەڵانی بەرێزترو چاکتر بوون، چونکە ئیمامی عەلی چوارەم جێنشینەکانە، لە پیشکەوتوە یەکەمینەکانی کۆچکردوان و، لە کەسوکارە نزیکەکانی پێغەمبەری خواش بوو ﷺ بۆیە ئیمامی عەلی و هاوەڵانی لەئەوانەی کە لە وولاتی شام بوون چاکتر بوون، ئەم شتە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەم فەرموودەیە جێگەی تێڕوانیە کە گوایە لە وولاتی شامن.

بۆیە ناوی چاکترین کەسمان لە سوپای موعاویەدا بن و لە سوپای عەلیدا نەبن، وقد أخرجا في ((الصحيحين))[1] عن أبي سعيد، قال: قال رسول الله ((تمرق مارقة من الدين على حين فرقة من المسلمين، يقتلهم أولى الطائفتين بالحق))[2]

---

(١) صحيح: أعلم أن أصل حديث الخوارج في الصحيحين عند البخاري (٣٣٤٤ و ٣٦١٠ و ٤٣٥١ وفي عدة مواضع من صحيحه)، ومسلم (١٠٦٣)، كتاب الزكاة، باب ذكر الخوارج وصفتهم وفيه: ((... إنَّ من ضئضئ هذا قومٌ يقرؤون القرآن، لا يُجاوِزُ حناجرهم، يمرُقُون من الإسلام مُرُوقَ السَّهم من الرَّمِيَّة، يقتلون أهلَ الإسلامِ، ويَدَعُونَ أهلَ الأوثانِ، لئِن أنا أدركتُهُم لأقتلنَّهُم قتلَ عادٍ)).

وهو في الصحيحين من حديث أبي سعيد الخدري ـ رضي الله عنه ـ، لكن قوله ـ عليه السلام ـ: ((يقتلُهم أولى الطائفتين بالحق ))، إنما هو عند مسلم فقط ص ( ٧٤٦ )، ولم يخرجه البخاري.

(٢)ـ پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی دەرکەوتنی خەواریجەکان و کاتی دەرکەوتنیانی پێداوین، لەگەڵ ئیمامی عەلیدا دەجەنگان، کاتێ لە صیففین گەڕانەوە، جەنگەکە تەواو بوو، ئیمامی عەلی بەداوەری و ناوبژیوانیەکە ڕازی بوو، کۆمەڵێکی زۆریان دەیانگوت: ئیمامی عەلی بەداوەری و ناوبژیوانی پیاوان ڕازیبووە، لە کاتێکدا خوای تعالی دەفەرموێت: ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلَّهِ﴾[الأنعام: ٥٧] واتە: فەرمانڕەوایی تەنها بۆ خوایە، مەبەستیان ئەوەبوو کە حوکمی خوا لەم مەسەلە دا ئاشکرایەو دەبێ لەگەڵ موعاویەدا جەنگ بکرێت و، نابێ بە ناوبژیوانیەکە ڕازیبن، بۆیە تکفیری ئیمامی عەلیان کردو، لێی هەڵگەڕانەوە، دوانزە هەزار کەس بوون، لە شوێنێك دابەزین بە ناوی حارورا لە عێراق، بۆیە حەروریەکانیان پێ دەگوترێت، پاشان ئیمامی علی لە نەهرەوان لە دژیان جەنگاو، خوای گەورە بەسەریاندا سەریخست، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((يَقْتُلُهُمْ أَوْلَى الطَّائِفَتَيْنِ بِالْحَقِّ)) ئەمە شایەتیدانێکە بۆ ئیمامی عەلی کە لە خەڵکی وڵاتی شام نزیکتر بوو لە هەقەوە، چونکە ئەو بوو کە خواریجەکانی کوشت.

واته: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((کۆمەڵێك لەئایینی ئیسلام هەڵدەگەڕێنەوە، لە کاتی جیاوازی نێوان موسڵماناندا، نزیکترینی هەردوو تایەفەکە لە هەقەوە دەیان کوژن))، ئەو هەڵگەڕاوانە بریتین لە خواریجە حەروریەکان، ئەمانە هەڵگەڕانەوە ئەو کاتەی کە جیاوازی لە نێوان موسڵماناندا ڕوویدا لە ماوەی جێنشینی ئیمامی عەلیدا، ئەوە بوو ئیمامی عەلی و هاوەڵانی کوشتنیان، بۆیە ئەو فەمووده (صحیح)ە ئاماژە دەکات کە ئیمامی عەلی لە موعاویەو هاوەڵانی هەقدار تر بوو[١].

کەوا بوو چۆن ئەبدال لەو سوپایەدا دەبێ کە پلەکەی کەمترەو لەو سوپایەدا نابێ کە پلەکەی گەورترو بەرزترە[٢]؟

هەروەها دەگێڕنەوە کە شاعیرێك ئەم شیعرەی خوێندەوە[٣]:

قد لَسَعَتْ حَيَّةُ الْهَوَى كَبِدِي فَلا طَبِيبَ لَهَا وَلا رَاقِي

إلا الْحَبِيبُ الَّذِي شُغِفْتُ بِهِ فَعِنْدَهُ رُقْيَتِي وَتِرْيَـــاقِي واته:

مـــاری خۆشەویستی جەرگی گەستم و نە پزیشك و نە نزاکارێکی بۆ هەیە

جگە لەو خۆشەویستەی کە شەیدای بووم لای ئەو نزاو دەرمانی من هەیـــە

---

(١)_ ئەمە هیچ گومانێکی تێدا نییە.

(٢)_ ئەگەر ئەبدال لە وڵاتی شام بن مانای وایە لەگەڵ موعاویەدا دەبن و، لەگەڵ ئیمامی عەلیدا نابن، لە کاتێکدا کە سوپای ئیمامی عەلی لە سوپای معاویە چاکترە.

(٣)_ ئا ئەمەیە سەرسوڕمان، کەسانێك لە صۆفیەکان ئەمە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕنەوە، گوایە کاتێ گوێبیستی ئەو شیعرانە بووە بە شێوەی صۆفیەکان سۆز گرتویەتی.

بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ سۆز گرتی تاوەکو بوردەکەی لەسەر شان کەوتە خواری[1]، ئەم شتە بەرێکەوتنی زانایانی فەرموودەناس درۆیە[2]، لەمیش درۆتر ئەوەیە کە کەسانێکیان دەگێڕنەوە کە گوایە پۆشاکەکەی دڕاندو، جبرێلیش پارچەیەکی لێبردو بە عەرشەوە هەڵیواسی[3]، ئەمەو هاوشێوەکانی لەوانەن کە ئەهلی زانست و زانین بەپێغەمبەری خوا ﷺ چاك دەزانن کە لە ڕوون ترین ئەو فەرموودانەن کە بۆ درۆ کردن بە دەم پێغەمبەری خواوە ﷺ هەڵبەستراون[4].

---

(١)_ الوجد: واتە: سۆز لێهاتن کە یەکێکە لە دەستەواژەکانی ئەهلی تەصوف بە جۆرێك لە کاتی بیستنی ئەو شیعرو ئاوازو گۆرانیانەدا کەیف خۆش دەبێ و جۆش و خرۆشی دەیگرێ، پاشان جۆش و خرۆش بوون و سەرسوڕمانەکەی زیاد دەکات تا هۆشی بە لای دونیاوە نامێنێ و، دەکەوێتە سەر زەوی، بانگەشەی ئەوە دەکەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو دێڕانەی بیست، کە دێڕە شیعری عیشق و خۆشەویستی و غەزەلیاتە، چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ گوێ بیستی ئەو شتانە دەبێ، لەوەش سەختر گوایە لەو کاتەدا سۆز گرتی وەکو سۆز گرتنی صۆفیەکان، تەماشاکەن چۆن درۆ بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵ دەبەستن و، ڕێزی ناگرن، هەرزەیی و بێ هۆشیان داوەتە پاڵ _ علیه الصلاة والسلام _.

(٢)_ ئەم چیرۆکە بە ڕێکەوتنی زانایان درۆیە، لایەق بە پێغەمبەری خوا ﷺ نیە کە سۆز بیگرێ و، گوێبیستی دێڕە شیعری عیشق و خۆشەویستی و غەزەلیات بێت، خوای گەورە لە ئاستی ئەوانەدا داوێن پاك و بە ناموس و ئابڕوداری کردووە.

(٣)_ گوایە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ سۆز گرتی پۆشاکەکەی دڕاندو، جبرێلیش پارچەیەکی بردو بە عەرشەوە هەڵیواسی، هەر هەمووی درۆیە، تەماشاکەن بێشەرمی بە چ ئاستێکی گەیاندون، لە کاتێکدا بانگەشە دەکەن کە دۆستی خوان.

(٤)_ صۆفیەکان ئەوەندە قسەی هەڵەت و پەڵەت و، سەرسوڕمێن و، درۆ و، شتی پێکەنیناویان هەیە کە زۆر لەمە سەخترە. ئەمە سوونەتی خوای گەورەیە کە هەر کەسێك هەق پشتگوێ بخات، دڵنیا بن بە شتی پڕووچەوە گرفتار دەبێ.

وكذلك ما يروونه عن عمر ﷺ أنه قال: ((كان النبي ﷺ وأبوبكر يتحدثان، وكنت بينهما كالزنجي))[١] واته دەگێڕنەوە کە ئیمامی عومەر فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبکر قسەیان دەکردو، منیش لە نێوانیاندا وەکو زنجی وا بووم و هیچیان لێ تێ نەدەگەیشتم )) ئەمە درۆ و هەڵبەستراوە بە ڕێکەوتنی زنایانی فەرمووده ناس[٢].

مەبەستی سەرەکی لێرەدا ئەوەیە کە کەسانێکی بێشومار بە ڕووکار دان بەپەیامەکەی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەنێن، بەڵام لە دڵ و ناوەڕۆکەوە بیروباوەڕێکی دیکەیان هەیەو پێچەوانەی ئەوەیە[٣]، ئەم ڕەفتارە دەیانکات بە مونافیق ودوو ڕوو لە کاتێکدا بانگەشەی دۆستایەتی خوای گەورە بۆ خودی خۆیان و کەسانی هاوشێوەی خۆیان دەکەن[٤]

---

(١)_ واتە: لە قسەکەیان تێ نە دەگەیشت، بە شێوازێك قسە بکەن ئیمامی عومەر لێیان تێنەگات؟ ئەمە ڕێی تێدەچێ، ئیمامی عومەر نەزانێ چیان فەرمووە؟.

(٢)_ مەبەستی شێخولئیسلام _ڕەحمەتی خوا لێ بێت_ لە نووسینی ئەم قسە بێکەنیناویانەی صۆفیەکان ئەوەیە کە کردارە ناشیرینەکانیان ڕوون بکاتەوەو، خەوش و ناتەواویەکانیان بەدەرخات، چونکە ئەوان بانگەشەی دۆستایەتی خوای گەورە دەکەن، لە کاتێکدا ئەم قسە هەڵەت و پەڵەت و پڕوپوچانەیان هەیە.

(٣)_ ئا ئەمەیە مەبەستی سەرەکی، چونکە کەسانێکی زۆر هەن بە ڕووکار خۆیان وا بەدەر دەخەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕاست دادەنێن، بەڵام لە دڵ و لە ناوەڕۆکەوە پەیامەکەی بەدرۆ دەخەنەوە، لەوانە صۆفیەکان و دوو ڕووەکانن.

(٤)_ ئا ئەمانە مونافیق و دوو ڕووەکانن کە لەخانەو تەبەقی هەرە ژێرەوەی ئاگردان لە کاتێکدا بانگەشەی دۆستایەتی خوای گەورە دەکەن، بۆ ئەوان دوو ڕوون؟ چونکە بەزمانیان شتانێك دەڵێن کە لە دڵیاندا نییە، بە ڕووکار دان بە پەیامەکەی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەنێن و، لە دڵ و لە ناوەڕۆکەوە بە درۆزنی دادەنێن.

لە کاتێکدا لەدڵ و لە ناوەڕۆکەوە کوفر بەوە دەکەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ هێناویەتی، بە نەفامی یان بە کەللە ڕەقی[1].

---

(١)_ یان بە کەللەڕقی هەر چەند دەزانن، یان نەفامن بەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ هێناویەتی، لە کاتێکدا بانگەشەی زانست دەکەن و، بانگەشەی زانین دەکەن و، بەکەسانی زانیار بە خوا (العارف باللە) ناو دەبرێن، گوایە بە خوای گەورە گەشتوون، چۆن بەخوای گەورە دەگەن، لە کاتێکدا ئەوان لەسەر ئەم پلە نزمەی نەفامی و گێلێتیەن.

هێشتا شیخولئیسلام _ڕەحمەتی خوا لێ بێت_ جیاکاریەکانی نێوان دۆستانی خوا و دۆستانی شەیتان باس دەکات، خوای گەورە بۆی باس کردوین کە دۆستانی خوا ئەو کەسانەن کە ئیمانیان هێناوەو لە پەروەردگاریان دەترسن، لە ڕووکارو لەدڵ و ناوەڕۆکیشەوە ئیمانیان هێناوە، بەس نییە تەنها بەڕووکار ئیمان بێنیت بەبێ ئەوەی لە دڵ و لە ناوەڕۆکەوە ئیمان بێنیت، وەکو ئیمانی مونافیق و دوو ڕووەکان، ئەوانەی شایەتی دەدەن کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە بەڵام درۆزنن و، لە دڵەوە پەیامەکەی بە درۆ دەخەنەوە، ئەمانە لە خانەو تەبەقی هەرە ژێرەوەی ئاگردان، ئیتر چۆن بگوترێت ئەمانە دۆستانی خوان، هەروەها سەرانی صۆفیە توندڕەوەکان، ئەوانەی خۆیان وا بەدەردەخەن کە شایەتی ڕاستێتی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەدەن، بەڵام لە دڵ و لە ناوەڕۆکەوە بیروباوەڕێکی پێچەوانەی ئەوەیان هەیە، لەو باوەڕەدان کە دۆستانی خوای گەورە پێویستیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ نییە، بەڵکو ڕاستەوخۆ لە خوای گەورەوە وەردەگرن، بە بۆچونی ئەوان تەنها خەڵکانی ئاسایی پێویستیان پێیەتی ئەوانەی بە خوا نەگەیشتوون، بەڵام تایبەتمەندانی تەصەوف بە خوای گەورە گەیشتوون، بۆیە پێویستیان بە پێغەمبەران نییە، ئایا ئەمانە پێیان دەگوترێت لە دۆستانی خوای گەورەن، لە کاتێکدا لە دڵ و لە ناوەڕۆکەوە کوفر دەکەن و، بە ڕووکاریش بانگەشەی ئیمان و باوەڕ دەکەن؟ خۆیان دەڵێن: ئێمە

---------------------------------------
---------------------------------------
---------------------------------------

دۆستی خواین، بەڵام ئەهلی ئیمان و ئەهلی بیروباوەڕی ڕاست بە دۆستی شەیتانیان دادەنێن، چونکە لە ڕووکارو لە دڵ و ناوەڕۆکیشەوە ملکەچی نەبوون، بۆیە لە دۆستانی شەیتانن، هەروەها تاقمێکی سێیەمیش هەن کە بریتین لە گاورەکان، چونکە گاورانی واهەن شایەتی دەدەن کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە بەڵام دەڵێن: پەیامەکەی بە عەرەبەوە تایبەت کراوەو، بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی نییە، کەسانی وەکو ئەمانە ئیماندار نین، چونکە پەیامەکەیان بەلایەکەوە تایبەت کردوە، دانیان بە لایەکدا ناوەو، لایەنە گەورەکەیان پشتگوێ خستوە، کە بریتیە لە گشتێتی پەیامەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هەموو مرۆڤایەتی، بۆیە ناگوترێت کەسانی وەکو ئەمانە دۆستانی خوای گەورەن، ئەگەر چی شایەتیش دەدەن کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە، چونکە گشتێتی پەیامەکەی بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی ڕەتدەکەنەوە، هەروەها تاقمێکی چوارەمیش هەن دان بەوەدا دەنێن کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایەو، پەیامەکەشی سەرجەم مرۆڤایەتی دەگرێتەوە، بەڵام دەڵێن: کۆتاهەمینی پێغەمبەران نییەو، پێغەمبەرانی دیکەی بە دوا دا دێت، ئیمانیان بەوەنییە کە کۆتاهەمینی پێغەمبەران بێت لە کاتێکدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَٰكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ﴾ [الأحزاب: ٤٠] واتە: بەڵام ئەو نێردراوی خواو کۆتاهەمینی پێغەمبەرانە. هەروەها پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: ((أَنا خَاتَمُ النَّبِيِّينَ لاَ نَبِيَّ بَعْدِي)) واتە: ((من کۆتاهەمینی پێغەمبەرانم و هیچ پێغەمبەرێکی دیکەم بە دوادا نایەت))، بۆیە هەر کەسێك باوەڕی وا بێ کە بە دوای پێغەمبەری خوادا ﷺ پێغەمبەرێکی تردێت، ئەو کەسە کافرە، چونکە باوەڕی بەوە نییە کە پەیامی خوای گەورە بە موحەممەد ﷺ کۆتایی دێت، بۆیە هەر هەموو ئەوانەی باسکران وەلی و دۆستی خوای گەورە نین، ئەگەر چی خۆیان وا بەدەر دەخەن کە دۆستی خوان یان بانگەشەیان بۆ دەکرێت کە

ئەوانە دۆستی خوابن، چونکە ناچنە چوارچێوەی ئەو ئایەتەوە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (٦٢) الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ﴾[یونس: ٦٢ _ ٦٣] واتە: ﴿أَلَآ إِنَّ﴾ ئاگادار بن بێ گومان ﴿أَوْلِيَاءَ اللَّهِ﴾ دۆستانی خوا ﴿لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ﴾ ترسیان لە سەر نییە ﴿وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ خەفەتیش ناخۆن ﴿الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە ﴿وَكَانُوا يَتَّقُونَ﴾ وە هەمیشە خۆیان دەپارێزن و لە خوا دەترسن. ئا ئەمانەن وەلی و دۆستانی خوای گەورە، ئەمەیە هەقیقەت، نەك بەبانگەشە کردن. یان بە کەللەڕەقی ئەگەر چی دەزانن، یان بەنەفامی، ئەم نافامێتیەش بۆ ئەوان بە بەهانەو عوزر دانانرێت، چونکە لە تواناداپە بە فێر بوونی زانست لابرێت، بەڵام ئەوان لە بنەڕەتەوە باوەڕیان بە زانست نییە، چونکە بە سووك تەماشای ئەو کەسانە دەکەن کە خەریکی فێر بوونی زانستن، دەڵێن: ئێمە پێویستمان بەزانست نییە، ئەمە دیاردەیەکی زۆر ئاشکرایەو، لە کۆنەوە پێشەوا ئیبنونەلجەوزی لەکتێبی تەلبیس ئیبلیسدا باسی کردووە، هەتاوەکو ئەمڕۆش ئەم شتە واقیعەو هەیە، تاقمێك لە صوفیەکان هەن فێر بوونی زانست ڕەت دەکەنەوە دەڵێن: بەعیبادت و خواپەستنەوە خۆمان خەریك دەکەین، فێر بوونی زانست ڕێگری لە خواپەرستیەکەمان دەکات، بە خواپەرستیەوە خۆت خەریك بکە، پێویستت بە فێر بوونی زانست نییە؛ بە بێ ویست و هەر لە خۆوە زانستت بەرەو ڕوو دێت، ئەگەر خۆتت بە خواپەرستیەوە خەریك کرد ئەوا بە بێ ویست و هەر لە خۆوە لە لایەن خوای گەورەوە زانستت بۆ دێت، پێویستت بەوە نییە لە خویندنگاکاندا یان لە ئەڵقەکانی زیکردا بۆ فێر بوونی زانست دانیشیت، بەڵکو بە خواپەرستیەوە خۆت خەریك بکە، خوای گەورە خۆی زانستت دەداتێ. ئەمەیە سیفەتی ئەوانەی خۆیان کردۆتە خواپەرست، ئەمانە بانگەشە دەکەن کە بەجێهێنانی پەرستنەکان لە فێر

---------------------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------------------

------------------------------------------------------------------

بوونی زانست چاكتره، له كاتێكدا شتەكە بە پێچەوانەوەیەو، فێر بوونی زانست له عیبادەت و بەجێهێنانی پەرستنەكان چاكتره، مەسەلەیەك كە فێری دەبی و دەیزانیت له شەو نوێژێك و، له نافیلەكان چاكتره، هیچ شتێك وەكو فێر بوونی زانست نییە، فێر بوونی زانست چاكترین عیبادەت و خواپەرستیە، بەڵام عیبادەت و خواپەرستی بەبێ فێربوونی زانست گومڕاییەو، ڕێبازی گاورەكانە، بۆیە دەبێ پێشبینی ئەو شتە لەم كەسانە بكرێت، ئێمە ناڵێین ئەم كەسانە نەماون و چوون، نەخێر تا وەكو ئێستاش هەر ماون.

## له هۆکارەکانی کوفری جوولەکەو گاورەکان

هەروەها ژمارەیەکی زۆری جوولەکەو گاورەکان لەو باوەڕەدان کە دۆستانی خوای گەورەن، بەڕاستی موحەممەد پێغەمبەری خوایە(١)

---

(١)_ خوای گەورە ئەوەی باسکردوەو، دەفەرموێت: ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى نَحْنُ أَبْنَاءُ اللَّهِ وَأَحِبَّاؤُهُ﴾[المائدة: ١٨] واتە: جوولەو گاورەکان دەیانووت ئێمە کوڕان و خۆشەویستانی خواین. بانگەشەی ئەوە بۆ نەفسی خۆیان دەکەن، لە کاتێکدا دەڵێن بێگومان خوا یەکێکە لەو سێ خوا (پەروەردگارو عیساو دایکی)، یان دەڵێن: بە ڕاستی خوا هەر مەسیحی (عیسای) کوڕی مەریەمە، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلَاثَةٍ﴾[المائدة: ٧٣] واتە: سوێند بە خوا بە ڕاستی بێ باوەڕ بوون ئەوانەی کە ووتیان بێگومان خوا یەکێکە لەو سێ خوا (پەروەردگارو عیساو دایکی). تەماشاکەن ئەمانە دەڵێن: ئێمە دۆستی خواین لە کاتێکدا دەڵێن: بێگومان خوا یەکێکە لەو سێ خوا (پەروەردگارو عیساو دایکی)، جوولەکەکانیش دەڵێن: بێگومان خوا هەژارەو ئێمە دەوڵەمەندین، چونکە داوای قەرزمان لێدەکات، یان دەڵێن: خوا دەستی بەستراوە، پاک و بێگەردی بۆ خوای گەورە، گوێرەکە دەپەرستن و، دەڵێن: ئێمە کوڕان و خۆشەویستانی خواین.

بەلام دەڵێن: لە ڕاستیدا تەنها بۆ خەڵکی دیکەی جگە لە ئەهلی کیتاب نێردراوە(١)

---

(١) بە بۆچوونی ئەوان موحەممەد ﷺ تەنها بۆ خەڵکانی دیکەی جگە لە ئەهلی کیتاب نێردراوە، تەنها بۆ عەرەب، بۆ نەخوێندەوارەکان نێردراوە، ئەمە کوفرێکی ئاشکرایە، چونکە پەیامی پێغەمبەری خوا ﷺ گشتییەو بۆ هەموو مرۆڤایەتییە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا﴾[الأعراف: ١٥٨] واتە: ( ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ئەی خەڵکینە بە ڕاستی من پێغەمبەری خوام بۆ ئێوە هەمووتان. خوای گەورە سەبارەت بە جوولەکەو گاورەکان دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ﴾[الأعراف: ١٥٧] واتە: ئەوانەی کە شوێنی پێغەمبەر و نێردراوی نەخوێندەوار دەکەون (کە لە لایەن پەروەردگارەوە هاتووە) ئەو کەسەی کە (نامەدارەکان) دەیبینن بە نووسراویی لایانە لە تەورات و ئینجیلدا کە فەرمانیان پێ دەکات بەچاکە ﴿وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ﴾ و ڕێگریان لێدەکات لە خراپە. لەم ئایەتەدا کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ﴾ ئەوانەی کە شوێنی پێغەمبەر و نێردراوی نەخوێندەوار دەکەون، باشە مەبەستی کێیە؟ بێگومان مەبەست موحەممەدە ﷺ، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمْ﴾[البقرة: ١٤٦] واتە: ﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ﴾ ئەوانەی کە پەڕاومان پێداون ﴿يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمْ﴾ پێغەمبەر ﷺ دەناسن وەکو چۆن کوڕانی خۆیان دەناسن. عیسا پێغەمبەر _علیه السلام_ مژدەی بە هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ داوە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ﴾[الصف: ٦] واتە: مژدەتان پێ دەدەم بە پێغەمبەرێك کە لە دوای من دێ و ﴿اسْمُهُ أَحْمَدُ﴾ ناوی ئەحمەدە. باشە کێ بە دوای عیسا پێغەمبەردا _ علیه السلام_ هات؟ موحەممەد بوو ﷺ ﴿اسْمُهُ أَحْمَدُ﴾ ئەمە ناوی پێغەمبەرەکەیە ﷺ

------------------------------------------------------------

------------------------------------------------------------

------------------------------------------------------------

که ناوی ئەحمەد و موحەممەدەو، جگە لەم دوو ناوەش چەند ناوێکی دیکەی هەیە،
ئەمان باوەڕ بە گشتێتی پەیامەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ ناکەن بۆ هەموو مرۆڤایەتی.
تەنانەت کەسانێکی سەر بە ئیسلامیش هەن بڕوایان پێدەکەن و، دەڵێن: با ئەوان
لەسەر ئایینی خۆیان بن و، ئێمەش لەسەر ئایینی خۆمان بین، هەموومان براین،
هەموو ئایینەکان بە خوا دەگەن، ئەمە کوفرە _ خوا پەنامان بدات _ ئەمە
نکۆڵیکردنە لە پەیامەکەی موحەممەد ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:
((وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٌ بِيَدِهِ لاَ يَسْمَعُ بِي أَحَدٌ مِنْ هَذِهِ الْأُمَّةِ يَهُودِيٌّ وَلاَ نَصْرَانِيٌّ ثُمَّ يَمُوتُ وَلَمْ
يُؤمِنْ بِالَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ إِلاَّ كَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّار)) واتە: ((سوێند بەو کەسەی نەفسی
منی بە دەستە هەر یەکێك لەم ئوممەتە با جوولەکەو گاوریش بن هەواڵی منی
بیستبێت و پاشان بمرێ و ئیمان بەوە نەهێنێ کە بەمندا نێردراوە مەگەر دەبێ بە
نیشتەجێی دۆزەخ))، پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو خەڵکی بانگ کردووە بۆ ئیسلام،
عەرەب، جوولەکەو گاور، بۆ پادشایان و سەرۆکەکانی نووسی، بۆ کیسراو، قەیسەری
نووسی و، بۆ ئیسلام بانگی کردن، چۆن بۆیان دەنووسێ ئەگەر بۆ ئەوان نەنێر درا
بێ، پێویستە ڕوو بە ڕووی ئەم بیرۆکە پیسانە بوەستینەوە کە جوولەکەو گاورەکان
بڵاوی دەکەنەوەو، پێدەچێ کەسانێکی سەر بە ئیسلامیش قبوڵی بکەن، بە قەستی
بێت یان بە نەفامی.

بە ڕاستی لەسەر ئێمە واجب نییە شوێنی بکەوین، چونکە خوای گەورە پێش موحەممەد پێغەمبەری دیکەی بۆ ناردوین[1]

---

(١)_ پێغەمبەرانی پێشتر خەڵکیان هەواڵەی لای پێغەمبەری خوا ﷺ کردۆتەوە، ئەوە مووسا پێغەمبەر _ علیه السلام _ لەو تەوراتەدا کە پێیەتی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ﴾[الأعراف: ١٥٧] ئەو کەسەی کە ئەهلی کیتاب دەیبینن بە نووسراویی لایانە لە تەوراتدا، عیسا پێغەمبەر_علیه السلام_ مژدەی بە هاتنی داوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ﴾[الصف: ٦] وە مژدەتان پێدەدەم بە پێغەمبەرێك کە لە دوای من دێ و ناوی ئەحمەدە، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوانیش نێردراوە، بۆ پادشایان و سەرکردەکانیان نامەی نووسی و بۆ ئیسلام بانگی کردن. پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ هاوەڵی بەڕێز موعاذی رضي الله عنه بۆ یەمەن نارد پێی فەرموو: ((إِنَّكَ تَأْتِي قوما من أهل الْكتاب فَلْيَكُنْ أَوَّلَ ما تَدْعُوهُم إِلَيهِ شَهَادَةَ أَن لآ إِلَه إِلآ الله وَأَنِّي رَسُول الله)) واتە: ((تۆ دەچێتە لای قەومانێك لە ئەهلی کیتاب با یەکەم شتێك بانگی ئەوانی بۆ دەکەی شایەتیدان بێت کە بە ڕاستی هیچ خوایەك نییە بەهەق جگە لە خوای گەورەو بە ڕاستی منیش پێغەمبەری خوام))، پێغەمبەری خوا ﷺ کتێبێکی پێیە کە چاکترینی هەموو کتێبەکانە، باشە چۆن بانگیان دەکات بۆ ئەوەی شایتومان بێنن، ئەگەر ئەوان ئیماندار بن وەکو ئەوەی ئەوان بانگەشەی بۆدەکەن، ئەگەر ئیمانداری تەواو بوایەن پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئیسلام بانگی نەدەکردن، بۆیە ئەو بۆچوونەی ئەوان لە پوچترین پووچیەکانەو، گەورەترین گومڕا بوونیشە _ پەنا بە خوا _.

بۆیە هەر هەموو ئەمانە کافرن، ئەگەر چی بەنەفامی و بێ ئەقڵێتی خۆیان لەو باوەڕە دابن کە تایەفەکەی خۆیان لە دۆستانی خوان(١) ،

---

(١)_ ئەوان دۆستانی شەیتانن چونکە وەلامی پێغەمبەری خوایان ﷺ نەدایەوە، خوای گەورە سەبارەت بەجوولەکەو گاورەکان دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا جَاءَهُمُ الْحَقُّ مِنْ عِنْدِنَا قَالُوا لَوْلاَ أُوتِيَ مِثْلَ مَا أُوتِيَ مُوسَى أَوَلَمْ يَكْفُرُوا بِمَا أُوتِيَ مُوسَى مِنْ قَبْلُ قَالُوا سِحْرَانِ تَظَاهَرَا وَقَالُوا إِنَّا بِكُلٍّ كَافِرُونَ (٤٨) قُلْ فَأْتُوا بِكِتَابٍ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ هُوَ أَهْدَى مِنْهُمَا أَتَّبِعْهُ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ (٤٩) فَإِنْ لَمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءَهُمْ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِنَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ (٥٠)﴾[القصص: ٤٨_٥٠] واتە: ئینجا کاتێ ڕاستیان بۆ هات لە لایەن ئێمەوە ووتیان بۆ چی بەو ( موحەممەد ﷺ) نەدراوە وێنەی ئەوەی بە مووسا دراوە ئایا ئەوان پێشتر بێ بڕوا نەبوون بەوەی درا بوو بە مووسا دەیانووت (قورئان و تەورات) دوو سیحرو جادوون پشتگیری یەکتر دەکەن و دەیانگوت بێگومان ئێمە بێ بڕواین بە هەموویان (قورئان و تەورات) (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ دەی ئێوە کتێبێك لە لایەن خواوە بێنن کە ئەو (کتێبە) ڕاست تر بێت لەو دووانە (قورئان و تەورات) من شوێنی دەکەوم ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن ئینجا ئەگەر بە گوێیان نەکردی (و وەلامیان نەدایتەوە) ﴿فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءَهُمْ﴾ ئەوە بزانە کە تەنها شوێن هەواو ئارەزووی خۆیان دەکەون و کێ لەو کەسە گومڕاترە کە شوێن ئارەزووی خۆی بکەوێت بێ ڕێنموونی لە لایەن خواوە بێگومان خوا ڕێنموونیی گەلی ستەمکار ناکات. ئایەتەکە باسی جوولەکەو گاورەکان، نامەدارەکان دەکات، ئەوان شوێنکەوتەی مووسا و عیسا _ علیهما السلام _ نین، بەڵکو ئەوان کافرن، لە شەریعەتی مووسا و لە شەریعەتی عیسا بەدەرن، تەماشاکەن خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِنْ لَمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءَهُمْ﴾ ئینجا ئەگەر بە گوێیان نەکردی (و وەلامیان نەدایتەوە) ئەوە بزانە

--------------------------------------------------------------------
--------------------------------------------------------------------
--------------------------------------------------------------------

که تەنها شوێن هەواو ئارەزووی خۆیان دەکەون، نەیفەرمووە ئەگەر بە گوێیان نەکردی ئەوا شوێنی شەریعەتەکانی پێشتر دەکەون، چونکە بە هاتنی ئیسلام شەریعەتەکانی تر لا بران و نەسخ بوونەوە، بۆیە تەنها شوێنی هەواو ئارەزووی خۆیان دەکەون، بزانە کە شەریعەتەکانی تر لا براون و نەسخ بوونەتەوەو لە هەمان کاتیشدا خەڵکیان هەواڵەی شوێنکەوتنی کۆتاهەمینی پێغەمبەران موحەممەد ﷺ کردۆتەوە، تەماشاکەن خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ لَمَا آتَيْتُكُمْ مِنْ كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مُصَدِّقٌ لِمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنْصُرُنَّهُ قَالَ أَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَى ذَلِكُمْ إِصْرِي قَالُوا أَقْرَرْنَا قَالَ فَاشْهَدُوا وَأَنَا مَعَكُمْ مِنَ الشَّاهِدِينَ (٨١) فَمَنْ تَوَلَّى بَعْدَ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ (٨٢) أَفَغَيْرَ دِينِ اللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ (٨٣)﴾[آل عمران: ٨١_٨٣] واتە: (بهێنەوە یادیان) کاتێک کە خوا پەیمانی وەرگرت لە پێغەمبەران کە هەر چیم دانێ لە نامەو حیکمەت (شەریعەت) لە پاشان پێغەمبەرێکتان بۆ هات بە بڕوا هێنەر بەو نامەی کە لە لاتانە دەبێ بڕوای پێ بهێنن و یارمەتی بدەن خوای گەورە فەرمووی ئایا دانتان نا بەم پەیمانەدا؟ و لە سەر ئەوە پەیمانی منتان وەرگرت پێغەمبەران گوتیان بەڵێ دانمان پیا ناو پەیمانمان بەست خوا فەرمووی کەواتە ئێوە بە شاهێد بن وە منیش لە گەڵ ئێوە یەکێکم لە شاهێدەکان جا ئەوەی پشتی هەڵکرد (لەم پەیمانە) دوای ئەم دان پیانانە کەواتە هەر ئەوانەن دەستەی دەرچوان لە فەرمان ئایا (بێ بڕوایان ) داوای غەیری دینی خوا دەکەن؟! لە کاتێکدا هەر چی لە ئاسمان و زەوی دایە فەرمانبەری خوان بیانەوێ (بە ویستی خۆیان) یا نەیانەوێ (بە ناچاری) وە هەموو هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنرێنەوە، خوای گەورە کاتێ دەفەرموێت: مەبەستی موحەممەدە ﷺ، کاتێ بە وردی دیقەتی ئەو ئایەتانە دەدەیت بۆت ڕوون دەبێتەوە

---

---

---

ئەوەی کە خوای گەورە باسی دەکات زۆر ڕوونەو ئاشکرایەو، هیچ سەرسوڕمانێك لەوەدا نییە کە جوولەکەو گاوران ئەو شتانە بڵێن، لەوەش سەختتر دەڵێن، بەڵام بە ڕاستی سەرسوڕمان لەوە دایە کەسانێك بانگەشەی ئیسلامەتی دەکەن، قسەکانی جوولەکەو گاور بە ڕاست دادەنێن و دەڵێن: ئەوان لەسەر ئایینێکن و کافر نین، دەڵێت: جوولەکەو گاورەکان کافر نین، باشە چۆن کافر نین لە کاتێکدا کوفر بە کۆتامەمینی پێغەمبەران موحەممەد ﷺ دەکەن، دەڵێت: نەخێر کافر نین، دڵنیا بن ئەوەی ئەم قسانە بڵێت: کافر دەبێ بە هاوشێوەی ئەوان، چونکە ئەوەی کافر بە کافر دانەنێت، بە هاوشێوەی کافرە، ئەوە ئیسلام بوون هەڵدەوشێنێتەوە.

لە ڕاستیدا دۆستانی خوا تەنها ئەوانەن کە خوای گەورە وەسفی کردوون بە دۆستایەتی خۆی و دەفەرموێت: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ اللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (٦٢) الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ﴾[1] [يونس: ٦٢ _ ٦٣] واتە: ئاگادار بن بێ گومان دۆستانی خوا ترسیان لەسەر نییە خەفەتیش ناخۆن ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و هەمیشە خۆیان دەپارێزن و لە خوا دەترسن.

لە ئیمان هێناندا پێویستە مرۆڤ ئیمانی بە خواو، فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی هەبێت[2]،

---

(١)_ خوای تعالی وەلی و دۆستانی دیاری کردووە، دۆستی خوای دیاریکردووە بەئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو، هەمیشە خۆیان دەپارێزن و لە خوای گەورە دەترسن، لە ڕووکارو لە دڵ و ناوەڕۆکیشەوە ئیمانیان هێناوە، ئەوانەی خۆیان دەپارێزن و لە خوای گەورە دەترسن ئەولیاو دۆستانی خوان، ئیماندارە لە خوا ترسەکان دۆستانی خوان، هەر کەسێکیش بەو شێوە نەبێت وەلی و دۆستی خوای گەورە نییە، بەڵکو دۆستی شەیتانە.

(٢)_ ئەمانە ئیمانیان بە پێغەمبەران نەهێنا، ئیمانیان بە کتێبەکان نەهێنا، بە قورئان و بەموحەممەد ﷺ کوفریان کرد، هەر کەسێك بە یەك کتێب کوفر بکات ئەوا بە هەموو کتێبەکان کوفری کردووە، و هەر کەسێکیش بە یەك پێغەمبەر کوفر بکات ئەوا بە هەموو پێغەمبەران کوفری کردووە، هەموو پێغەمبەران نێردراوی خوای گەورەن و پێویستە ئیمان بە هەر هەموویان بێنیت، لە یەکەم پێغەمبەرەوە تا کۆتاهەمینی پێغەمبەران، جولەکەکان بەدوو پێغەمبەر کوفریان کرد، بە موحەممەد و بە عیسا، گاورەکانیش بەموحەممەد ﷺ کوفریان کرد، ئیتر چۆن بگوترێت ئیماندارن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُولُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ إِلَىٰ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ

---

---

---

مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ﴾[البقرة: ١٣٦] واتە: بڵێن (ئەی موسڵمانینه) بڕوامانهێنا بەخوا و بەو قورئانەی کە بۆ خۆمان نێرراوەتە خوارەوە بەو نامەیەی کە نێرراوە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و کوڕەکانی یەعقوب و بەوەی کە دراوە بە مووسا و عیسا وە بەوەی کە دراوە بە هەموو پێغەمبەران لە لایەن پەروەردگاریانەوە جیاوازی ناکەین لە نێوان هیچ کامێکیان دا و ئێمە فەرمانبەری خواین. بەڵام ئەمانە جیاوازییان کردو، بە گەورەترینی پێغەمبەران و سەروەری پێغەمبەران موحەممەد ﷺ کوفریانکرد، ئیتر چۆن بگوترێت ئەوان ئیماندارن، کەسانێکیش هەن دەڵێن: ئەوان برامانن _ پەنا بە خوا_.

وە ئیمان بێنێت بە هەموو پێغەمبەرێك كە خوای گەورە ناردوویەتی، و هەموو كتێبێك كە خوای گەورە دایبەزاند بێ[1]، بە بەڵگەی ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُولُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ إِلَىٰ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ (١٣٦) فَإِنْ آمَنُوا بِمِثْلِ مَا آمَنتُم بِهِ فَقَدِ اهْتَدَوا وَّإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ (١٣٧)﴾[2] واتە: بڵێن (ئەی موسڵمانینە) بڕوامان هێنا بە خوا و بەو قورئانەی كە بۆ خۆمان نێرراوەتە خوارەوە و بەو نامەیەی كە نێرراوە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و كوڕەكانی یەعقوب و بەوەی كە دراوە بە مووساو عیسا و بەوەی كە دراوە بە هەموو پێغەمبەران لە لایەن پەروەردگاریانەوە جیاوازی ناكەین لە نێوان هیچ كامێكیاندا و ئێمە فەرمانبەری خواین ئینجا ئەگەر بڕوایان هێنا بەو وێنەیەی كە ئێوە بڕواتان پێ هێناوە ئەوا بێگومان ڕێی ڕاستیان دۆزی یەوە و ئەگەر پشتیان هەڵكرد ئەوا ئەوان لە دوو بەرەكیی دان و خوا ئاگاداریی تۆ ئەكات لەوان و هەر خوایە بیسەری زانا.

---

(١)_ پێویستە بە هەر هەموو ئەو كتێبانەی كە خوای گەورە دایبەزاندووە ئیمان بێنێت، ئەگەر بەیەك كتێب كوفری كرد، بەڵكو بە هەندێ بەش لە كتێبێكیان ئیمان بێنێ و، بەهەندێ بەشی تریان ئیمان نەهێنێ، ئەوا بەهەموو كتێبەكان كافر بووە. هەروەها پێویستە بە هەر هەموو پێغەمبەران ئیمان بێنێت، لە یەكەم پێغەمبەرەوە تا كۆتاهەمینی پێغەمبەران، ئیتر دەبێ باروحاڵی ئەو كەسە چۆن بێت كە بە چاكترینی پێغەمبەران موحەممەد ﷺ كوفردەكات، ئایا بەمە دەگوترێت ئیماندار؟.

(٢)_ خوای تعالی لەم ئایەتەدا دەفەرموێت: ﴿فَإِنْ آمَنُوا بِمِثْلِ مَا آمَنتُم بِهِ فَقَدِ اهْتَدَوا﴾ ئینجا ئەگەر بڕوایان هێنا بەو وێنەیەی كە ئێوە بڕواتان پێهێناوە ئەوا بێگومان ڕێی ڕاستیان دۆزیوەتەوە، كەوا بوو ئەگەر بڕوایان نەهێنا بەو شێوەیەی كە

ئێوه بڕواتان پێهێناوه، ئەوا بێگومان کافرن، چونکه بـه موسـڵمانان دەڵـێن: ﴿كُونُواْ هُودًا أَوْ نَصَارَى تَهْتَدُواْ﴾[البقرة ١٣٥]واته: ببن به جووله‌که یان گاور تا بکەونه سەر ڕێی ڕاست. بـەڵام خـوای گـەوره پێـی فـەرموون: ﴿قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾[البقرة: ١٣٥] واته: بڵێ: بەڵکو پەیڕەویی ئایینی پاکی ئیبراهیم دەکەین که له هاوبەش پەیدا کەران نەبووه. پاشان خوای گەوره دەفـەرموێت: ﴿فَإِنْ آمَنُوا بِمِثْلِ مَا آمَنتُم بِهِ فَقَدِ اهْتَدَوْا وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ﴾ ئینجا ئەگەر بڕوایان هێنا بەو وێنەیەی که ئێوه بڕواتان پێ هێناوه ئەوا بێگومان ڕێی ڕاستیان دۆزی یەوه ﴿وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ﴾ و ئەگەر پشتیان هەڵکرد ئـەوا ئـەوان لـه دوو بـەرەکی دان، لـه گـەڵ خـواو پێغەمبەرەکەیدا له دوو بەرەکیدان، ﴿فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ خوای گـەورە ئاگاداریی تۆ ئەکات لـەوان و هـەر خوایـه بیسـەری زانـا. نـازانم ئەمانـه چۆن قورئـان ناخوێننەوه کاتێ دەڵێن: جووله‌کەو گاورەکان ئیمانـدارن، بـرای ئێمـەن، نـازانم چۆن قورئان ناخوێننەوه.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ (٢٨٥) لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنْتَ مَوْلاَنَا فَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ (٢٨٦)﴾[1] واتە: پێغەمبەر بڕوای هێنا بەو نامەیەی کە بۆی نێرراوە لە پەروەردگاریەوە لەگەڵ بڕواداراندا هەموو بڕوایان هێناوە بە خوا وفریشتەکانی و نامەکانی و پەیامبەرانی جیاوازی ناکەین لە نێوان هیچ یەکێك لە پەیامبەرانی (بڕوا دارەکان) گوتیان: (پێغەمبەر ئاییینی خوای پێگەیاندوین ئێمەش) بیستمان فەرمانبەرییمان کرد داوای لێخۆشبوونت لێدەکەین ئەی پەروەردگارمان و هەر بۆ لای تۆیە گەڕانەوە خوا داوا لە هیچ کەسێك ناکات مەگەر بە ئەندازەی توانای خۆی (سوودی) بۆ خۆی هەیە هەر چاکەیەك بکات (با هەر بەدڵیش بێت) و (زیانی) بۆ خۆیەتی هەر خراپەیەك بکات (بە عەمدی و ئەندامی لەش) ئەی پەروەردگارمان لێمان مەگرە ئەگەر کردەوەیەکی پێویستمان لە بیرچوو یا بە هەڵە گوناهێکمان کرد ئەی پەروەردگار لەسەرمان دامەنێ باری قورس وەك داتناوە لە سەر ئەوانەی پێش ئێمە ئەی پەروەردگارمان بەلای وامان بەسەردا مەدە کە بۆمان هەڵنەگیرێت وە گوناهەکانمان بسڕەوە وە لێمان خۆشبە و میهرەبانیمان لەگەڵ دا بکە تۆی یاریدەدەرو کارسازمان کەواتە: سەرمان بخە بەسەر گەلی بێ بڕواياندا.

---

(١)_ ئەم ئایەتانە لە سورەتی ئەلبەقەرەدایە، هەر لەم سورەتەدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ﴾[البقرة: ١٧٧] واتە: چاکە ئەوە نییە کە ڕوو بکەنە بەرەو ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا بەڵکو چاکە ئەوەیە کە مرۆڤ بڕوای ببێ بەخوا

---------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------
-------------------------------------------------------

و فریشتەکان و کتێبەکان و پێغەمبەران. لە سەرەتای سورەتەکەش دا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ (٢) الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ (٣) والَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ وَبِالآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ (٤) أُوْلَئِكَ عَلَى هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (٥)﴾[البقرة:٢_٥] واتە: ئەم قورئانە هیچ گومانێکی تێدا نییە ڕێ نیشاندەرە بۆ پارێزکاران ئەوانەی کە بڕوا دەهێنن بە شتە پەنهان و نادیارەکان و نوێژ دەکەن لەوەی کردومانە بە ڕۆزی یان دەبەخشن (لە بەر خوا) و ئەوانەی کە بڕوا دەهێنن بەو قورئانەی کە بۆ تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ) نێرراوە ﴿وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ﴾ و بەو کتێبانەی کە بۆ نێراوانی پێش تۆ نێرراونەتە خوارەوە و بڕوایان هەیە بە ڕۆژی دوایی ئەوانە لەسەر ڕێی ڕاستن لە لایەن پەروەردگاریانەوە و هەر ئەوانن ڕزگارن. ئەوە بەسنییە بڵێی: من تەنها ئیمانم بە موحەممەد هێناوەو، پەیوەندیم بە پێغەمبەرانی پێشترەوە نییە، یاخود بڵێی: ئیمانم بە پێغەمبەرانی پێشتر هێناوەو، پەیوەندیم بە موحەممەدەوە نییە، نەخێر پێویستە ئیمانت بە هەر هەموویان هەبێ.

له سەرەتای سورەتەکەشدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الم (١) ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ (٢) الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ (٣) والَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ وَبِالآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ (٤) أُوْلَئِكَ عَلَى هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (٥)﴾[البقرة: ٢_٥] واتە: ﴿الم﴾ بە ئەلف لام میم دەخوێندرێتەوە ئەم قورئانە هیچ گومانێکی تێدا نییە ڕێنیشاندەرە بۆ پارێزکاران ئەوانەی کە بڕوا دەهێنن بەشتە پەنهان و نادیارەکان وە نوێژ دەکەن لەوەی کردومانە بە ڕۆزییان دەبەخشن (لە بەر خوا) و ئەوانەی کە بڕوا دەهێنن بەو قورئانەی کە بۆ تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ) نێرراوە و بەو کتێبانەی کە بۆ نێراوانی پێش تۆ نێرراونەتە خوارەوە و بڕوایان هەیە بە ڕۆژی دوایی﴿أُوْلَئِكَ عَلَى هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ﴾ ئەوانە لە سەر ڕێی ڕاستن لە لایەن پەروەردگاریانەوە و هەر ئەوانن ڕزگارن.

لە بواری ئیمان هێناندا دەبێ باوەڕت بەوە هەبێ کە موحەممەد ﷺ کۆتاهەمینی پێغەمبەرانەو هیچ پێغەمبەرێکی تری بە دوادا نایەت[1]

---

(١)_ پێویستە باوەڕت بە گشتێتی پەیامەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەبێ کە بۆ هەموو مرۆڤایەتیەو، هەروەها دەبێ باوەڕیشت هەبێ کە کۆتاهەمینی پێغەمبەرانەو هیچ پێغەمبەرێکی تری بە دوادا نایەت.

خوای گەورە بۆ هەموو جین و ئینسی ناردووە، بۆیە هەر کەسێك باوەڕی بە هەموو ئەوانە نەبێ کە بۆی دابەزیووە ئیماندار نییەو، چجا یەکێك بێت لە وەلی و دۆستە لە خوانرسەکانی خوای گەورە[1] و هەر کەسێك باوەڕ بە هەندێك لەوانەی بۆی دابەزیوە بێنێ و بە هەندێکی تری کوفر بکات، ئەو کەسە کافرەو ئیماندار نییە[2]

---

(۱)_ هەر کەسێك ئیمان بەم پێغەمبەرە ﷺ و بەوەی بۆ دابەزیوە نەهێنێ ئیماندار نییە، واتە: کافرە، باشە ئەگەر کافر بێت چۆن بە دۆستی خوای گەورە دەبێ، ئەمە شتێکی مەحاڵە، کافران دۆستی خوای گەورە نین، لە ڕاستیدا تەنها دۆستی شەیتانن، بۆیە دەبێ ئاگاداری ئەم شتە بین، ئایەتەکانی قورئان لەم بارەوە ڕوون و ئاشکران، بەڵام بە لای کەسانێکی بێشوماری ئەمڕۆوە نادیارو نەزانراوە، بە تایبەت بەلای زۆرێك لەو کەسانەوە کە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ڕۆشنبیرن و ڕۆژنامەوانن وە...وە...، کەچی ئەم شتەیان بەلاوە نادیارو نەزانراوە، بۆیە داوای نزیك بوونەوە لەگەڵ جوولەکەو گاورەکاندا دەکەن، لە کاتێکدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَن تَرْضَى عَنكَ الْيَهُودُ وَلاَ النَّصَارَى حَتَّى تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ﴾[ البقرة: ۱۲۰ ] واتە هەرگیز نە جوولەکەو نە گاور لێت ڕازی نابن تا دوای ئایینیان نەکەویت. ئەم کەسە بە ناو موسڵمانانە دەیانەوێ ڕازیان بکەون و خۆشرەفتاریان لەگەڵدا بکەن، بەڵام دڵنیا بن ئەوان هەرگیز لە ئێمە ڕازی نابن تاوەکو واز لە ئایینەکەی خۆمان نەهێنین و دوای ئایینەکەی ئەوان نەکەوین.

(۲)_ هەروەها دەبێ مرۆڤ باوەڕ بە هەموو ئەو کتێبانە بێنێت کە خوای گەورە بۆ پێغەمبەرانی خۆی دایبەزاندووە، نەك باوەڕ بەژمارەیەك لەو کتێبانە بێنێ و، کوفر بەژمارەیەکی تری بکات، هەروەها دەبێ مرۆڤ باوەڕی بە هەر هەموو کتێبەکە هەبێ، نەك باوەڕی بەهەندێك لەحوکمی کتێبەکە هەبێ و، باوەڕی بە هەندێکی تری حوکمی کتێبەکە نەبێ، وەکو ئەوەی باوەڕ بە هەندێ حوکمی کتێبەکە بێنێ کە لەگەڵ هەواو

ئارەزوویدا ڕێکدەکەوێ و، باوەڕ بە هەندێ حوکمی کتێبەکە ناهێنێ کە لەگەڵ هەواو ئارەزوواتی نەفسیدا ڕێك ناکەوێ، خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ فَمَا جَزَاءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْيٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰ أَشَدِّ الْعَذَابِ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾[البقرة: ٨٥] واتە: جا ئێوە بڕوا دەهێنن بە هەندێك لە تەورات، و بێ بڕوا دەبن بە هەندێکی تری جا تۆڵەی ئەو کەسانە کەوا بکەن لە ئێوە هەر ڕیسوایی و بەد ناوی یە لە ژیانی دونیادا وە لە ڕۆژی دوایشدا دەگەڕێنرێنەوە بۆ ناو سەخت ترین سزا و خوا بێ ئاگا نییە لەوەی کە دەیکەن. دەبێ بڕوات هەبێ بەهەر هەموو کتێبەکە، ئەوەی لەگەڵ هەواو ئارەزووتدا دەگونجێت و، ئەوەی لەگەڵیدا ناگونجێت، چونکە ئەگەرچی لەگەڵ هەواو ئارەزووی نەفسیشتدا نەگونجێت بەلاّم چاکترین خەیری بۆ تۆ تێدایە، خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿وَعَسَىٰ أَن تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰ أَن تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾[البقرة: ٢١٦ ] واتە: و ئەگونجێ شتێکتان پێ ناخۆش بێت و باش بێ بۆتان و ئەگونجێ شتێکتان پێ خۆشبێت وخراپ بێ بۆتان وە خوا (چاك و خراپی ئێوە) ئەزانێ و ئێوە نایزانن.

خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيُرِيدُونَ أَنْ يُفَرِّقُوا بَيْنَ اللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَنْ يَتَّخِذُوا بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلًا (١٥٠) أُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقًّا وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُهِينًا (١٥١)﴾[1]

---

(١)_ خوای گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرموێت: ﴿أُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقًّا﴾ ئا ئەوانە بەڕاستی بێ باوەڕی تەواون، چونکە دەیانگوت: بە هەندێ لەکتێبەکە باوەڕ دێنین و، باوەڕ بە هەندێکی ناهێنین، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيُرِيدُونَ أَنْ يُفَرِّقُوا بَيْنَ اللَّهِ وَرُسُلِهِ﴾ و دەیانەوێ جیاوازی بخەنە نێوان خواو پێغەمبەرەکانی، باشە بەچ جۆرێك دەیانەوێ ئەو جیاوازیە دروست بکەن؟ بەو جۆرەی کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ﴾ و دەڵێن باوەڕ بە هەندێك لە پێغەمبەران دەهێنین وە باوەڕ بە هەندێکی تریان ناهێنین، ئا ئەمەیە جیاوازی کردن لە نێوان خواو پێغەمبەرەکانیدا ﴿وَيُرِيدُونَ أَنْ يَتَّخِذُوا بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلًا﴾ لەو نێوانەدا ڕێگەیەك بدەنە بەرو، ڕێباوەڕێك بۆی بچن ﴿أُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقًّا وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُهِينًا﴾ ئائەوانە بە ڕاستی بێ باوەڕی تەواون وە ئامادەمان کردووە بۆ بێباوەڕان سزایەکی ڕیسواکەر، ئەوانەی باوەڕ بە موحەممەد ﷺ ناکەن کافری تەواون.

وَالَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ وَلَمْ يُفَرِّقُوا بَيْنَ أَحَدٍ مِنْهُمْ أُولَئِكَ سَوْفَ يُؤْتِيهِمْ أُجُورَهُمْ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا (١٥٢)﴾[1] [النساء: ١٥٠_١٥٢] واتە: بە ڕاستی ئەوانەی بێ باوەڕن بە خواو پێغەمبەرەکانی و دەیانەوێ جیاوازی بخەنە نێوان خواو پێغەمبەرەکانی و دەڵێن باوەڕ بە هەندێك (لە پێغەمبەران) دەهێنین و باوەڕ ناهێنین بە هەندێکی تریان و دەیانەوێ لەو نێوانەدا ڕێگەیەك بدەنە بەر ئا ئەوانە بەڕاستی بێ باوەڕ تەواون ﴿وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ﴾ و ئامادەمان کردووە بۆ بێباوەڕان سزایەکی ڕیسواکەر و ئەوانەی بڕوایان هێناوە بە خواو پێغەمبەرەکانی و هیچ جیاوازی یەکیان نەخستە نێوان هیچ کام لەو پێغەمبەرانە ئا ئەوانە لە داهاتوودا خودا پاداشتیان دەداتەوە و خوا هەمیش لێبوردەی میهرەبانە.

---

(١)_ بەڵام کەسانێکی بێشوماریش جیاوازیان لە نێواندا ناکەن و، ئیمان بەهەر هەموویان دێنن، چونکە هەر هەموویان پێغەمبەری خوان _ علیهم الصلاه والسلام _ ڕێگەی هەر هەموویان یەکەو، هەر یەکێکیان بەڕاست دانەری ئەوەی پێشی خۆیەتی و، مژدە دەدات بە هاتنی پێغەمبەرێکی دیکە لەپاشخۆی، هەموویان یەك زنجیرەن، بۆیە پێویستە جیاوازی لە نێوانیاندا نەکرێت، بەوەی کە باوەڕ بە هەندێکیان بکرێ و، بە هەندێکی تریان کوفر بکرێت.

له چوار چێوەی باوەڕهێناندا بە پێغەمبەری خوا ﷺ: پێویستە باوەڕت بەوە هەبێ کە واسیتەو میانگیری کارە لە نێوان خواو مەخلوقاتیدا، کە فەرمان و قەدەغەکاریەکان[1]،

---

(١)_ پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان خواو لە نێوان مەخلوقاتیدا واسیتەو میانگیری کارە، بۆ چ شتێك؟ بۆ جێبەجێکردنی پێداویستیەکان و، ڕەوانەوەی ناڕەحەتیەکان؟ نەخێر، بۆ پێ ڕاگەیاندنی پەیامەکەی، واسیتەو میانگیری کاری نێوان خواو نێوان مەخلوقاتێتی بۆ ئەوەی پەیامی خوایان پێڕاگەیەنێت، بەڵام بۆ ئەوەی واسیتەو میانگیری کاری نێوان خواو مەخلوقاتی بێت بۆ جێبەجێکردنی پێداویستیەکان، ئەم بۆچونە کوفرە، پێشەوا ئیبنوتەیمیە کتێبێکی لەم بارەوە نوسیوە بەناوی ((الواسطة بين الحق والخلق))، لەو کتێبەدا دەڵێت: واسیتەو میانگیری کاریەك هەیە هەر کەسێك نکۆڵی لێبکات کوفری کردووە، واسیتەو میانگیری کاریەکیش هەیە هەر کەسێك جێگیری بکات و دانی پێدا بنێت کوفری کردووە، باشە کامانەن؟ ئەو واسیتەو میانگیری کاریەی کە هەر کەسێك نکۆڵی لێبکات کوفریکردووە، واسیتەیی و میانگیرێتیە بۆ پێڕاگەیاندنی پەیامەکەی، پێغەمبەران واسیتەو میانگیری کاری نێوان خوای گەورەو مەخلوقاتەکانین بۆ ئەوی پەیامەکەی خوایان پێڕاگەیەنن، لەڕێگەی ئەوانەوە نەبێ هیچ کەسێك ناتوانێ بە خوای گەورە بگات، هەر کەس نکۆڵی لەمە بکات کافر دەبێ، سەرانی صوفیە توندڕەوەکان نکۆڵیان کردو وتیان: هیچ پێویستیەکمان بە پێغەمبەران نییە، ئێمە ڕاستەوخۆ لەخوای گەورەوە وەردەگرین، کەسانێکیان گوتویانە: من لەگەڵ خوادا دادەنیشم و، لەگەڵم دا قسە دەکات. بەڵام ئەو واسیتەو میانگیری کاریەی کە بەکاری دێنن بۆ جێبەجێکردنی پێداویستیەکان و، ڕەوانەوەی ناڕەحەتیەکان هەر کەس جێگیری بکات و دانی پێدا بنێت کافر دەبێ، دڵنیا بن هیچ واسیتەو میانگیری کاریەك لە نێوان خواو مەخلوقاتیدا نییە بۆ ئەوەی پێداویستیەکانیان بۆ جێبەجێ بکات و، نزاکانیان قبوڵ بکات و، فریای ناڕەحەتیەکانیان بکەوێت.

پەیمان و هەڕەشەکان، حەڵاڵ و حەرامەکانی[١] خوای گەورەیان پێ دەگەیەنێت.

---

(١)_ ئەم ئایینە گەورەیەمان پێ نەگەیشتووە تەنها لە ڕێگای ئەم پێغەمبەرەوە ﷺ نەبێ، پێش ئەم پێغەمبەرە ﷺ خەڵك لە گومڕاییەكی ئاشكرا دا بوون، خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولًا مِنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ﴾[الجمعة: ٢] ﴿هُوَ الَّذِي﴾ خوا ئەوەیە ﴿بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ﴾ كە ناردویەتی لە ناو نەخوێندەواراندا ﴿رَسُولًا مِنْهُمْ﴾ پێغەمبەرێك لەخۆیان ﴿يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ﴾ دەخوێنێتەوە بەسەریاندا نیشانەكانی خوا ﴿وَيُزَكِّيهِمْ﴾ پاكیاندەكاتەوە ﴿وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ﴾ و قورئان و فەرمودەی (پڕسوود)یان فێر دەكات ﴿وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلُ﴾ هەرچەند ئەوان لەپێشدا ﴿لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ﴾ لە گومڕاییەكی ئاشكرا دا بوون. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت ﴿لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِنْ أَنْفُسِهِمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ﴾[آل عمران: ١٦٤] واتە ﴿لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ﴾ سوێند بێ بێگومان خوا چاكەو منەتی نا ﴿عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾ بەسەر بڕواداراندا ﴿إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ﴾ كاتێ كە ڕەوانەی كرد لە ناویاندا ﴿رَسُولًا﴾ پێغەمبەرو نێرراوێك ﴿مِنْ أَنْفُسِهِمْ﴾ لە خۆیان ﴿يَتْلُو عَلَيْهِمْ﴾ كە دەیخوێنێتەوە بەسەریاندا ﴿آيَاتِهِ﴾ بەڵگەكانی ﴿وَيُزَكِّيهِمْ﴾ پاك و خاوێنیان دەكاتەوە ﴿وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ﴾ و قورئان و فەرموودەیان فێر دەكات ﴿وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلُ﴾ هەرچەند ئەوان لە پێشدا ﴿لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ﴾ لە گومڕاییەكی ڕوون و ئاشكرا دا بوون. پێشتر لە نەفامیدا دەژیان، لە گومڕاییەكی ئاشكرا دا بوون، بەڵام كاتێ ئەم پێغەمبەرە ﷺ نێردرا ڕێنموونیی هات، نورو ڕووناكی و زانستی بە سوود هات، ئەو كەسانە سوودیان لێ بینی كە ئیمانیان پێ هێنا، بەوەش لە تاریكستانیەوە بەرەو ڕووناكی و نوور دەرچوون.

حەلاڵیش: بریتیە لەوەی کە خواو پێغەمبەرەکەی حەلاڵیان کردوەو، حەرامیش: بریتیە لەوەی کە خواو پێغەمبەرەکەی حەرامیان کردووە[1]،

---

(١)_ وریای ئەمە بن، حەلاڵ ئەوەیە کە خواو پێغەمبەرەکەی حەلاڵیان کردوەو، حەرامیش ئەوەیە کە خواو پێغەمبەرەکەی حەرامیان کردووە، بۆ هیچ کەسێك نییە خۆ ویستانەو هەر لە خۆوە شتێك بە حەلاڵ دابنێ و، شتێك بە حەرام دابنێ، خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ بْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُوا إِلاَّ لِيَعْبُدُوا إِلَهًا وَاحِدًا لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾[التوبة: ٣١] واتە: زاناو عابیدەکانیان کردووە بە پەروەردگار لە جیاتی خوا هەروەها مەسیحی کوڕی مەریەمیش(یان کردوە بەخوا) لە کاتێکدا فەرمانیان پێنەدراوە بێجگە لەوەی کە یەك خوا بپەرستن کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە بێجگە لە ئەو پاك و بێگەردی بۆ ئەو (خوا) لەوەی دەیکەنە هاوبەشی. عەدی کوڕی حاتەم لەسەر ئایینی گاور بوو، پێش ئەوەی موسڵمان بێت، کاتێ گوێبیستی ئەم ئایەتە بوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە نایانپەرستین، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: ئایا ئەوان حەرام کراوەکان بە حەلاڵ دانانێن و ئێوەش بەحەلاڵیان دادەنێن، عەدی گوتی: بەڵێ، پێی فەرموو: ئایا حەلاڵکراوەکانیش بەحەرام دانانێن و ئێوەش بە حەرامیان دادەنێن، عەدی گوتی: بەڵێ، فەرمووی: ئا ئەوە پەرستنیانە. واتە: گوێڕایەڵیکردنیان لە حەلاڵ کردن و حەرام کردنداو گوێڕایەڵی نەکردنی خوای گەورە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾[الأنعام: ١٢١] واتە: و بێگومان شەیتانەکان بە نهێنی شت بە دۆستەکانیان دەڵێن بۆ ئەوەی موجادەلەو دەمەدەمێتان لە گەڵ بکەن جا ئەگەر بە گوێیان بکەن ئەوە بێگومان لە هاوبەشدانەران دەبن. باشە ئەم ئایەتە سەبارەت بەچ شتێکە؟ سەبارەت بە ئاژەڵی مردارەوە بووە، چونکە خەڵکانی سەردەمی نەفامی ئاژەڵە مردارەوە بووەکانیان بە

حەڵاڵ دادەناو، دەیانگوت: لە ئاژەڵی سەربڕاو باشترە، چونکە ئاژەڵی مردارەوە بوو خوای گەورە سەری بڕیوە، بەڵام ئاژەڵی سەر بڕاو ئێوەن سەری دەبڕن، بۆیە مردارەوە بوو لەسەر بڕاو باشترە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ﴾ واتە: شەیتانەکان بەنهێنی ئەو گومان و شوبهانە بە دۆستەکانیان دەڵێن ﴿لِيُجَادِلُوكُمْ﴾ بۆ ئەوەی موجادەلەو دەمە دەمێتان لە گەڵ بکەن ﴿وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾ جا ئەگەر بەگوێیان بکەن ئەوە بێگومان لە هاوبەشدانەران دەبن، بۆیە هەر کەسێك گوێڕایەڵی کەسێکی تر بێت لە حەڵاڵ کردنی ئەوانەدا کە خوای گەورە حەرامی کردوون، بە دڵنیایی بە موشریك و هاوبەشدانەر دەبێ، چونکە لە بواری حەڵاڵ کردن و حەرام کردندا هاوبەشێکی بۆ خوای گەورە داناوە، کەچی ئەم شتە تەنها هەقی خوایە.

ئێستا کەسانێك هەن دەڵێن: لەبەر ئەوەی مەسەلەکە لە نێوان زانایاندا خیلاف و جیاوازی تێدایە، ئێمە بۆچونی ئەو زانایانە وەر دەگرین کە لەگەڵ ویستی ئێمەدا دەگونجێ، ئەم شتە فراوانی تێدایە، بەڵام دڵنیا بن ئەمە گومڕاییە _ پەنا بە خوا _، گوفتارو بۆچونی هیچ زانایەك وەرناگرین مەگەر ڕێکەوتی بەڵگەکان بێت، ئەو گوفتارو بۆچونانە وەردەگرین کە سازیارو ڕێکەوتی بەڵگەکانە، ئەوەشی کە پێچەوانەی بەڵگەکانە پشتگوێی دەخەین. ئیمامی شافیعی _ ڕەحمەتی خوا لێ بێت _ فەرموویەتی: هەر کات گوفتارو بۆچونەکانم پێچەوانەی گوفتاری پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، ئەوا گوفتارو بۆچونەکانم بە پانتایی دیواردا بدەن، ئیمامی مالیك فەرموویەتی: هەموومان لە گوفتارو بۆچونمان وەردەگیرێت و ڕەت دەکرێتەوە جگە لە خاوەنی ئەم گۆڕە، مەبەستی پێغەمبەری خوایە ﷺ، ئیمامی ئەحمەد فەرموویەتی: لە کەسانێك سەرم سوڕدەمێنێ کە ئیسنادو (صحیح)یەکەی دەزانن، بەڵام ڕاو بۆچونی ئەبی سوفیان وەردەگرن، خوای گەورە دەفەرموێت:

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

﴿فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾[النور: ٦٣] واتە: جا بابترسن ئەوانەی کە پێچەوانەی فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەن کە (لە دنیادا) بەڵاو تاقیکردنەوەیەکیان تووش ببیّ یا سزایەکی سەختیان تووش ببیّ (لە دوا ڕۆژدا). شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب _ ڕەحمەتی خوا لیّ بێت _ بەشێکی لە کتێبی توحید ناوناوە بە: هەر کەس گوێڕایەڵی زانایان و کار بە دەستان بێت لە حەڵاڵ کردنی ئەوانەدا کە خوای گەورە حەڕامی کردوون و، لە حەڕام کردنی ئەوانەدا کە خوای گەورە حەڵاڵی کردوون، بێگومان کردونی بە پەروەردگار لە جیاتی خوا.

دڵنیا بن مەسەلەکە زۆر ترسناکە، بەڵیّ گوفتارو بۆچونی زانایان بەسوودن، بەڵام بەپێی ویستی خۆمان وەریان ناگرین و، بڵێین: زانست دەریایەکی فراوانەو، ئەوەی سازیارو ڕێکەوتی ویستمان بێت وەریگرین، نەخێر، ئێمە گوفتارو بۆچونی ئەو زانایانە وەردەگرین کە لەگەڵ بەڵگەکانی قورئان و سوونەتەکانی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەگونجێن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا﴾[النساء: ٥٩] واتە: جا ئەگەر دووبەرەکیتان هەبوو لە شتێکدا ئەوە بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ئێوە باوەڕتان هەیە بە خوا و بە ڕۆژی دوایی ئەوە باشترە و ئاکام و ئەنجام چاکترە.

ڕێگەو ڕێبازی خوای گەورە ئاشکرایەو شاراوە نییە، بەڵام لە کوێن ئەوانەی لە قورئان شارەزا دەبن و، بۆ قورئان و سوونەت دەگەڕێنەوە. نەك ئەوەی زانایان بە حەڵاڵی دادەنێن و، بە حەڕامی دادەنێن بەبیّ هیچ بەڵگەیەك، ئەگەرچی ئەوان زاناش بن گوفتارو بۆچونەکانیان بەبیّ بەڵگە وەرناگرین، چونکە زانایان موجتەهیدن و لەسەر ئیجتهادەکانیان پاداشت دەدرێنەوە ئەگەر نەشیان پێکا بێت، بەڵام ئێمە بەهانەکانمان وەرناگیرێت ئەگەر گوفتارێکی پێچەوانەی بەڵگەکان وەرگرین، یان فەتوایەکی پێچەوانەی بەڵگەکان وەرگرین.

دینیش: بریتیە لەوەی کە خواو پێغەمبەرکەی داینـاوەو بڕیاریـان لەسـەر داوە[١]، هەر کەسێك باوەڕی وابێت کە یەکێك لە وەلی و دۆستانی خوا ڕێگەیەکی دیکەیان هەیە بۆ گەیشـتن بـەخوای گـەورە، بـە بـێ شـوێنکەوتنی موحەممـەد ﷺ ئـەوە کـافرەو لە دۆستانی شەیتانە[٢].

---

(١)_ ئەمە بەر پەرچدانەوەی بیدعەچیانە، ئەوانەی دەڵێن: ئێمە خۆمان لە خوا نزیك دەکەینەوە، مەبەستمان پەرستن و گوێڕایەڵیکردنە، بۆیە هیچ شتێك نابێتە ڕێگر بۆ ئەوەی خۆمان لە خوا نزیك بکەینەوە، بە هەر شێوە پەرستنێك کـە بـە خەیاڵماندا بێت، ئێمە دەڵێین: نەخێر، ئەمە جایز نییە، ئایین لەسەر پـەیڕەوکردن و شـوێنکەوتن بونیـادنراوە، تەوقیفیـە، هـیچ تازەگەریـەکی تێـداناکرێت، قالَ رسولُ اللّه ﷺ ((مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا ما لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ)) واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەسـێك لـەم کارەمانـدا شـتێك دابهـێنێ کـە تیایـدا نـەبێ بەسـەر خاوەنەکەیدا ڕەتکراوەتـەوە))، وفي رواية أخرى ((مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ)) واتـە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەس کردەوەیەك ئـەنجام بـدات و فـەرمانی ئێمـەی لەسـەر نـەبێ ئـەوا بەسـەر خاوەنەکەیدا ڕەتکراوەتـەوە))، ئـایین بریتیـە لەو شەرعەی کە خوای گەورە دایناوە، نەك ئەوەی کە بەبۆچون و پەسەندکردنی خەڵك و بەبێ هیچ بەڵگەیە دانراوە.

(٢)_ ئەمە گوفتاری سەرانی صۆفیە توندڕەوەکان بوو، ئەوانەی دەیانگوت: ئێمە هیچ پێویستیەکمان بە پێغەمبەران یان بە موحەممەد ﷺ نییە، چونکە ئێمە بە خوا گەیشتین و، هەق لە خواوە فێر دەبین، ڕاستەوخۆ لـە خـواوە وەردەگرین، کەچی لە ڕاسـتیدا تـەنها لـە شـەیتانەوە وەردەگـرن و هیچـی تـر، نـەك لـە خـوای گـەورەوە، بانگەشەی ئەوە دەکەن کـە لەگەڵیدا دادەنیشـن و لەگەڵیـدا قسـە دەکـەن، بێگومان ئەوەی لەگەڵیدا دادەنیشن و قسە دەکەن شەیتانە _خوای گەورە بمانپارێزێت_.

بەلام خولقاندنی مەخلوقات و ڕۆزی دانیان و وەلامدانەوەو بەجێهێنانی دوعاو نزاکانیان و هیدایەتدانی دڵیان و(١)، سەرخستنیان بەسەر دوژمنانیانداو، شتی دیکەی جگە لەوانەش لە بواری بە دەست هێنانی سوودەکان و دور خستنەوەی زیانەکاندا، تەنها بۆ خوای تاك و بێهاوەڵە، ئەو شتانە جێ دەهێنێ بەو هۆکارو ئەسبابانەی کە پێستی دەکات(٢)، واسیتەو میانگیری پێغەمبەران هیچ پەیوەندیەکی بە مانەوە نییە.

---

(١)_ ئەمە هەقی خوای گەورەیەو، واسیتەو میانگیری پێغەمبەرانی تێدا نییە، واسیتەو میانگیری پێغەمبەران لەم بوارەدا ڕەفزە، شێخولئیسلام _ڕەحمەتی خوا لێ بێت_ کاتێ باسی واسیتەو میانگیری ڕاست و دروستی پێغەمبەرانی کرد بۆ ڕاگەیاندنی شەرعی خوای گەورە، ئینجا دێتە سەر باس کردنی ئەو کارانەی کە واسیتەو میانگیری پێغەمبەرانی تێدا نییەو ڕەفزە، بە تەنها هەقی خوای گەورەیە.

(٢)_ خوای تعالی هەموو ئەو شتانە بەجێدێنێ، بە بێ واسیتەو میانگیرێتی پێغەمبەران، چونکە واسیتەو میانگیرێتی پێغەمبەران لێرەدا ڕەفزە، ئەو شتانە بەتەنها مافی خوای گەورەیە، بۆیە بەکارهێنانی واسیتەو میانگیری کار لە نێوان بەندەو خوای گەورەدا بۆ بە جێهێنانی پێداویستیەکان و، لا بردن و ڕەوانەوەی نارەحەتیەکان و وەلام دانەوەی نزاکان و داواکردنی ڕۆزی، یان کەسێك ڕۆزیت بدات جگە لەخوای گەورە ئەمە ڕەفزەو پووچە، وەسیلەیەکی پووچە. ئەمە واسیتەو میانگیر دانانێکی قەدەغە کراوە، واتە لەو بوارانەدا دروست نییە پێغەمبەران بکرێن بەواسیتەو میانگیری کار لە نێوان بەندەو خوای گەورەدا، هەر کەس جێگیری بکات و باوەڕی پێ بێت کوفری کردووە.

## پێویستێتی باوەڕ هێنان بەهەموو ئەوەی کە بۆ پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ دابەزیوەو کوفرکردنی ئەو کەسەی سەرپێچی لێدەکات

ئەگەر پیاو لە زوهدو پەرستن و زانستدا بگات بە لووتکە، بەڵام باوەڕ بە هەموو ئەوانە نەهێنێ کە بۆ موحەممەد ﷺ دابەزیوە، باوەڕدار نییەو دۆستی خوای گەورەش نییە(١)،

---

(١)_ ئەگەر مرۆڤ لە ئەنجام دانی پەرستنەکان و، نوێژو ڕۆژو و خێرو صەدەقە کردندا هەوڵ بدات و درێغی نەکات، بەڵام ئیمان بەهەر هەموو ئەوانە نەهێنێ کە بۆ موحەممەد ﷺ دابەزیوە، بێگومان ئیماندار نییەو کردەوەکانی پووچە، عیبرەت بەزۆری ئەنجامدانی کردەوە نییە، بەڵکو عیبرەت بە شوێنکەوتن و پەیڕەوکردنە، عیبرەت بە زۆری ئەنجام دانی کردەوەو پەرستن و ماندوو بوون نییە، خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾[الملك: ٢] واتە: ئەوەی کە مردن و ژیانی داهێناوە تا تاقیتان بکاتەوە کە کردەوەی کامتان چاکترە. خوای تعالى لەم ئایەتەدا دەفەرموێت: تا تاقیتان بکاتەوە کە کردەوەی کامتان چاکترە، نەیفەرمووە: کە کردەوەی کامتان زۆرترە، دڵنیابن عیبرەت بە زۆری نییە، عیبرەت بە چاکێتیە. باشە چ کاتێك کردەوەو پەرستنەکان چاك دەبن؟ ئەگەر دوو مەرجی سەرەکی تێدا بوو، یەکەم: بە دڵسۆزی و بە تەنها بۆ خوای گەورەبێت (الإخلاص لله)، دووەمیش: شوێنکەوتن و پەیڕەوکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ (المتابعة للرسول)، ئائەمەیە کردەوەو پەرستنی چاك، بەڵام ئەگەر هەر کردەوەیەك یەکێك لەم مەرجانەی تێدا نەبوو، بێگومان کردەوەیەکی ناشیرینە و چاك نییە، با مرۆڤ خۆی لە ئەنجام دانیدا ماندوو بکات و هەموو کاتەکانی خۆی تێدا بەسەر بەرێت، لای خوای گەورە هیچ سودێکی پێ ناگەیەنێت.

وەکو حیبرو ڕاهیبەکان لە زاناکانی جوولەکەو گاور و عابیدەکانیان[١]، هەروەها ئەوانەی سەر بەزانست و پەرستنن لە کۆمەڵانی موشریك و هاوڵپەرستان: هاوڵپەرستەکانی عەرەب و تورك و هیندو کەسانی دیکەی غەیری ئەوانیش وەکو دانایانی هیندو تورك[٢] کە زانست یان زوهدو پەرستنیان لە ئایینەکەی خۆیاندا هەیە، بەڵام بڕوادار نین بە هەر هەموو ئەوەی کە بۆ موحەممەد ﷺ دابەزیوە، بۆیە ئەوان کافرن، دوژمنی خوان[٣]،

---

(١)_ جوولەکەو گاورەکان حیبرو ڕاهیبی زانایان تێدایە لە عیبادەت و پەرستندا درێغی ناکەن و لە دێرو کڵێساکاندا گۆشەگیر دەبن، لە دونیا واز دەهێنن و ژن ناهێنن، خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا﴾[الحديد: ٢٧] واتە: وەگۆشە گیری یەك کە خۆیان دایان هێنابوو. ئەگەر گومراییە _ پەنا بە خوا _ ئەو خۆ ماندوو کردنەیان هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەنێت، چونکە ئەوە بەبێ ڕێنموونی ئەنجام دەدەن، نەك لەسەر ڕێگەی ڕاست.

(٢)_ کافرانیش زاهیدانیان تێدایە، کە واز لەدونیا دێنن و، بەکولەمەرگی ژیان دەگوزەرێنن، ئەم شتە لەهندستان باوەو، چەندەها زاهیدان و دانایانیان تێدایە، فەیلەسوفان و مولحیدەکانیش زوهد دەکەن، واز لە دونیا دێنن و، بەشێکی کەمی ژیان وەردەگرن و، تەقەشوف دەکەن، بەڵام گومڕان و لەسەر ڕێگەی ڕاست نین.

(٣)_ دوژمنی خوان، چونکە شوێنی پێغەمبەران نەکەوتوون، بۆیە کۆششکردنیان و زوهد و تەقشوف و گۆشەگیریەکەیان بە لای خوای گەورەوە هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەنێت، بەڵکو ئیمانداری سەرکەش و یاخی، تەماشاکەن ئیمانداری یاخی کە گوناەو تاوانەکەی لە شیرك و هاوەڵدانان کەمتر بێت لەوان چاکترو باشترە، ئەگەر فاسقیش بێت لەبەر ئەوەی ئیماندارە با فاسقیش بێت لە خواوە نزیکترەو، ئومێدی ڕزگار بوون و لێخۆش بوونی بۆ دەکرێت. بەڵام ئەو کەسەی گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ نابێ با تەقەشوف بکات و، زوهد بکات و گۆشەگیری بکات کافرە بە خوای تعالی، لە ئەهلی دۆزەخە و ئەو کردەوانە هیچ سوودێکی پێ ناگەیەنن.

ئەگەرچی بەبۆچونی تایەفەیەك وەلی و دۆستی خوا بن[١]، هەروەها دانایانی فارس، کە سەر بە ئاگرپەرستان بوون، کافری ئاگر پەرست بوون[٢].

هەروەها دانایانی یونان _ وەکو: ئەرستۆ و هاوشێوانی _ موشریك و هاوەڵپەرست بوون، بت و هەسارەکانیان دەپەرست[٣]، ئەرستۆ پێش مەسیح _ علیه السلام _ بە سێ سەد ساڵ هاتۆتە دونیاوە، وەزیری ئەسکەندەری کوڕی فیلبسی مەقدۆنی بوو[٤].

---

(١)_ عیبرەت بەزۆری ئەنجام دانی پەرستن و، زوهدو، تەقەشوف و، کەم وەرگرتن لە دونیا و، گۆشەگیری نییە، عیبرەت بە شوێنکەوتنە، بە شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ.

(٢)_ قەومێك پەرستن دەکەن و بەشەو ناخەون، ئاگر پەرستان ئاگر دەپەرستن، هندۆس و سیخ مانگا دەپەرستن، زوهدو تەقەشوف دەکەن، لە کاتێکدا ئەهلی دۆزەخن، ئەگەر پێش مردنیان تەوبە نەکەن و پەشیمان نەبنەوەو، موسڵمان نەبن، ئەوا زوهدو تەقەشوفەکانیان هیچ سوودێکیان پێناگەیەنن. دڵنیا بن هیچ مرۆڤێك بە خوای گەورە ناگات مەگەر لە ڕێگەی ئەم پێغەمبەرەوە ﷺ.

(٣)_ فەیلەسوفە یونانیەکان ئەهلی زوهدو ئەهلی پەرستن و تەقشوف بوون، بەڵام باوەڕیان بە پێغەمبەران نەبوو، بۆیە ئەوان ئەهلی دۆزەخن، باوەڕیان بە پێغەمبەران نییە، بە تایبەت بە کۆتاهەمینی پێغەمبەران موحەممەد ﷺ، بۆیە ئەوان ئەهلی دۆزەخن، وەکو ئەفلاتۆن و ئەرستۆو غەیری ئەوانیش.

(٤)_ وەزیری ئەسکەندەری کافر بوو، چونکە دوو ئەسکەندەر هەن، یەکێکیان کافرەو، ئەویتریان موسڵمانە، ئەسکەندەری موسڵمان بریتیە لە ذولقەرنەین، کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باسی دەکات، بەڵام ئەسکەندەری مەقدۆنی کە شاری ئەسکەندەریەی لە مصر دروست کرد کافرە، وەزیرەکەشی ئەرستۆی فەیلەسوف بوو، ئەرستۆ مامۆستای ئەسکەندەر بووە لە تەمەنی منداڵیدا، کاتێ بوە بە پادشا ئەرستۆی هێناوەو، کردویەتی بە وەزیری خۆی، ئەرستۆ خوێندکاری ئەفلاتۆن بوو.

ئەو باوەڕەیە کە هۆکاری نووسینەوەی مێژووی ڕووم و یونانە، هۆکاری نووسینەوەی مێژووی جوولەکەو گاوریشە، ئەم ئەسکەندرە ذولقەرنەین نییە کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باسی دەکات[1]، کەسانێك وا دەزانن ئەرستۆ وەزیری ذولقەرنەین بوو[2]، چونکە تەماشایان کرد ئەو پیاوە ناوی ئەسکەندەرەو پێدەچێ ذولقەرنەینیش هەر بە ئەسکەندەر ناوبرێت، بۆیە وای بۆ دەچوون کە ئەسکەندەری مەقدونی ئەسکەندەری ذولقەرنەین بێت[3]، وەکو ئەوەی ئیبن وسینا و تایەفەیەك وای بۆ دەچوون[4]،

---

(١)_ ئەسکەندەری ذولقەرنەین موسڵمانە، بە ئەسکەندەر ناو دەبرێت بەڵام موسڵمانە.

(٢)_ نەخێر، ئەمە پووچەو ئەرستۆ هاوچەرخی ذولقەرنەین نەبوو، نێوان هەر دوو کیان هەزار ساڵ بوو.

(٣)_ ناوەکەیان لێگۆڕا، نەیاندەزانی دوو کەس هەن هەر دووکیشیان بە ئەسکەندەر ناو دەبرێن، یەکێکیان کافرەو، ئەویتریان موسڵمانەو، نێوانی هەر دوو کیان دوو هەزار ساڵە، ئەسکەندەر ناوی دیاری ذولقەرنەین نییە، بەڵام لەوانەیە جار بە جار بەو ناوە ناوبرێت، بەڵام ئەسکەندەری یەکەم ناوی دیاری ئەسکەندەرە، تاوەکو ئەمڕۆش هەر بەو ناوە ناو دەبرێت، پێی دەگوترێت: ( سکەندەر ) و ( ئەسکەندەر ).

(٤)_ ئیبن و سینا پزیشکە بە ناو بانگەکەیە، بەڵام ئایینێکی پیسی هەیە، چونکە باطنیەو لە ئیسماعیلیەکانە.

بەڵام شتەکە بەو جۆرە نییە، بەڵکو ئەسکەندەری بێباوەڕ _ کە ئەرستۆی فەیلەسوف وەزیری بوو _ لە دوای ئەسکەندەری ذولقەرنەین هاتۆتە دونیاوە، نە بەر بەستەکەی دروست کردوەو، نە بە وولاتی یەئجوج و مەئجوجیش گەیشتووە[1]، ئەسکەندەری مەقدۆنی کە ئەرستۆی فەیلەسوف وەزیری بوو، هۆکاری نووسینەوەی مێژووی ڕۆمە[2].

---

(١)_ ئەسکەندەری ذولقەرنەین کە قورئان باسی دەکات، ئەو بوو کە بەربەستەکەی لە پێش یەئجوج و مەئجوجدا دروستکردو، بە بەر بەستی ذولقەرنەین ناسراوە، ئەو بوو کە بە شوێنی هەڵاتن و ئاوا بوونی خۆر گەیشت، پادشایەکی موسڵمان بوو.

(٢)_ ئەمە ئەسکەندەری کافری بێباوەڕە.

## زاڵبوونی شەیتان بەسەر دۆستەکانیدا

لە نێو جۆرەکانی موشریك و هاوڵپەرستاندا، لە هاوەڵپەرستانی عەرەب و هیند و تورك و یونان و کەسانی دیکەی غەیری ئەوانیش کەسانێك هەن لە زانست و زوهدو پەرستندا درێغی ناکەن[1]، بەڵام شوێنی پێغەمبەران ناکەون، ئیمانی بەهەر هەموو ئەوە نییە کە بۆیان دابەزێنراوە، باوەڕ بەوانە ناکات کە هەواڵیان پێداوە، گوێڕایەڵیشیان ناکات لەوانەدا کە فەرمانیان پێکردووە.

بۆیە ئەمانە نەئیماندارن و نەوەلی و دۆستی خوان[2]،

---

(١)_ وەکو پێشتر ئاماژەی پێدرا زاهیدان و عابیدان و گۆشە گیرانیان تێدایە، بەڵام لەسەر ڕێگەی ڕاست نین، بۆیە ئەو شتانە سوودیان پێناگەیەنێ، بەڵکو ماندوو بوونێکی بێسوودە، دڵنیا بن کردەوە بێسوودە مەگەر بە دڵسۆزی و بە تەنها بۆ خوای گەورە ئەنجام بدرێ و، ڕاستیشبێ و دەقا و دەق لەسەر سوونەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بێت، بێگومان بەبێ ئەم دوو مەرجە با مرۆڤ خۆی ماندوو نەکات.

(٢)_ ئەگەر چی بە وەلی و دۆستانی خوا ناو دەبرێن، بەڵام ئیماندار نین ئیتر چۆن وەلی و دۆستانی خوا بن، لە ڕاستیدا ئەوان تەنها دۆستانی شەیتانن، با زاهید و عابید و کۆش شکاریش بن، چونکە لەسەر ڕێگەی ڕاست نین.

ئەمانە شەیتانیان پێوە پەیوەست دەبێ و بەسەریاندا دادەبەزێت، بۆیە موکاشەفەی هەندێ شت بۆ خەڵکی دەکەن و چەندەها تەصەڕوفاتی نائاسایی لە توانا بەدەریان لە ڕەگەزی سیحرو جادوو هەیە[1]، ئەمانە لە ڕەگەزی کاهین و جادووگەرانن کە شەیتانەکانیان بە سەردا دادەبەزێ.

---

(١)_ دۆستانی شەیتان کاتێ موخالەفەی پێغەمبەران دەکەن و گوێڕایەڵی شەیتان دەبن، چەندین بارو حاڵی نامۆیان دەبێ، چونکە شەیتانەکان یارمەتیان دەدەن و هەندێ تەصەڕوفاتی نائاسایی لە توانا بەدەریان بۆ بەدی دێنێت، پێشتریش ئاماژەی پێدرا کە ڕفتاری نا ئاسایی لە توانا بەدەر دوو بەشە: ڕفتارێکی نائاسایی لە توانا بەدەر هەیە کەرامەتە و خوای گەورە بەو کەسەی دەبەخشێ، ئەگەر خاوەنەکەی لەسەر گوێڕایەڵی خوای گەورە ڕاستڕۆ بێ و، لە ئیمانداره لەخوا ترسەکان بێت. ڕفتارێکی نائاسایی لە توانا بەدەریش هەیە شەیتانیە، ئەگەر خاوەنەکەی لەسەر کوفر و گومڕایی و سەرپێچی پێغەمبەران بەردەوام بێت، لەم بارەدا کردەوە نا ئاساییە لە توانا بەدەرەکە شەیتانی دەبێ و کەرامەتی خوایی نابێ، ئەمە ئەو بەشەیە کە شێخولئیسلام _ڕەحمەتی خوا لێ بێت_ بەو گوفتارانەی سەرەوەی باسی دەکات. ئەم کەسانە کە بوون بە دۆستی شەیتان و، دوژمنایەتی پێغەمبەرانیان کرد، ئیتر شەیتانەکان دەیانگرنە ئەستۆ و هەندێ تەصەڕوفاتی نائاسایی لە توانا بەدەریان بۆ ئەنجام دەدەن، ئەم شتە باروحاڵی شەیتانیەو، فریوی پێناخورێت. کەسانی نەفامیش دەڵێن: ئەمانە دۆستی خوان، چونکە تەصەڕوفات و، کردەوەی نائاسایی لە توانا بەدەریان هەیە.

خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَى مَنْ تَنَزَّلُ الشَّيَاطِينُ(٢٢١)تَنَزَّلُ عَلَى كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ(٢٢٢) يُلْقُونَ السَّمْعَ وَأَكْثَرُهُمْ كَاذِبُونَ(٢٢٣)﴾ [الشعراء: ٢٢١ _ ٢٢٣] واتە: هەواڵتان بدەمێ شەیتانەکان دادەبەزنە سەر کێ؟ دا دەبەزنە سەر هەموو (کەسێکی) زۆر درۆزنی زۆر تاوانبار باش گوێ دەگرن (بۆ شەیتانەکان) وە زۆربەیان درۆزنن (لەو هەواڵانەدا دەی دەن بە خەڵکی)[1].

---

(١)_ خوای گەورە نکوڵی لە دابەزینی شەیتان کردووە بە قورئان یان بۆ سەر پێغەمبەری خوا ﷺ خوای گەورە لەم بارەوە لە ئایەتێکی دیکەدا دەفەرموێت: ﴿وَمَا تَنَزَّلَتْ بِهِ الشَّيَاطِينُ (٢١٠) وَمَا يَنبَغِي لَهُمْ وَمَا يَسْتَطِيعُونَ (٢١١) إِنَّهُمْ عَنِ السَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ (٢١٢)﴾ واتە: شەیتانەکان ئەو (قورئانە)یان نەهێناوەتە خوارەوە نەشیاوی ئەوەن و نەدەشتوانن بە ڕاستی شەیتانەکان لە گوێ گرتنی (هەواڵی ئاسمان) بەرگری کراون. خوای گەورە کاتێ دەفەرموێت: ﴿وَمَا تَنَزَّلَتْ بِهِ الشَّيَاطِينُ﴾ مەبەستی قورئانە و کە دەفەرموێت: ﴿إِنَّهُمْ عَنِ السَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ﴾ مەبەستی سروش و وەحیە، واتە: شەیتانەکان توانای وەرگرتنی سروش و وەحی خوای گەورەیان نییە، مەگەر ئەوانەی سیفەتی بە دزیەوە گوێ گرتنیان هەیە. پاش ئەوەی خوای گەورە نکوڵیدەکات لەوەی کە شەیتانەکان قورئان دابەزێننە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ، ئینجا دێتە سەر باسکردنی ئەوانەی کە شەیتانیان بەسەردا دادەبەزێ، بۆیە لە ئایەتەکەی سەرەوەدا دەفەرموێت: ﴿هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَى مَنْ تَنَزَّلُ الشَّيَاطِينُ(٢٢١)تَنَزَّلُ عَلَى كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ(٢٢٢)﴾ هەواڵتان بدەمێ شەیتانەکان دادەبەزنە سەر کێ؟ دا دەبەزنە سەر هەموو کەسێکی زۆر درۆزنی زۆر تاوانبار، ﴿يُلْقُونَ السَّمْعَ﴾ بە دزیەوە گوێ دەگرن ﴿وَأَكْثَرُهُمْ كَاذِبُونَ﴾ لە یەك وشەدا ڕاست دەکەن بەڵام سەد درۆی تێکەڵ دەکەن، وەکو ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێداوین. لێرەدا خوای گەورە دۆستانی شەیتانمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە ئەوان دۆستی خوای گەورە نین، بەڵکو تەنها دۆستی شەیتانن، شەیتانیان بەسەردا دادەبەزێت.

هەر هەموو ئەوانەی کە سەر بە کەشف و کردەوە نائاسایە لە توانا بەدەرەکانن، ئەگەر شوێنکەوتووی پێغەمبەران نەبن، بێگومان درۆ دەکەن و[(١)] شەیتانەکانیان درۆیان پێدەکەن، بێگومان لە کارو کردەوەکانیاندا تاوان و کردەوەی ناشیرین هەیە، وەکو جۆرێك لە شیرك یاستەمکاری یا خراپەکاری ناشیرین و قیزەون یا زیدەڕۆیی و بیدعەکردن لە پەرستنەکاندا[(٢)].

---

(١)_ ئا ئەمەیە یاساکە، چونکە عیبرەت بەوە نییە مرۆڤ کردەوەی نائاسایی لە توانا بەدەر ئەنجام بدات، تا تەماشای بارو حاڵی دەکرێت، ئەگەر لەسەر گوێڕایەڵی خوای گەورە ڕاستڕۆ بوو، کەسێك بوو لە ئیماندارە لە خوا ترسەکان، بێگومان ئەو کردەوە نائاسایە لە توانا بەدەرەی ئەنجامی دەدات، کەرامەت و ڕێزێکەو لە لایەن خوای گەورەوە پێی بەخشراوە، بەلام ئەگەر کەسێکی سەرپێچیکاری فەرمەنەکانی خوا بوو، گوێڕایەڵکاری فەرمانەکانی شەیتان بوو، بە دڵنیایی ئەو کردەوە نائاساییە لە توانا بەدەرەی ئەنجامی دەدات شەیتانیەو، بە هۆی شەیتانەکانەوە بە ئەنجامی دەگەیەنێت، بۆیە ئەم کەسە بە دۆستی خوای گەورە دانانرێ، بەڵکو تەنها دۆستی شەیتانە.

(٢)_ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَى مَنْ تَنَزَّلُ الشَّيَاطِينُ(٢٢١) تَنَزَّلُ عَلَى كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ(٢٢٢)﴾[الشعراء: ٢٢١_٢٢٢] هەواڵتان بدەمێ شەیتانەکان دادەبەزنە سەر کێ؟ دا دەبەزنە سەر هەموو کەسێکی﴿ أَفَّاكٍ ﴾ زۆر درۆزن ﴿أَثِيمٍ ﴾ زۆر تاوانبار بە هۆی ئەو کردەوە ناشیرین و قیزەون و سەرپێچێکاریانەوە کە بەردەوام ئەنجامی دەدات، ئیتر چۆن ئەم کەسە بە وەلی و دۆستی خوای گەورە دابنرێت، ئەمە بە هەڵەدا چوونە.

بۆیە شەیتانەکانیان بەسەردا دابەزی و، پێیانەوە پەیوەست بوون، ئیتر بوون بە دۆستی شەیتان نەك دۆستی ڕەحمان[(١)] خوای تعالی لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ يَعْشُ عَنْ ذِكْرِ الرَّحْمَنِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ﴾[(٢)] [الزخرف: ٣٦] واتە: و هەر کەس پشت لە زیکرو یادی خوا هەڵکات شەیتانێکی بۆ ئامادە دەکەین کە هەمیشە لەگەڵی بێ و لێی جیا نەبێتەوە.

---

(١)_ بە هۆی زۆر درۆزنی و زۆری تاوانەکانیانەوە شەیتانیان بەسەردا دابەزی، کەوا بوو مرۆڤ یا وەلی و دۆستی خوایە یا وەلی و دۆستی شەیتانە، ئەگەر ملکەچی خواو پێغەمبەرەکەی بێ و، بڕوادارو لە خوا ترس بێ، بێگومان وەلی و دۆستی خوایە، بەڵام ئەگەر گوێڕایەڵی شەیتان بێ و سەرپێچی پێغەمبەری خوا ﷺ بکات، بێگومان دۆستی شەیتانە. ئەم شتە جیاوازیەکی ڕوون و بنەمایەکی گرنگەو لە هیچ کەس تێك ناچێت، مەگەر کەسێکی خاوەن ئارەزووات یان کەسێکی نەفام کە وا دەزانێت هەموو سپێتیەك بەزو پیوە وەکو ئەوەی دەڵێن.

(٢)_ خوای تعالی دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ يَعْشُ عَنْ ذِكْرِ الرَّحْمَنِ﴾ باشە مانای ﴿يَعْشُ﴾ چییە؟ ئایەتەکەی سورەتی (طه) ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي﴾﴿طه: ١٢٤﴾ تەفسیری دەکات، واتە ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ﴾ و هەر کەسێ ڕوو وەرگێڕێ ﴿عَنْ ذِكْرِي﴾ لەڕێباز و یادی من. بۆیە مانای ﴿يَعْشُ﴾ واتە: لە سروش و یادکردنەوەی خوای گەورە ڕوو وەردەگێڕێت، هەر کەسێك لە یاد کردنەوەی خوای گەورە ڕوو وەرگێڕێت، کە بریتیە لەقورئان و سووننەت و (سبحان الله) و (لا إله إلا الله) و ( الله أكبر) بێگومان شەیتان دەبیات و، دەیکات بە یەکێك لە سەربازانی خۆی، ﴿وَمَنْ يَعْشُ عَنْ ذِكْرِ الرَّحْمَنِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا﴾ وەهەر کەس پشت لەیادیی خوا هەڵکات، شەیتانێکی بۆ ئامادە دەکەین، ئەمە سزایەکە بۆ ئەو کەسە، واتە: خوای گەورە شەیتانی بەسەردا زاڵ دەکات، کە هەمیشە لەگەڵی دەبێ و لێی جیا نابێتەوە وەکو سزایەك بۆ ئەو

كەسە، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنْ السَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ مُهْتَدُونَ(٣٧) حَتَّى إِذَا جَاءَنَا قَالَ يَالَيْتَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ بُعْدَ الْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ الْقَرِينُ(٣٨) وَلَنْ يَنفَعَكُمُ الْيَوْمَ إِذ ظَّلَمْتُمْ أَنَّكُمْ فِي الْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ﴾ ﴿الزخرف: ٣٧ _ ٣٩﴾، ﴿وَإِنَّهُمْ﴾ واتە: شەیتانەکان ﴿لَيَصُدُّونَهُمْ عَنْ السَّبِيلِ﴾ لە ڕێگای ڕاستی خوای گەورە دووریان دەخەنەوەو بەرگریان دەکەن ﴿وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ مُهْتَدُونَ﴾ واش دەزانن بەبێ هیچ گومانێك تەنها ئەوانن کە ڕێنوێنیکراون، ئەگەر مرۆڤ وا بزانێت ڕێنوێنیکراوە لە کاتێکدا لەسەر گومڕایی بێت، ئەمە بەڵایەکی گەورەیەو، بێگومان ناگەڕێتەوە، بەڵام ئەگەر لەسەر گومڕایی بێ و، بزانێ لەسەر گومڕاییە، بێگومان چاوەڕوانی گەڕانەوەی لێدەکرێت، ﴿حَتَّى إِذَا جَاءَنَا﴾ کاتێ کە دەمرێ و دێتەوە لامان لە ڕۆژی قیامەتدا ﴿قَالَ يَالَيْتَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ بُعْدَ الْمَشْرِقَيْنِ﴾ دەڵێت خۆزگە نێوانی من و تۆ بە قەدەر خۆرهەڵات و خۆرئاوا بوایە ﴿فَبِئْسَ الْقَرِينُ﴾ ئای کە هاوڕێیەکی خراپ بویت. ﴿وَلَنْ يَنفَعَكُمُ الْيَوْمَ إِذ ظَّلَمْتُمْ أَنَّكُمْ فِي الْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ﴾ ئەم خۆزگە خواستنە هیچ سودێکتان پێ ناگەیەنێ چونکە ستەمتان کرد بێگومان ئێوە لە سزای سەختدا هاوبەشن.

زیکرو یادی ڕەحمانیش بریتیە لەو زیکرو یادەی کە بەهۆی پێغەمبەرەکەیەوە ناردویەتی، وەکو قورئان[١] بۆیە هەر کەسێك بڕوا بە قورئان نەکات و، هەواڵەکانی بە ڕاست دانەنێت و، باوەڕی بە واجبوونی فەرمانەکانی نەبێ، بە دڵنیاییی ڕووی وەرگێڕاوە[٢]، بۆیە خوای گەورە شەیتانێکی بۆ ئامادە دەکات، لەگەڵی دا دەبێ و هەمیشە لێی جیا نەبێتەوە[٣]، دیسان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهَٰذَا ذِكْرٌ مُّبَارَكٌ أَنزَلْنَاهُ﴾[٤] [الانبیاء: ٥٠] واتە: و ئەم قورئانە یاد خەرەوەیەکی بەفرو پیرۆزە ﴿أَنزَلْنَاهُ﴾ ناردومانەتە خوارەوە،

---

(١)_ بریتیە لە سروش و وەحی دابەزێنراو، ئەمەیە زیکری ڕەحمان.

(٢)_ هەر کەسێك باوەڕ بە قورئان نەکات و بڵێت: جادوەو ئەفسانەی پێشینانە، یاخود درۆیەو، گوفتاری موحەممەدەو گوفتاری خوا نییە، یان بڵێت: قورئان مەخلوقەو گوتاری خوای گەورە نییە، بێگومان کەسێکی بەو جۆرە بڕوای بە قورئان نییە. هەروەها بەس نییە تەنها بڕوای بە قورئان بێ و هیچی تر، بەڵکو پێویستە کردەوەی پێ بکات و شوێنی بکەوێت، تا ببێتە ئەهلی قورئان و یەکێك بێت لە دۆستانی خوای گەورە.

(٣)_ پێوەی پەیوەست دەبێ و، لێی جیانابێتەوە.

(٤)_ ئەوەی خوای تعالی فەرموویەتی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە زیکری قورئانە دابەزێنراوە، ئەم ئایەتە ﴿وَهَٰذَا ذِكْرٌ مُّبَارَكٌ أَنزَلْنَاهُ﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە زیکر بریتیە لەوەی کە خوای تعالی دایبەزاندووە، بریتیە لەوەی کە بۆ پێغەمبەرەکەی خۆی دایبەزاندووە، وەکو قورئان و سووننەت، ئا ئەمەیە زیکر.

هەروەها خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى(١٢٤) قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِي أَعْمَى وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا(١٢٥) قَالَ كَذَلِكَ أَتَتْكَ آيَاتُنَا فَنَسِيتَهَا وَكَذَلِكَ الْيَوْمَ تُنسَى(١٢٦)﴾[(١)] [طه:١٢٤-١٢٦] واتـە: هـەر كەسىٚ ڕوو وەرگێڕێ لە ڕێبازو یادی مـن ئـەوە بێگومـان ئـەو كەسـە گـوزەرانێكی سـەخت و تەنگی دەبێت (لە گۆڕدا) و لە ڕۆژی دواییشدا حەشری دەكەین بە كوێری دەڵێ ئەی پەروەردگارم بۆچی بە كوێری حەشرت كردم خۆ مـن (لـە دونیـادا) سـاغ و بینـا بووم دەفەرموێ هەر بەو شێوەی ئایەتەكانی ئێمەت بـۆ هـات و لـە بـیری خـۆت بـردەوە (و كوێر بویت لە ئاستیدا) بە هەمان شێوە تۆش ئەمڕۆ گوێت پیٚ نادریٚ لە بیر دەكرێی.

---

(١)_ فەرمایشتی خوای گـەورە: ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي﴾ وەكـو فـەرمایشـتەكەی دیكەیەتی كە دەفـەرموێت: ﴿وَمَنْ يَعْشُ عَنْ ذِكْرِ الرَّحْمَنِ﴾، ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي﴾ و هەركەسـیٚ لـەو سـروش و ڕێبـازو یـادەی كـە بـۆ پێغەمبەرەكـەی دایبەزانـدووە ڕوو وەرگێڕێت ﴿فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا﴾ بەدڵنیایی گوزەرانێكی تەنگی دەبێت، گوتراوە ئەمە لەگۆڕدا دەبیٚ، گۆڕەكەی لیٚ تەنگدەبێتەوە، چونكە لێی دەپرسن و پێـی دەگوترێت: پـەروەردگارت كێیـە؟ ئایینـت چییە؟ پێغەمبـەرت كێیـە؟ دەڵێـت: هـا، هـا نـازانم، گوێبیستی خەڵك بووم شتێكیان دەگوت و، منیش گوتم، بۆیە گۆڕەكەی لەسەر تـەنگ دەبێتەوە تا هێنـدەی نـامێنی ئەنـدام و پەراسووەكانی جەستـەی تێكبچـن و تێكەڵ بەیـەكتربن، ئەمەیـە مانـای وشـەی ﴿ضَنكًا﴾ی نێـو ئایەتەكـە _ پـەنا بـە خـوا _ لـە دونیاشـدا گـوزەرانێكی تـەنگی دەبیٚ، تەماشـا دەكـەی لـە بـیٚ ئـارامی و دوو دڵـی و پەرێشانی و غەم و دڵتەنگی و ئەندێشەی خراپدا دەژی، بەڵام تەماشا دەكەی ئیماندار بە ئاسوودەیی و ئارامی و، دلنیایی و، بێخەمی دەژی و لەزەت لە زیكـرو یـادی خـوای گەورە وەردەگریٚ. ئەو كەسـەی لـە زیكـرو یـادی خـوای گـەورە ڕوو وەردەگێـڕیٚ، لە دونیادا بەبیٚ ئارامی و، دڵتـەنگی دەژی، ئەگەرچـی بـە ملیارەهـا سـەروەت و سامانی هەبیٚ، لە گوزەران تەنگیدایەو، لەوەی كە لە ژێر دەستیدایە لەزەت وەرناگریٚ، یان لە

گۆڕدا، پاشان لە ڕۆژی دوایشدا بە کوێری حەشر دەکرێت و چاوی نابێ وەکو سزایەك، ئیتر سەری سوڕدەمێنێ و دەڵێت: ﴿قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِي أَعْمَى وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا﴾ هۆکار چی یە؟ هۆکارەکەی ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ آيَاتُنَا فَنَسِيتَهَا وَكَذَٰلِكَ الْيَوْمَ تُنسَىٰ﴾، پاداشت لە ڕەگەزی کردەوەیە.

ئەو ئایەتانە بەلگەن لەسەر ئەوەی کە ڕێبازو یادو زیکری خوای گەورە ئایەتەکانێتی کە دایبەزاندووە[(١)] کەوا بوو ئەگەر پیاو بە شەو و ڕۆژ یادی و زیکری خوای گەورە بکات، لەگەڵ زوهدێکی تەواو دا[(٢)]، و بیپەرستێ و لە پەرستنیدا کۆشش بکات، بەڵام شوێنکەوتووی ئەو زیکرەی خوا نەبێ کە دایبەزاندووە _کە بریتیە لە قورئان_ ئەوا بێگومان لە دۆستانی شەیتانە[(٣)]، با بە هەواشدا بفڕێ[(٤)]،

---

(١)_ خوای گەورە قورئانی ناو ناوە بە (ذکر)، (الذکر الحکیم).

(٢)_ مەبەست بە (ذکر) چییە؟ مەبەست بە(ذکر) ئەو (سبحان الله ) و (لا إله إلا الله) نییە کە بەزمان دەگوترێت، بەڵکو مەبەست بەوشەی (ذکر)ی نێو ئایەتەکان سروش و وەحیە، بەڵام سەبارەت بەو یادو زیکرەی کە مرۆڤ دەیڵێت، بیرتان لای ئەوە بێت کە شێخ دەیڵێت.

(٣)_ ئەگەر ویردو زیکرێکی زۆر بخوێنێ، ئەو ویردانەی کە بەیانیان و ئێوان دەیخوێنن، زۆرەو نوسراوە، کەسانێکیان لە بەری دەکات و لە گوێڕایەڵی و پەرستندا کۆشش دەکات، بەڵام شوێنی قورئان ناکەوێ، بەڵکو شوێنی فلان شێخ و، فلان تەریقەت دەکەوێ و شوێنی قورئان ناکەوێ، بێگومان ئەم کەسە دۆستی شەیتانە.

(٤)_ شەیتان دەیفڕێنێت.

یان بەسەر ئاودا ڕێبکات[١]، دڵنیا بن ئەوە شەیتانە کە بە هەوا دا دەیفڕێنێ و، بەسەر ئاودا ڕێی پێ دەکات، ئەمەش لە شوێنێکی تردا باسکراوە[٢].

---

(١)_ لێرەدا ئەو کەسانە دەچنە چوار چێوەی ئەو ئایەتانەوە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ يَعْشُ عَنْ ذِكْرِ الرَّحْمَنِ﴾، ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي﴾، لێرەدا مەبەست بە وشەی (ذکر) ئەو زیکرانە نییە کە بە زمان دەگوترێت، وەکو (سبحان الله) و (لا إله إلا الله) و (الله أكبر)، بەڵکو مەبەست بە (ذکر) ئەو سروشە دابەزێنراوەیە، کە بریتیە لە قورئانی پیرۆز. بۆیە ئەو کەسانە ئەگەر بە زمانیش زیکر بخوێنن، بەڵام شوێنکەوتووی ڕاستی قورئان نەبن و بە هەوا دا بفڕن و بەسەر ئاودا ڕێبکەن، یان بە نێو ئاگردا ڕێبکەن، بێگومان ئەم کردەوە نائاسایە لەتوانا بەدەرانەی ئەنجامی دەدەن شەیتانیەو، بۆیان جێبەجێدەکات و بەم شتانە خزمەتیاندەکات. عیبرەت بەبوونی کردەوەی نائاساییە لە توانا بەدەر نییە کە مرۆڤ ئەنجامی بدات، بەڵکو عیبرەت بەڕەوشت و ژیانامەیەتی، بۆیە ئەگەر بە تەواوی شوێنکەوتووی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، ئەوا دۆستی خوایە، بەڵام ئەگەر سەرپێچی پێغەمبەری خوای ﷺ دەکردو، گوێڕایەڵی کەسانی خوراف و شەیتانەکان بوو، پێچەوانەی سوونەتی پێغەمبەری خوا ﷺ کرداری دەکرد، بێگومان دۆستی شەیتانە، با بە هەواشدا بفڕێ و، بەسەر ئاودا ڕێ بکات و، بەو هاوشێوانە، دڵنیا بن ئەو کردەوە گەلە نائاساییە لەتوانا بەدەرانە شەیتانیەو خزمەتی دۆستانی خۆی پێدەکات.

(٢)_ شەیتان ئەو کەسانە بە هەوا دا هەڵدەگرێ و ماوەی دوریان پێدەبڕێ، هەواڵی شتگەلێکیان پێدەدات کە ئینس نایزانن، هەواڵی ئەو شتانەو شوێنەکەیانی پێدەدات، ئەو باروحاڵانە شەیتانین، ئەمە ئەو کەراماتە نییە کە هی وەلی و دۆستانی خوای گەورەیە. ئێستا ئەم شتە بە لای خەڵکەوە تێکەڵ و شێواوەو، توانای جیاکردنەوەی ئەو دوو شتەیان نییە. بە حەقیقەت ئەم کتێبە زۆر بە نرخە و جێگەی خۆیەتی بە ئاوی زێڕ بنوسرێت، چونکە دۆستانی خواو دۆستانی شەیتان زۆر بە جوانی ڕوون دەکاتەوە.

## بەشێك[1]

## لە جەماوەری خەڵكدا كەسانێك هەن ئیمانیان تێدایەو لقێكی نیفاق و دوو ڕوویشیان تێدایە[2]

## ( زیادبوون و كەمبوونی ئیمان )

---

(١)_ ئێستا شێخولئیسلام _ڕەحمەتی خوا لێ بێت_ لە ڕوون كردنەوەی دۆستانی خواو دۆستانی شەیتان و ئەو نیشانانەی كە بە هۆیەوە دەناسرێن بویەوە، ئەوەی بۆ ڕوون كردینەوە كە شتەكە بە بانگەشەكردن نییە، بەڵكو شتەكە بەحەقیقەتە، دۆستانی پوختی شەیتانی بۆ ڕوونكردینەوە، ئینجا لەم بەشەدا دێتە سەر باس كردنی جۆرێكی سێیەم كە بریتیە لەكۆمەڵە كەسێكی دیكە كە لە لایەكەوە دۆستی خوان و لە لایەكی تریشەوە دۆستی شەیتانن، جۆری سێیەم كەسانی ئیمانداری سەرپێچیكارن، ئەوانەی سەرپێچیەكانیان بە پلەی كوفرو شیرك نەگەیشتووە، بەڵكو تاوانێكی گەورەیە لە تاوانە گەورەكان و بەپلەی كوفرو شیرك نەگەیشتووە، بۆیە ئەم جۆرە كەسانە نە وەلی و دۆستێكی پوختی خوان و نەدۆستێكی پوختی شەیتانیشن، لە نێوان هەر دوو شتەكەدان، بۆیە ئەم جۆرە دۆستی خوان بە پێی ئەو ئەندازە ئیمانەی كە هەیەتی و بەپێی ئەندازەی گوێڕایەڵ بوونی بۆ خواو پێغەمبەرەكەی، دۆستی شەیتانیشە بە پێی ئەندازەی سەرپێچی بوونی بۆ خواو پێغەمبەرەكەی.

(٢)_ لێرەدا مەبەست بە (لقێك لەنیفاق) نیفاقی عەمەلیە، كە پێدەچێ لە هەندێ ئیمانداراندا هەبێ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەترسا لە هاوەڵانیدا هەبێ و دەیفەرموو: ((إِنَّ أَخْوَفَ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمُ الشِّرْكُ الأَصْغَرُ)) قَالُوا: وَمَا الشِّرْكُ الأَصْغَرُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: ((الرِّيَاءُ)) واتە: دەیفەرموو: (( لە هەموو شتێ زیاتر كە دەترسم تووشی بن شیركی بچوكە)) فەرموویان: باشە شیركی بچوك چییە؟ فەمووی: ((ڕووپامایی)).

لە نێو جەماوەری خەڵكدا كەسانێك هەن ئیمانیان تێدایەو لقێك لە نیفاق و دوو ڕوویشیان تێدایە، جاء في ((الصحيحين)) عن عبد الله بن عمرو رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ ((أربعٌ من كنَّ فيه كان منافقًا خالِصاً، وَمَنْ كانتْ فيه خصلةٌ مِنهُنَّ كانتْ فيهِ خَصْلَةٌ مِنَ النفاقِ حتى يدعَها: إذا حدَّث كَذَبَ، وإذا خاصمَ فَجرَ، وإذا اؤْتُمِنَ خانَ، وإذا عاهدَ غَدرَ))[1] واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عەمرەوە رضي الله عنه فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ((چوار شت هەن هەر كەس تیایدا بێت موونافیقێكی تەواوە، هەر كەسیش یەكێكیانی تێدا بێت، سیفەتێكی موونافیقی تێدایە، هەتا وازی لێدێنێت، هەر كات قسەی كرد درۆ بكات، ئەگەر دژایەتی كەسێكیكرد لە هەق لا بدات و ستەمی لێ بكات، ئەگەر ئەمانەتی لا دانرا ناپاكی بكات، هەر كات پەیمانیدا بیشكێنێت)).

لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی ڕوون كردوینەتەوە كە هەر كەس سیفەتێك لەو سیفەتانەی تێدا بێت، ئەوا سیفەتێكی دوو ڕووی و موونافیقی تێدایە تا وازی لێدێنێت.

---

(١)_ صحيح: أخرجه البخاري (٣٤)، ومسلم (٥٨)، من حديث عبدالله بن عمرو بن العاص رضي الله عنه عن النبي ﷺ.

مەبەست نیفاقی عەمەلیە، ((منافقاً خالصاً)) واتە: نیفاقی عەمەلی، پێی كافر نابێ، (وَمَنْ كانتْ فيه خصلةٌ مِنهُنَّ كانتْ فيهِ خَصْلَةٌ مِنَ النفاقِ حتى يدعَها) هەركەسیش یەكێكیانی تێدا بێت، سیفەتێكی موونافیقی تێدایە، ئەم شتە ئاماژە بۆ ئەوە دەكات كە پێدەچێ موسڵمان ئیمانی تێدابێ و نیفاقیشی تێدابێ لە هەمان كاتدا، ((إذا حدَّث كَذَبَ)) پێویستە مرۆڤی موسڵمان لە گوتارەكانیدا ڕاستگۆ بێ و خۆی لەسەر درۆ ڕانەهێنێ و درۆكردنی بە لاوە ئاسایی نەبێت، پێویستە مرۆڤی موسڵمان هەر كات بەڵێنێكیدا بەجێی بێنێ، دوانەكەوێ و بەڵێنەكەی بەرێتەسەر، ((وإذا اؤْتُمِنَ خانَ)) ئەگەر كرا بە كەسێكی متمانەكاری سەر نهێنیەك یان كارێك یان وەزیفەیەك یان

ئەسپاردەیەك ناپاکیدەکات، بەڵام ناپاکی سیفەتی ئیماندار نییە، بەڵکو ئیماندار سیفەتە هەرە بەرزەکەی لە گوتاروکردار دا دەسپاکیە، کەسێکی دەسپاکە، ((وإذا عاهدَ غدرَ)) ئەگەر گفتی بە کار بە دەست و سەر گەورەی موسڵماناندا غەدر دەکات و لە گوێڕایەڵیەکەی پەشیمان دەبێتەوە، هەتا ئەگەر پەیمانی بە کافرێکیشدا پێویستە بیباتەسەر، خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿وَأَوْفُواْ بِعَهْدِ اللّهِ إِذَا عَاهَدتُّمْ وَلاَ تَنقُضُواْ الأَيْمَانَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا وَقَدْ جَعَلْتُمُ اللّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلاً إِنَّ اللّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ﴾[النحل: ٩١] واتە: وە بەڵێنی خوا بەجێبێنن کاتێ کە بەڵێن دەدەن و بەڵێن و پەیمانەکانتان مەشکێنن لە پاش بەهێز کردنیان لە کاتێکدا خواتان کردووە بە شایەت و چاودێر بەسەر خۆتانەوە بە ڕاستی هەر چی دەکەن خوا دەیزانێ. واتە: ئەگەر بەڵێنی بە کەسێکدا ئیماندار بێت یان کافر پێویستە بەڵێنەکەی بەجێ بێنێت، چونکە غەدرو پەشیمان بونەوە لە بەڵێن و پەیمانەکان سیفەتێکی نیفاقیە، خوای تعالی دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ﴾[المائدة: ١] واتە: ئەی بڕواداران بەڵێنەکانتان ببەنەسەر. کەوابوو پێویستە ئیماندار لەسەر بەڵێن و پەیمان و ڕاستگۆیی ودەستپاکی خۆی بێت، بۆ ئەوەی لە نیفاقی عەمەلیەوە بەدوربێت. شاهد لە فەرمودەکە ئەوەیە پێدەچێ موسڵمان سیفەتێك لە سیفاتەکانی نیفاقی تێدا بێت، بۆیە ئیمان و نیفاقی لە هەمان کاتدا تێدا کۆ دەبێتەوە.

عن أبي هريرة رضي الله عنه عن النبي ﷺ انه قال: ((الإيمان بضع وسبعون شعبة، أعلاها: قول لا إله إلا الله، وأدناها: إماطة الأذى عن الطريق، والحياء شعبة من الإيمان))[1] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە رضي الله عنه لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموویەتی: ((ئیمان شەصت و ئەوەندە یا حەفتاو ئەوەندە بەشە، گەورەترینیان: گووتنی ((لا إله إلا الله))یەو، بچوکتربنیشیان لا بردنی کۆسپێکە لەسەر رێگا، شەرم و حەیاش بەشێکە لە ئیمان)).

---

(١)_ صحيح: أخرجه البخاري (٩) من حديث أبي هريرة رضي الله عنه عن النبي ﷺ بلفظ: ((الإيمانُ بضعٌ وستُّونَ شُعبَةً، والحَياءُ شُعبَةٌ مِنَ الإيمانِ))، وليس عنده: ((أعلاها: قَوْلُ لآ إِلَهَ إلا اللَّهُ، وأدناها: إماطةُ الأذى عَنِ الطَّرِيقِ))، إنما هي عند مسلم (٣٥) من حديث أبي هريرة قال: قال رسول الله ﷺ: ((الإيمانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ _ أَو بِضْعٌ وَسِتُّونَ _ شُعْبَةً، فَأَفْضَلُهَا: قَوْلُ لآ إِلَهَ إلا اللَّهُ، وَأَدْنَاهَا: إِمَاطَةُ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ، والحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الإيمانِ)).

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئیمان حەفتاو ئەوەندە بەشە یان شەصت و ئەوەندە بەشە، ئەمە بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە ئیمان جیاوازەو یەك ئاست نییە، هەندێکی لە هەندێکی دیکەی کامڵ ترو تەواو ترەو یەك شت و یەك ئاست نییە وەکو ئەوەی مورجیئەکان دەیڵێن، بەڵکو ئیمان بەرزی و نزمی هەیە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((أعْلاها)) ئەمە بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە بەرزی هەیەو نزمیشی هەیە، بەرزترینی شایەتومانە، بچوکترین خەسڵەتی ئیمانیش لا بردنی کۆسپ و شتێکی ئازار پێگەیەنەری خەڵکی موسڵمانە لەسەر رێگە، ((وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الإِيمَانِ)) چونکە شەرم و حەیا مرۆڤ لەو شتانەی کە شایستەی نین دەگەڕێنێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((إنَّ مما أدركَ الناسُ من كلامِ النبوةِ الأولى: إذا لَمْ تستحِ فاصنعْ ما شئتَ)) واتە: ((بە ڕاستی ئەوەی لە پێغەمبەرایەتیە پێشینەکانەوە بە خەڵك گەیشتووە: ئەگەر لە خوای گەورە شەرم و حەیا نەیگرتی ئەوەی ئارەزووت لێیەتی

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

بیکه))، بۆیه شەرم و حەیا لە ئیمانە و لقێکە لە لقەکانی ئیمان. شاهێد لە فەرموودەکە ئەوەیە کە ئیمان جیاوازە و هەندێکی بەرزە و هەندێکیشی بچووك و کەمە، هەندێکیشی ناوەندە و هەمووی وەکو یەك نییە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەسانی وا هەن ئیمانێکی تەواویان هەیە و کەسێکە لە وەلی و دۆستانی تەواو پوختی خوای گەورە، کەسانی واش هەن ئیمانیان نا تەواوی تێدایە ئەم کەسانە لە لایەکەوە ئیمانیان تێدایەو، لە لایەکیشەو ناتەواوی لە ئیمانیاندا هەیە، بۆیە لە لایەکەوە دۆستی خوان و لە لایەکی دیکەشەوە دوژمنی خواو دۆستی شەیتانن.

وقـد ثبـت ((الصـحيحين)) أنـه قـال لأبي ذر ـ وهـو مـن خيـار المـؤمنين: ((إِنَّكَ امْرُؤٌ فِيكَ جَاهِلِيَّةٌ))، فقال: يا رسول الله أعلى كبر سني؟ قال: ((نَعَمْ))[1] واتـه پێغەمبـەری خـوا ﷺ بەئـەبی ذَرّی فـەرموو ـ کـە یـەکێك بـوو لـە چاکترینی موسڵمانان ـ ((تـۆ پیاوێکیت سیفەتێکی نەفامێتیت تێدا ماوە))، ئەویش فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا بەم تەمەن گەورەیشمەوە هێشتا هەر نەفامێتیم تێدا ماوە؟ فەرمووی: ((بەڵێ)).

---

(١)_ أخرجه البخاري (٦٠٥٠)، وفي غير موضع من صحيحه، ومسلم (١٦٦١) من حديث أبي ذر رضي الله عنه.

ئەمە ئەبوذَرّە رضي الله عنه لە کەسە پێشـەنگەکانە بـۆ ئیسلام، یەکێکیشـە لـە چاکترین هـاوەڵان، لەگـەڵ ئەوەشـدا پێغەمبـەری خـوا ﷺ پێـی دەفــەرموێت: ((إِنَّكَ امْرُؤٌ فِيكَ جَاهِلِيَّةٌ)) واتە: خەسڵەتێك لە خەسڵەتەکانی سەردەمی نەفامێتیت تێدا ماوە، ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە پێدەچـێ ئیمانـدار خەسڵەتێك لـە خەسـڵەتەکانی نەفامیـەتی تێـدا بێـت. هۆکارەکەشـی ئـەوە بـوو کـە ئـەبو ذَرّ رضي الله عنه لەگـەڵ یـەکێك لە هاوەڵاندا خراپ تێکەشـتنێك کەوتـە نێوانیانـەوە، ئـەبو ذَرّ رضي الله عنه پێـی فـەرموو: ((ئـەی کوڕی ژنە ڕەشەکە)) ئەو هاوەڵە بەڕێزەی عەیبـدار کـرد، بۆیـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ پێی دەفەرموێت: ((بە دایکی عەیبـدارت کـرد، تـۆ پیاوێکیـت هێشـتا نـەفامێتیت تێدا ماوە)) چونکە عەیبدار کردن و تانەدان لـە بنەماڵـەو تـیرەو تایەفـە لـە خەسڵەتەکانی سـەردەمی نەفامێتیـە، ئـەم پیـاوە لەگـەڵ تـەواوێتی ئیمانیـدا و پێشـەنگێکەیدا بـۆ موسڵمان بوون کە چی ئەم خەسـڵەتەی تێـدا بـوو، ئـیتر بـارو حـاڵی کەسـانی تـر کـە نەوەکو ئەون و نە لەویشەوە نزیکن دەبێ چۆن بێ.

وثبت في ((الصحيح)) عنه أنه قال: ((أَرْبَعٌ فِي أُمَّتِي مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ: الْفَخْرُ فِي الأحساب، وَالطَّعْنُ فِي الأَنْسَابِ، والنِّياحةُ على الميِّت، والاسْتسقاءُ بالنُّجوم))[1] واتـه: فەرموویەتی: ((چوار شت لە نێو ئوممەتەکەمدا هەن و لە کردەوەکانی سەردەمی نەفامین: خۆ هەڵکێشان بە ڕەچەڵەك و پلە و پایەوە، تانەدان لە تیرەو تایەفە، شین و زاری بۆ مردووان، بە تەما بوونی باران بە هۆی ئەستێرەکانەوە)).

---

(١)_ أخرجه مسلم (٩٣٤) من حديث أبي مالك الأشعري.

بە ناردنی پێغەمبەری خوا ﷺ سەردەمی نەفامیەت نەماو لا چوو _سوپاس بۆ خوا_ بەڵام پێدەچێ شتێك لەو نەفامیەتە هەر بمێنێت، پێدەچێ شتێك لەو نەفامیەتە بە لای کەسانێکی موسڵمانانەوە هەر بمێنێت، وەکو ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەبو ذَرِی رضي الله عنه فەرموو، لە نێو هۆزانێکدا، لە هەندێ وڵاتاندا شتێك لەو خەسڵەتە نەفامیانە هەر دەمێنێ، ((أَرْبَعٌ فِي أُمَّتِي مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ: الْفَخْرُ فِي الأَحْسَابِ)) لە زمانی عەرەبیدا وشەی (حَسَب) واتای ڕەچەڵەك و پلە و پایە دەبەخشێت، پێدەچێ مرۆڤ پلەوپایەیەکی هەبێ شەرافەت و بەڕێزیەکی لە نێو خەڵکدا هەبێ و، شانازی پێوە دەکات بەڵام ئەمە لە کردەوەکانی سەردەمی نەفامیەتە، ئەگەر بە پلە و پایەو شەرافەت و بەڕێزیەکەی خۆیەوە شانازی بکات و، بەو شتانەوە خۆی بەسەر خەڵکیدا بەرز بکاتەوە، با دڵنیا بێ شتێکی سەردەمی نەفامیەتی ئەنجامداوە، دووەم: ((وَالطَّعْنُ فِي الأَنْسَابِ)) لە زمانی عەرەبیدا وشەی ((الأَنْسَابِ)) کۆی وشەی (نَسَب)، کە بریتیە لەو هۆزو تیرەو بنەماڵانەی مرۆڤی بۆ دەگەڕێتەوە، جایز نییە تانە لە هۆزو تیرەو بنەماڵەی خەڵکی بدرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾[الحجرات:١٣] واتە: ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە دروستمان کردون لە نێر و مێیەك و کردومانن بە چەند گەل و هۆزێك تا یەکتری بناسن بە ڕاستی بەڕێزترینتان

لای خوا پارێزکارترینتانه. بۆ گەلانی عەجەمەویش بۆ هۆزانی عەرەبە، کەوا بوو ناسینی نەسەب و هۆزو تیرەو بنەماڵە تەنها بۆ یەکتر ناسینە، نەك بۆ تانەدان بێت لە یەکتر، خوای گەورە هەر لەو ئایەتەدا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾[الحجرات: ١٣] ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ﴾ بە ڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا پارێزکارترینتانە، تانەدان لە نەسب و بنەماڵە ئەوەیە یەکێك بڵێت: فلان کەس لە بنەماڵەیەکی نزمە، فلان کەس سەر بەهیچ هۆزێك نییە، ئەم شتانە جایز نییە، بەڵام مەبەستت بە زانینی بنەماڵەو هۆزو تیرەی خۆت بۆ ئەوەبێ کە خزم و کەسوکارو بنەماڵەو تیرەو هۆزی خۆت بناسیت، ئەمە هیچی تێدا نییە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((تَعَلَّمُوا مِنْ أَنْسَابِكُمْ مَا تَصِلُونَ بِهِ أَرْحَامَكُمْ)) واتە: ((ناوی باوباپیران مام و خاڵ و تێکڕای خزمانتان بزانن بەئەندازەی ئەوەی کە بتوانن گەیاندنی خزمایەتی بەجێبێنن))، بۆیە ئەگەر مەبەست بەزانینی بنەماڵەو هۆزو تیرە ناسینی خزمان و بنەماڵەو هۆزو تیرە بێت، ئەوە هیچی تێدا نییە، بەڵام ئەگەر بۆ تانەدان بێت، ئەوە جایز نییە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((لا فَضْلَ لِعَرَبِيٍّ عَلَى أَعْجَمِيٍّ، وَلا لأَبْيَضَ على أَسْوَد، إلا بِالتَّقْوَى)) واتە: ((نەعەرەبییەك فەزڵی بەسەر ئەعجەمیەکدا هەیەو، نەسپی پێستێکیش فەزڵی بەسەر ڕەش پێستێکدا هەیە، مەگەر بەتەقواو لەخواترسان)) ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ هەمان مانای ئایەتەکەی خوای گەورەی هەیە کە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾، نەعەرەبوون هیچ زیانێکی بۆ هاوەڵانی بەڕێزی وەکو بیلال و سەلمان و صوهەیب نەبوو، کە یەکەم حەبەشی و دووەم فارسی و، سێیەم ڕوومی بوو ئەوە هیچ زیانێکی بۆ ئەوان نەبوو، بەڵکو بوون بە کەسانێك لە گەورە هاوەڵان، خزمایەتیش سوودی بۆ ئەبولەهەب نەبوو، بەوەی هاشمی و مامی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، ئەوە هیچ سوودێکی بۆ نەبوو، کەوا

بوو عیبرەت بە خزمایەتی نییە، بەڵکو عیبرەت بە لەخواترسان و بڕوا بوون بە خواو پێغەمبەرەکەیەتی، لە ڕاستیدا زانینی نەسەب و بنەماڵەو هۆزو تیرە تەنها بۆ گەیاندنی خزمایەتیە، سێیەم: ((والنِّياحَةُ على الميِّتِ))، لەزمانی عەرەبیدا وشەی ((النِّياحَة)) مانای بەرز کردنەوەی دەنگ بە گریان و بێ ئارامی و بێ ئۆقرەیی لە کاتی کارەساتی مردندا دەبەخشێت، شیوەنکار دەگرێ و ڕەوشت و کردارە چاکەکانی مردوو دەژمێرێت، وەکو ئەوەی دەڵێت: (داخەکەم بۆ سەرگەورەم، داخەکەم بۆ دەستی ڕاستم) وەکو ئەوەی ژنانی شیوەنکاری سەردەمی نەفامیەت ئەنجمیان دەدا، تا ئەو ئاستەی کەسانێك هەن ژنانێکی شیوەنکار بەکرێ دەگرن، بۆ ئەوەی ڕەوشت و کردەوە چاکەکانی مردوکە بژمێرن و، لە ڕوومەتیان بدەن و بە دەم و چاوی خۆیاندا بکێشن و جلەکانیان بدڕێنن و پرچەکانیان بکێشن، گوایە بێ تاقت و بێ ئۆقرەن بۆ مردوکە، هەر کەسیش ئەو شتانەنەکات بێنرەخەو، بەلایانەوە هیچ بەهایەکی نییە، بەڵام با دڵنیا بن کردەوانێکی سەردەمی نەفامیان ئەنجام داوە، واجیبە لە کاتی ئەو کارەساتانەدا مرۆڤ بە ئارامبێ و بێ ئۆقرە نەبێ و شیوەن و زارینەکات، بەچارەنووس ڕازیبێت، بەڵام بۆ ئەوەی مرۆڤ دەڵ تەنگ بێ و بگری، ئەمە هیچی تێدا نییە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی مردنی ئیبراهیمی کوڕیدا دڵ تەنگ بوو و، فرمێسك بە چاوەکانیدا هاتە خوارێ، لە ڕاستیدا دڵ تەنگ بوون و بێ ئارامیی زیانی نییە، بێزاری و تووڕە بوون بۆ قەزاو قەدەرو چارەنووسی خوا زیان بە مرۆڤ دەگەیەنێ، ئەمە زیان بە مرۆڤ دەگەیەنێ، ئەم شتە لە نێوان موسڵماناندا نەبڕاوەو تەواوو نەبووە، بەڵکو کەسانێك لە نێو موسڵماناندا هەن هەر ئەنجام دەدەن. چوارەم: ((وَالِاسْتِسْقَاءُ بِالنُّجُومِ)) واتە باران بۆ ئەستێرە بگەڕێندرێتەوە، ئەمە نەریتی سەردەمی نەفامیەتە، دەڵێن: هەر کات فلان ئەستێرە هەڵهات باران دەبارێ، هەر کات فلان ئەستێرە ئاوا

بوو باران دەبارێ، باران بارینەکە بۆ خوای گەورە ناگەڕێننەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلاَ أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ (٧٥) وَإِنَّهُ لَقَسَمٌ لَوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ (٧٦) إِنَّهُ لَقُرْآنٌ كَرِيمٌ (٧٧) فِي كِتَابٍ مَكْنُونٍ (٧٨) لاَ يَمَسُّهُ إِلاَّ الْمُطَهَّرُونَ (٧٩) تَنْزِيلٌ مِنْ رَبِّ الْعَالَمِينَ (٨٠) أَفَبِهَذَا الْحَدِيثِ أَنْتُمْ مُدْهِنُونَ (٨١) وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ (٨٢)﴾[الواقعة: ٧٥_٨٢] واتە: جا سوێند بێ بە شوێنی (هەڵهاتن و ئاوا بوونی) ئەستێرەکان بە ڕاستی ئەم سوێندە ئەگەر بزانن سوێندێکی زۆر گەورەیە کە بێگومان ئەمە قورئانێکی گەورەو بەڕێزە لە ناو کتێبێکی شاراوەدایە (کە لەوحولمەحفوزە) جگە لە (فریشتەی) پاکان کەس دەستی لێنادات نێردراوەتە خوارەوە لە لایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە دەی ئایا ئێوە بەم قورئانە باوەڕ ناکەن و لە جیاتی سوپاس گوزاری لەسەر ڕۆزیتان ئێوە باوەڕناهێنن. باران بارین بۆ ئەستێرەکان دەگەڕێننەوەو، گوایە بە هۆی ئەستێرەکانەوەیە، بۆیە کاتێ لە حودەیبیە بارانیان بەسەر دابارێ، پێغەمبەری خوا ﷺ پاش ئەوەی نوێژی بەیانی پێکردن، پێی فەرموون: ((هَلْ تَدْرُونَ مَاذا قَالَ رَبُّكُمْ)) قَالوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: ((أَصْبَحَ مِنْ عِبادي مُؤْمِنٌ بِي وَكافِرٌ، فَأَمّا مَنْ قَالَ مُطِرْنا بِفَضْلِ اللهِ وَرَحْمَتِهِ، فَذَلِكَ مُؤْمِنٌ بِي وَكافِرٌ بِالْكَوْكَبِ، وَأَمّا مَنْ قَالَ مُطِرْنا بِنَوْءِ كَذا وَكَذا، فَذَلِكَ كافِرٌ بِي وَمُؤْمِنٌ بِالْكَوْكَبِ)). واتە: فەرمووی: ((ئایا دەزانن پەروەردگارتان چ فەرمووە)) وتیان: خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: ((فەرموویەتی: بەندەکانم هەیانە بڕوای پێمە، هەشیانە کافرە. ئەوانەی دەڵێن: خوای گەورە بەڕەحمەت و بەزەیی خۆی بارانی بۆ باراندین، ئەوە بڕوایان بەمن هەیەو کافرن بەئەستێرە، بەڵام ئەوانەی کە دەڵێن: بەهۆی جووڵەی ئەستێرەکانەوە بارانمان بۆ باری، ئەوە باوەڕیان بەخوا نییەو باوەڕیان بە ئەستێرە هەیە))، کەوا بوو نابێ باران بارین بدرێتە پاڵ هەڵهاتن و ئاوا بوونی ئەستێرەکان،

وەکو نەریتی سەردەمی نەفامیەت، بەڵکو باران بەفەرمانی خوای گەورەوە پەیوەندە، خوای گەورە بە ویستی خۆی باران دەبارێنێ، خوای تعالى دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الَّذِي يُنَزِّلُ الْغَيْثَ مِن بَعْدِ مَا قَنَطُوا وَيَنشُرُ رَحْمَتَهُ﴾[ الشورى: ٢٨] واتە: و خوا ئەو کەسەیە کە باران دەبارێنێ لە پاش ئەوەی کە خەڵکی بێ ئومێد بوون و (بارانی) ڕەحمەتی خۆی بڵاودەکاتە. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَفَرَأَيْتُمُ الْمَاءَ الَّذِي تَشْرَبُونَ (٦٨) أَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ الْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ الْمُنزِلُونَ (٦٩)﴾ [الواقعة: ٦٨_٦٩] واتە: جا پێم بڵێن ئەو ئاوەی کە دەیخۆنەوە ئایا ئێوە لە هەورەوە دەیبارێنن ﴿أَمْ نَحْنُ الْمُنزِلُونَ﴾ یا ئێمە دەیبارێنین. خوای گەورە خۆی باران دەبارێنێت. دیسان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾[لقمان:٣٤] واتە: بە ڕاستی تەنها لای خوایە زانیاری (کاتی هاتنی) ڕۆژی دوایی و هەر خوا باران دەبارێنێ تەنها خوا دەزانێ بەوەی لە منداڵدانی (دایکان)دایە و هیچ کەس نازانێ سبەینێ (لە داهاتوودا) چی دەکات و هیچ کەس نازانێ لە چ شوێن و زەوی یەکدا دەمرێ بە ڕاستی خوا زاناو ئاگادارە. کەوا بوو گەڕاندنەوەی باران بۆ ئەستێرە، یا بۆ ئاو هەواکان لە کردەوەکانی سەردەمی نەفامیەتە، شاهێد لە فەرموودەکە ئەوەیە کە مرۆڤ پێدەچێ خەسڵەتێك لە خەسڵەتەکانی سەردەمی نەفامیەتی تێدا بێت، ئەگەر یەکێك لەوانەی تێدا بێت، با موسڵمانیش بێت.

وفي ((الصحيحين)) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: ((آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلاثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ))[1].

وفي ((صحيح مسلم)): ((وَإِنْ صَامَ وَصَلَّى وَزَعَمَ أَنَّهُ مُسْلِمٌ))[2].

**واتە: لە ئەبو هورەیرەوە رضي الله عنه لەپێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموویەتی: نیشانەکانی کەسی دوو ڕوو سیانە: هەر کات قسەی کرد درۆ بکات، هەرکات پەیمانیدا بیشکێنێت، ئەگەر ئەمانەتی لادانرا ناپاکی بکات)).**

**لە((صەحیحی موسلمیشدا)) هاتووە: ((با ڕۆژووش بگرێ و نوێژیش بکات و واش ڕاگەیەنێت کە موسڵمانە)).**

وذكر البخاري عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، قَالَ: (( أَدْرَكْتُ ثَلاثِينَ مِنْ أَصْحَابِ محمد ﷺ، كُلُّهُمْ يَخَافُ النِّفَاقَ على نَفْسه))[3] **واتە: ئیمامی بوخاری لە ئیبن و ئەبی مولەیکەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: بەسی هاوەڵی پێغەمبەری خواﷺ گەیشتم هەر هەموویان دەترسان نەفسیان تووشی نیفاق و دوو ڕووی بێت.**

---

(١)_ صحيح: أخرجه البخاري (٣٣)، و(٢٦٨٢)، و(٢٧٤٩)، (٦٠٩٥)، ومسلم حديث (٥٩)، من حديث أبي هريرة رضي الله عنه عن النبي ﷺ.

**(٢)_ ئەم فەرموودەیە پێشتر باس کراوە و ئەمەش ڕیوایەتی ئیمامی موسلیمە، فەرموودەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات ئەو موسڵمانەی کە نوێژ دەکات و ڕۆژووش دەگرێت، جار بە جار سیفەتێکی نیفاق و دوو ڕووی تێدایە.**

(٣)_ ذكره البخاري معلقاً في كتاب ((الأيمان))، باب خوف المؤمن من أن يحبط عمله وهو لا يشعر وعزاه الحافظ في ((الفتح)) الى ابن أبي خيثمة في ((التاريخ))، ومحمد بن نصر المروزي في كتاب ((الإيمان)) له، وعنهم أبوزرعة الدمشقي من وجه آخر مختصراً كما هنا.

------------------------------------------------

------------------------------------------------

وذكر الحافظ ابن حجر: أن معنى هذا الأثر روي في حديث عن عائشة مرفوعاً عند الطبراني في ((الأوسط))؛ وفي إسناده ضعف (فتح الباري ٩/١).

ئیبن و ئەبی مولەیکە تابیعیەکی بەرێزەو، یەکێکە لە زانایانی مەککەی پیرۆز، دەفەرمویت: هەموو ئەو ژمارە هاوەڵەی پێغەمبەری خوا ﷺ ترسی ئەوەیان هەبوو نەفسیان تووشی نیفاق و دوو ڕووی بێت، واتە: پاکانەیان بۆ نەفسی خۆیان نەدەکرد، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ خەمی ئەوەی بوو هاوەڵانی تووشی ئەو شتەبن، ئەم شتە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە پێدەچێ مرۆڤی موسڵمان خەسڵەتێکی دوو ڕووی تێدا بێت؛ بۆیە پێویستە وریای خۆی بێت و، نەڵێت: من موسڵمانم و لە خەسڵەتەکانی دوو ڕوویی بێوەی دەبم، وریای خۆی بێت و، لەو شتە پەنا بە خوا بگرێت. پێغەمبەری خوا ﷺ بەنهێنی ناوی دوو ڕووەکانی بە هاوەڵی بەرێزی خۆی حوذەیفە کوڕی یەمان دەفەرموو، نهێنیەکانی بۆ باس دەکرد، بۆیە حوذەیفە ﷺ بەمتمانەکاری سەر نهێنیەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەناسرا، ئیمامی عومەر ﷺ لێی دەپرسی و دەیفەرموو: توخوا ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ منی لە ڕیزی دوو ڕوواندا ناو برد، دەترسا نەفسی تووشی دوو ڕووی بێت، لە کاتێکدا ئەو عومەری کوڕی خەتاب ﷺ بوو، مرۆڤ نەفسی خۆی لە دوو ڕووی بە دور ناگرێت، وە ئەگەر نەفسی خۆشی لە نیفاق بەدور نەگرت ئەوا پێویستە وریای خۆی بێت، لە خەسڵەتەکانی نیفاق خۆی دورخاتەوە، شاهێد لە فەرمایشتەکەی ئیبن و ئەبی مولەیکە ئەوەیە کە پێدەچێ مرۆڤی موسڵمان خەسڵەتێك لەخەسڵەتەکانی دوو ڕووی تێدا بێت و، بە ئەندازەی ئەو خەسڵەتە نیفاق و دووڕووەیەی کە تیایدایە دۆستایەتی شەیتانیشی تێدایە. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەوان خۆیان بە کامڵ و تەواو دانەدەنا، بۆ نەفسی خۆیان پاکانەیان نەدەکرد، هەر چەند ئەو پلە و پایەو ڕێزەشیان لە ئیمان و بڕواداریدا هەبوو، نەفسی خۆیان پاك نەدەکردەوەو، ترسی ئەوەیان هەبوو تووشی دوو ڕوویی بن.

﴿وَمَا أَصَابَكُمْ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيَعْلَمَ الْمُؤْمِنِينَ (١٦٦) وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ نَافَقُوا وَقِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا قَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوِ ادْفَعُوا قَالُوا لَوْ نَعْلَمُ قِتَالًا لَاتَّبَعْنَاكُمْ هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَانِ(١٦٧)﴾[1] [آل عمران: ١٦٦ _ ١٦٧] واته: ئەوەی کە دووچارتان بوو لەو ڕۆژەدا کە هەر دوو کۆمەڵ بە یەك گەیشتن (لە ئوحوددا) ئەوە بە ویستی خودا بوو بۆ ئەوەی بڕواداران دەرخات و بۆ ئەوەی دوو ڕووەکان ئاشکرا بکات ﴿وَقِيلَ لَهُمْ﴾ وپێیان ووترا ﴿تَعَالَوْا قَاتِلُوا﴾ وەرن بجەنگن ﴿فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ لە ڕێی خوادا یا بەرگری (لە وولاتی خۆتان بکەن) گوتیان: ئەگەر بمانزانیبایە جەنگ دەبێ شوێنتان دەکەوتین ئەوانە لەو ڕۆژەدا لە بێ بڕواییەوە نزیك تر بوون تا بڕواو ئیمان.

---

(١)_ ئەو لێقەومان و بەڵایەی لە جەنگی ئوحوددا بەسەر موسڵماناندا هات، بە هۆی ئەو سەرپێچیەوە بوو کە لە هەندێکیانەوە ڕویداو، بریتی بوون لەو تیرهاوێژانەی کە بەسەر چیاکەوە بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێدان چیاکە بە جێنەهێڵن لە حاڵەتێکدا ئەگەر موسڵمانان سەرکەوتوو یا دۆڕاو بوون، بەڵام هەندێ لە تیرهاوێژەکان کاتێ موسڵمانانیان بەدی کرد لەسەرەتای جەنگەکەدا سەرکەوتن و دەستیان بە کۆ کردنەوەی دەستکەوتەکان کرد، هەوڵیاندا لە چیاکە دابەزن و وتیان: بێگومان جەنگەکە کۆتایی هات، عەبدوڵای کوڕی جوبەیر ﷺ کە فەرماندەیان بوو، فەرمانەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ بیر خستنەوە، کە پێی فەرموو بوون: ((چیاکە بەجێ مەهێڵن))، بەڵام سەرەڕای ئەوەش هەر دابەزین و چیاکەیان بە جێهێڵا، بۆیە کاتێ هاوەڵپەرستان چیاکەیان بەدی کرد ژمارەیەکی کەمی تیرهاوێژی بەسەرەوە ماوە، لە پشتەوەو لە لای چیاکەوە پەلاماری موسڵمانانیان داو، موسڵمانان کەوتنە نێو بێباوەڕەکانەوە، لە پێش و لەپاشەوە، ئیتر جەنگەکە دووبارە هەڵگیرسایەوە و لێقەومان و بەڵاکە بەسەر موسڵماناندا هات، حەفتایان لێ شەهید بوو، تا ئەو ئاستەی پێغەمبەری خواش ﷺ بریندار بوو، خودەکەی سەری شکاو هەر چوار دانەکانی

نێوان کەڵپەو خرێکانی شکان، بەهۆی ئەو سەرپێچیەوە کە ڕویدا، زیانی سەرپێچی تەنها بکەرەکەی ناگرێتەوە بەڵکو ئەو سنورەشی تێپەڕاند و هەڵبژێردراوانیشی گرتەوە، دەرەنجامیش خوای گەورە ئەوەیان بیر دەخاتەوەو، دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَصَابَكُمْ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ﴾ ئەوەی کە دووچارتان بوو لەو ڕۆژەدا کە هەر دوو کۆمەڵ بە یەك گەیشتن، ئەوە لە ڕۆژی جەنگی ئوحوددا بوو ﴿الْجَمْعَانِ﴾ واتە: هەر دوو کۆمەڵی موسڵمانان و کۆمەڵی هاوەڵپەرستان ﴿فَبِإِذْنِ اللَّهِ﴾ ئەوە بەویست و قەزاو قەدەری خوای گەورە بوو ﴿وَلِيَعْلَمَ الْمُؤْمِنِينَ (١٦٦) وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ نَافَقُوا﴾ بۆ ئەوەی بڕواداران دەرخات و بۆ ئەوەی دوو ڕووەکان ئاشکراکات، ئەمە ئاماژەیە کە کەسانێکی موسڵمان دوو ڕوویان تێدا دەبێ، خوای گەورە هەر خۆشی موسڵمانان دەناسێ، خوای گەورە ئەم تاقیکردنەوەیەی کرد، تا ئەو کەسانەی ئیمانێکی تەواویان هەیە لەو کەسانەی کە نیفاق و دوو ڕوویان تێدایە جیابنەوە و ئاشکرا بن، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَانِ﴾ ئەمەیە مەحەلی شاهێد لە فەرموودەکە، کەوا ئیمانی مرۆڤ لە لاواز دەبێ، تا لە کوفرەوە نزیك تر دەبێ، ئیمانێکی لاوازی دەبێ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەکدا فەرموویەتی: ((مَا مِنْ نَبِيٍّ بَعَثَهُ اللَّهُ فِي أُمَّةٍ قَبْلِي إِلاَّ كَانَ لَهُ مِنْ أُمَّتِهِ حَوَارِيُّونَ وَأَصْحَابٌ يَأْخُذُونَ بِسُنَّتِهِ وَيَقْتَدُونَ بِأَمْرِهِ ثُمَّ إِنَّهَا تَخْلُفُ مِنْ بَعْدِهِمْ خُلُوفٌ يَقُولُونَ مَا لاَ يَفْعَلُونَ وَيَفْعَلُونَ مَا لاَ يُؤْمَرُونَ فَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِيَدِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِلِسَانِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِقَلْبِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ وَلَيْسَ وَرَاءَ ذَلِكَ مِنَ الإِيمَانِ حَبَّةُ خَرْدَلٍ)) واتە: ((زۆربەی پێغەمبەرانی پێشی من کە خوای گەورە بۆ ئوممەتانێك ناردوونی، بە دڵنیایی لە ئوممەتەکانیاندا هاوەڵانێکی تایبەت و نزیك و دۆستانێکی پشتگیریکاری هەبوو، کە دەستیان بە سووننەتەکانیانەوە دەگرت و پەیڕەوی فەرمانەکانیان دەکرد، دوای ئەوان کەسانێکی

شەڕ پەیدا دەبن، فەرمان بەشتانێك دەكەن كە خۆیان ئەنجامی نادەن و شتانێك ئەنجام دەدەن كە فەرمانیان پێنەكراوە، بۆیە هەر كەسێك بە دەستەكانی كۆششی ڕێگریان بكات، ئیمانێكی زۆر بەهێزی هەیە، هەر كەسیش بەدڵ كردەوەكانیانی پێناخۆش بێت و، پێی ڕازی نەبێ، ئیمانێكی تەواوی هەیە، دوای ئەوەش بە ئەندازەی تووە ڕەشە زۆر بچوكەكەی خەرتە لە ئیمانێكی تر نییە)). هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەكدا كە ئیمامی موسلیم بە ژمارە (٢٣٥) دەیگێڕێتەوە، فەرموویەتی: ((مَن رَأى مِنكُم مُنكَراً فَليُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإنْ لَمْ يَستَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإنْ لَمْ يَستَطِعْ فَبِقَلْبِهِ وَذَلِكَ أَضْعَفُ الإِيمَانِ)) واتە: ((هەر كات كەسێكتان خراپەیەكی بەدی كرد، با بە دەستەكانی بیگۆڕێت، ئەگەر نەیتوانی با بە دڵ پێی ناخۆش بێت و پێی ڕازی نەبێت، ئەوەش كەمترین بەروبومەكانی ئیمان و لاوازترین كاتەكانێتی)). هەموو ئەوانە ئاماژەن كە ئیمان لاوازو لاواز تری هەیە تا ئەو ئاستەی خاوەنی ئەو ئیمانە لە كوفرەوە نزیكتر دەبێت، مەحەلی شاهێد لە ئایەتەكە ئەوەیە كە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَانِ﴾ ئەوانە لەو ڕۆژەدا لە بێ بڕواییەوە نزیك تر بوون تا بڕواو ئیمان، كەوا بوو ئیمان كەم دەكات و، لاواز دەبێ تا نزیكی كوفر دەبێتەوە، ئیمان یەك شت نییە كە نەزیادو نەكەم بكات، وەكو ئەوەی كۆمەڵی مورجیئە ستەم كارەكان بانگەشەی بۆ دەكەن، بەڵكو ئیمان زیاد و كەم دەكات، شاهێد ئەوەیە كە ئیمانی موسڵمان لاواز دەبێ تا لە كوفرەوە نزیك دەبێتەوە.

بە ڕاستی خوای گەورە ئەوانەی لەکوفر نزیکتر کردۆتەوە تا ئیمان، بەوە دەزانرێت ئەوانە تێکەڵکارن و کوفریان بەهێزترە[1]، کەسانی غەیری ئەوانیش تێکەڵکار دەبن بەڵام ئیمانیان بەهێزتر دەبێ[2].

ئەگەر وەلی و دۆستانی خوا بریتیبن لە ئیماندارە لە خواترسەکان، کەوا بوو بە گوێرەی ئیمانی بەندەو لە خوا ترسانەکەی دۆستایەتی بۆ خوای گەورە دەبێ[3]، بۆیە هەر کەسێك تا ئیمان و لە خوا ترسانەکەی کامڵ و تەواو تر بێت، ئەوەندە وەلایەت و دۆستایەتێکەی بۆ خوای گەورە کامڵ و تەواوتر دەبێ، خەڵکی لە دۆستایەتی خوای گەورەدا پتر بەرزبونەوەیان بەسەر یەکتریدا هەیە، ئەمەش بە گوێرەی بەرزبونەوەی هەندێکیانە لە بواری ئیمان و لە خوا ترساندا بەسەر هەندێکی تریاندا[4]

---

(١)_ واتە: ئیمان تێکەڵ بە کوفر دەکەن، بە دوو ڕوویی تێکەڵی دەکەن، کوفرەکەیان لە ئیمانەکەیان بەهێزترە.

(٢)_ کەسانێك لە موسڵمانان ئیمانیان تەواو و پوختە، کەسانێکیش تێکەڵکارن، واتە: ئیمان و دوو ڕوویان تێدایە، موسڵمانانیش جیاوازن کەسانێکیان تێکەڵکارە بەڵام ئیمانەکەی لە دوو ڕوویی و نیفاقەکەی بەهێزترە، کەسانێکیشیان بە پێچەوانەوەن ئیماندارن بەڵام دوو ڕوویی و نیفاقەکەیان لە ئیمانەکەیان بەهێزترە، کەوا بوو جەماوەری خەڵك لە بواری ئیمانەوە جیاوازیەکی گەورەیان هەیە و یەك پلە نین.

(٣)_ بە گوێرەی ئیمان و لە خوا ترسانەکەی دۆستایەتی بۆ خوای گەورە دەبێ، دۆستایەتیەکەی تەواو و پوخت دەبێ یان تێکەڵکار دەبێ، ئیمانەکەی بەهێز دەبێ یان نیفاق و دوو ڕووەیەکەی بەهێز دەبێ.

(٤)_ جەماوەری خەڵك لە وەلایەت و دۆستایەتی خوای گەورەدا پتر بەرز بونەوەیان بەسەر یەکتریدا هەیە، واتە: لە خۆشویستنی خوای گەورەدا، ئەوان خوایان خۆش دەوێ و خواش ئەوانی خۆش دەوێ، بە ئەندازەی ئەو ئیمانەی کە پێیانە، بۆیە

........................................................................

کەسانێکیان وەلایەت و دۆستایەتیەکەی بۆ خوای گەورە تەواو و پوختە، هەشیان وەلایەت و دۆستایەتیەکەی ناتەواوە، هەر هەمووشیان دۆستی خوای گەورەن. ئەمە بەرپەرچدانەوەی کۆمەڵی مورجیئەیەو پێشتر باسمان کرد، هەروەها بەرپەرچدانەوەی کۆمەڵی خەواریجیشە، ئەوانەی ئەنجامدەرانی تاوانە گەورەکان بەکافر دادەنێن و لە چوار چێوەی ئیمان دەریان دەکەن، بەڵام ئەمە ڕێباوەڕێکی پووچە، چونکە ئەنجام دەرانی تاوانە گەورەکان ئیمانیان پێیە بەڵام ناتەواوە، ئەوان لە ژێر ویستی خوای گەورەدان، ئەگەر خوای گەورە ویستی لێبێت دەیان بورێت و، ئەگەر ویستیشی لێبێت بە گوێرەی تاوانەکانیان سزایان دەدات، ئەمەیە بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بەرامبەر بە ئەنجام دەرانی تاوانە گەورەکان، کە بیروباوەڕێکی نێوەندە لە نێوان بیروباوەڕی کۆمەڵی خەواریج کە بە کافریان دادەنێن و، لە نێوان کۆمەڵی مورجیئەدا کە دەڵێن: ئیمانیان تەواوەو سەرپێچیکردن زیانیان پێ ناگەیەنێت، دەڵێن: ئەگەر مرۆڤ ئیمانی هەبوو سەرپێچیکرن زیانی پێ ناگەیەنێت.

هەروەها لە دوژمنایەتیشیاندا بۆ خوای گەورە پتر بەرز بونەوەیان بەسەر یەکتریدا هەیە، بە گوێرەی بەرزبونەوەیان بەسەر یەکتریدا لە بواری کوفرو دوو ڕوویدا[1].

لە بارەی زیاد بوون و کەمبوونی ئیمانەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا مَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَٰذِهِ إِيمَانًا فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا فَزَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ (١٢٤) وَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ وَمَاتُوا وَهُمْ كَافِرُونَ﴾[2] [التوبة ١٢٤_١٢٥] واتە: و کاتێ کە بنێردرێتە خوارەوە سورەتێك (لە قورئان) (دوو ڕووەکان) هی وایان هەیە دەڵێ کام لە ئێوە زیادی کرد بەم (سورەتە) باوەڕی جا ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە ئەمە ئیمانیان زیاد دەکات (و بەهێزتر دەبێ) و ئەوان مژدە بەخشن و خۆش حاڵن بەڵام ئەوانەی لە نێو دڵیاندا نەخۆشی (ناپاکی) هەیە ئەوە سورەتەکە بۆیان زیاد دەکات سەرەڕای پیسی و ناپاکی خۆیان پیسی و ناپاکی تر ئەو (ناپاکانە) دەمرن لە کاتێکدا کە بێ بڕوان.

---

(١)_ هەروەها کافرانیش یەك پلە نین، دوژمنانی خوا یەك پلە نین، کوفرو دوژمنایەتی هەندێکیان لە هەندێکی تریان بۆ خوای گەورە سووکترە، خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَدَاوَةً لِّلَّذِينَ آمَنُوا الْيَهُودَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُوا وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ قَالُوا إِنَّا نَصَارَىٰ﴾[المائدة: ٨٢] واتە: سوێند بێت دەبینیت (ئەی موحەممەد ﷺ) خراپترینی خەڵکی بۆ دوژمنایەتی لەگەڵ بڕواداران دا جولەکەو هاوبەش دانەرانن و سوێند بێت دەبینیت نزیکترینیان لە خۆشەویستی بۆ بڕواداران ئەوانن کە دەیان ووت بێگومان ئێمە گاورین. کافران لە کوفردا یەك پلە نین.

(٢)_ ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کوفر زیاد و کەمی هەیە، ئیمانیش بەرزو نزمی هەیە، ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا فَزَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ﴾ ئەم ئایەتە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە ئیمان زیاد دەکات، ﴿وَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ واتە

دڵیان گومان و نیفاق و دوو ڕووی تێدایە ﴿فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَى رِجْسِهِمْ﴾ واتە: سەرەڕای پیسی و ناپاکی خۆیان پیسی و ناپاکی کوفری تری بۆ زیاد کردن ﴿وَمَاتُوا وَهُمْ كَافِرُونَ﴾ ئەو ناپاکانە دەمرن لە کاتێکدا کە بێ بڕوان، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کوفریش زیاد دەکات، چونکە خوای تعالی دەفەرموێت: ﴿فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَى رِجْسِهِمْ﴾ کەوا بوو کوفریش زیاد و کەم دەکات.

هەروەها خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿إِنَّمَا النَّسِيءُ زِيَادَةٌ فِي الْكُفْرِ﴾[١] [التوبة: ٣٧] واتە: بە ڕاستی دواخستن و گۆڕینی (مانگە حەرامەکان) ڕۆچونە لە بێباوەڕیدا.

هەروەها خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿وَالَّذِينَ اهْتَدَوْا زَادَهُمْ هُدًى وَآتَاهُمْ تَقْوَاهُمْ﴾[٢] [محمد: ١٧] واتە ﴿وَالَّذِينَ اهْتَدَوْا﴾ ئەو کەسانەی هیدایەتیان وەرگرتووە ﴿زَادَهُمْ هُدًى﴾ (خوا) شارەزایان زیاد دەکات ﴿وَآتَاهُمْ تَقْوَاهُمْ﴾ تەقواو پارێزکارییان پێ دەبەخشێ.

هەروەها خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضًا﴾[٣] [البقرة: ١٠] واتە: لە دڵیاندا نەخۆشی (ناپاکی) هەیە خواش نەخۆشییەکەی زۆرتر کردن (بە مانی قورئان).

---

(١)_ ﴿النَّسِيءُ﴾ بریتییە لە دواخستنی حەج لە کاتی دیاریکراوی خۆی، لە سەردەمی نەفامیدا بە پێی ئارەزووی خۆیان حەجیان لە کاتی دیاریکراوی خۆی دوا دەخست، ﴿النَّسِيءُ﴾ بریتییە لە دوا خستن، و مانگە حەرامەکانیشیان لەکاتی دیاریکراوی خۆی دوادەخست، ئەم شتە لەسەردەمی نەفامیدا دەکرا، ﴿زِيَادَةٌ فِي الْكُفْرِ﴾ ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کوفریش زیاد دەکات، ئەو خەڵکانە کاتێ حوکمەکانی خوای گەورەیان گۆڕی، بوو بە هۆی زیاد بوونی کوفریان، کوفر لەسەر کوفر_ پەنا بە خوا _.

(٢)_ ئەمە بەڵگەیە لەسەر زیاد بوونی ئیمان، ﴿وَالَّذِينَ اهْتَدَوْا زَادَهُمْ هُدًى﴾ ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هیدایەت زیاد دەکات و ئیمانیش زیاد دەکات.

(٣)_ ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کوفرو دوو ڕوویی زیاد دەکات، ﴿فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ﴾ واتە: دوو ڕووەکان لە دڵیاندا نەخۆشی ناپاکیی هەیە، ﴿فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضًا﴾ ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کوفر زیاد دەکات و دوو ڕوویش زیاد دەکات و، نەخۆشی ناپاکیی نێو دڵیش زیاد دەکات، تا ئەو ئاستەی دڵ دەمرێت.

خوای گەورە خۆی ڕوونکردوینەتەوە کە لەوانەیە تەنها کەسێک بەشێک لە وەلایەت و دۆستایەتی خوای تێدا بێت بە ئەندازەی ئیمان و تەقواو لە خوا ترسانەکەی، هەمان کاتیشدا لەوانەشە بەشێک لە دوژمنایەتی خوای تێدا بێت بە ئەندازەی کوفرو فیسق و دوو ڕوویەکەی.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَزْدَادَ الَّذِينَ آمَنُوا إِيمَانًا﴾[1] [ المدثر: ٣١] واتە: و بڕوادارەکان بڕواکەیان زیاد دەکات.

---

(١)_ خوای تعالى دەفەرموێت: ﴿وَمَا جَعَلْنَا أَصْحَابَ النَّارِ إِلَّا مَلَائِكَةً وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِلَّذِينَ كَفَرُوا لِيَسْتَيْقِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَيَزْدَادَ الَّذِينَ آمَنُوا إِيمَانًا﴾ واتە: هەر فریشتەمان کردووە بەکاربەدەستی دۆزەخ و ژمارەی ئەو فریشتانەمان نەگێڕاوە مەگەر بۆ تاقیکردنەوەی ئەوانەی بێباوەڕن تا ئەوانەی کتێبیان پێدراوە دڵنیا بن و بڕوادارەکان بڕواکەیان زیاد بکات. خوای گەورە لەم سورەتەدا دەفەرموێت: نۆزدە فریشتە بەسەر دۆزەخەوەن، بۆیە کەسانێکی کافر بۆ قەشمەری کردن و ڕابواردن دەیانگوت: هیچی تێدا نییە با نۆزدەش بن، من چارەی ئەوەندەو ئەوەندەیانتان بۆ دەکەم. ئێوەش ئازاد بن و چاری ئەوانی ترم بۆ بکەن و لە دۆزەخ دێمە دەرەوە، ئەوەندە بێ ئەقڵن وا دەزانن فریشتەکان بە هاوشێوەی ئادەمین، تەنها خوای گەورە دەزانێ فریشتەکان چەند بەهێزو گەورەو توند و تیژن، بە هاوشێوەی ئادەمیەکان نین تا مرۆڤ بتوانێت بەسەریاندا زاڵبێت، تەنها یەك فریشتە سەراپای ئادەمیەکان ناتوانن بەرگەیی بگرن، ﴿وَمَا جَعَلْنَا أَصْحَابَ النَّارِ إِلَّا مَلَائِكَةً وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً﴾ بۆ تاقیکردنەوەی ئەوانەی کافرن ﴿لِيَسْتَيْقِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ﴾ چونکە ڕێککەوتنی تەوراتەکەی خۆیان بوو ﴿وَيَزْدَادَ الَّذِينَ آمَنُوا إِيمَانًا﴾ ئەمەیە مەحەلی شاهێد کە ئیمان زیاد دەکات.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَعَ إِيمَانِهِمْ﴾[1] [الفتح: ٤] واتـە: تا ئیمانیان زیاد بکات لەگەڵ ئەو ئیمانەی کە هەیانە.

---

(١)_ خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ السَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ ئـەو خوا بە خۆی ئارامی دابەزاندۆتە ناو دڵی ئیمانداران لە ڕۆژی جەنگی ئوحوددا ﴿لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَعَ إِيمَانِهِمْ﴾ تا ئیمانیان زیاد بکات لەگەڵ ئەو ئیمانەی کە هەیانـە. ئەمـە بەڵگەیـە لەسەر ئەوەی کە کەسی ئیماندار ئیمانی زیاد دەکات.

# بەشێك

## سەبارەت بەوەی كە دۆستانی خوا دوو چینن

## ( پلەكانی دۆستایەتی )

وەلی و دۆستانی خوا دوو چینن[1]: (سابقون مقربون ) و(أصحاب يمين مقتصدون)[2].

---

(١)_ دۆستانی خوا جیاوازن بەشێكیان لە(المقربون)ن، بەشێكیشیان لە(أصحاب اليمين)ن، هەروەها چینێكی سێیەمیش هەن و ستەمكارن لەنەفسی خۆیان، كەوابوو ئەهلی ئیمان جیاوازن، خوای تعالی دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ وَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ بِإِذْنِ اللَّهِ﴾[فاطر: ٣٢] واتە: لە پاشان ئەم قورئانەمان بەخشی بە كەسانێ كە لە ناو بەندەكانماندا هەڵمانبژاردن ئینجا هەندێكیان ستەمكارن لەخودی خۆیان، ئەمانە كەسانی خاوەن سەرپێچین لەگەڵ ئەو ئیمانەی كە هەیانە ﴿وَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ﴾ و هەندێكیان مامناوەندین، بریتین لەو كەسانەی كە تەنها واجیباتەكانی سەر شانیان ئەنجام داوەو، خۆیان لە حەرامەكان دوور خستۆتەوە، و هەندێكی تریان بە فەرمانی خوا پێشكەوتوون بە هۆی چاكەكانیانەوە، ئەمانە چینی هەرە بەرزن، بە هۆی چاكەكانیانەوە پێشكەوتوون، بریتین لەو كەسانەی هەموو واجیبات و موستەحیباتی سەر شانیان ئەنجام داوەو خۆیان لە هەموو حەرام و مەكروهاتێك بە دوور گرتووە، تا ئەو ئاستەی خۆیان لە هەندێ موباحات و ڕێپێدراویش بە دوور گرتووە، بۆ ئەوەی ئاگادارو وریای خۆیان بن، ئا ئەمانەن (السابقون)، لەم بارەشەوە شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێ بێت _ چەند ئایەتێك دەنووسێت بیخوێننەوە. لەو ئایەتانەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە كە ئیمانداران یەك چین نین، بە گوێرەی ئەوە لە ڕۆژی قیامەتیشدا پاداشتەكانیان جیاواز دەبێ.

(٢)_ ئەوانە چاكانن(الأبرار)، یارانی دەستی ڕاست.

خوای گەورە لە چەندین جێگەی قورئانە پیرۆزەكەیدا باسی كردوون، لە سەرەتای سورەتی (الواقعة)و لە كۆتایەكەشیدا، لە سورەتی (الإنسان) و (المطففين) و لە

سورەتی (فاطر)یشدا، خوای گەورە لە سەرەتای سورەتی (الواقعة)دا باسی قیامەتی گەورەی کردووە، لە کۆتایەکەشیدا باسی قیامەتی بچوکی کردووە، لە سەرەتای سورەتەکەدا دەفەرموێت: ﴿إِذَا وَقَعَتِ الْوَاقِعَةُ (١) لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ (٢) خَافِضَةٌ رَافِعَةٌ (٣) إِذَا رُجَّتِ الْأَرْضُ رَجًّا (٤) وَبُسَّتِ الْجِبَالُ بَسًّا (٥) فَكَانَتْ هَبَاءً مُنْبَثًّا (٦) وَكُنْتُمْ أَزْوَاجًا ثَلَاثَةً (٧) فَأَصْحَابُ الْمَيْمَنَةِ مَا أَصْحَابُ الْمَيْمَنَةِ (٨) وَأَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ مَا أَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ (٩) وَالسَّابِقُونَ السَّابِقُونَ (١٠) أُولَئِكَ الْمُقَرَّبُونَ (١١) فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ (١٢) ثُلَّةٌ مِنَ الْأَوَّلِينَ (١٣) وَقَلِيلٌ مِنَ الْآخِرِينَ﴾[1] [الواقعة:١ـ١٤] واتە: کاتێک کە ڕووداوی گەورەی (قیامەت) ڕوویدا لە ڕوودانیدا هیچ درۆ و گومانێک نییە نزم کەرەوەی (کەسانێکە) بەرزکەرەوەیە (بۆ کەسانێکی تر) کاتێک کە زەوی هێنرایە جولان بە جولانێکی توند و شاخەکان زۆر وەردکران بەوورد کردن و بوون بە تەپو تۆزی پەرش ربلاو و ئێوە دەبنە سێ کۆمەڵ (لە دوا ڕۆژدا) ئەنجا یارانی لای ڕاست، کام یارانی لای ڕاست؟ و یارانی لای چەپ، کام یارانی لای چەپ؟ و پێشکەوتوەکان هەر خۆیانن پێشکەوتوو ئەوانەن نزیکانی (بارەگای خوا) لە بەهەشتانی پڕ نازو نیعمەتان کۆمەڵێکی زۆرن لە(گەلانی) پێشینان و کەمێکن لە پاشینان (لە ئوممەتی موحەممەد ﷺ).

---

(١)_ ﴿إِذَا وَقَعَتِ الْوَاقِعَةُ (١) لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ (٢) خَافِضَةٌ رَافِعَةٌ (٣) إِذَا رُجَّتِ الْأَرْضُ رَجًّا (٤) وَبُسَّتِ الْجِبَالُ بَسًّا (٥) فَكَانَتْ هَبَاءً مُنْبَثًّا (٦)﴾ تا ئێرە باسی ڕووداوەکانی ڕۆژی قیامەت دەکات، ﴿وَكُنْتُمْ أَزْوَاجًا ثَلَاثَةً﴾ واتە: سێ جۆر، ئەی ئیمانداران ئێوە بوون بە سێ جۆر، چونکە ئیمانی هەر هەموو مەخلوقاتی خوا یەك ئاست نییە، ئەی موسڵمانان ئێوە سێ جۆرن، ﴿فَأَصْحَابُ الْمَيْمَنَةِ مَا أَصْحَابُ الْمَيْمَنَةِ﴾

---------------------------------------------------------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------------------------------------------------------
------------------------------------------------------------------------------------------------

ئەمانە چاکانن (الأبرار)، خاوەنانی دەستی ڕاست (أصحاب اليمين)، ﴿وَأَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ مَا أَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ﴾ ئەمانە کافرانن _ پەنا بە خوا _ کە خاوەنی شوم و بەد بەختی و کوفرن، کاتێکیش دووجار لە نێو ئایەتەکەدا دەفەرموێت: ﴿وَأَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ مَا أَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ﴾ لە زمانی عەرەبیدا ئاماژە بۆ گەورەبوونی شتەکە دەکات، پاشان دەفەرموێت: ﴿وَالسَّابِقُونَ السَّابِقُونَ (١٠) أُولَٰئِكَ الْمُقَرَّبُونَ﴾ و پێشکەوتووەکان هەر خۆیان پێش کەوتوو، ئەوانەن نزیکانی (بارەگای خوا)، کەوا بوو موسڵمانان سێ جۆرن: کافران، خاوەنانی دەستی ڕاست (أصحاب اليمين)، نزیکان(المقرّبون)، ئەمەی سەرەتای سوورەتەکە باسی قیامەتی گەورە دەکات.

هەركات قیامەتی گەورە ڕوویدا دابەشبوونی خەڵك بەو جۆرە دەبێ کە خوای گەورە پێشینان و پاشینانی تێ دا کۆ دەکاتەوە، وەکو ئەوەی خوای گەورە لەچەندین جێگەی قورئانەکەیدا وەسفی ئەوەیکردووە. پاشان خوای گەورە لە کۆتای سورەتەکەشدا دەفەرموێت: ﴿فَلَوْلاَ إِذَا بَلَغَتِ الْحُلْقُومَ (٨٣) وَأَنْتُمْ حِينَئِذٍ تَنْظُرُونَ (٨٤) وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْكُمْ وَلَكِنْ لاَ تُبْصِرُونَ (٨٥) فَلَوْلاَ إِنْ كُنْتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ (٨٦) تَرْجِعُونَهَا إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ (٨٧) فَأَمَّا إِنْ كَانَ مِنَ الْمُقَرَّبِينَ (٨٨) فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّةُ نَعِيمٍ (٨٩) وَأَمَّا إِنْ كَانَ مِنْ أَصْحَابِ الْيَمِينِ (٩٠) فَسَلاَمٌ لَكَ مِنْ أَصْحَابِ الْيَمِينِ (٩١) وَأَمَّا إِنْ كَانَ مِنَ الْمُكَذِّبِينَ الضَّالِّينَ (٩٢) فَنُزُلٌ مِنْ حَمِيمٍ (٩٣) وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ (٩٤) إِنَّ هَذَا لَهُوَ حَقُّ الْيَقِينِ (٩٥) فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ (٩٦)﴾[1] [الواقعة: ٨٣_٩٦] واتە: دەی بۆچی کاتێ گیانی( نەخۆشەکەتان) دەگاتە گەرووی و ئێوە لەو کاتەدا تەماشا دەکەن لەو کاتەدا (فریشتەکانمان) لە ئێوە نزیکترن لەو (کەسەی لە سەرە مەرگدایە) بەڵام ئێوە ئێمە نابینن دەی بۆچی ئەگەر ئێوە (زیندو ناکرێتەوەو) پاداشت نادرێتەوە ڕۆحی (مردوکانتان) بگێڕنەوە ئەگەر ڕاست دەکەن ئەنجا ئەگەر ئەو (کەسەی لە گیانەڵایە) لە نزیکان بێ (لە خوا) ئەوە حەسانەوەو بۆنی خۆش و بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەتی بۆ هەیە وە ئەگەر لە هاوەڵانی دەستی ڕاست بێ ئەوە سەلامەتی و بێ زیانی بۆ تۆ (چونکە) تۆ لە یارانی دەستی ڕاستی بەڵام ئەگەر لە بێ باوەڕانی گومڕایان بێ ئەو (شوێن) میواندارییەکەی ئێجگار گەرمە و چوونە ناو دۆزەخە بە ڕاستی ئەوەی (کە لەم سورەتەدا باسکرا) حەق و بێگومانە جا کەوا بوو بە پاکی یادی پەروەردگاری گەورەی خۆت بکە.

---

(١)_ لە کۆتایی سورەتەکەشدا باسی قیامەتی بچووك دەکات، کە بریتیە لە مردن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَوْلاَ إِذَا بَلَغَتِ الْحُلْقُومَ﴾ دەی بۆچی کاتێ ڕوح و گیانی نەخۆشەکەتان دەگاتە گەرووی ﴿وَأَنْتُمْ حِينَئِذٍ تَنْظُرُونَ (٨٤) وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ

مِنكُمْ وَلَكِن لاَّ تُبْصِرُونَ﴾ لەو کاتەدا فریشتەکانمان لە ئێوە نزیکترن لەو کەسەوە کە لە
سەرە مەرگدایە بەڵام ئێوە ئێمە نابینن ﴿فَلَوْلاَ إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ (٨٦) تَرْجِعُونَهَا إِن
كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ ڕۆحی مردوکانتان بگێڕنەوە ئەگەر ڕاست دەکەن ﴿فَأَمَّا إِن كَانَ مِنَ
الْمُقَرَّبِينَ (٨٨) فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّةُ نَعِيمٍ﴾ جا ئەگەر لە پێشکەوتووە نزیکەکان بوون
(السابقون المقرّبون) ئەوا لە حەسانەوەو بۆنی خۆش و بە هەشتی پڕ لە ناز و نیعمەتدان
﴿وَأَمَّا إِن كَانَ مِنْ أَصْحَابِ الْيَمِينِ﴾ وە ئەگەر لە یارانی دەستی ڕاست (الأبرار) بن
﴿فَسَلاَمٌ لَّكَ مِنْ أَصْحَابِ الْيَمِينِ﴾ ئەوا لە دەست درێژی خەڵك و بەڵاو کارەسات بێ
وەیی و بێ زیان دەبن، بەڵام وەکو چینە بەرزەکە نابن، ﴿وَأَمَّا إِن كَانَ مِنَ الْمُكَذِّبِينَ
الضَّالِّينَ﴾ و ئەگەر لە بێ باوەڕانی گومڕایانی کافریش بوون ﴿فَنُزُلٌ مِّنْ حَمِيمٍ (٩٢)
وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ﴾ جێگەیەی گەرمیان هەیەو دەچنە دۆزەخەوە. ئا بەم جۆرەن خەڵکان
لەکاتی مردندا، یا لەنزیکانن (المقرّبين)، یا لەیارانی دەستی ڕاست (أصحاب اليمين)، وبا
لە کافرانن _ پەنا بە خوا _.

له سورەتی (الإنسان)یشدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا (٣) إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ سَلَاسِلَ وَأَغْلَالًا وَسَعِيرًا (٤) إِنَّ الْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا (٥) عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ اللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا (٦) يُوفُونَ بِالنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيرًا (٧) وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا (٨) إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا (٩) إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا (١٠) فَوَقَاهُمُ اللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ الْيَوْمِ وَلَقَّاهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا (١١) وَجَزَاهُم بِمَا صَبَرُوا جَنَّةً وَحَرِيرًا (١٢) مُّتَّكِئِينَ فِيهَا عَلَى الْأَرَائِكِ لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا وَلَا زَمْهَرِيرًا (١٣)﴾[1] [الإنسان: ٣_١٣] واتە: بێگومان ئێمە ڕێ نموونیمان کرد بۆ ڕاستەڕێ ئایا سوپاس گوزارە وەیا نا سوپاس و سپڵە بە ڕاستی ئێمە ئامادەمان کردووە بۆ بێ بڕوایان زنجیرو تەوقی زۆر (کە دەکرێتە گەردنیان) و ئاگری هەڵگیرساو بێگومان چاکان لە پەرداخێکدا (شەراب) دەخۆنەوە کە ئاوێنەکەی لەسەرچاوەی کافورەوەیە کە کانی یەکە (لە بەهەشتدا) بەندەکانی خوا لێی دەخۆنەوە (لە هەر شوێنێکدا بیانەوێ) بەری دەدەنەوە چۆن بەردانەوەیەك وەفا بە نەزر دەکەن و لە ڕۆژێکیش دەترسن کە بەدی و سەختی یەکەی هەموان دەگرێتەوە و خواردەمەنی بە هەژاران و هەتیوان و دیلان دەدەن با حەزیشیان لێی بێت (دەڵێن) بە ڕاستی ئێمە خواردەمەنیتان دەدەینێ هەر لەبەر خوا چاوەڕوانی ناکەین لە ئێوە نەپاداشت و نە سوپاس بە ڕاستی ئێمە لە سزای پەروەردگارمان دەترسین لە ڕۆژێکی ترش و تاڵ و دژوارا جا خوا پاراستنی لە بەدی ئەو ڕۆژە و پێیدان پاراوی و خۆشی و پاداشتی دانەوە بەهۆی خۆڕاگرتنیان (لەسەر چاکەو دورکەوتنەوە لە خراپە) بە بەهەشت و (پۆشاکی) ئاورێشم پاڵی تیادەدەنەوە لەسەر تەخت و قەنەفەی زۆر نابینن تیایدا نە گەرمی ڕۆژ ﴿وَلَا زَمْهَرِيرًا﴾ و نە سەرما (واتە هەوایەکی زۆر خۆشی هەیە).

---

(١)_ ﴿إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ﴾ واتە: بێگومان ئێمە مرۆڤمان بۆ ڕاستەڕێ هیدایەت و ڕێنموونی کرد، هیدایەتی گشتی کە بریتیە لە ڕوون کردنەوەی هەق لە باتڵ و هیدایەت

و ڕێنموونی لە گومڕایی، ﴿إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا﴾ ئیتر یا سوپاسگوزارە، پاشان پاداشتی سوپاس گوزاران ڕوون دەکاتەوە و یا نا سوپاس گوزارو سپڵەیەو پاداشتی ئەمانەش ڕووندەکاتەوە، ﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِنْ كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا﴾ ئەمانە هاوەڵانی دەستی ڕاستن (أصحاب اليمين)، چاکان(الأبرار) هاوەڵانی دەستی ڕاست ﴿يَشْرَبُونَ مِنْ كَأْسٍ﴾ لە پەرداخێکدا شەرابی بەهەشت دەخۆنەوە ﴿كَانَ مِزَاجُهَا﴾ کە ئاوێتەکەی ﴿كَافُورًا﴾ کافوری بۆن خۆش و تام بەلەزەتە، ﴿عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ اللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا﴾ بەندەکانی خوا ئەو نزیکانە (المقرّبون) لەکانیەکی بەهەشت دەخۆنەوە ﴿يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا﴾ لە هەر شوێنێك خۆیان بیانەوێ بەری دەدەنەوە چۆن بەردانەوەیەك، نزیکان(المقرّبون) ئەو شەرابی بەهەشتە بە پوختی دەخۆنەوە _ واتە تەنها شەرابەکەیەو هیچی تر _، بەڵام چاکان(الأبرار) لەگەڵ تێکەڵی کافوردا دەیخۆنەوە، ﴿يُوفُونَ بِالنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيرًا (٧) وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَى حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا﴾ ئەمە سیفاتی ئەو بەندانەی خوای گەورەیە کە بەو شێوە پاداشتیان دەداتەوە. خوای گەورە لەم سورەتەدا هەر سێ چینەکەی خەلکی باسکردووە: کافران، هاوەڵانی دەستی ڕاست (الأبرار أصحاب اليمين)، نزیکان(المقرّبون) لە شەرابە پوختەکەی بەهەشت دەخۆنەوە، ﴿فَوَقَاهُمُ اللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ الْيَوْمِ وَلَقَّاهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا (١١) وَجَزَاهُمْ بِمَا صَبَرُوا جَنَّةً وَحَرِيرًا (١٢) مُتَّكِئِينَ فِيهَا عَلَى الْأَرَائِكِ لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا وَلَا زَمْهَرِيرًا﴾ پاداشتەکەشیان بەم شێوە دەبێ لای خوای گەروە.

له سوورەتی (المطففين)یشدا دەفەرموێت: ﴿كَلَّا إِنَّ كِتَابَ الْفُجَّارِ لَفِي سِجِّينٍ (٧) وَمَا أَدْرَاكَ مَا سِجِّينٌ (٨) كِتَابٌ مَرْقُومٌ (٩) وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ (١٠) الَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ الدِّينِ (١١) وَمَا يُكَذِّبُ بِهِ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ (١٢) إِذَا تُتْلَى عَلَيْهِ آيَاتُنَا قَالَ أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ (١٣) كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ (١٤) كَلَّا إِنَّهُمْ عَنْ رَبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَمَحْجُوبُونَ (١٥) ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُو الْجَحِيمِ (١٦) ثُمَّ يُقَالُ هَذَا الَّذِي كُنْتُمْ بِهِ تُكَذِّبُونَ (١٧) كَلَّا إِنَّ كِتَابَ الْأَبْرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ (١٨) وَمَا أَدْرَاكَ مَا عِلِّيُّونَ (١٩) كِتَابٌ مَرْقُومٌ (٢٠) يَشْهَدُهُ الْمُقَرَّبُونَ (٢١) إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ (٢٢) عَلَى الْأَرَائِكِ يَنْظُرُونَ (٢٣) تَعْرِفُ فِي وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ النَّعِيمِ (٢٤) يُسْقَوْنَ مِنْ رَحِيقٍ مَخْتُومٍ (٢٥) خِتَامُهُ مِسْكٌ وَفِي ذَلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ الْمُتَنَافِسُونَ (٢٦) وَمِزَاجُهُ مِنْ تَسْنِيمٍ (٢٧) عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا الْمُقَرَّبُونَ (٢٨)﴾[1] |المطففين: ٧ـ٢٨| واتە: با پەشیمان بنەوە، چونکە بە ڕاستی نامەی تاوانباران لە ناو دەفتەریکی پەستی ڕەشدایە تۆ چوزانیت ئەو دەفتەرە چی یە دەفتەرێکی نووسراوە هاوار لەو ڕۆژەدا بۆ بێ بڕوایان ئەوانەی کە بڕوا ناکەن بە ڕۆژی پاداشت دانەوە کەس ئەو ڕۆژە بەدرۆ نازانێت مەگەر هەموو ستەم کارێکی گوناهبار هەر کاتێك کە ئایەتەکانی ئێمەی بۆ بخوێنرێتەوە دەڵێ (ئەمانە) ئەفسانەی پێشینانن نەخێر وا نییە بەڵکو ژەنگی ئەو (خراپانەی) کە دەیانکرد پەردەی هێناوە بەسەر دڵیاندا نەخێر بە ڕاستی ئەوان لەو ڕۆژەدا، بێ بەشن لەبینینی پەروەردگاریان لە پاشان بێگومان ئەوان دەچنە دۆزەخەوە ئینجا پێ یان دەووترێت ئەمە ئەوەیە کە بڕواتان پێ نەکرد بە ڕاستی نامەی (کرداری) چاکان لە ناو دەفتەرێکی بەرزدایە تۆ چوزانیت ئەو دەفتەرە چی یە؟ دەفتەرێکی نوسراوی (ئەوەندە بەفەڕە) نزیکانی خودا دەیبینن بێ گومان چاکان لە نازو نیعمەت دان لەسەر تەخت و بارەگاوە سەیر دەکەن دەبینیت لە ڕوخسارياندا جوانیی و گەشاوەیی خۆشگوزەرانیی شەڕابی پاکی سەر بە مۆریان پێ دەدرێ بیخۆنەوە کە دوا قومی بۆنی میسکە بۆ ئەوە با پێشبڕکێ بکەن پێشبڕکێ کاران تێکەڵ کراوی، لە ئاوی تەسنیمە کانییەکە کە نزیککراوەکان لێی دەخۆنەوە.

---

(١)ـ ﴿كَلَّا إِنَّ كِتَابَ الْفُجَّارِ لَفِي سِجِّينٍ﴾ ئەمە چینێکە، ﴿سِجِّينٍ﴾ واتای پەستێتی و ڕەشێتی و تەنگێتی دەبەخشێت، لە زمانی عەرەبیدا لەسەر وەزنی (فعيل)ە کە (صيغة

مبالغة)یەو، واتای تەنگیتی دەبەخشیت، هەروەها گوتراوە ﴿سِجِّينٍ﴾ لە ژیرەوەی چینی حەوتەمی زەمیندایە _پەنا بە خوا_ ﴿كَلاَّ إِنَّ كِتَابَ الْأَبْرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ﴾ ئەمەش چینێکی تری خەڵکە کە بریتین لە چاکان(الأبرار المقتصدون)، ﴿يُسْقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ (٢٥) خِتَامُهُ مِسْكٌ وَفِي ذَلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ الْمُتَنَافِسُونَ﴾ ئەم چینە نزیکانن (المقرّبون) کە لە شەرابی بەهەشتی پوختی سەرمۆر دەخۆنەوە، ﴿وَمِزَاجُهُ مِن تَسْنِيمٍ﴾ ئەمە چینی چاکانن (الأبرار) کە لە شەرابی تێکەڵ کراوی بە ئاوی تەسنیم دەخۆنەوە، کەواتە چینی چاکان (الأبرار) شەرابەکەیان بۆ تێکەڵ دەکرێت، ﴿عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا الْمُقَرَّبُونَ﴾ کانیەکی بەهەشتەو نزیکان(المقرّبون) لێی دەخۆنەوە بە پوختی و تێکەڵ نەکراوی.

وعن ابن عباس رضي الله عنهما وغيره من السلف[(١)] قالوا: يمزج لأصحاب اليمين مزجاً، ويشرب بها المقربون صرفاً، واته: لـه ئـيبن وعـهباس (رضـي الله عنهمـا) و پێشـینانی دیکهشـهوه دهفهرموون: خاوهنانی دهستی ڕاست (أصحاب اليمين) شهرابی بهههشتیان بۆ تێکهڵ دهکرێت بـه تێکـهڵ کـردن، نزیکـانیش (المقرّبون) بـه پـوختی و تێکـهڵ نـهکراوی دهیخۆنهوه[(٢)]. هـهر بهو جۆرهشه که ئهوان فهرموویانه، چونکه خوای گهوره لـه ئایهتهکهدا دهفهرموێت: ﴿يَشْرَبُ بِهَا﴾ نهیفـهرمووه: (يشربُ منها)، چونکه کـه خـوای گهوره دهفهرموێت: ﴿يَشْرَبُ بِهَا﴾ واته دهیخواتهوه تا تهواو تێر دهبێ، چونکه کهسی وا ههیه دهخواتهوه بهڵام تێرنابێ.

بۆیه ئهگهر گووترا: (يشربون منها) واته (لێی دهخواتهوه) ئهم بێژهیه ئاماژه بۆ تێر بوون ناکات، بهڵام ئهگهر گووترا: (يشربون بها) واته: (دهیخواتهوه) ئهم بیژهیه ئـامـاژه بۆ تێر بوونی تـهواوهتی دهکات، نزیکـان (المقرّبون) دهیخۆنـهوه تـا بـه تـهواوی تـێر دهبن[(٣)]، کهوا بوو پێویستیان بهشتێکی دیکه نابێ[(٤)]،

---

(١)_ ورد ذلـك عـن ابـن مسعود وابـن عبـاس وحذيفـة رضي الله عنهم، وانظـر: ((الـدر المنثـور)) (٣٢٨/٦)، وأورده هناك، عن بعض التابعين أيضاً.

(٢)_ واته: شهڕابێکی پوختی پاکی ساف له ساف و بێ تێکهڵ دهخۆنهوه.

(٣)_ کهوا بوو نزیکان(المقرّبون) له چینی دهستانی ڕاست (أصحاب اليمين، الأبرار) خۆشبهختترن، چونکه (أصحاب اليمين، الأبرار) شـهرابی بهههشـت بـه تێکـهڵ کـراوی لهگهڵ میسك، له ئایهتهکهی تریشدا لهگهڵ کافوردا دهیخۆنهوه، بهڵام نزیکان(المقرّبون) به پوختی و پاکی و تێکهڵ نهکراوی دهیخۆنهوه.

(٤)_ ئهمـهش دیسـان جیاوازیـهکی دیکهیـه، (أصحاب اليمين، الأبرار) لێـی دهخۆنهوهو، پێدهچێ تێر نهبن، بهڵام نزیکان(المقرّبون) ﴿يَشْرَبُ بِهَا﴾ واته: دهیخۆنهوه تا به تهواوی تێر دهبن، هـهر دوو بێژهکـه (يشرب بها) و (يشرب منها) جیاوازیـان لـه نێواندایه، بڕوانه ووردی تێگهیشتن و ووردی فیقهی قورئانی پیرۆز.

بۆیە بە پوختی و پاکی و ساف لە ساف و بێ تێکەڵ خواردیانەوە، بەڵام چینی دەستانی ڕاست(أصحاب الیمین) بۆیان تێکەڵ دەکرێت بە تێکەڵ کردن، بەو جۆرەی کە خوای گەورە لە سورەتی (الإنسان)دا دەفەرموێت: ﴿كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا (٥) عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ اللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا (٦)﴾، ﴿عِبَادُ اللَّهِ﴾(١)

---

(١)_ پێشتر شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوای لێ بێت _ ئەوەی بۆ باسکردین کە وەلی و دۆستانی خوای گەورە بۆ سێ چین دابەش دەبن: پێشکەوتووە نزیکەکان (السابقون المقرّبون)، چاکان (الأبرار أصحاب الیمین)، ستەمکاران لە نەفسی خۆیان کە یاخیبووانی یەکخواپەرستانان، وە کردەوەی هەر سێ تایەفەکەی بۆ باس کردووین، پێشکەوتووە نزیکەکان(السابقون المقرّبون) ئەوانەن کە هەر هەموو واجیبات و سوونەتەکانیان ئەنجام داوە و خۆشیان لە هەر هەموو حەرام کراو و مەکروهەکان دوور خستۆتەوە، بۆیە هەر هەموو کردەوەکانیان بوون بە عیبادەت و خوا پەرستی، بەڵام چاکان (الأبرار أصحاب الیمین) پێیان دەوترێت (المقتصدون) ئەوانەن کە واجیباتەکانی سەرشانیان ئەنجام داوەو، خۆیان لە حەرام کراوەکان دوور خستۆتەوە و پێدەچێ واز لە سوونەتەکان بێنن و، هەندێ لە مکروهەکانیش ئەنجام بدەن، بەڵام ئەوانەی ستەمیان لە نەفسی خۆیان کردووە بریتین لەو موسڵمانانەی کە لەوانەیە هەندێ لە گوناهە گەورەکان ئەنجام بدەن، کە لە شیرک و هاوەڵپەرستی کەمترن، هەندێ لە حەرام کراوەکان ئەنجام بدات کە لە شیرك و هاوەڵپەرستی کەمترن، ئەمانە ستەمکارن لە نەفسی خۆیان. پاداشتەکانیشیان بەپێی کردەوەکانیان دەبێ پێشکەوتووە نزیکەکان(السابقون المقرّبون) لە شەرابی بە هەشتی سەرمۆر بەپوختی و پاکی دەخۆنەوە، کە لەگەڵ هیچ شتێکدا تێکەڵ نەکراوە، چونکە کردەوەکانیان بە دڵسۆزی تەنها بۆ خوای گەورە ئەنجامدا و هەر هەموو ژیانیان بوو بە پەرستن بۆ خوای گەورە، چاکان (الأبرار أصحاب الیمین)یش دەخۆنەوە بەڵام لەوەی کە تێکەڵ

---------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------
-----------------------------------------------------------

به كافور یان به میسك كراوه، له ڕۆژی قیامەتدا بۆیان تێكەڵ دەكرێت وەكو چۆن ئەوان له دونیادا كردەوەكانیان بە هەندێ لە لەزەت و چێژەكانی نەفسی موباح و ڕێپێدراو تێكەڵ دەكرد، بەڵام ستەمكاران لە نەفسی خۆیان لە ژێر ویستی خوای گەورەدان، ئەگەر ویستی لێبێت سزایان دەدات بەهۆی ئەو تاوانانەوە كە ئەنجامیان داوەو، پاشان دەیان خاتە بەهەشتەوە، لەوانەشە بە تكا كاری پێغەمبەری خوا ﷺ لە دۆزەخ بكرێنە دەرەوە، پاش ئەوەی دەچنە نێو ئاگرەوە پێدەچێ بە تكا كاری پێغەمبەری خوا ﷺ یان بەتكای غەیری ئەویش دەركرێنەدەرەوە، ئائەمانە چینەكانی دۆستانی ئیمانداری خوای گەورەن.

بریتین لەو نزیکانەی (المقربون) کە لە سورەتەکەدا باسکراوە[١]، کە شەرابی بەهەشت بە پوختی و پاکی و ساف لە سافی دەخۆنەوە، چونکە پاداشت لە رەگەزی کرداری مرۆڤەکەیە لە خێرو شەڕدا[٢]، لەم بارەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيا نَفَّسَ اللهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ القِيامَةِ[٣]، وَمَنْ يَسَّرَ عَلى مُعْسِرٍ يَسَّرَ اللهُ عَلَيْهِ في الدُّنْيا والآخِرَةِ[٤]))

---

(١)_ لە سورەتی (الحاقة) و سورەتی (الواقعة) لە سەرەتاو کۆتاکەیدا و سورەتی (الإنسان) و سورەتی (الفاطر)دا، باسی هەر سێ چینەکە هاتووە.

(٢)_ ئێمە لە دونیادا کردەوەکانمان بەشتێك لەسەر پێچی تێکەڵ دەکەین، بۆیە لە ڕۆژی قیامەتیشدا شەڕابەکەمان بۆ تێکەڵ دەکرێت و هەر کەسێکیش کردەوەکانی بە دڵسۆزی ئەنجام دابێ و هیچ سەرپێچیەکی تێدا نەبێ، شەڕابەکەی بە پوختی و پاکی و تێکەڵ نەکراوی دەخواتەوە، کەوا بوو پاداشت لە رەگەزی کردەوەیە.

(٣)_ ئەمە پاداشت دانەوەیەکە لە رەگەزی کرداری بەندەکە، ((نَفَّسَ)) واتە: ڕەوانەوەو لا بردن، ((مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً)) واتە: هەر کەس تەنگانەو ناڕەحەتیەك لەسەر ئیمانداریك بەڕەوێنێتەوەو لابەرێت، بۆ نموونە موسڵمانێك برایەکی ئیمانداری خۆی بەدی کرد لە تەنگانەیەکی قەرزاریدایە، یان لە تەنگانەی برسێتیدایە، یان لە هەر تەنگانەیەکی تردایە، هەستاو ئەو تەنگانەیەی لەسەر ڕەواندەوەو لابرد، یاخود برا ئیماندارەکەی سزایەکی بەسەردا سەپێنرا بێ و ئەمیش تکاکاری بۆ کردو، لەو تەنگانەیە ڕزگاریکرد دەرەنجام تەنگانەو ناڕەحەتیەکی لەسەر لابرد، ڕۆژی قیامەت خوای گەورە لە تەنگانەو ناڕەحەتیەکانی قیامەتی لەسەر لا دەبات.

(٤)_ ئەگەر کەسێك قەرزی بە لای یەکێکەوە هەبێ و بە پەلە داوای قەرزەکەی نەکاتەوە و ئاسانکاری بۆ کەسی قەرزار بکات تا ئەو کاتەی پارەی دەبێ و ئینجا دەیداتەوە، ئەوا خوای گەورەش لە دونیاو قیامەتدا ئاسانکاری بۆ دەکات، وەکو پاداشتێك بۆ کردەوە باشەکەی کە بەرامبەر بە کەسی قەرزار کردویەتی، پاداشت لە ڕەگەزی کردەوەیە.

ومن ستر مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللهُ فِي الدُّنْيا والآخِرَةِ[1]،

---

(١)_ هەر کەسێك هەڵەو تاوانێکی لە برا موسڵمانەکەی بەدی کرد، چونکە مرۆڤ پارێزراو نییەو هەندێ هەڵەی لێدەوەشێتەوە، هەندێ تاوانی لێدەوەشێتەوە، با هەر کەسێك بەو هەڵەو تاوانانەی زانی دایانپۆشێت و هەڵەکانی لە نێو خەڵکدا بڵاونەکاتەوە، بەڵکو با ئامۆژگاری بکات، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا هەڵەی ئەم کەسە دادەپۆشێت، پاداشت لە ڕەگەزی کردەوەیە، چونکە مرۆڤ هەڵەی هەیەو ئەگەر هەڵەکانی لە لایەن خەڵکەوە داپۆشرێت، ئەوا خوای گەورەش لە ڕۆژی قیامەتدا هەڵەو تاوانەکانیان دادەپۆشێت. بەڵام ئەگەر هەڵەو تاوانی برا موسڵمانەکەی ئاشکرا کرد و ناوی زڕاند و هەڵەکانی لەنێو خەڵکدا بڵاو کردەوە، ئەوا خوای گەورەش ڕیسوای دەکات و، هەڵەکانی لە نێو خەڵکدا بڵاو دەکاتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((يا معْشَرَ مَنْ آمَنَ بِلِسَانِهِ وَلَمْ يُفْضِ الْإِيمَانُ الى قَلْبَهُ لاَ تُؤْذوا المسلمين، وَلاَ تَتَّبِعُوا عَوْرَاتِهِمْ، فَإِنَّ مَنْ تَتَبَّعَ عَوْرَةَ أخيهِ المسْلِمْ، تَتَبَّعَ اللَّهُ عَوْرَتَهُ، وَمَنْ تَتَبَّعَ اللَّهُ عَوْرَتَهُ، يُوشِكُ أَنْ يَفْضَحُهُ)) واتە: ((ئەی کۆمەڵی ئەوانەی کە تەنها بە زمانیان موسڵمان بوونە و ئیمان نەچۆتە دڵیانەوە ئازاری موسڵمانە تەواوەکان مەدەن و بە دوای هەڵەو تاوانەکانیاندا مەگەڕێن، چونکە هەر کەسێك بە دوای هەڵەو عەیبی برا موسڵمانەکەیدا بگەڕێت، خوای گەورەش عەیب و ناتەواویەکانی ئاشکرا دەکات، خوای گەورە کە عەیب و ناتەواوی هەر کەسێکی ئاشکرا کرد، نزیکە ڕیسوای بکات))، کەوا بوو داپۆشینی هەڵەو عەیبی خەڵك پێویستە پاش ئامۆژگاری کردنیان.

والله في عَوْنِ العَبْدِ ما كانَ العَبْدُ في عَوْنِ أخيهِ[١]، ومَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فيهِ عِلْمًا سَهَّلَ اللهُ بِهِ طَرِيقًا إلى الجَنَّةِ[٢]،

---

(١)_هەروەها خوای گەورە لە یارمەتیدانی بەندەکەیدا دەبێ چەند بەندەکەی لە یارمەتیدانی براکەیدا بێت، ئیماندار یارمەتی براکەی لە دینەکەیدا، لە دونیاکەیدا دەدات، لە ئەنجامدانی بەرژەوندیەکانیدا یارمەتی دەدات، کەوا بوو هەر کەسێك یارمەتی برا موسڵمانەکەی بدات، خوای گەورەش یارمەتی دەدات، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾[المائدة:٢] واتە: ﴿تَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى﴾ کۆمەکی بکەن لەسەر چاکەو پارێزکاری ﴿وَلاَ تَعَاوَنُواْ﴾ کۆمەکی یەکتر مەکەن ﴿عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾ لەسەر تاوان و دەست درێژی.

(٢)_ ئەمە هاندانی تێدایە بۆ فێر بوونی زانست، هەر کەس ڕێگەی فێر بوونی زانستێك بگرێتەبەر، خوای گەورەش بەو هۆیەوە ڕێگەیەکی بۆ بەهەشت ئاسان دەکات، پاداشت لە ڕەگەزی کردەویە، بۆیە وەکو چۆن مرۆڤ ڕێگەی فێر بوونی زانست دەگرێتە بەر، بە ئارەزووی سوود وەرگرتن لە فێر بوونی زانست و، سوود گەیاندن بە کەسانی تریش، بەو جۆرە خوای گەورە ڕێگەیەکی بۆ بەهەشت ئاسان دەکات، کەوا بوو ئەم دێڕە فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ هانی مرۆڤ دەدات بۆ ئەوەی کۆششی فێر بوونی زانست بکات و تەمبەڵینەکات و مەیلی حەوانەوە نەکات، بێگومان گەڕان بە دوای فێر بوونی زانستدا ماندویەتی تێدایە، ناڕەحەتی تێدایە، بەڵام بەشێکە لەتێکۆشان لە پێناوی خوادا، پێوستە مرۆڤ بە ئارام بێت، چونکە فێر بوونی زانست بە حەوانەوەو تەمەبڵی دەستگیر نابێت، بەڵکو بە ماندوبون و شەونخوونیی و لێکۆڵینەوەو گەڕان و پرسیار کردن دەستگیر دەبێ، بە پرسیار کردن لە ئەهلی زانست و ئامادە بوونی مەجلیسەکانی یادکردنەوە با دووریش بێت دەستگیر دەبێ، تا ئەمەبە گرتنەبەری ڕێگەی فێر بوونی زانست.

وما اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللهِ يَتْلُونَ كِتَابَ اللهِ وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ إِلاَّ نَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ، وغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وحَفَّتْهُمُ الْمَلائِكَةُ، وذَكَرَهُمُ اللهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ(١)،

---

(١)_ ئەمە فەزڵ و چاکێتی فێر بوونی زانستمان لە مزگەوتەکان و لە ماڵەکانی خوادا بۆ ڕوون دەکاتەوە، ئەمە چاکترین شوێنە بۆ زانست فێر بوون، چونکە ئەو سوودانەی تێدا دەستگیر دەبێت: دڵ ئارامیان بەسەردا دادەبەزێت، ڕەحمەت و بەزەیی دایان دەپۆشێت، فریشتە بەرێزەکان چواردەوریان دەگرن، لە هەمووشی گەورەتر ئەوەیە خوای گەورەش لەنێو کۆمەڵی هەرە بەرزی فریشتەکان یادیان دەکات، ئەمە فەزڵی فێر بوونی زانستی تێدایە لە مزگەوتەکاندا کە ماڵی خوایە، پێویستە ماڵی خوا بەو شتانە زیندوو بکرێتەوە، بۆ ئەوەی ئەو موسڵمانانەی ئامشۆی مزگەوت دەکەن، سوود وەرگرن، بێگومان ئەوەش ئاوەدانکردنەوەی مزگەوتەکانی ماڵانی خوای گەورەیە، بۆیە چاکترین شوێنێك بۆ فێر بوونی زانست مزگەوتەکانە، هیچ ڕێگرییەکیش نیە بۆ ئەوەی زانست لە خوێندنگا و پەیمانگا و کۆلیجەکان وغەیری ئەو شوێنانەش وەربگیرێت، بەڵام گەڕان بە دوای فێر بوونی زانست لە سارداوەی ژێرخان و ئەشکەوتەکان و خەڵوەتگاکان و غەیری ئەو جێگە نادیارو نهێنیانە، ئەوە جایز نییە و پێدەچێ هەندێ بیروبۆچونی تێکەڵ بکرێت، بە تایبەت لەم زەمەنەدا پێدەچێ هەندێ بیروبۆچونی خراپ و لادراوی تێکەڵ بێت بانگەواز خوازانی گومڕاییش ئامشۆی بکەن، کەوا بوو پێویستە مرۆڤ لەم شتانەو لەم جێگا گوماناویانە وریای خۆی بێت، ئەو کەسەی بە دوای فێر بوونی زانستدا دەگەڕێ، پێویستە بۆ ئەو جێگە گوماناویانە نەچێت، بەڵکو بۆ خانەکانی زانستی وەکو مزگەوتەکان و خوێندنگاکان و پەیمانگاکان و کۆلیجەکان دەچێت، چونکە ئەوانەن شوێنی فێربوونی زانست، چونکە کاروباری ئایین نهێنی و خۆشاردنەوەی تێدا نییە، دڵنیابن هیچ کەسێك لەو جێگە گوماناویانەدا خۆی ناشارێتەوە مەگەر مرۆڤێك کە بیروباوەڕێکی خراپی هەبێ و نەیەوێ خەڵکی پێی

بزانن، بەلام زانستی شەرعی هیچ شتێکی تێدا نییە بە لای خەڵکەوە نادیار بێت، بۆیە لە پێشەوا عومەری کوڕی عەبدولعەزیز دەگێڕنەوە فەرموویەتی: هەرکاتێک کەسانێک بەدی کرد لە فێر بوونی زانست یان لە کاروباری ئاییندا خۆیان دەشارنەوە، ئەوا بزانن نزیک بە دەروازی فیتنەیەکن یان لەدەرگای فیتنـەیان داوە، چونکە سوپاس بۆ خوا کاروباری ئایین ڕوونەو هیچ نهێنی و خۆشاردنەوەیەکی تێدا نییە، بـەڵکو پێویستە بۆ سـەرجەم مرۆڤایـەتی ئاشـکرا بکرێـت، بـۆ ئـەوەی سـوودی لێـوەربگرن، بۆ ئەوەی گومانـەکان بـە لای خەڵکـەوە نـەمێنێت و تۆمـەتبار نـەکرێن، ئەمـە شـتێکە پێویستە هەموو خەڵك ئاگاداری بێت، بە تایبەت لەم زەمەنەدا.

وَمَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ))[(١)] واتـه: ((هـەر كـەس تەنگانـەو نارەحەتيـەكى دونيايى لەسەر ئيماندارێك لابەرێت، ئەوا خواى گەورەش نارحەتيەك لە نارەحتيەكانى رۆژى قيامەتى لەسەر لا دەبات، وە هەر كەس لـە قـەرزارێك چـاو پۆشـى بكـات، ئـەوا خواى گەورەش لە دونياو قيامەتيشدا چاوپۆشى لىٚ دەكات هەر كەس عەيب و هەڵەى موسـڵمانێك داپۆشـيت، ئـەوا خـواى گـەورەش لـە دونيـاو قيامەتـدا عەيبـەكانى دادەپۆشێت، خواى گەوە لـە يارەمەتيـدانى بەندەكەيدا دەبىٚ هـەتا ئـەو كاتـەى كـە بەندەكەى لە يارمەتيدانى براكەيدا بێت وە هـەر كـەس ڕێگـەى فێـر بـوونى زانسـتێك بگرێتە بەر، خواى گەورەش بەو هۆيەوە ڕێگەيـەكى بـۆ بەهەشـت ئاسـان دەكـات، وە هيچ قـەومێك لـە ماڵێـك لـە ماڵـەكانى خـوادا دانەنشـتوون بـۆ خوێندنـەوەى قورئـان و ليتوێكردنى ماناكـانى لـە نێـوان خۆيانـدا مەگـەر دڵنارامييـان بەسـەردا دادەبـەزێت و رەحمەت و بەزەيى دەياندەپۆشێت و فريشته بەرێزەكان چواردەوريان دەگرن و خـواى گەورەش لـەنێو دەسـتەو كۆمـەڵێكى باشـتر لـە دەسـتەو كۆمەڵەكـەى خۆيـان باديـان دەكاتەوە هەر كەسيش كردەوەكانى دواى خات، بێگومـان چـاكێتى نەسـب و بنەماڵـە پێشى ناخات))،

---

(١)_ صحيح: أخرجه مسلم (٢٦٩٩) من حديث أبي هريرة ﷺ.

بێگومـان عيـبرەت بـەكردەوەى چـاكە، بـەڵام نەسـەب و بنەماڵـە بـەلاى خـواى گەورەوە مرۆڤ پێش ناخات، خواى گەورە دەفەرموێت: ﴿يا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾[الحجرات:١٣] واته: ﴿يا أَيُّهَا النَّاسُ﴾ ئەى خەڵكينە بێگومان ئێمە دروستمان كردون لە نێرو مـێ يـەك وكردومانن بە چەند گەل و هۆزەوە تا يەكترى بناسـن بـە ڕاسـتى بـەرێزترينتان لاى خوا پارێزكارترينتانە. پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى: ((لا فَضْلَ لِعَرَبِيٍّ عَلَى أَعْجَمِيٍّ، وَلا لأَبيَضَ على أَسْوَد، إلا بِالتَّقْوَى)) واته:

((نەعەرەبییەك فەزڵی بەسەر ئەعجەمیەكدا هەیە و نەسپی پێستێكیش فەزڵی بەسەر ڕەش پێستێكدا هەیە، مەگەر بە تەقواو لە خواترسان))، كەوا بوو نەسەب و بنەماڵ بەلای خوای گەورەوە مرۆڤ پێش ناخات، با سەر بە بەرزترین و بلندترین بنەماڵەكانیش بێت، بەرزێتی و بلندێتی بنەماڵە هیچ سوودێكی بە ئەبو لەهەبی مامی پێغەمبەری خوا ﷺ نەگەیاند، لەو بارەیەوە خوای گەورە ئایەتێكی دابەزاند كی تاوەكو ڕۆژی قیامەت دەخوێندرێتەوە ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ (١) مَا أَغْنَى عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ (٢) سَيَصْلَى نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ (٣) وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ (٤) فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِنْ مَسَدٍ (٥)﴾ واتە: لە ناو چێ هەر دوو دەستی ئەبولەهەب و لە ناویش چوو سوودی پێنەگەیاند دارایییەكەی و ئەوەی كە كردی (لە دوژمنایەتی پێغەمبەردا _ صلى الله عليه وسلم) بێگومان لەمەولا دەچێتە ناو ئاگری بلێسە دار لەگەڵ ژنەكەیدا، كە هەلگری داروچیلكەیە (بۆ نانەوەی ئاژاوە) هەمیشە گوریسێكی بادراو (لە پەلی خورمایی ئاگرین)و وا لە گەردنیدا. بەرزێتی و بلندێتی بنەماڵەكەی سوودی پێنەگەیاند، لەكاتێكدا كە لە خانەوادەكانی بەنی هاشم و مامی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، زیانیشی بە هاوەڵانی ڕێزدار بیلال و سەلمان و صوهەیب و خەبباب و عەماری كوڕی یاسر نەگەیاند، كە لە مەوالی و لایەنگران بوون، بەڵكو بوون بە كەسانێك لەگەورە هاوەڵان ﷺ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((وَمَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ)) واتە: هەر كەسێك كردەوەكانی دوایخات، نەسەب و بنەماڵە پێشی ناخات، با لەبنەماڵەیەكی بە ناو بانگیش بێت، بەلای خوای گەورەوە هیچ سوودێكی بۆ نابێت، خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ فَلَا أَنْسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَاءَلُونَ (١٠١) فَمَنْ ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (١٠٢) وَمَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ فَأُولَئِكَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنْفُسَهُمْ فِي جَهَنَّمَ خَالِدُونَ (١٠٣)﴾ [المؤمنون:١٠١_١٠٣]

---

---

---

---

واته: ئینجا کاتیّ فوو دەکریّ بەشەی پوردا لەو ڕۆژەدا هیچ خزمایەتیەك نامیّنیّ لە نیوانیاندا و پرسیاری یەکتری ناکەن ئینجا هەر کەسیّ کیّشراوە (چاکە)کانی قورس بیّت ئەوە ئەوانە ڕزگارو سەرکەوتوون و کەسیّ کیّشراوە (چاکە)کانی سووك بیّت ئەوانە کەسانیّکن زیانیان لە خۆیانداوە، خۆیان دۆڕاندوە لە دۆزەخ دان بیّ برانەوە.

بیّگومان هەر کەسیّك بنەماڵەی بەرزو بڵندی هەبیّت یان نەیبیّت، بە لای خوای گەورەوە هیچ سوودیّکی نییە، لە ڕۆژی قیامەتدا جگە لە کردەوەی چاك هیچ شتیّك سوودی نییە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((الرَّاحِمُونَ يَرْحَمُهُمُ الرَّحْمَنُ، ارْحَمُوا مَنْ فِي الأَرْضِ يَرْحَمْكُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ))[1] واتە: ((کەسانی بەڕەحم و بەزەیی خوای گەورە ڕەحمیان پێدەکات، ڕەحم و بەزەییتان بە خەڵکی سەر زەمیندا بێتەوە، ئەوەی لە ئاسمان ڕەحم و بەزەیی بۆتان دەبێت)).

---

(١)_ صحيح لشواهده: أخرجه الترمذي (١٩٢٤)، وقال: هذا حديث حسن صحيح، و ابو داود(٤٩٤١)، وأحمد (١٦٠/٢)، من طريق أبي قابوس، عن عبدالله بن عمرو _ رضي الله عنه _ مرفوعاً، وفي إسناده أبي قابوس، وهو مجهول إلا أنه قد توبع بلفظ آخر، تابعه حبان بن زيد الشرعبي عند أحمد (تحقيق أحمد شاكر:٦٥٤١)، بلفظ: ((ارحموا تُرحَموا، واغفروا يُغفر لكم...)) وله شواهد كثيرة متظافرة من الكتاب والسنة، فأخرج البخاري (٧٣٧٧) ومسلم (٩٢٣)، من حديث أسامة بن زيد _ رضي الله عنه _ أنه قال: ((إنما يرحم الله من عباده الرحماء)). وأخرج البخاري (٧٣٧٦)، ومسلم(٢٣١٩)، من حديث جرير بن عبدالله _ رضي الله عنه _ عن النبي _ صلى الله عليه وسلم _ قال: ((لايرحم الله من لا يرحم الناس)).

وأخرجه الطبراني في ((الكبير)) (٢٤٩٧)، من حديث جرير مرفوعاً بلفظ: ((من لا يرحم من في الأرض لا يرحمه من في السماء)).

ولمزيد طرق انظر: ((فتح الباري)) (٤٤٩/١٠).

هەروەها ئەم فەرموودەش ئەوەمان بۆ بەدەردەخات کە پاداشت لەڕەگەزی کردەوەیە، ئەو کەسانەی کە ڕەحم بەخەڵکی دەکەن و بەرامبەریان بە بەزەیین، بە نەرم ونیانی مامەڵیان لەگەڵ دەکەن و کەسی برسی تێر دەکەن و ڕووت پۆشتە دەکەن و خێرو صەدەقە بە هەژاران دەکەن، بێگومان خوای گەورە ڕەحمیان پێدەکات، ((ڕەحم و بەزەییتان بەخەڵکی سەر زەمیندا بێتەوە، ئەوەی لە ئاسمانە ڕەحم و بەزەیی بۆتان دەبێ)) مەبەست خوای گەورەیە کە ڕەحمیان پێدەکات، ئەو سوودەی لەم فەرموودەیەوە دەستگیرمان دەبێ ئەوەیە کە بەرزبوونەوەو لە ئاسمان بوونی خوای گەورە جێگیر دەکات.

**هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((أَنَا الرَّحْمَنُ، خَلَقْتُ الرَّحِمَ وَشَقَقْتُ لَهَا اسْماً مِنِ اسْمِي، فَمَنْ وَصَلَهَا وَصَلْتُهُ، وَمَنْ قَطَعَهَا قَطَعْتُهُ وَبَتَتُّهُ))[1] واتە: ((مـن رەحمـانم، (الرَّحِمَ) واتە خزم و کەسوکارم خولْقاندووە، لە ناوی خۆم ناوێکم بۆ داتاشیوە، بۆیە هەر کەس پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنێت دەیگەیەنم، هەر کەسیش بیپچڕێنێت دەیپچڕێنم)).**

---

(١)_ صحيح لشواهده: فله طرق: الأولى: سفيان عن الزهري، عن أبي سلمة بن عبدالرحمن بن عوف، عن أبيه مرفوعاً، أخرجه أبوداود في الزكاة (٤٥)، باب في صلة الرحم حديث (١٦٩٤)، وأحمد(١/١٩٤)، والترمذي(١٩٠٧)، وقال عقبة: حديث سفيان، عن الزهري حديث صحيح.

الثانية: معمر، عن الزهري، حدثني أبوسلمة بن عبدالرحمن أن أباالردادالليثي أخبره، عن عبدالرحمن بن عوف أنه سمع رسول الله _ صلى الله عليه وسلم.

أخرجه أحمد (١/١٩٤).

**هەروەها ئەم فەرموودەیەش بۆی ڕوون کردوینەتەوە کە پاداشت لە ڕەگەزی کردەوەیە، هەر کەس پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنێت، خواش بە پاداشتی دەگەیەنێت، هەرکەسیش پەیوەندی خزمایەتی بپچڕێنێت، خواش لە پاداشت دەیپچڕێنێت، کەوا بوو پاداشت لە ڕەگەزی کردەوەیە، (رەحمان) لە ناوەکانی خوای گەورەیەو ڕەحم و بەزەیی لە خۆ دەگرێت، (الرَّحمن) ناوی خوای گەورەیەو (الرَّحمة)ش سیفەتی خوای گەورەیە، هەروەها وشەی (الرَّحِمْ) واتە: پەیوەندی خزمایەتی لە ناوی (الرَّحمن) داتاشراوە، بۆیە ئەمە زۆر لەسەر گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی پێ داگری دەکات، خزم و کەسوکاری مرۆڤیش خزمەکانی لایەنی بابی و خزمەکانی لایەنی دایکێتی، خوای گەورە پاش مافی باب و دایك مافی بۆ ئەوانیش داناوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَبِذِي الْقُرْبَى﴾ [النساء: ٣٦]**

واتە: بەس خوا بپەرستن وهیچ شتێك مەكەن بە هاوبەشی هەروەها لەگەڵ باوك و دایكتاندا چاك بن و لە گەڵ خزم و نزیكان، مافەكانی ئەوانی لە پلەی سێیەمدا داناوە، ماڵ خوای گەورە، ئینجا باب و دایك، دواتر خزمان، كەوا بوو ئاماژەیەكی بەهێزە بۆ پێویستێتی گەیاندنی خزمایەتی، خوای گەورە لەو كەسانەش كە پەیوەندی خزمایەتی خۆیان دەپچڕێنن هەڕەشەی كردووە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ (٢٢) أُولَٰئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَىٰ أَبْصَارَهُمْ (٢٣)﴾[محمد: ٢٢_٢٣] واتە: جا ئایا ئێوە بەتەمان (ئەی ناپاكان) ئەگەر پشت هەڵكەن (لە ئیسلام و جیهاد) لە زەویدا ئاژاوەو خراپە بەرپا بكەن و هەر چی پەیوەندی خزمایەتی یە بیپچڕێنن ئا ئەوانە ئەو كەسانەن كە خوا نەفرینی لێ كردوون و كەڕی كردوون و چاویانی كوێر كردووە. مانای ئەم فەرموودەیە ئەوەیە كە هەر كەسێك پەیوەندیەكانی خزمانی خۆی بگەیەنێت، خوای گەورەش لە دونیاو قیامەتدا بە هەموو خێرو نیعمەت و بەرەكەتێكی دەگەیەنێت، هەر كەسێش بیپچڕێنێت، خوای گەورەش دەیپچڕێنێت و، لە هەموو خێرێك بێبەشی دەكات، بەم جۆرە پاداشتی دەداتەوە، چونكە پاداشت لە ڕەگەزی كردەوەیە، خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿هَلْ جَزَاءُ الْإِحْسَانِ إِلَّا الْإِحْسَانُ﴾[الرحمن: ٦٠] واتە: ئایا پاداشتی چاكە هەر چاكە نییە.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((وَمَنْ وَصَلَها وَصَلَهُ الله، وَمَنْ قَطَعَها قَطَعَهُ الله))[1] واتە: ((هەر کەس بیگەیەنێت خوای گەورە دەیگەیەنێ و هەر کەسیش بیپچڕێنێت خوای گەورە دەیپچڕێنێت)).

هاوشێوەی ئەم فەرموودانەش زۆرن.

---

(١)_ صحيح: أخرجه البخاري (٥٩٨٩)، ومسلم (٢٥٥٥) من حديث عائشة قالت: قال رسول الله ﷺ ((الرحم معلقة بالعرش تقول من وصلني وصله الله ومن قطعني قطعه الله)) (واللفظ لمسلم).

وأخرجه البخاري (٥٩٨٧)، ومسلم (٢٥٥٤)، من حديث أبي هريرة ﷺ قال: قال رسول الله ﷺ ((إنَّ الله خلق الخلق، حتى إذا فرغ من خلقه، قال الرحم: هذا مقام العائذ بك من القطيعة، قال: نعم، أما ترضين أنْ أَصِلَ مَنْ وصلك وأقطع مَنْ قَطَعَكَ؟ قالت: بَلى يا رب، قالَ: فهو لك)).

وللحديث طرق وألفاظ أخرى كثيرة.

((من وَصَلَها)) واتە: هەر کەس پەیوەندی خزمانی خۆی بگەیەنێت، خوای گەورەش دەیگەیەنێت، وەکو پاداشتێك بۆ کردەوە چاکەکەی بەهەموو خێرێکی دەگەیەنێت، ((وَمَنْ قَطَعَها)) واتە پەیوەندی خزمانی خۆی بپچڕێنێت، خوای گەورەش لە هەموو خێرێکی دەپچڕێنێت، ئەمەیە پاداشتی کردەوەی خراپ.

هەموو ئەو فەرموودانەی شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێ بێت _ لێرەدا باسیان دەکات، بۆ تێگەیاندنی ئێمەیە کە لەڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە پاداشتی ئەهلی بەهەشت بەپێی کردەوەکانی خۆیان دەداتەوە، بۆیە کەسانێکیان لە پێشکەوتوانی نزیکن (السابقون المقرَّبون)، کەسانێکیشیان لە چاکانن (الأبرار المقتصدون)، کەسانێکیشیان ستەمکارن لەنەفسی خۆیان وەکو دوو ڕووەکان و کافران.

وەلی و دۆستانی خواش دوو جۆرن: پێشکەوتووە نزیکەکان (السابقون المقربون) و چاکان (الأبرار المقتصدون أصحاب اليمين)، وەکو ئەوەی پێشتر ئاماژەی پێدرا[1].

پێغەمبەری خوا ﷺ کردەوەی هەر دوو جۆری دۆستانی خوای لە فەرموودەی (الأولياء)دا باسکردووە.

فقال: ((إِنَّ اللهَ تَعَالَى قَالَ: مَنْ عَادَى لِي وَلِيّاً فَقَدْ بَارَزَنِي بِالمحَارَبَةِ _ أَوْ فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالحَرْبِ. وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِيْ بِشَيءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ . ومَا يَزَالُ عَبْدِيْ يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ، فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ كُنْتُ سَمْعَهُ الَّذِيْ يَسْمَعُ بِهِ، وَبَصَرَهُ الَّذِيْ يُبْصِرُ بِهِ، وَيَدَهُ الَّتِي يَبْطِشُ بِهَا، وَرِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِيْ بِهَا))[2].

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((خوای گەورە دەفەرموێت: هەر کەس دوژمنایەتی لەگەڵ دۆستێکی مندا بکات بە ڕاستی شەڕی لە دژ ڕاگەیاندووم _ یا خود بە ڕاستی شەڕم لە دژی ڕاگەیاندووە _ وە بەندەکەم بە هیچ شتێك لێم نزیك نەبۆتەوەو خۆشەویستر بێت بە لامەوە بە ئەندازەی ئەو فەرزانەی کە بەسەریدام سەپاندووە، بەندەکەم بەردەوام بە سووننەت و نافیلەکان لێم نزیك دەبێتەوە تا خۆشم دەوێ، کاتێ خۆشم ویست گوێیەکانی دەپارێزم کە پێی دەبیستێ، چاوەکانی کە پێی دەبینێ، دەستەکانی کە زەبرو زەنگی پێدەکات، پێیەکانی کە ڕێی پێدەکات)).

---

(١)_ پێشتر لە سوڕەتی (الواقعة) و (الإنسان)دا ئاماژەی پێدرا.

(٢)_ ئەم فەرموودەیە پێشتر ئاماژەی پێدرا، ئیمامی بوخاری دەیگێڕێتەوە، فەرموودەیەکی قودسیە، خوای گەورە فەرموویەتی: ((مَنْ عَادَى لِي وَلِيّاً فَقَدْ بَارَزَنِي بِالمحَارَبَةِ)) هەر کەس دوژمنایەتی لەگەڵ دۆستێکی من بکات بە ڕاستی شەڕی لە دژ ڕاگەیاندووم، خوای گەروە بۆ دۆستانی خۆی تۆڵە دەکاتەوە، بۆیە هەر کەس ئازاریان بدات یان دوژمنایەتیان بکات، بێگومان خوای گەورە بە سزادانی هەنووکەیی و دواتر،

ئاشکرایی و نهێنیتی جەنگیان لەگەڵ دەکات، پاشان دەفەرموێت: ((وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِيْ بِشَيءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ. وَمَا يَزَالُ عَبْدِيْ يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ)) و بەندەکەم بە هیچ شتێك لێم نزیك نەبۆتەوە کە خۆشەویستر بێت بەلامەوە بە ئەندازەی ئەو فەرزانەی کە بەسەریدا سەپاندوومە، بەندەکەم بەردەوام بە سوونەت و نافیلەکان لێم نزیك دەبێتەوە، ئەمە کردەوەی پێشکەوتووە نزیکەکانە (السابقون المقرّبون)، ئەم کۆمەڵە بە بەجێهێنانی فەرزەکان و سوونەت و نافیلەکان لە خوای گەورە نزیك دەبنەوە، پاداشتەکەشیان ئەوەیە کە خوای گەورە ڕێنوێنی ڕێگەی ڕاستیان دەکات و سەرکەوتوویان دەکات و، لەسەر بەجێهێنانی کردەوەی چاك جێگیریان دەکات، پاشان دەفەرموێت: ((حَتَّى أُحِبَّهُ)) خوای گەورە خۆشی دەوێن ((فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ كُنْتُ سَمْعَهُ الَّذِيْ يَسْمَعُ بِهِ، وَبَصَرَهُ الَّذِيْ يُبْصِرُ بِهِ، وَيَدَهُ الَّتِي يَبْطِشُ بِهَا، وَرِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِيْ بِهَا)) مانای ئەوەیە کە خوای گەورە پاڵپشتیان دەکات و سەریان دەخات و ڕێگەی ڕاستیان پیشان دەدات، سەبارەت بەوەی کە ئامادە نییە شتی تری گوێبیست بێت جگە لەوەی سوودی پێ دەگەیەنێت، گوێبیستی زیکرو یادکردنەوە دەبێ، گوێبیستی زانست دەبێ، چونکە خوای گەورە لە بواری بیستندا ڕێگەی ڕاستی پیشانداون، بۆیە خۆی لە حەرام کراوەکان بە دوور دەگرێت و، گوێبیستی قسەی پڕوپوچ و ڕابواردن و گۆرانی و غەیبەت و دوو زمانی نابێ، گوێبیستی هیچ شتێك نابێ کە خوای گەورە تووڕە بکات، هەروەها تەماشای هیچ شتێك ناکات جگە لەوەی سوودی بۆ دەبێ، بۆیە تەماشای مەخلوقاتی خواو نیشانەو بەڵگەو شتە سەرسوڕمێنەکانی دەکا و بیر دەکاتەوە و لەو شتانە ڕادەمێنێ و دەیانکات بە بەڵگە بۆ توانا و تاکێتی خوای گەورە و شایان بوونی بە پەرستن، تەماشای حەرام کراوەکان ناکات، ئامادە نییە تەماشای ئەو شتانە بکات کە دەبنە هۆی تووڕە بوونی خوای

گەورە، گوێ و چاوەکانی لەو بوارانەدا بەکار دێنێ کە کەڵکیان بۆ هەبێ و سوودی پێ دەگەیەنن، واز لەهەموو ئەوانە دێنێ کە زیانی دەگەیەنن و ئـاین و ڕەوشتی خراپ بکەن. هەروەها ڕێناکات تەنها بۆ ئەو جێگایانە نەبێ کە بەرژەوەندی بۆ دەستەبەر دەکات، هیچ شتێك بە دەستەکانی هەڵناگرێ و هیچ شتێك بەدەستەکانی نابەخشێ مەگەر لەو بوارانەدا کە بەرژەوەندی خۆی تێدایە، بۆیە شتی حەرام هەڵناگرێ و بە دەستەکانی لە هیچ کەس نادات، ستەم لە هیچ کەسناکات، دەستەکانی لە حەرام و ستەمدا بەکارناهێنێ، لە ڕاستیدا تەنها لە پێناوی خوادا دەباو دەبەخشێ، دەستەکانی لە گوێڕایەڵی خوای گەورەدا بە کاردێنێ، هەروەها ڕێناکات تەنها بۆ ئەو شوێنانە نەبێ کە جێگەی ڕەزامەندی خوای گەورەیە، وەکو ڕێکردن بۆ مزگەوتەکان، بۆ ئەڵقەکانی زیکرو یادکردنەوە، ڕێکردن بۆ گوێڕایەڵی خوای گەورە لە هەر جێگەیەك بێت، ڕێناکات تەنها بۆ ئەو شوێنانە نەبێ کە گوێڕایەڵی خوای گەورەی تێدایە، ڕێناکات بۆ ئەو شوێنانەی کە خوای گەورە حەرامی کردون، بەڵکو بۆ ئەو شوێنانەی کە گوێڕایەڵی و خەیر و زیکر و فێر بوونی زانستی بە سوودی تێدایە ڕێدەکات.

کەوا بوو (الأبرار المقتصدون أصحاب اليمين) ئەوانەن کە خۆیان بە بەجێهێنانی فەرزەکان لە خوای گەورە نزیك دەکەنەوە، ئەو فەرزانە بەجێدێنن کە خوای گەورە بەسەریاندا سەپاندوونی و واز لەو شتانە دێنن کە خوای گەورە لەسەری حەرام کردوون[1] بەڵام خۆیان بە بەجێهێنانی مەندوو باتەوە ماندوو ناکەن و لە زیادەی موباح و ڕێپێدراویش نەفسی خۆیان ناگرنەوە[2].

بەڵام چینی پێشکەوتووە نزیکەکان (السابقون المقرَّبون) بە بەجێهێنانی فەرز و نافیلەو سوونەتەکان خۆیان لە خوای گەورە نزیك کردەوە[3]، واجیبات و موستەحیباتەکانیان بەجێهێنا و حەرام کراو و مەکروهەکانیان واز لێهێنا[4].

---

(۱)_ ئەمانە (الأبرار المقتصدون أصحاب اليمين)ن، ئەم کۆمەڵە تەنها فەرزەکانیان بەجێهێناوە و خۆیان لە حەرامەکان بە دوور گرتووە، پێدەچێ سوونەت و نافیلەکانیش وازلێبێنن و، شتێك لە مەکروهەکان ئەنجام بدەن، یان شتێك لە موباح و ڕێپێدراوەکان ئەنجام بدەن کە نەفسیان ئارەزووی دەکات. بۆیە ئەم کۆمەڵە کاتێ هەندێ شتی موباح و ڕێپێدراویان بەنەفسی خۆیاندا کە ئارەزووی دەکات و پێی دەحەوێتەوە، کاتێ کردەوەکانی خۆیان لەگەڵ ئەو شتانەدا تێکەڵ کرد، خوای گەورە لە ڕۆژی دوایدا شەرابی بەهەشتی بۆ تێکەڵکردن. پاداشت لە ڕەگەزی کردەوەیە.

(۲)_ موباح و ڕێپێدراوی زیاد، واتە: نەفسیان چ حەز پێ بکات لە موباح و ڕێپێدراوەکان دەیدەنێ، ئەمانە هەندێ لە ڕێپێدراوەکانی ژیان بە نەفسی خۆیان دەدەن، ئەم شتانە موباح و ڕێپێدراون و هیچی تێدا نییە، بەڵام لای خوای گەورە پاداشتەکانیان کەم دەبێتەوە و لەگەڵ چینی پێشکەوتووە نزیکەکاندا نابن.

(۳)_ ئەمەیە جیاوازی و تایبەتمەندیەکەیان.

(٤)_ هەموو کارو کردەوەکانیان بۆ خوای گەورە بوو، هیچ شتێکیان بە نەفسی خۆیان نەدا، وەکو ئەوەی چاکان (الأبرار المقتصدون) ئەنجامیان دەدا، هەموو ژیانیان بۆ خوا بوو.

کاتێ لە خوا نزیك بوونەوە بە بەجێهێنانی هەموو ئەو کردەوانەی کە توانایان بەسەریدا دەشکێ و خوا خۆشی دەوێن، پەروەردگار بە خۆشویستنێکی تەواو خۆشیویستن[1] چونکە لە فەرموودەکەی پێشوودا هاتووە: ((وَمَا يَزَالُ عَبْدِيْ يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ)) بەندەکەم بەردەوام بەسوونەت و نافیلەکان لێم نزیك دەبێتەوە تا خۆشم دەوێ، مەبەستی خۆشویستنێکی تەواو تەواوە(الحب المطلق)[2]، ئەمەش بەهاوشێوەی ئایەتەکەی خوای گەورەیە کە دەفەرموێت: ﴿اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ (٦)صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ﴾[الفاتحة: ٦_٧] واتە: ڕێنموونیمان بکە بۆ ڕێگای ڕاست ڕێگای ئەوانەی کە چاکەت لەگەڵ کردوون نەك (ڕێی) ئەوانەی خەشمی (تۆیان) لێگیراوە (بەهۆی ئەوەوە دەیزانن لایان داوە وەك جولەکەکان و هاوکردارییان) نەك (ڕێی) گومڕایان (بەهۆی لاساری و نەزانینیانەوە وەك گاورەکان و هاوکردارییان).

---

(١)_ پەسەندیتی پاداشتی خوایان دا بەسەر ئارەزوواتی نەفسی خۆیاندا ئەگەرچی موباح و ڕێپێدراویش بێت، لە بەر خاتری خوای گەورە لە هەموو ئەو شتانە وازیان هێنا، ئەگەرچی موباح و ڕێپێدراویش بێت، بۆیە پلە و پایە بەرزەکەیان بەدەست هێنا، پلەی پێشکەوتووە نزیکەکان(السابقون المقرّبون).

(٢)_ خۆشویستنی تەواو، خۆشی دەوێن خۆشویستنێکی تەواو، خوای گەورە چاکان (الأبرار المقتصدون)ی خۆش دەوێ و، ڕقی لەو موسڵمانانەیە کە بە تاوان کردن ستەم لە نەفسی خۆیان دەکەن، بەڵام خۆشویستنی تەواو تەواو بۆ پێشکەوتووە نزیکەکانە (السابقون المقرّبون)، چاکانیش (الأبرار المقتصدون) بەشیان لەو خۆشویستنە لە چینی یەکەم کەمترەو، ستەمکاران لە نەفسی خۆشیان لە هەر دوو چینەکە کەمتر.

لێرەدا كە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ﴾ واتە: ئەوانەی چاكەو نیعمەتی تەواو تەواوی پێ بەخشیون(أنعم عليهم الإنعام المطلق التام)، ئەو چاكەو نیعمەتە تەواو تەواوەیە كە لەم ئایەتەدا باسی دەكات ﴿وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقًا﴾[1] [النساء: ٦٩] واتە: هەر كەسێك گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر بكات جا ئەوانە لەگەڵ كەسانێكن كە خوا بەهرەی ڕشتوە بەسەریاندا لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاو چاكان ئەوانە چ هاوڕێ و هاوەڵێكی چاكن.

موباح و ڕێپێدراوەكان بۆ ئەو پێشكەوتووە نزیكەكانە (السابقون المقرّبون) بوو بە تاعەت و گوێڕایەڵی پێی لەخوای گەورە نزیكدەبنەوە[2]،

---

(١)_ خوای گەورە نیعمەتی تەواوی خۆی بەسەر پێشكەوتووە نزیكەكاندا(السابقون المقرّبون) ڕشتووە، كە هیچ ناتەواویەكی تێدا نیە، (الإنعام المطلق)ی پێداون، بەڵام ئەوانەی لە خواری ئەوانەوەن خوای گەورە نیعمەتی خۆی بەسەر دارشتوون، بەڵام بە گوێرەی نیعمەتی چینی یەكەم نیە، (مطلق الإنعام)ی پێداون، لە نێوان (الإنعام المطلق) و (مطلق الإنعام)دا جیاوازی هەیە، چونكە (مطلق الإنعام) كەمو كورتی تێدایە، بەڵام (الإنعام المطلق) تەواوەو هیچ كەموكورتیەكی تێدا نییە، كەوا بوو پادشت دانەوەیەكە لە ڕەگەزی كردەوە، ئەگینا چاكان (الأبرار المقتصدون)یش خوای گەورە نیعمەتێكی بەرزی پێداون، ستەم كاران لە نەفسی خۆشیان خوای گەورە نیعمەتی پێداون بە ئەندازەی ئەو ئیمان و هیدایەتەی كە پێیانە، بەڵام نیعمەتێكە لەنیعمەتی (الأبرار المقتصدون) كەمترە، نیعمەتی ئەمانیش لە نیعمەتی پێشكەوتووە نزیكەكان كەمترە.

(٢)_ واتە: سەرەڕای مەكروهەكان و حەرامەكان بە وازهێنان لە موباح و ڕێپێدراوەكانیش خۆیان لە خوای گەورە نزیك دەكەنەوە، بۆیە هەر هەموو كردەوەكانیان بو بە پەرستنی خوای گەورە.

سەراپای کردەوەکانیان بوو بە تاعەت و پەرستن بۆ خوای گەورە، بۆیە شەرابی بەهەشت بەپوختی و پاکی و بێ تێکەڵکردن دەخۆنەوە، وەکو چۆن کردەوەو پەرستنەکانیان بە پوختی و پاکی و دلسۆزی بۆ خوای گەورە ئەنجام دا[1].

بەلام چاکان (الأبرار المقتصدون) جگە لەو کردەوانەی کە بۆ خوای گەورەیان ئەنجام دابوو، هەندێ شتیان بۆ خودی خۆیان ئەنجام دابوو[2]، بۆیە ئەپاداشتیان دەدرێتەوەو ئەسزاشیان دەدرێت[3]، شەرابی بەهەشتیان بەپوختی و پاکی نەخواردەوە، بەلکو شەرابەکەی چینی (المقربين)یان بۆ تێکەلکرا، بەگوێرەی ئەوەی لە دونیادا کردەوەکانی خۆیان تێکەڵ دەکرد[4].

---

(١)_ لە ڕۆژی قیامەتدا لە شەرابی بەهەشتیان بە پوختی و پاکی خواردەوە، کە تێکەڵ بەهیچ نەکرابوو، خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ اللَّهِ﴾ واتە پێشکەوتووە نزیکەکان لێی دەخۆنەوە، لەکاتێدا ئەوەی بۆ باسکردوین کە چاکان (الأبرار) ﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا﴾ چاکان لە پەرداخێکدا شەرابی بەهەشت دەخۆنەوە کە تێکەڵکراوی کافورە، بۆنی خۆشە بەلام وەکو پاك و پوختەکە نییە.

(٢)_ واتە: لە موباح و ڕێپێدراوەکان لەزەتیان وەردەگرت و هەندێ حەوانەوەیان بەنەفسی خۆیاندەدا، بۆیە ئەپاداشتیان دەدرێتەوەو، ئەسزاشیان دەدرێت، لە شەرعدا موباح ئەوەیە کە هەردوو لاکەی یەکسان بێت، نەپاداشتی تێدایەو، نەسزاشی تێدایە، بۆیە لەبەر ئەوەی هەندێ حەوانەوەیان بەنەفسی خۆیاندا لە ڕۆژی قیامەتدا پاداشتەکەشیان کەم بوویە لە چاو پلەی پێشکەوتووە نزیکەکاندا. دەلێن: (حسنات الأبرار سيئات المقربين) واتە: کردەوە چاکەکانی چینی (الأبرار المقتصدون) کردەوە خراپەکانی چینی (السابقون المقربون)ە، چونکە (السابقون المقربون) ئەو حەوانەوە بە نەفسی خۆیان نادەن کە چینی (الأبرار المقتصدون) بە نەفسی خۆیانی دەدەن.

(٣)_ بەلام پاداشتەکەیان لە پاداشتی چینی (السابقين المقربين)دا کەمترە.

(٤)_ لەگەڵ کافورو، لەگەڵ میسکدا بۆیان تێکەڵکرا.

## بەندایەتی و پێغەمبەرایەتی، پێغەمبەرایەتی پادشایەتی

هاوتای دابەشبوونی دۆستانی خوای گەورە پێغەمبەرانیش بۆ بەندەی پێغەمبەر و پێغەمبەری پادشا دابەش دەبن[1]، خوای گەورە موحەممەدی ﷺ لە نێوان بەندایەتی پێغەمبەرایەتی و پێغەمبەرایەتی و پادشایەتیدا سەرپشك كرد، ئەویش بەندایەتی بۆ خواو پێغەمبەرایەتی هەڵبژارد.

پێغەمبەرە پادشاكان وەكو: داودو سولەیمان و بەو هاوشێوانە _ علیهم الصلاة والسلام _.

خوای گەورە لە چیرۆكی سولەیماندا دەفەرموێت: ﴿قَالَ رَبِّ اغْفِرْ لِي وَهَبْ لِي مُلْكًا لَا يَنْبَغِي لِأَحَدٍ مِنْ بَعْدِي إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ (٣٥) فَسَخَّرْنَا لَهُ الرِّيحَ تَجْرِي بِأَمْرِهِ رُخَاءً حَيْثُ أَصَابَ (٣٦) وَالشَّيَاطِينَ كُلَّ بَنَّاءٍ وَغَوَّاصٍ (٣٧) وَآخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِي الْأَصْفَادِ (٣٨) هَذَا عَطَاؤُنَا فَامْنُنْ أَوْ أَمْسِكْ بِغَيْرِ حِسَابٍ (٣٩)﴾[ص: ٣٥_٣٩] واتە: (سولەیمان) ووتی ئەی پەروەردگارم لێم خۆشبەو دەستەڵات و پاشایەتێكم پێ ببەخشە ﴿لَا يَنْبَغِي لِأَحَدٍ مِنْ بَعْدِي﴾ كە دوای من دەست نەدا بۆ كەسی تر بێگومان تەنها تۆی بەخشندەی (هەموو شتێكی) (دوای نزاكەی) با مان بۆ ڕامهێنا بە فەرمانی ئەو بە نەرمیی دەڕۆیی بۆ هەر جێگەیەك بیویستایە وە هەموو (پەری و) شەیتانەكانمان بۆ ڕامهێنابوو كە بیناسازو مەلەوانی ژێر دەریابوون وە هەندێكی تریان (كە سەرپێچی سولەیمانیان كرد بوو ڕامان هێنان بۆی) بە پێكەوە بەستراوی لە كۆت و زنجیردا ئەمە (كە باسكرا) بەخششی ئێمەیە (بۆتۆ) ئینجا بەویستی خۆت ببەخشە یا بیگرەوەو مەیبەخشە بەبێ پرسینەوە (لێت).

---

(١)_ پێغەمبەران بۆ بەندەی پێغەمبەرو، پێغەمبەری پادشا دابەش دەبن، بێگومان بەندەو پێغەمبەر لە پێغەمبەرو پادشا چاكترە، یوسف و داود و سولەیمان _ علیهم السلام _لەو پێغەمبەرانە بوون كە پێغەمبەربوون و پادشاش بوون، پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ لە نێوان بوون بەبەندەە پێغەمبەرو، پێغەمبەری پادشادا سەرپشك كرا، ئەویش بەندایەتی خواو پێغەمبەرایەتی هەڵبژارد، بۆ خوای گەورە خاكێتی نواندو، ئەوەی هەڵبژارد كە بەندەو پێغەمبەر بێت، ئەو موڵك و پادشایەتیەی پێنەدرا وەكو ئەوەی بە یوسف و داودو سولەیمان _علیهم السلام _ درا.

مانای ئایەتی کۆتاش ئەوەیە کە بەویست و ئارەزووی خۆت بە هەر کەس دەبەخشی ببەخشە، لەهەر کەسێکیشی دەگریتەوە بیگرەوەو پێی مەبەخشە، پێغەمبەری پادشا ئەو کردەوانە ئەنجامدەدا کە خوای گەورە لەسەری فەرز کردوون و لەو کردەوانەش واز دەهێنێ کە خوای گەورە لەسەری حەرام کردوون، بەلام لە بواری فەرمانڕەوایی و ماڵ و داراییدا بەپێی حەزی خۆی و هەڵبژاردنی خۆی تەصەروف دەکات، بەبێ ئەوەی هیچ تاوانێکی لەسەر بێت[1].

---

(١)_ وەکو چۆن ئیمانداران چین چینن و هەندێکیان لە هەندێکی تریان چاکترن، هەر بەو جۆرەش پێغەمبەران هەندێکیان لە هەندێکی دیکەیان چاکترن، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ مِنْهُمْ مَنْ كَلَّمَ اللَّهُ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَاتٍ وَآتَيْنَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ الْبَيِّنَاتِ وَأَيَّدْنَاهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ﴾[البقرة: ٢٥٣] واتە: ئەو پێغەمبەرانەی (کە باسکران) ڕێزمانداوە بە هەندێکیان بەسەر هێندێکیاندا لەو پێغەمبەرانە هی وایانبووە کە خوا قسەی لەگەڵ کردووە (بەبێ پەردە) وە هەندێکیانی بەرز کردۆتەوە چەند پلەیەك وە دامان بە عیسای کوڕی مەریەم چەند بەڵگەیەکی (موعجیزەیەکی ئاشکرا) وە پشت گیریمان کرد بە فریشتەی سرووش (کە جبریلە). کەوابوو خوای گەورە ڕێزی هەندێ لەپێغەمبەرانی بەسەر هێندێکی دیکەیان دا داوە.

بەڵام بەندەی پێغەمبەر بە هیچ کەسێك نابەخشێت مەگەر بە فەرمانی پەروەردگاری، نابەخشێت بەهەر کەسێك ئارەزووی لێبێت و، بیگرێتەوە لەهەر کەس ئارەزووی لێبێت[1]، بەڵکو بەوانە دەبەخشێت کە پەروەردگاری فەرمانی داوە پێیان بەخشرێت، وە ئەو کەسانەش بە کار بەدەست دەکات، کە پەروەردگاری فەرمانی داوە بکرێن بە کار بەدەست، بۆیە هەر هەموو کردەوەکانی عیبادەت و پەرستنە بۆ خوای گەورە.

كما في ((صحيح البخاري)) عن أبي هريرة رضي الله عنه عن النبي ﷺ أنه قال: ((إنِّي واللَّهِ لا أُعطي أحدًا، ولا أمنعُ أحدًا، وإنَّما أنا قاسِمٌ أضَعُ حيثُ أُمرتُ))[2]، واتە: ((سوێند بەخوا من بە ڕای تایبەتیی خۆم بەهیچ کەس نابەخشم و، لە هیچ کەسێشی ناگرمەوە، بەڵکو لە ڕاستیدا من تەنها دابەشکارێکم و دەبەخشم و دەگرمەوە بە هەر کەسێك کە خوای گەورە فەرمانی پێدابم)).

---

(١)_ خوای گەورە ڕێیداوە بە پێغەمبەری ﷺ کە بەویست و ئارەزووی خۆی بە هەر کەسێك دەبەخشێت ببەخشێت، هەر کەسێکیش بێبەش دەکات بیکات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَامْنُنْ أَوْ أَمْسِكْ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ واتە: ببەخشە یان بیگرەوەو مەیبەخشە بەبێ هیچ پرسینەوەیەك، هیچیت لەسەر نابێ، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بەو جۆرە نییە بە ئارەزووی خۆی ببەخشێت و بیگرێتەوە، بەڵکو بەوانە دەبەخشێ کە خوای گەورە فەرمانی داوە پێیان ببەخشرێت، بەوانەش نابەخشێت کە خوای گەورە فەرمانی داوە پێیان نەدرێت، چونکە ئەم پێغەمبەرە بەندەیەو پاشا نییە.

(٢)_ صحيح: أخرجه البخاري (٣١١٧)، من حديث أبي هُريرة رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قال: ((ما أُعطيكمْ ولا أمنعكمْ إنما أنا قاسم أضع حيث أُمرتُ)).

وأخرج البخاري (٦١٩٦)، ومسلم (٢١٣٣)، من حديث جابر رضي الله عنه مرفوعاً...((فإنما أنا قاسمٌ أُقسِمُ بينكمْ)).

بۆیه خوای گەورە ماڵ و سامانە شەرعیەکان دەداتە پاڵ خۆی و پێغەمبەرەکەی ﷺ، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلِ الأَنفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ﴾[1] [الأنفال: ١] واته: تۆش بڵێ: ئەو دەست کەوتانە هەر بۆ خواو پێغەمبەرن ﷺ.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ﴾[2] [الحشر: ٧] واته: ئەوەی خوا دەست پێغەمبەری خست (بەبێ جەنگ لە(سەروەت وسامانی) دێهاتی یەکان ئەوە بۆ خواو بۆ پێغەمبەرە ﷺ.

---

(١)_ بۆیه ماڵ و دارایە شەرعیەکانی وەکو (الفيء) واتە ئەو دەستکەوتانەی کە بەبێ جەنگ دەستی موسڵمانان دەکەوێ، (الغنيمة والأنفال ) واتە: دەستکەوتەکانی جەنگی داوتە پاڵ خواو پێغەمبەر، وەکو ئەوەی لە ئایەتەکانی سەرەوەدا هاتووە، خوای گەورە ماڵ و دارایەکانی کردووە بەهی خواو پێغەمبەر، بە تەنها نەیکردووە بەهی پێغەمبەری ﷺ وەکو ئەوەی کرد بووی بە هی سولەیمان پێغەمبەر علیه السلام. پێغەمبەری خوا ﷺ نابەخشێ و ناگرێتەوە، بەڵکو خوای گەورەیە کە فەرمان بە بەخشین و گرتنەوە دەکات.

(٢)_ هی خواو پێغەمبەرە، تەماشا دەکەین پێغەمبەر بە تەنها لە بردنی (الفيء)دا تاك نەبۆتەوە، بەڵکو هی خواو پێغەمبەرە، بەڵام پێغەمبەر بەبێ فەرمانی خوای گەورە تەصەروفی پێوەناکات، پێغەمبەر تەنها فەرمان جێبەجێ دەکات، پێغەمبەر ﷺ جێبەجێکارە، کەوا بوو خوای گەورە دابەش دەکات و پێغەمبەر ﷺ تەنها جێبەجێکارە.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ﴾[1] [الأنفال: ٤١] واتە: بزانن بێگومان هەر چیەکتان لە غەنیمەت (دەستکەوت) گرت ئەوە بە ڕاستی پێنج یەکی ئەو (دەسکەوتە) بۆ خوایە وە بۆ پێغەمبەرە ﷺ.

---

(١)_ ئەو دەستکەوتانەی جەنگ کە بەدەستتان کەوتووە، باشە دەستکەوتەکانی جەنگ چۆن دابەش دەکرێت، بەپێی ئارەزووی خەڵك؟ بە پێی ئارەزووی پێغەمبەر؟ بەپێی ئارەزووی فڵان کەس؟ نەخێر، بەڵکو پێویستە لەم بوارەدا بۆ شەرعی خوا بگەڕێنەوە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ إِنْ كُنْتُمْ آمَنْتُمْ بِاللَّهِ وَمَا أَنْزَلْنَا عَلَى عَبْدِنَا يَوْمَ الْفُرْقَانِ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ﴾[الأنفال: ٤١] واتە: بزانن بێگومان هەر چیەکتان لە غەنیمەت (دەستکەوت) گرت ئەوە بە ڕاستی پێنج یەکی ئەو (دەسکەوتە) بۆ خوایە وە بۆ پێغەمبەرە ﷺ و بۆ خزمانی (پێغەمبەر ﷺ) و بۆ هەتیوان و بۆ هەژاران و بۆ ڕێبوارانە ئەگەر ئێوە باوەڕتان هێناوە بەخوا وە بەوەی ناردومانەتە خوارەوە بۆ سەر بەندەکەمان (کە موحەممەد پێغەمبەرە ﷺ) لە ڕۆژی جیاکردنەوەدا (واتە: جەنگی بەدر) ﴿يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ﴾ لەو ڕۆژەی کەدوو کۆمەڵ بە یەك گەیشتن (دژ بە بەیەك جەنگان). لە ئایەتەکەی تریشدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ كَيْ لا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الأَغْنِيَاءِ مِنْكُمْ وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا﴾[الحشر: ٧] واتە: ئەوەی خوا دەست پێغەمبەری خست (بەبێ جەنگ) لە(سەروەت وسامانی) دێهاتییەکان ئەوە بۆ خواو بۆ پێغەمبەرە ﷺ وە بۆ خزمان و هەتیوان وە بۆ هەژاران و ڕێبوارانی کەم دەست تا دەست بە دەستی پێ نەکرێ (ئەو سامانە) لە ناو دەوڵەمەنەکانتاندا و بەس و ئەوەی پێغەمبەر ﷺ

پێیدان وەربگرن ﴿وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا﴾ وە ئەوەی لێتانی قەدەغە کرد وازی لێبێنن. کاتێ خوای گەورە لە ئایەتەکەی سەرەوەدا دەفەرموێت: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ﴾ وە بزانن بێگومان هەر چیەکتان لە غەنیمەت و دەستکەوتان گرت، مەبەستی لەسەروەت و ماڵ و سامانی کافرانە لە جەنگدا، لە ئایەتەکەی تریشدا کە دەفەرموێت: ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ﴾ وەئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێیدان وەربگرن، چونکە پێغەمبەر ﷺ بەفەرمانی خوای گەورە شتەکان دەبەخشێت.

بۆیە دەرکەوتوترین بۆچونی زانایان ئەوە بوو کە ئەم دەستکەوتانەی جەنگ لەو بوارانەدا خەرج دەکرێت کە خواو پێغەمبەرەکەی پێیان خۆشەو، بە پێی ئیجتهادی کار بە دەستی موسڵمانان، ئەمە بۆچوونی پێشەوا مالك و غەیری ئەویشە لە پێشینی چاك، هەروەها ریوایەتێکی پێشەوا ئەحمەدیشە.

گوتراویشە: دەستکەوتەکانی جەنگ بەسەر پێنج دا دابەش دەکرێت، بە پێی بۆچونی شافیعی و بۆچونی زانراوی ئیمامی ئەحمەد _ ڕەحمەتی خوایان لێ بێت _[(١)]،

گووتراویشە بەسەر سێدا دابەش دەکرێت، بەپێی بۆچونی ئەبو حەنیفە[(٢)].

مەبەستی سەرەکی: لێرەدا ئەوەیە کە بەندە پێغەمبەرەکان لە پێغەمبەرە پادشاکان چاکترن[(٣)]

---

(١)_ ئەم بۆچونە لەسەر ئەو ئایەتە دامەزراوە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ﴾ لێرەدا بەشی خواو پێغەمبەر یەك بەشە، ﴿وَلِذِي الْقُرْبَى﴾ بەشێك، ئەمە دوو، ﴿وَالْيَتَامَى﴾ بەشێك، ئەمە سێ ﴿وَالْمَسَاكِينِ﴾ بەشێك، ئەمە چوار ﴿وَابْنِ السَّبِيلِ﴾ بەشێك، ئەمە پێنج، کەوا بوو (خُمس) پێنج یەك بەو ناو براوانەی نێو ئایەتەکە دەدرێت.

(٢)_ بە پێی بۆچونی ئەبو حەنیفە دابەشی سێ دەکرێت ﴿وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ﴾.

(٣)_ شێخولئیسلام _ڕەحمەتی خوای لێ بێت_ کە لە باسە سەرەکیەکە لایداوەو، باسی دابەش کردنی دەستکەوتەکانی جەنگ دەکات، لە ڕاستیدا بۆ درێژە پێدان لە باسکردنی هەندێ بابەتی پێویستدا، ئەگینا ناوەڕۆکی بابەتەکە باسی پێغەمبەرانی بەندەو، پێغەمبەری پادشاکان دەکات.

کەوا بوو ئیبڕاهیم و مووسا و عیسا و موحەممەد _ علیهم الصلاة والسلام _ لە یوسف و داود و سولەیمان _ علیهم الصلاة والسلام _ چاکترن[١]، وەکو چۆن پێشکەوتووە نزیکەکان (السابقون المقرَبون) لە دۆستە چاکەکانی خاوەنانی دەستی ڕاست (الأبرار أصحاب اليمين) چاکترن، ئەمانە نزیکانی پێشکەوتوو نین ( المقرّبين السابقين)، بۆیە هەر کەسێك واجیباتەکانی سەرشانی ئەنجام بدات و، ئەو موباح و ڕێپێدراوانە ئەنجام بدات کە حەزی پێیەتی، ئەوە لە دۆستە چاکەکانی خاوەنانی دەستی ڕاست (الأبرار أصحاب اليمين)ن، بەڵام هەر کەسێك ئەو شتانە ئەنجام بدات کە خوای گەورە حەزی لێیەتی و پێی ڕازیە، وە موباح و ڕێپێدراوەکان بکات بە یارمەتیدەر بۆ جێبەجێکردنی ئەو واجیباتانەی کە خوای گەورە فەرمانی پێداوە، ئەوە لە چینی پێشکەوتووە نزیکەکانە[٢].

---

(١)_ ئیبڕاهیم و مووسا و عیسا _ علیهم الصلاة والسلام _ بەندەن و پێغەمبەرن بۆیە لە پێغەمبەرە پادشاکان چاکترن، وەکو یوسف _ علیه السلام _ کە چووە سەر تەختێکی ئاسان، هەروەها سولەیمان و داودی باوکی -علیهما الصلاة والسلام-.

(٢)_ لەو پێشکەوتووە نزیکانەن کە هەموو ژیانیان بۆ خوای گەورە تەرخان کردووە، بۆیە هەر هەموو کردەوەکانی ژیانیان بووە بە خواپەرستی، بەڵام چاکان (الأبرار المقتصدون) کردەوەکانیان خوا پەرستیە، هەندێ شتیشی تێدایە عیبادەت نییە، ئەو شتانە موباحن، ژیانی ئەوان ئەنجام دانی کردەوەی موباح و ڕێپێدراوی تێدایە کە نەپاداشتیان دەدرێتەوەو، نەسزاشیان دەدرێت، بۆیە پاداشتەکانیان لە چینی پێشکەوتووانی نزیك کەمترە.

## بەشێك

## سەبارەت بەوەی کە خوای بە بەزەیی لە قورئاندا باسی دۆستانی خۆیکردووە

خوای بە بەزەیی لە سورەتی (فاطر)دا دۆستانی خۆی و (السابقین)ی بۆ باسکردوین[1]، کە تیایدا دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ وَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ بِإِذْنِ اللَّهِ ذَلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ (٣٢)[2]

---

(١)_ خوای گەورە لە سورەتی (فاطر)دا بە بیری هێناوینەتەوە کە ئوممەتی موحەممەد _ صلى الله عليه وسلم _ سێ بەشن یان سێ چینن: ﴿فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ﴾ئەوانەی ستەمیان لە خۆیان کردووە، مام ناوەنجیەکان (المقتصدون)، پێشکەوتووان بە هۆی چاکەکانیانەوە (السابقون بالخيرات)، خوای گەورە هەواڵی پێداوین کە هەمووشیان لە بەهەشتدان، چونکە دەفەرموێت: ﴿ جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا ﴾[فاطر: ٣٣] واتە: ﴿ جَنَّاتُ عَدْنٍ ﴾ بەهەشتانێك جێگای مانەوەی هەمیشەیی یە ﴿ يَدْخُلُونَهَا ﴾ کە ئەوان دەچنە ناویەوە، هەموویان چینی ستەمکاران لە نەفسی خۆیان دەچنە بەهەشتەوە، لەوانەیە هەر لە سەرەتاوە بچنە بەهەشتەوە، پێدەچێ سزایان بدرێت و پاشان لە کۆتادا بچنە بەهەشتەوە، دەرەنجام دەچنە بەهەشتەوە، (المقتصدون)، (السابقون بالخيرات) ئەمانە لە بەهەشتدان و سزایان لە سەر نیەو، ناچنە ئاگرەوە.

(٢)_ ﴿ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ ﴾ بریتیە لەو ئیماندارە یەکخواپەرستەی کە پێدەچێ شتێك لە تاوانی گەورە ئەنجام بدات کە بەپلەی شیرك ناگات، ئەمە کەسێکی ستەمکارە لە خودی خۆی، خۆی تووشی سزای خوای گەورە کردووە ئەگەر لێی نەبورێت، ئەمەیە ستەمکار لە نەفسی خۆی، کەوتۆتە بەر هەڕەشە، کە چی لە ئەهلی بەهەشتیشە، یان لە سەرەتاوە، یان لە کۆتادا، پاشان ﴿ مُقْتَصِدٌ ﴾ بریتیە لەو کەسەی کە تەنها واجیباتەکانی سەرشانی ئەنجام داوە، خۆی لە حەرامەکان بە دوور گرتووە، ئا ئەمەیە کەسانی (المقتصدون الأبرار أصحاب اليمين)، چینی سێ یەمیش ﴿سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ کە بریتین لە پێشکەوتوانی نزیك (المقرّبون).

جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِنْ ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ (٣٣)[1] وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَذْهَبَ عَنَّا الْحَزَنَ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ (٣٤) الَّذِي أَحَلَّنَا دَارَ الْمُقَامَةِ مِنْ فَضْلِهِ لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٌ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٌ (٣٥)﴾[فاطر: ٣٢ ـ ٣٥] واته: لە پاشان ئەم قورئانەمان بەخشی بە کەسانێ کە لەناو بەندەکانماندا هەڵمانبژاردن ئینجا هەندێکیان ستەم لە خۆیان دەکەن وە هەندێکیان مام ناوەندین و هەندێکی تریان بە ئیزنی خوا پێشکەوتوون بەهۆی چاکەکانیانەوە ئەم (پێدانی قورئان) لە بەهرەیەکی گەورەیە ئەوانە دەچنە ناو بانی تێکەوە کە نافەوتێن لەوێدا بە بازنی ئالتونی و مرواری دەڕازێنرێنەوە وە پۆشاکیان تێیدا ئاوریشمە و ئەوان دەڵێن: هەموو سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە خەفەتی لابردین ونەیهێشت بە ڕاستی پەروەردگارمان لێبوردەی شایستەی سوپاسە ئەو (خوایە) کە بە چاکەو بەهرەی خۆی نیشتەجێی کردین لەماڵی هەمیشەیی دا (بەهەشت دا) لەوێدا نەهیچ ماندووبونێکمان تووش دەبێ وە نەهیچ ئەرك و زەحمەتێکمان دووچار دەبێ.

---

(١)_ ئەم ئایەتە ڕەتدانەوەیە بۆ خەواریج و موعتەزیلە، چونکە ئەمانە ئەنجام دەرانی تاوانی گەورە کافر دەکەن، خوای گەورە هەواڵی پێ داوین کە ئەنجام دەرانی تاوانی گەورەکان دەچنە بەهەشتەوە، کەچی خەواریج و موعتەزیلە دەڵێن: نەخێر ناچنە بەهەشتەوەو، بەهەتا هەتایی لە دۆزەخدا دەمێننەوە _ داواکارین خوای گەورە لە گومڕایی بمانپارێزێت _.

بەڵام ئەم سێ جۆرەی کە لەم ئایەتەدا باسکراون ئوممەتی موحەممەدن ﷺ بە تایبەت[1]، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ وَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ بِإِذْنِ اللَّهِ ذَلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ﴾[فاطر: ٣٢] واتە لە پاشان ئەم قورئانەمان بەخشی بەکەسانێ کە لەناو بەندەکانماندا هەڵمان بژاردن ئینجا هەندێکیان ستەمکارن لە نەفسی خۆیان و هەندێکیان مام ناوەندین و هەندێکی تریان بە ئیزنی خوا پێشکەوتوون بەهۆی چاکەکانیانەوە، پێدانی ئەم قورئانە بەهرەیەکی زۆر گەورەیە.

---

(١)_ خوای گەورە لە ئایەتی (٣٢) سورەتی (فاطر)دا دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ﴾ لە پاشان ئەم قورئانەمان بەخشی بەکەسانێ ﴿اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا﴾ کە لەناو بەندەکانماندا هەڵمان بژاردن، ئەوانەش ئەم ئوممەتە موحەممەدیەن کە خوای گەورە لە نێوان هەر هەموو ئوممەتاندا هەڵیبژاردوون و، ئەم قورئانە گەورەو بەرێزەی پێبەخشیون، بەو بەخشینە رێزی لێناون و فەزڵیداون بەسەر هەموو ئوممەتانی تردا، خوای گەورە لە وەسفی ئەم ئوممەتە موحەممەدیەدا کە قورئانی پێ بەخشیون دەفەرموێت: ﴿كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾[آل عمران: ١١٠] واتە: ﴿كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ﴾ ئێوە (موسڵمانان) باشترین گەلێك بوون ﴿أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾ بۆ خەڵکی هێنرابێتە دی.

تەنها ئوممەتی موحەممەدیش ﷺ بوو کە لە دوای ئوممەتانی تر هاتن قورئانیان ئەو بەخششە گەورەیەش بەخشینەش تەنها تایبەت نەکراوە بەو کەسانەی قورئانیان لەبەرە[1]، بەڵکو هەر کەسێك ئیمانی بەقورئان هێنا بێ لە ئەوانە[2]، بۆ سێ چینیش دابەشی کردوون: ئەوانەی کە ستەمیان لە خۆیان نەکردووە ﴿ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ﴾، مام نێوەنجییەکان (المقتصدون) و پێشکەوتووەکان بەهۆی چاکەکانیانەوە (السابقون)، ئەمە بە پێچەوانەی ئایەتەکانی سورەتی (الواقعة) و (المطففين) و (الأنفطار)ەوەیە[3]،

---

(١)_ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا﴾ لەپاشان ئەم قورئانەمان بەخشی بەکەسانێ کە لە ناو بەندەکانماندا هەڵمان بژاردن، کەوا بوو پاسەوانانی ئەم قورئانە تەنها کەسانی لە بەرکاری قورئان نین، بەڵکو سەرجەم موسڵمانانە با قورئانیش نەخوێننەوە، بەو کەسانەوە سنوردار نەکراوە کە قورئانیان لەبەرە، بەڵکو هەموو تاکێکی ئەم ئوممەتە ئەم قورئانەی پێ بەخشراوە، بەڕاستی هەموو ئیماندارێك ئەهلی قورئانە ئەگەر چی لەبەریشی نەبێت، ئەم پاداشتە گەورەیەش تەنها لای خوای گەورەوەیە.

(٢)_ هەر کەسێك ئیمانی بەم قورئانە هێنابێ لەو کەسانەیە کە خوای گەورە لە کۆی ئەم ئوممەتە هەڵیبژاردوون و، قورئانی پێ بەخشیون.

(٣)_ لە سورەتی (الواقعة)دا تەنها دوو جۆری لە ئیمانداران باس کردووە (المقرّبون) و (أصحاب اليمين)، لەگەڵ ئەوانەدا (أصحاب الشمال)یشی باسکردووە، کە بریتین لە کافران، هەروەها لە سورەتی (الإنسان)یشدا دوو جۆری باس کردووە، (المقرّبون) و (الأبرار)، لەگەڵ ئەوانەدا کافرانیشی باس کردووە، لە سورەتی (الانفطار)یشدا تەنها دوو جۆری باس کردووە ﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ (١٣) وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ (١٤)﴾[الأنفطار: ١٣_١٤] واتە: بە ڕاستی چاکان لەناو نازو تیعمەتدان بێگومان بەدکاران لە دۆزەخدان. لەم سورەتەدا ئەم دوو جۆرەی باس کردووە، کەچی لە سورەتی (فاطر) دا هەر سێ چینەکەی خەڵکی ئەم ئوممەتەی باس کردووە، دوای ئەوانەش ئەهلی دۆزەخی باسکردووە _ پەنا بە خوا _.

لێرەدا هەر هەموو ئوممەتانی پێشووشی گرتەوە، کافران و ئیماندارانیان[1]، کەوا بوو دابەشبوونی ئوممەتی موحەممەد ﷺ بەم جۆرە دەبێ: ستەمکاران لە نەفسی خۆیان (ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ) ئەو کەسەی تاوان ئەنجام دەداو سووره لەسەری[2] (مُقْتَصِدٌ) ئەو کەسەی نەپزەکان بەجێدێنێ و خۆی لە حەرامەکان بەدور دەگرێت (سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ) ئەو کەسەی فەرزەکان و نافیلەو سوونەتەکان بەجێدێنێت. لە ئایەتەکانی پێشوودا ئاماژەی پێدراوە.

---

(١)_ بەڵێ، سورەتەکانی (الواقعة) و (الإنسان) و (المطففين) و (الأنفطار) ئیمانداران وکافرانی هەر هەموو ئوممەتەکان دەگرێتەوە، بەڵام ئەم ئایەتەی سورەتی (فاطر) تەنها تایبەتە بەم ئوممەتەوە، تایبەتە بە ئیماندارانی ئەم ئوممەتەوە.

(٢)_ بەڵام ئەو کەسانەی لە تاوانەکانیان پەشیمان دەبنەوەو تەوبە دەکەن، وەکو ئەوانەن کە هیچ تاوانێکیان نەبێت، تا ئەو ئاستەی ئەگەر شیرک و کوفریشیان کرد بێ و لێی پەشیمان بوبێتنەوەو تەوبەیان کرد بێت، خوای گەورە تەوبەکانیان قبوڵ دەکات، وەکو ئەو کەسانەیان لێدێت کە هیچ تاوانێکیان نەبێت، لەڕاستیدا ئەوەی شێخولئیسلام _ڕەحمەتی خوای لێ بێت _ لێرەدا باسی دەکات سەبارەت بەو کەسانەیە کە تاوانیان ئەنجام داوەو، پەشیمان نەبونەتەوەو تەوبەیان لێنەکردووە، بەڵام تاوانەکانیان بە پلەی شیرک و هاوڵپەرستی نەگەیشتووە، بۆیە ئەم کەسانە لە ژێر ویستی خوای گەورەدان.

وه هەر کەسێك لە تاوانەکەی پەشیمان ببێتەوەو تەوبەی کرد بێت _ هەر تاوانێك بێت ئەوە وەکو ڕاست و دروست ئەوا لـە چینەکانی (السابقين) و (المقتصدين) ناچێتە دەرەوە. ئەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَسَارِعُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَوَاتُ وَالْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ (١٣٣) الَّذِينَ يُنْفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ (١٣٤) وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ وَمَنْ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَى مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ (١٣٥) أُولَئِكَ جَزَاؤُهُمْ مَغْفِرَةٌ مِنْ رَبِّهِمْ وَجَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَنِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ (١٣٦)﴾[٣] [آل عمران:١٣٣_١٣٦] واتـە: پێشبڕکێ بکـەن بـۆ لێـبوردنێکی گەورە لـە لایـەن پەروەردگارتانـەوە وە بۆ بەهەشتێك کە پانییەکەی (بـە ئەندازەی) ئاسمانەکان و زەوی یە کە ئامادە کراوە بۆ لە خوا ترسان ئەوانەی مـاڵ دەبەخشن (لە ڕێی خوادا) لـە کـاتی خۆشی و (دەوڵەمەنـدی)و ناخۆشـی دا وە ڕقـی بـەتینی خۆیـان دەخۆنەوە و دەبوورن لە خەڵکی خواش چاکەکارانی خۆش دەوێت وە ئەوانەی کە کاتێ کردەوەیەکی ناشیرین دەکەن یا ستەم لە خۆیان دەکەن کە یادی خوایان کردەوە ئینجا داوای لێبووردن دەکەن بۆ گوناهەکانیان ئایا کێ دەبورێ لە گوناهەکان بێجگە لە خوا؟ وە بەردەوام نابن لە سەر ئـەوەی کـە کردویانـە لـە کاتێکدا بزانن (گوناهـە) ئـا ئەوانـە پاداشتیان لێـبووردنە لـە لایـەن پەروەردگاریانـەوە و چـەند باخانێـك (بەهەشتێك) کـە ڕووبارەکان دەڕۆن بە ژێریانـدا ئەمێننـەوە لـەو بەهەشـتانەدا بەهەمیشـەیی چـەند چاکە پاداشتی چاکەکاران.

---

(٢)_ وە ئەوانەی کە کـاتێ کردەوەیـەکی ناشـیرین دەکـەن، ئەگـەر تەوبـەی لێـبکەن، دەچـە بەهەشـتـەوە. وەکو ئەوەی هیچ تاوانێکیان نەکرد بێت، لێرەدا فـەزڵی تەوبـەمان بۆ ڕوون دەبێتـەوە.

(٣)_ ئەو کەسەی لە تاوانەکەی تەوبە دەکات و پەشیمان دەبێتـەوە، ئیتر لەپلـەی چینی (السابقين و المقربين أصحاب اليمين) دلنابەزێت، ئەگەر کردەوەکەی چاك بێت، ئەو تاوانانەی کە ئەوەی ئیکردوون پلەکەی دلنابەزێنێت. وەکو ئەوەی هیچ تاوانێکی ئەنجام نەدابێت.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا﴾[الرعد: ٢٣] واتە: ﴿جَنَّاتُ عَدْنٍ﴾ بەهەشتانێك جێگای مانەوەی هەمیشەیی یە ﴿يَدْخُلُونَهَا﴾ كە ئەوان دەچنە ناویەوە. ئەهلی سوونئەت دەیكەن بە بەڵگەی ئەوەی كە هیچ كەسێك لە ئەهلی یەكخواپەرستی لە دۆزەخدا بەهەتا هەتایی نامێننەوە[1].

---

(١)_ ئەمە بەر پەرچدانەوەیە بۆ ئەو خەواریج و موعتەزیلانەی كە دەڵێن: لە دۆزەخدا بە هەتا هەتایی دەمێننەوە، هەر كەسێك بچێتە ئاگرەوە هەرگیز دەرناچێت، بەڵگەكانی قورئان و سووننەت ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن كە ئەگەر یەكتاپەرستان بچنە ئاگریشەوە بە هەتا هەتایی تیایدا نامێننەوە، لە دۆزەخ دەردەكرێن.

## هەندێک لە ئەنجامدەرانی تاوانە گەورەکان دەچنە دۆزەخەوەو پاشان دەردەچن:

زۆرێک لە ئەنجامدەرانی تاوانە گەورەکان واتە چینی ستەمکاران لە نەفسی خۆیان (الظالم لنفسه) دەخرێنە دۆزەخەوە، لەم بارەوە فەرموودە گەلێک بە (متواتر)ی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هاتووە[1]، هەروەها فەرموودەگەلێکی تریش بە(متواتر)ی هاتووە سەبارەت بەدەرچونیان لە دۆزەخ و، تکا کردنی پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ بۆ ئەنجامدەرانی تاوانە گەورەکان و، دەرکردنی ئەو کەسانەی لە ئاگر دێنە دەرەوە بە تکا کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ و تکا کردنی غەیری ئەویش .

---

(١)_ ئەم گوتارە بەر پەرچدانەوەیە بۆ هەردوو کۆمەڵی خەواریج و موعتەزیلە کە پێیان وایە ئەنجام دەرانی تاوانە گەورەکان لە دۆزەخدا بە هەتا هەتایی دەمێننەوە و هەرگیز دەرچونیان نییە، بەڵام کۆمەڵی مورجیئە بە پێچەوانەی هەردوو کۆمەڵەکەی تر پێیان وایە کە ئەنجام دەرانی تاوانە گەورەکان هەرگیز ناچنە دۆزەخەوە، ئەوان لە بەهەشتدان، تاوانە گەورەکان کە لە شیرک و هاوەڵپەرستی کەمترن زیانیان پێ ناگەیەنێت، لە ڕاستیدا ئەم بۆچونانە تەنها فریو خواردن و گومڕاییە، چونکە چەندەها بەڵگە بە (متواتر)ی هاتوون، ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ئەنجام دەرانی تاوانە گەورەکان پێدەچێ بچنە ئاگرەوەو سزا بدرێن، لەوانەیە ماوەیەکی درێژیش تیایدا بمێننەوەو، پاشان بە خەڵوزی دەچنە دەرەوە، لەدۆزەخ بە خەڵوزی دەچنە دەرەوە، پاشان جەستەیان دەڕوێتەوەو، دەچنە بەهەشتەوە، ئەمە بەر پەرچدانەوەیە بۆ ئەو مورجیئانەی کە دەڵێن: لەگەڵ ئیمان هەبووندا سەرپێچی زیانی نییە، ئیمان بەسەرپێچیکردن کەم نابێتەوەو، هیچ زیانێکیان پێ ناگەیەنێت، لە ڕاستیدا ئەمە تەنها نەفامیەو قسەکردنە بە بێ زانست، سەرپێچیکردنی بەڵگەکانە، بەڵام ئەهلی سوننەت لەم بارەوە _ سوپاس بۆ خوا _ مام ناوەندن، ناڵێن: سەرپێچیکردن زیانی نییەو،

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

کەسی سەرپێچیکاری ئەنجام دەری تاوانی گەورە خاوەن ئیمانێکی تەواوە وەکو ئەوەی مورجیئەکان دەیڵێن، ناشڵێن: بە هیچ شێوەیەك ئیمانی نییەو کافرە، وەکو ئەوەی خەواریجەکان دەیڵێن، بەڵکو دەڵێن: ئیماندارەو خاوەن ئیمانێکی ناتەواوە.

بۆیە هەر کەسێك بڵێت: ئەنجامدەرانی تاوانە گەورەکان بە هەتا هەتایی لە دۆزەخدا دەمێننەوە، ئایەتی (٢٣) سورەتی (الرَّعد) بەو جۆرە لێك بداتەوە کە تەنها چینی پێشکەوتووان (السابقین) دەچنە بەهەشتەوە چینەکانی (المقتصد) و (الضالم لنفسه) ناچنە نێوی، وەکو ئەوەی موعتەزیلەکان لێکی دەدەنەوە بەم شێوەیە، ئەوا قسەکانیان بە لێك دانەوەکەی کۆمەڵی مورجیئە بەر پەرچ دەدرێتەوە کە سوورن لەسەر ئەوەی کە هیچ کەسێك لە ئەنجامدەرانی تاوانە گەورەکان ناچنە دۆزەخەوە، وە ئەو بانگەشەیەش دەکەن کە ئەنجام دەرانی تاوانە گەورەکان پێدەچێ هەر هەموویان بەبێ سزادان بچنە بەهەشتەوە، بەڵام هەر دوو بۆچوونەکە پێچەوانەی سوونەتی (متواتر)ی پێغەمبەری خوان ﷺ، هەروەها پێچەوانەی کۆڕایی و یەك دەنگی پێشین و پێشەوایانی چاکی ئەم ئوممەتەن.

بە ڕاستی ئەوەی ئاماژە بۆ بۆگەنی گووتاری هەر دوو تاقمەکە دەکات فەرمایشتی خوای کار بەجێیە لە دوو ئایەتی قورئانەکەیدا کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ﴾[1] [النساء: ٤٨] واتە: بە ڕاستی خوا خۆش نابێت گەر هاوبەشی بۆ دابنرێ، بێجگە لەوە خۆش ئەبێت لە هەر گوناهێکی تر بۆ هەر کەسێك کە بیەوێت.

---

(١)_ ئەمە بەر پەرچدانەوەیە بۆ خەواریج و موعتەزیلەکان.

لێرەدا خوای گەورە هەواڵی پێداوین کە لە شیرك و هاوبەش دانان خۆش نابێت، و هەواڵیشی پێداوین کە بێجگە لەوە لە هەر گوناهێکی تر خۆش دەبێت، جایزیش نییە مەبەست لەوەدا کەسی تەوبەکار بێت[1] وەکو ئەوەی موعتەزیلەکان دەیڵێن، چونکە خوای گەورە لە شیرك و هاوەڵپەرستی هەموو کەسێك خۆش دەبێت ئەگەر لێی پەشیمان بێتەوەو تەوبە بکات[2]، خوای گەورە لەو تاوانانەش خۆش دەبێت کە پلەکەیان لەشیرك و هاوەڵپەرستی کەمترە بۆ هەر کەسێك لێی پەشیمان بێتەوەو تەوبە بکات، (فلا يعلق بالمشيئة)، بۆیە کاتێك خوای گەورە باسی لێخۆش بوون بۆ تەوبە کاران دەکات، دەفەرموێت: ﴿قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لاَ تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾[3] [الزمر: ٥٣] واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ: ئەی بەندەکانم ئەی ئەوانەی کەخۆتان زۆر گوناهبار کردووە نائومێد مەبن لە میهرەبانی و بەزەیی خوا چونکە بێگومان خوا لە هەموو گوناهەکانتان خۆش دەبێت بە ڕاستی هەر ئەوە لێ بوردەی بە بەزەیی.

---

(١)_ ئەو کەسەی تەوبەی کرد بێت، وەکو ئەوەیە هیچ گوناهێکی نەبێت، لە ڕاستیدا فەرمایشتەکە دەربارەی ئەوانەیە کە تەوبەیان نەکردوەو، پەشیمان نەبونەتەوە، کەسی ئەنجام دەری تاوانی گەورە کە لێی پەشیمان نەبۆتەوەو تەوبەی نەکردووە و لەسەر ئەو حاڵەتە مردووە، ئەمەیە جێگەی بەڵگە هێنانەوەکە.

(٢)_ خوای گەورە لە هەموو شتێك خۆش دەبێت، با هاوەڵپەرستی و کوفریش بێت، تەوبە کردن تاوانەکانی پێش تر دەسڕێتەوە، چونکە بە ئەنجام دەرانی تاوانە گەورەکانەوە تایبەت نییە.

(٣)_ خوای گەورە لە ئایەتەکەی دوای ئەوەدا دەفەرموێت: ﴿وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ﴾[الزمر: ٥٤] واتە: بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارتان و گەردن کەچی ئەو بن، لێرەدا خوای گەورە فەرمان بە تەوبە دەکات، چونکە لەهەر هەموو تاوانێکی بەندەکەی خۆش دەبێت ئەگەر پەشیمان بێتەوەو تەوبەی لێ بکات.

لەم ئایەتەی سورەتی (الزمر)دا خوای گەورە لێبوردنەکەی خۆی بۆ هەر هەموو تاوانەکان گشتاندوەو، ڕەهایەتیشی پێداوەو بە شیرك و هاوەڵپەرستی یاخود بە تاوانێکەوە تایبەتی نەکردووە، چونکە خوای گەورە بەندەکەی دەبورێت لە هەر تاوانێك تەوبەی لێ کرد بێت، بۆیە هەر کەسێك لە شیرك و هاوەڵپەرستی تەوبە بکات، خوای گەورە لێی خۆش دەبێت، وە هەر کەسێك لە ئەنجامدانی تاوانە گەورەکان پەشیمان بێتەوەو تەوبە بکات، خوای گەورە لێی خۆش دەبێت، کەوا بوو هەر کەسێك لە ئەنجامدانی هەر تاوانێك پەشیمان بێتەوەو تەوبە بکات، خوای گەورە لێی خۆش دەبێت. لە ئایەتەکەی سورەتی (الزُمر)دا کە باسی تەوبە دەکات دەیگشتێنێت و ڕەهایی دەداتێ (عمم وأطلق)، لە ئایەتەکەی سورەتی (النساء)یشدا (تایبەتی دەکات و قەیەی دەخاتە سەر) (خصص وعلق)[1]، بەو جۆرەی کە شیرك و هاوەڵپەرستی تایبەت دەکات کە نایبورێت و، هەر شتێکی دیکەی جگە لە شیرکیشی بە ویستی خۆیەوە پەیوەندکردووە، لە جۆرەکانی شیرکیش پەکخستنی خوای خولقێنەرە[2].

---

(١)_ لە ئایەتەکەی سورەتی (الزُمر)دا هیچ کەسێکی جیانە کردۆتەوە، نەیفەرمووە: هەر کەسێك تەوبە بکات خوای گەورە لێی دەبورێت ئەگەر ویستی لێبێت، بەڵام لە ئایەتەکەی سورەتی (النساء) دا شیرك و هاوەڵپەرستی تایبەت دەکات کە نایبورێت، هەر شتێکی دیکەی جگە لەشیرکیشی داوەتە پاڵ ویستی خۆی لێی ببورێ یان نا.

(٢)_ واتە: نکۆڵێکردن لە هەبوونی پەروەردگار، گوایە هیچ پەروەردگارێك نییە - پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە _.

ئەم پەکخستنە ئاماژە بۆ بۆگەنی قسەی ئەو کەسانە دەکات کە سوورن لەسەر ئەوەی بەخشین و لێبوردن هەموو تاوانبارێك دەگرێتەوە، یان بە دروستی دادەنێت کە بەهۆی تاوانێکەوە سزا نەدرێت[1]، چونکە ئەگەر بەو جۆرە بوایە باسی ئەوەی بۆ نەدەکردین کە لە هەندێکی دەبورێت و، لە هەندێکیشی نا بورێت، ئەگەر خوای گەورە لە هەر کەسێکی کە ستەمی لە نەفسی خۆی کردووە (الظالم لنفسه) خۆش بوایە بە بێ تەوبە کردن و بەبێ کردەوەی چاکی تاوان لابەر (حسنات ماحية) ئیتر لێبوردنی تاوانی بەویستی خۆیەوە پەیوەند نەدەکرد[1].

ئەرمایشتی خوای بەزەیی: ﴿وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ﴾ [النساء: ٤٨] بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە خوای گەورە لە هەندێ دەبورێت و، لە هەندێکیشی نابورێت، کەوابوو ئەنی و لێبوردنی گشتی پوچ بویەوە.

---

(١)_ قسەی کۆمەڵی مورجیئەکانە کە دەڵێن: بەندە بەهۆی تاوانەوە سزا نادرێت لەبەر ئەوەی ئیماندارە، با تاوانیش بکات هەرگیز سزا نادرێت، ئەمە گومڕاییەکی ئاشکرایە.

(٢)_ خوای گەورە تەوبە کردنی بە ویستی خۆیەوە پەیوەند نەکردووە، بۆیە هەر کەسێك تەوبە بکات، خوای گەورە تەوبەکەی قبوڵ دەکات، لە ڕاستیدا تەنها لێبوردنی ئیماندارە تاوانبارەکان ئەوانەی کە تەوبەیان نەکردووە بەویستی خۆیەوە پەیوەند کردووە. ویستی لێبێت دەیان بورێت و، ویستی لێنەبێت نایانبورێت.

## بەشێك

## سەبارەت بەوەی کە جیاوازیی پێگە و پلە و پایە لە وەلایەت و دۆستایەتیدا وەکو جیاوازیی پێگە و پلە و پایە ئیمان و لە خوا ترساندا

ئەگەر وەلی و دۆستانی خوای پەروەردگار ئیمانداره لە خوا ترسەکان بن، خەڵکیش جیاوازی پێگە و پلە و پایەیان هەبێت لە ئیمان و لە خوا ترساندا، کەوا بوو بە گوێرەی ئەوە لە وەلایەت و دۆستایەتیشدا جیاوازی پێگە و پلە و پایەیان دەبێت[1].

---

(١)_ سەرەتا بنچینیە لە دۆستایەتی خوا دا چییە؟ خوای گەورە لەم ئایەتەدا بۆی ڕوون کردوینەتەوە کە دەفەرموێت: ﴿أَلَا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (٦٢) الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ(٦٣)﴾[يونس: ٦٢_٦٣] واتە: ئاگادار بن بێ گومان دۆستانی خوا ترسیان لەسەر نییە خەفەتیش ناخۆن ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و هەمیشە خۆیان دەپارێزن و لەخوا دەترسن، کەوا بوو هەر کەسێك هەر دوو وەسفی ئیمان و لە خواترسان و (خۆپارێزی) لە خۆیدا کۆکاتەوە، بێگومان دۆستی خوای گەورەیە، هەر کەسێکیش هەر دوو وەسفەکە یا یەکێکیانی تێدا نەبێ، بێگومان دوژمنی خوایەو، یەکێکە لە دۆستانی شەیتان، ئا ئەمەیە هەر چی ئەو پێناسەیەی کە قورئانی پیرۆز بۆ وەلی و دۆستانی دەکات، نەك وەکو ئەو پێناسەیەی کە کەسە چاولێکەرەکان لەسەری ڕێککەوتوون بەوەی گوایە وەلی ئەو کەسەیە کە کردەوەیەکی نائاسایی لە سروشت بەدەری پێچەوانەی واقیع ئەنجام دەدات، ئەمە بە دۆستی خوا دادەنێن، بە ڕای ئەوان ئەگەر بەسەر ئاو دا ڕێبکات، بە هەوادا بفرێت، یان بچێتە نێو ئاگرەوەو نەسوتێت و، هیچی بەسەر نەیەت، ئەوە وەلی و دۆستی خوایە، بە بێ ئەوەی تەماشای کردەوەکانی بکەن، بە بێ ئەوەی تەماشای بکەن ئایا هەر دوو وەسفەکەی سەرەوەی تێدایە؟ ئایا کەسێکی ئیمانداری لە خوا ترسە؟ ئەگەر کەسێکی ئیمانداری لە خوا ترس بوو ئەوا ئەو کردەوە نا ئاساییە لە سروشت بەدەرانەی

ئەنجامی دەدات کەڕامەتێکە لە کەڕامەتی دۆستانی خوا، ئەگەر هەر دوو وەسفەکە یان یەکێکیانی تێدا نەبوو ئەو دۆستی خوا نییەو، کردەوە نائاساییە لە سروشت دەرەکانیشی شەیتانیە، بێگومان ئەوە شەیتانە کە بە هەوا دا هەڵیدەگرێ و بەسەر ئاودا پێی پێدەکات، خەڵکیش وایان بە خەیاڵ دا دێت ئەمە کەسێکە دەچێتە نێو ئاگرەوەو هیچی بەسەر نایەت، لە ڕاستیدا ئەمە تەنها کردەوەگەلێکی نائاسایی شەیتانیەو هیچی تر، بۆیە نابێ مرۆڤ بەم جۆرە شتانە فریو بخوات. شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێ بێت _ گوتوویەتی: بە ڕاستی دۆستانی خوای گەورە جیاوازن، هەندێکیان لە هەندێکی تریان لە خواوە نزیکترن، پێشکەوتووە نزیکەکان (السابقون المقرّبون) لە خواوە نزیکترن بە بەراورد بە (الأبرار المقتصدون)، وە چاکە کارە مام ناوەنجیەکان لە خواوە نزیکترن بە بەراورد بە ستەمکاران لە نەفسی خۆیان (الظالمون لأنفسهم)، ستەمکاران لە کۆمەڵی ئیماندارانن بەڵام سەرپێچیان هەیەو لە چوار چێوەی ئایینی ئیسلام دەریان ناکات، ئیمانداران لە دۆستایەتی خوای گەورەدا جیاوازن بە گوێرەی بەهێزی و ناوەندێتی و لاوازی ئیمانەکانیان.

هەروەها لەبەر ئەوەی لە کوفرو نیفاق و دوو ڕوویشدا جیاوازی پێگە و پلە و پایە هەیە، بۆیە بە گوێرەی ئەوە لە دوژمنایەتی خوای گەورە دا جیاوازی پێگەو پلە و پایە هەیە(٢).

بنچینەی ئیمان و لە خوا ترسانیش: بریتیە لە بڕوا بوون بە هەر هەموو پێغەمبەرانی خوای گەورە(٢)،

---

(١)_ دوژمنانی خواو دۆستانی شەیتان جیاوازیان هەیە، دوژمنایەتی و کوفری هەندێکیان بۆ خوای گەورە بەراورد بە هەندێکی تریان توندترە، بەگوێرەی ئەو کوفرو گومڕاییەی کە لێیانەوە ڕوو دەدات.

(٢)_ بەڵێ بنچینەی ئیمان و لە خواترسان بڕوا بوونە بەپێغەمبەران، چونکە هەر کەسێك بڕوا بە پێغەمبەر بکات، ئەوە بڕوای بە ئەو خوایەش هەیە کە پێغەمبەرانی ناردووە، بڕوای بە هەموو ئەو شەریعەتانەش هەیە کە خوای گەورە بۆی دابەزاندوون، بڕوای بە هەموو کتێبەکانیان هەیە، بڕوا بوون بە پێغەمبەران، بڕوا بوون بە خوای گەورەو، بڕوا بوون بەو کتێبانەی دابەزاندوون، بڕوا بوون بە هەر هەموو ئەوانەی کە هەواڵی پێداوین لە خۆ دەگرێت، بە پێچەوانەی ئەو کەسەی کە ئیمانی بە پێغەمبەران نییە، ئەو کەسە ئەگەر چی بانگەشەی دۆستایەتی خوای گەورەش بکات، بەڵام لە ڕاستیدا تەنها دۆستی شەیتانە، چونکە کە کوفر بە پێغەمبەران دەکات ئەوە کوفریشی بە هەموو ئەو کتێبانە کردووە کە بۆیان دابەزیووە. لە ڕاستیدا ئەوە ڕەتدانەوەی بۆ ئەو کەسانی کە بانگەشەی دۆستایەتی خوای گەورە دەکەن، لە کاتێك دا شوێنکەوتووی ڕاستی پێغەمبەران نین، دەڵێن: ئێمە هیچ پێویستیەکمان بە پێغەمبەران نییە، ئێمە زانیمان و بە خوای گەورە گەیشتین، پێویستمان بە پێغەمبەران نییە، لە ئەوانەی دەڵێن پێغەمبەران تەنها بۆ خەڵکی ئاساین، بەڵام ئێمە تایبەتین، هەشیانە دەڵێن: ئێمە تایبەتی تایبەتین، باشە چۆن وەلی و دۆستی خوای گەورەن لە کاتێکدا دەڵێن: ئێمە پێویستمان بە پێغەمبەران نییە، دەڵێن: ئێمە خوای گەورە دەناسین و، بەبێ واسیتەی پێغەمبەران پێی دەگەین.

کۆگری ئەوەش بڕوا هێنانە بە کۆتاهەمینی پێغەمبەران موحەممەد ﷺ[1]، چونکە ئیمان هێنان ڕاست و درووست بە کۆتاهەمینی پێغەمبەران، ئیمان هێنان بە هەر هەموو پێغەمبەران و کتێبەکانی خوای گەورە لە خۆ دەگرێت[2].

---

(١)_ هەر کەسێك ئیمانی ڕاست و درووست بە پێغەمبەری خوا ﷺ بێنێت، ئەوە ئیمانی بە هەر هەموو پێغەمبەرانیش هەیە، چونکە کۆتاهەمینی پێغەمبەرانەو، بە ڕاستدانەری هەموو پێغەمبەرانە _ عليهم الصلاة والسلام _، هەر کەسێکیش کوفر بە پێغەمبەر ﷺ بکات، ئەوە کوفری بە هەر هەموو پێغەمبەرانیش کردووە، وەکو جوولەکەو گاورەکان کە بڕوایان بە پێغەمبەر ﷺ نییە، ئەمانە بە هەر هەموو پێغەمبەران کافرن تا ئەو پێغەمبەرەش کە بانگەشەی شوێنکەوتنی دەکەن، گوایە بڕوایان پێ هەیە، لە ڕاستیدا ئەوان کوفریان بەو پێغەمبەرە کردووە.

(٢)_ چونکە کۆتاهەمینی پێغەمبەرانەو کتێبەکەشی بەسەر کتێبەکانی پێش خۆیدا زاڵە، لابەریانە، کتێبی حوکمدارە، ئەو کتێبەیە کە کتێبەکانی پێش خۆی لابردووە، کەوا بوو هەر کەسێك ئیمان بەم پێغەمبەرەو بەم قورئانە نەهێنێت، بێگومان بە هەر هەموو پێغەمبەران کوفری کردووە، ئەگەر چی بانگەشەی ئەوەش بکات کە بڕوای پێیانە، چونکە هەر کەسێك نکۆڵی لە یەك پێغەمبەر بکات، ئەوە نکۆڵی لە هەر هەموو پێغەمبەران کردووە، چجای ئەو پێغەمبەرەی نکۆڵی لێ دەکات چاکترینی پێغەمبەران و کۆتاهەمینی پێغەمبەران و بە ڕاست دانەری هەر هەموو پێغەمبەران بێت. کەسانێك لە نێوان خواو پێغەمبەرانیدا جیاوازی دەکەن، بۆیە هەر کەسێك جیاوازی بخاتە نێوان خواو پێغەمبەرانیەوەو، ئیمان بەهەندێکیان بێنێ و کوفر بە هەندێکیان بکات، بێگومان کافرە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيُرِيدُونَ أَنْ يُفَرِّقُوا بَيْنَ اللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَنْ يَتَّخِذُوا بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلًا (١٥٠) أُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقًّا وَأَعْتَدْنَا

لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُهِينًا (١٥١) وَالَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ وَلَمْ يُفَرِّقُوا بَيْنَ أَحَدٍ مِنْهُمْ أُولَئِكَ سَوْفَ يُؤْتِيهِمْ أُجُورَهُمْ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا (١٥٢)﴾ [النساء: ١٥٠ـ١٥٢] واتـه: بـه ڕاستی ئەوانەی بێ باوەڕن بە خواو پێغەمبەرەکانی و دەیانەوێ جیاوازی بخەنە نێوان خواو پێغەمبەرەکانی وە دەڵێن باوەڕ بە هەندێك (لە پێغەمبەران) دەهێنین و باوەڕ ناهێنین بە هەندێکی تریان و دەیانەوێ لەو نێوانەدا ڕێگەیەك بدەنە بەر ئا ئەوانە بە ڕاستی بێ باوەڕی تەواون و ئامادەمان کردووە بۆ بێ باوەڕان سزایەکی ڕیسواکەر و ئەوانەی بڕوایان هێناوە بە خواو پێغەمبەرەکانی و هیچ جیاوازیەکیان نەخستە نێوان هیچ کام لەو پێغەمبەرانە ئا ئەوانە لە داهاتوودا خوا پاداشتیان دەداتەوە و خوا هەمیشە لێ بووردەی میهرەبانە.

بنەڕەتی کوفرو دوو ڕوویش: بریتیە لە کوفر کردن بە پێغەمبەران و بەو کتێبەی کە هێناویانە، ئائەمە ئەو کوفرەیە کە خاوەنەکەی لە ڕۆژی دوایدا بە شایستەی سزا دەبێت(١)، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا پێی ڕاگەیاندوین کە هیچ کەسێك سزا نادات، مەگەر پاش ئەوەی کە پەیامەکەی خوای گەورەی پێ دەگات(٢)، لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولًا﴾[الإسراء: ١٥] واتە: ئێمە هەرگیز سزای (بەندەکان) نادەین هەتا پێغەمبەر نەنێرین (بۆیان).

---

(١)_ چونکە کافران دوو بەشن، هەندێکیان لە ناوەڕۆك و ڕووکار دا کافرن، ئەم بەشە بڕوایان بەپێغەمبەران نییە، یان باوەڕیان بە هەندێکیان نییە، بەشێکی تریشیان لە ناوەڕۆکەوە کافرن نەك بە ڕووکار، ئەم بەشە بریتین لەو دوو ڕووانەی کە بەڕووکار ئیمان دەردەبڕن و، لە ناوەڕۆکی خۆیانەوە کافرن، ئەم بەشە لەو کافرانە خراپترن کە زۆر بە ئاشکرا کافر بوونی خۆیان دەربڕیوە، چونکە ئەوانەی کە بە ئاشکرا کافر بوونی خۆیان دەربڕیوە بە دوژمنی خواو پێغەمبەرەکەی ناسراون، ئیتر وەکو کافر مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێ، بەڵام ئەوان کافر بوونی خۆیان لەناوەڕۆکی دڵی خۆیاندا شاردۆتەوەو، بە ڕووکاریش خۆیان وەکو بڕوادار پیشانی داوە، فێڵیان کردووە، بۆیە ئەوانەی کە نەیانناسیون فریویەن پێ دەخۆن، لە ڕاستیدا زیانی دوو ڕووان بۆ سەر ئیسلام لە هەموو شتێکی تر توندترە.

(٢)_ بۆیە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا سەرزەنشتی کافران دەکات و دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ قَالُوا بَلَى قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ﴾ ئایا پێغەمبەرێکی ترسێنەرتان بۆ نەهاتووە؟ گوتیان: بەڵێ بۆمان هاتووە بەڵام بە درۆمان دەخستەوە، پێمان دەگوت خوای گەورە هیچی نەناردۆتە خوارەوە، بە پێغەمبەرانیشیان دەگوت: ﴿إِنْ أَنْتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ كَبِيرٍ﴾ ئێوە بەس لە گومراییەکی گەورەدان، پێغەمبەرانیان بە گومڕا دادەنا _داواکارین خوای گەورە بمانپارێزێت_ لە

ئایەتێکی دیکەدا خوای گەورە پێیان دەفەرموێت: ﴿أَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِنْكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِ رَبِّكُمْ وَيُنْذِرُونَكُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَذَا قَالُوا بَلَى وَلَكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ الْعَذَابِ عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ [الزمر: ٧١] واتە: ﴿أَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِنْكُمْ﴾ ئایا پێغەمبەرانتان لە خۆتان بۆ نەهات ﴿يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِ رَبِّكُمْ﴾ کە ئایەتەکانی پەروەردگارتان بەسەردا بخوێننەوە ﴿وَيُنْذِرُونَكُمْ﴾ وە بتانترسێنن ﴿لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَذَا﴾ لە گەیشتنتان بەم ڕۆژە ﴿قَالُوا بَلَى﴾ دەڵێن: بەڵێ (هاتن ئاگاداریان کردین) ﴿وَلَكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ الْعَذَابِ﴾ بەلام بڕیاری سزا دراوە ﴿عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ بەسەر (ئێمەی) بێ باوەڕاندا. لەم ئایەتەدا خوای گەورە بۆی ڕوون کردوینەتەوە کە ئەوان لە ڕۆژی قیامەتدا دانی پێدادەنێن کە پێغەمبەران پەیامی خوایان پێڕاگەیاندوون، هیچ بەهانەیەکیان نییە، چونکە خوای گەورە ستەم لە هیچ کەسێك ناکات، بۆیە ئەگەر بانگەوازی پێغەمبەرانیان پێنەگەیشت بێت ئەوا بەڵگەیان لەسەر دانامەزرێت، خوای گەورە سزای هیچ کەسێك نادات مەگەر ئەوانەی کە بەڵگەر بانگەوازیان پێگەیشت بێت، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولًا﴾[الإسراء: ١٥]، کەوا بوو ئەهلی فەترە و منداڵانی موشریك و هاوبەشدانەران، ئەوانەی بانگەوازیان پێنەگەیشتوەو لە جیهان دابڕاون هیچ شتێکیان نەبیستووە، لە ڕۆژی قیامەتدا کاروباریان بە دەستی خوای گەورەیە.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَى نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِنْ بَعْدِهِ وَأَوْحَيْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَعِيسَى وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَارُونَ وَسُلَيْمَانَ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا (١٦٣) وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِنْ قَبْلُ وَرُسُلًا لَمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا (١٦٤) رُسُلًا مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا (١٦٥)﴾[1] [النساء: ١٦٣_ ١٦٥] واتە: بە ڕاستی ئێمە نیگامان بۆ کردووی وەك چۆن نیگامان کرد بۆ نووح و بۆ پێغەمبەرەکانی پاشئەو و نیگامان کرد بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب نەوەکانی یەعقوب وە عیساو ئەیوب و یونس و هاروون و سولەیمان و زەبوریشمان بەخشی بەداوود وە پێغەمبەرانێك بێگومان بەسەرهاتەکانیمان گێڕاوەتەوە بۆت وە پێغەمبەرانێك بەسەرهاتەکانیمان نەگێڕاوەتەوە بۆت وە خوا قسەی کرد لەگەڵ مووسا بە قسەکردن پێغەمبەران (مان ناردووە) کە موژدەدەرن و ترسێنەرن بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی نەبێت بەڵگە بەسەر خواوە دوای (ناردنی) پێغەمبەران وە خوا هەمیشە زاڵی کار دروستە.

---

(١)_ پێویستە ئیمان بە هەر هەموو پێغەمبەران بێنین، لە یەکەمیانەوە تا کۆتاهەمینیان، ئەوانەی خوای گەورە ناویبردون و، ئەوەشی کە ناویی نەبردوون، چونکە خوای گەورە کۆمەڵێکی لێ باسکردوون وەکو ئەوەی لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿وَتِلْكَ حُجَّتُنَا آتَيْنَاهَا إِبْرَاهِيمَ عَلَى قَوْمِهِ نَرْفَعُ دَرَجَاتٍ مَنْ نَشَاءُ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ (٨٣) وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ كُلًّا هَدَيْنَا وَنُوحًا هَدَيْنَا مِنْ قَبْلُ وَمِنْ ذُرِّيَّتِهِ دَاوُودَ وَسُلَيْمَانَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَى وَهَارُونَ وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (٨٤) وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَى وَعِيسَى وَإِلْيَاسَ كُلٌّ مِنَ الصَّالِحِينَ (٨٥) وَإِسْمَاعِيلَ وَالْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى الْعَالَمِينَ (٨٦)﴾[الأنعام: ٨٣_٨٦] واتە: ئەو (بەڵگانە) بەڵگەی ئێمە بوون کە دابوومان بە ئیبراهیم لە بەرانبەر گەلەکەیەوە هەر کەسێك بمانەوێت پلەو پایەی بەرز دەکەینەوە بە ڕاستی پەروەردگارت کار دروستی زانایە و ئیسحاق و (لە ئیسحاقیش) یەعقوبمان

بێ بەخشی ڕێنموونیی هەموویانمان کرد وە لەوەو پێش ڕێنموونیی نووحیشمان کرد لە نەوەکانی نووح داوود و سولەیمان و ئەیووب و یوسف و مووساو هاروونمان (ڕێنموونیی کرد) ئا بەو چەشنە پاداشتی چاکەکارانی دەدەینەوە و زەکریاو یەحیاو عیساو ئیلیاس هەر یەك لەمانە لە چاکەکاران بوون وە ئیسماعیل و یەسەع و یونس و لووط هەر یەکە لەمانە ڕێزماندراون بەسەر هەموو خەڵکیدا. تەماشا دەکەین خوای گەورە ئەم پێغەمبەرانەی ناو بردوە، ئێمە ئیمان بەو پێغەمبەرانە دێنین کە خوای گەورە ناوی بردوون و، ئیمان بەوانەش دێنین کە ناوی نەبردوون، خوای گەورە دەفەرموێت: یەکەمینی پێغەمبەرانیش نووحە _ علیه السلام _ کە یەکەم پێغەمبەر بووە بۆ دانیشتووانی سەر زەمین، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: پاش ڕوودانی شیرك نووح _ علیه السلام _ یەکەم پێغەمبەر بووە بۆ دانیشتووانی سەر زەمین، شیرك هاوبەش دانان سەرەتا لە نێو قەومی نووحدا بڵاو بۆوە، کاتێك وەلی و پیاوچاکانی خۆیان پەرست، پەیکەرەکانیان دروست کردو دەستیان دایە پەرستنیان، لەو کاتەوە شیرك و هاوەڵپەرستی پەیدا بوو، بۆیە خوای گەورە نووحی _ علیه السلام _ بۆ ناردن، پێشتریش لە سەر دینی ئادەم _ علیه السلام _ بوون، پێغەمبەرانیان تێدا بوو، فێریان دەکردن و، ڕێنوێنیان دەکردن، یەکتاپەرست بوون، لە ڕاستیدا شیرك و هاوبەش دانان لە نێو قەومەکەی نووحدا بڵاو بۆوە، شاهێدیش لە ئایەتەکە بریتیە لە ڕوون کردنەوەی حیکمەت لە ناردنی پێغەمبەران، بۆیە خوای گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرموێت: ﴿رُسُلًا مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ﴾ ئا ئەمەیە دانایی و حیکمەت لە ناردنی پێغەمبەران، بۆئەوەی لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ کەسێك بەهانە نەهێنێتەوەو، بڵێت: نە پەیامی خوام پێگەیشتوەو، نەدینێکیشم پێگەیشتووە، بۆیە خوای گەورە بە ناردنی پێغەمبەران بەهانەی بڕین.

خوای گەورە دەربارەی ئەهلی دۆزەخ دەفەرموێت: ﴿كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ (٨) قَالُوا بَلَى قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ إِنْ أَنْتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ كَبِيرٍ (٩)﴾[1] [الملك: ٨_٩] واتە: هەر کاتێ دەستەیەك فڕێ بدرێنە ناویەوە دەرگاوانەکانی دۆزەخ پرسیاریان لێدەکەن ئایا پێغەمبەرێکی ترسێنەرتان بۆ نەهاتووە دەڵێن با بۆمان هاتووە بەڵام بە درۆمان دەزانی، و دەمانگووت (پێی) خوا هیچی نەناردۆتە خوارەوە ئێوە بەس لە گومڕاییەکی گەورەدان.

لەم ئایەتەدا خوای گەورە هەواڵی پێداوین کە دەستەیەك فڕێدرانە دۆزەخەوە رانیان بەوەدا نابوو کە ترسێنەریان بۆ هاتبوو بەڵام ئەوان بە درۆزنیان دانا بوو، ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە هیچ کەسێك فڕێ نادرێتە دۆزەخەوە مەگەر ئەو کەسەی کە پێغەمبەری ترسێنەری بە درۆزن دانا بێ[2].

---

(١)_ لەم ئایەتەدا خوای گەورە بۆی ڕوون کردوینەتەوە کە ئەوان دانی پێدادەنێن کە بەڵگەیان لەسەر دامەزراوەو، پێغەمبەرانیان بۆ هاتوەو، پەیامی خوایان پێ ڕاگەیاندوون، بەڵام بەدرۆیان داناون، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا﴾، نکوڵیشیان لە نیگاو وەحی خوای گەورە کردو، گوتیان: ﴿وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ إِنْ أَنْتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ كَبِيرٍ﴾ خوای گەورە هیچی نەناردۆتە خوارەوە، ئێوە ئەی پێغەمبەران تەنها لە گومڕاییدان، هیچ ڕێنوێنیەکتان بە لاوە نییە.

(٢)_ خوای گەورە لەو ئایەتەی سەرەوەدا دەفەرموێت: ﴿قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ إِنْ أَنْتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ كَبِيرٍ(٩)﴾[الملك: ٩] دەڵێن: پێغەمبەرمان بۆ هاتووە بەڵام بە درۆمان دەزانی، و پێمان دەگوت خوای گەورە هیچی نەناردۆتە خوارەوە ئێوە بەس لە گومڕاییەکی گەورەدان، لە هەمان ئایەتدا هاتووە: ﴿وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ (١٠) فَاعْتَرَفُوا بِذَنْبِهِمْ فَسُحْقًا لِأَصْحَابِ السَّعِيرِ (١١)﴾ [الملك: ١٠_١١] واتە: دەڵێن ئەگەر قسەی (پێغەمبەران)مان ببیستایە یان تێبگەیشتینایە ئەمڕۆ لە هاوڕێ یانی دۆزەخ نەدەبوین ئیتر پێ دانیان نا لە گوناهەکانیان کەوا بوو دووریی لە میهرەبانی خوا بۆ هاوڕێ یانی دۆزەخ.

خـوای گـەورە بـە ئیبلـیس دەفـەرموێت: ﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنْهُمْ أَجْمَعِينَ﴾[١] [ص: ٨٥] واتە: بە ڕاستی دۆزەخ پڕ دەکەم لە تۆ (نەوەکانت) و ئەوانەی (لە ئادەمیان) شوێنت دەکەون تێکڕا.

خـوای گـەورە پێـی ڕاگەیانـدووین کـە دۆزەخ بـە ئیبلـیس و شـوێنکەوتووانی پڕ دەکات، جا کە بەئەوان پڕ بوو ئیتر کەسی تـر ناچـێتە نێـوی[٢] ئـیتر دەزانرێت هیچ کەس ناچێتە دۆزەخەوە مەگەر شوێنکەوتووانی شەیتان[٣]

---

(١)_ ئەمانە دۆستانی ئیبلیسن، کـە شـوێنی ئیبلـیس دەکـەون، ئـەوان دۆستانی ئیبلیسن و، لە ڕۆژی قیامەتدا لە گەڵیدا دەچنە دۆزەخەوە، لە سـوورەتێکی دیکەشدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾ [هود: ١١٩] واتە: ﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ﴾ کـە سـوێند بـەخوا دۆزەخ پـڕ دەکـەم ﴿مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾ لە جنۆکەو لە ئادەمی هەموو پێکەوە، کەوا بوو ئـاگری دۆزەخ مـاڵی ئیبلـیس و ئەوانەیە کە شوێنی دەکەون، بەهەشتیش ماڵی پێغەمبەران و شوێنکەوتوانیانە.

(٢)_ مەبەستی مانەوەی هەتاهەتایە لە دۆزەخدا، ئـەگینا پێدەچـێ کەسانێك لە شوێنکەوتووانی پێغەمبەران کە خاوەن سەرپێچین بچـنە دۆزەخـەوە، بـەڵام بـە هـەتا هەتایی تیایدا نامێننەوە.

(٣)_ مەگەر ئەو کەسانەی کە بەتەواوی شوێنی شەیتان کەوتبن، ئەمانە بە هـەتا هەتایی دەچنە دۆزەخەوە، یان هەندێ شـوێنکەوتنی شـەیتانی هەیـە، بۆیـە دەچێتە دۆزەخەوە بەو ئەندازەیەی کە شوێنی شەیتان کەوتووە.

ئەمەش بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە بێتاوانان ناچنە دۆزەخەوە، چونکە لەو کەسانەیە کە نەشوێنی شەیتان کەوتوەو، نەتاوانیشی هەیە[1] ئەمەی کە پێشتر ئاماژەی پێدرا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هیچ کەس ناچێتە دۆزەخەوە مەگەر ئەو کەسانەی کە بەناردنی پێغەمبەران بەڵگەیان لە سەر دامەزراوە[2].

---

(١)_ لایەنێکی سێیەمیش هەن، نەشوێنکەوتووی شەیتانن و نەئیمانداریشن وەکو منداڵانی نەباڵغ، کەسانێك کە بەهیچ شێوەیەك پەیامی ئیسلامیان پێ نەگەیشتبێت، کەسانی شێت کە عەقڵ و ژیریان نییە، ئەمانە لایەنێکی سێیەمن کە نەکوفریان لێوەشاوەتەوەو، نەئیمانیشیان هەبووە.

(٢)_ هەر کەس بە ناردنی پێغەمبەران بەڵگەی لەسەر دامەزرا بێت، ئەگینا ئەو کەسانەی کە بەڵگەیان لەسەر دانەمەزراوە وەکو ئەوانەی کە بە هیچ شێوەیەك پەیامی ئیسلامیان پێ نەگەیشتوەو، منداڵانی نەباڵغ و، کەسانی شێت کە عەقڵ و ژیریان نییە، ئەمانە ناچنە دۆزەخەوە، چونکە تاوانیان نییە.

## بەشێك

## تەواوكردنی مانای ئەوەی پێشتری تێدایە

كەسانێك ئیمانیان بە پێغەمبەران هەیە ئیمانێكی (مُجمَلْ) واتە: ئیمانەكەیان قووڵ نەبۆتەوە بە ناخیان، بەڵكو ئیمانێكی سادەیان هەیە (عاماً مجملاً)[1] بەڵام سەبارەت بە ئیمانی ووردی تەواو (المفَصّل): پێدەچێ زۆرێك لەوەی پێغەمبەران هێناویانە پێی گەیشت بێت و[2]،

---

(١)_ ئیمان هێنان بە پێغەمبەران جیاوازە، ئیمانی كەسانی ئاسایی لە ئیمانی زانایان جیاواز ترە، چونكە زانایان وەردەكاریەكان دەزانن، شتانێك دەزانن كە نەفامان نایزانن، بۆیە ئەوەی لەسەر زانا واجب دەبێ زۆر زیاترە لەوەی كە لەسەر كەسی ئاسایی واجیب دەبێ، چونكە زانا وردەكاریەكان دەزانێت، بەڵام نەفام زانینێكی گشتی هەیە، بۆیە بە ئەندازەی زانینەكەی خۆی ئیمانی هەیە.

ئیمانی (عام مجمل): واتە ئیمانێك بە گوێرەی ئەو ئیمان هێنانەی كە لە فەرموودەكەی جبرِیلدا هاتووە.

ئیمانی (مفصَّل): واتە ئیمان بەوەی كە لە قورئانی پیرۆزەو فەرموودەكانی پێغەمبەرﷺ هاتووە، مرۆڤەكانیش لەم بوارەدا جیاوازن.

(٢)_ واتە: فێر بوەو، زۆرێك لەوانەی كە پێغەمبەران هێناویانە دەزانێت، بۆیە بازنەی ئیمانی لە كەسانی ئاسایی فراوانترە؛ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾[فاطر: ٢٨] واتە: بە ڕاستی لە ناو بەندەكانی خوا دا تەنیا زانایان (وەك پێویست) لە خوا دەترسن. كەوا بوو ترسیان لە خوا لەترسی نەفامان زیاترە، ئەگەر چی نەفامانی موسڵمان ئیمانیان بە خوا هەیەو، لە خواش دەترسن بەڵام ترسانیان لە خوا لە ترسانی.

هەندێکی دیکەشی پێ نەگەیشتبێت، بۆیە ئیمان بەوانە دێنێت کە لە پێغەمبەرانەوە گەیشتووە، ئەوەشی کە پێی نەگەشتووە نایزانێت و، ئەگەر پێی بگات ئیمانی پێ دێنێت[1]، بەڵام ئیمانی هێناوە بە وانەی کە پێغەمبەران هێناویانە ئیمانێکی گشتی، بۆیە ئەو کەسە ئەگەر کار بە وانە بکات کە زانیویەتی خوای گەورە فەرمانی پێکردووە، لەگەڵ ئیمان و لە خواترسانی خۆیدا ئەوا لەو کەسانە هەژمار دەکرێت کە وەلی و دۆستی خوان[2]، بە ئەندازەی ئیمان و لە خوا ترسانەکەی خۆی وەلایەت و دۆستایەتی خوای گەورەی دەبێت[3]

---

(۱)_ بەڵێ، ئەو ئیمان بەوانەی پێی گەیشتووە دێنێت، هەروەها ئیمان بەوانەش دێنێت کە پێغەمبەران هێناویانە، بەم نەگەیشتووەو نایزانێت، چونکە هیچ کەس توانای فێربوون و تێگەیشتنی هەموو زانستی نییە، بەڵام ئیمانی ووردی تەواو تەواوی هەیە بە هەموو ئەوانەی پێی گەیشتووە، ئیمانێکی گشتیشی هەیە بەهەموو ئەوانەی پێی نەگەیشتوە، کەسی ئیماندار بەم جۆرەیە.

(۲)_ بەڵێ، ئەگەر بە زانستەکەی کردەوە بکات، لەگەڵ ئیخلاص و خۆ ساغ کردنەوەی بۆ خوای گەورە، ئەوا دۆستی خوایە.

(۳)_ وەکو پێشتر ئاماژەی پێدرا ئیمانداران لە دۆستایەتیدا جیاوازن، هەندێکیان لە هەندێکی تریان بەرزترن، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ﴾ [مجادلة: ۱۱] واتە: خواش پایەی ئەو کەسانە بەرز دەکاتەوە لە ئێوە کە بڕوایان هێناوە وە ئەوانەی کە زانستیان پێ بەخشراوە بە چەند پلەیەك (پلەیان بەرز دەکاتەوە)، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ [الزمر: ۹] واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ئایا ئەوانەی دەزانن یەکسانن لەگەڵ ئەوانەی کە نازانن، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُو الْأَلْبَابِ﴾[الرعد: ۱۹] بێگومان هەر ئەوانە بیر دەکەنەوە کە خاوەنی ژیرین.

ئەوەش کە زانینی لە بارەوە نییەو بەلگەی لەسەر دانەمەزراوە پێی، خوای گەورە بەسەری نەسەپاندووە کە دەبێ بیزانێت و ئیمانی ووردی تەواوی (المفَصَّل)ی پێ بێنێت[1]، بۆیە لەسەر وازلێهێنان و نەکردنی سزا نادرێت، بەلام کەمالی دۆستایەتی خوای گەورەی لە دەست دەچێت بە ئەندازەی ئەوەی کە لە دەستی چووە لە عیلم و زانیاری و عەمەل[2].

ئیتر ئەو کەسەی کە هەموو ئەوانە دەزانێت کە بۆ پێغەمبەران هاتووەو، ئیمانی پێهێناوە، ئیمانێکی ووردی تەواو (المفَصَّل) تێر و تەسەل، بێگومان ئیمان و دۆستایەتیەکەی بۆ خوای گەورە کاملترو تەواو ترە، لە چاو ئەو کەسەدا کە ئەوانەی بەووردی و درێژی نەزانیوەو، بەووردی کاری پێ نەکردووە، بەلام هەر دوکیشیان هەر وەلی و دۆستی خوای گەورەن[3].

---

(١)_ ئەو کەسانەی کە زانستیان پێ نەگەیشتوەو بەلگەیان لەسەر دانەمەزراوەو، پەیامی خوایان پێ نەگەیشتووە، هیچ سەپاندنێکیان لەسەر نییە، چونکە پێی نەگەیشتوەو نەیزانیوە، ئەو کەسە لەبەر نەزانینەکەی عوزرو بەهانەی وەردەگیرێت، چونکە لە توانایدا نییە نەزانینەکەی لا بەرێت، هیچ شتێکی نەبیستوەو، هیچ کەسێکیش نەبوە پێی ڕاگەیەنێت و، بە دابڕاوی لە جیهان ژیاوە.

(٢)_ هەروەها کەسانی ئاسایی ئیسلامیان پێگەیشتووە، بەلام ئەو ووردەکاریانەی نازانن کە زانایان دەیزانن، ئەو زانایانەی کە کار بە زانستەکەیان دەکەن، بۆ خوای گەورە دلسۆزن بێگومان لەو کەسە ئاسایانە پلە بەرزترن کە ووردەکاریەکان نازانن.

(٣)_ هەر دوکیان وەلی و دۆستی خوای گەورەن، چونکە ئیمانداری لە خوا ترسن، بەلام لە ڕووی زۆری و کەمی ئیمان و لەخواترسانەوە جیاوازیان هەیە، بۆیە لای خوای گەورە لە پلەشدا جیاواز دەبن.

## جیاوازی له پێشتری و پێشه‌كێتی ئه‌هلی به‌هه‌شت له پله‌دا:

به‌هه‌شت چه‌ند پله‌یه‌كه جیاوازی له پێشتری و پێشه‌كێتیان هه‌یه به شێوه‌یه‌كی به‌رچاو، وه دۆستانی ئیمانداری له خواترسی خوای گه‌وره له‌و پلانه‌دان به گوێره‌ی جیاوازی ئیمان و ته‌قوای هه‌ر یه‌كێكیان[1]

---

(١)_ خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: ﴿هُمْ دَرَجَاتٌ عِنْدَ اللَّهِ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ﴾[آل عمران: ١٦٣] واته: (چاكه‌كاران و خراپه‌كاران) خاوه‌نی چه‌ند پله‌یه‌كه جیاوازن لای خوا و خوا بینایه به‌وه‌ی كه ده‌یكه‌ن، ئیتر به‌هه‌شتیش پله‌گه‌لێكه‌و هه‌ر پله‌یه‌كیش ئه‌هلی خۆی تێدا نیشته‌جێ ده‌بێت، كه پێی شایسته بوون، هه‌موویان له یه‌ك پله‌دا نین، هه‌روه‌ها دۆزه‌خیش _ په‌نا به خوا _ خانه خانه و چین چینه، خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ وَلَنْ تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا﴾[النساء: ١٤٥] واته: (بابزانن) دوو ڕووه‌كان له خانه‌و ته‌به‌قی هه‌ره ژێره‌وه‌ی ئاگردان و هه‌رگیز ڕزگاركه‌رێكت بۆ ئه‌وان ده‌ست ناكه‌وێت. كه‌وا بوو به هه‌شت پله پله‌یه، بۆ پله پله‌یه؟ چونكه كرده‌وه‌ی خه‌ڵكی نێوی جیاوازه، خوای گه‌وره سته‌م له هیچ كه‌س ناكات و، هه‌ر كه‌سێك له شوێنێكدا داده‌نێت كه كرده‌وه‌كه‌ی به‌و شوێنه شایسته‌ی ده‌كات، بۆیه به گوێره‌ی كرده‌وه‌كانی خۆیان پله‌یان له به‌هه‌شتدا جیاواز ده‌بێت.

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُ فِيهَا مَا نَشَاءُ لِمَنْ نُرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُ جَهَنَّمَ يَصْلَاهَا مَذْمُومًا مَدْحُورًا (١٨) وَمَنْ أَرَادَ الْآخِرَةَ وَسَعَى لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَئِكَ كَانَ سَعْيُهُمْ مَشْكُورًا (١٩) كُلًّا نُمِدُّ هَؤُلَاءِ وَهَؤُلَاءِ مِنْ عَطَاءِ رَبِّكَ وَمَا كَانَ عَطَاءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا (٢٠) انْظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَلَلْآخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَاتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلًا (٢١)﴾[1] [الإسراء: ١٨_٢١] واتە: هەر کەسێك تەنها ژیانی دونیای بوێ لەم (دونیا)دا زوو پێی دەدەین ئەوەی بمانەوێ بۆ هەر کەسێك لـە پاشـان دۆزەخمان بـۆ سازداوە دەچێتە ناوی بە لۆمە کراوی و دەرکراوی لە میهرەبانی خوا هەر کەسێکیش مەبەستی ڕۆژی دوایی بێت و هەوڵی بۆ بدات بەو جۆرەی شایستەی ئەوە وە باوەڕداریش بێت ئا ئەوانە کردەوەو هەوڵ و تێکۆشانیان وەرگیراوە دەبەخشین بە هـەمووان ئەوانە (کە هەر دونیایان دەوێ) و ئەوانە(ی کە ڕۆژی دواییان دەوێ) لە بەخششی پـەروەردگارت (لەم دونیایەدا) بێگومان ڕۆزی و بەخشراوی پەروەردگارت قەدەغەکراو نـەبووە (ئەی موحەممـەد ﷺ سـەرنج بـدە چـۆن (لـە دونیـادا) بـاوی هەنـدێکمان داوە بەسەر هەندێکیاندا وە بێ گومان پلەکان لە ڕۆژی دواییدا گـەورەترە بـاوی هەنـدکیان بەسەر هەندێکیان گەورە ترە.

---

(١)_ خوای گەورە لە دونیادا لە ڕۆزی و هێز و توانـا و شـتی دیکەشـدا هـەژاری و دەوڵەمەندی خستۆتە نێوان بەندەکانی و خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿كُلًّا نُمِدُّ هَؤُلَاءِ وَهَؤُلَاءِ مِنْ عَطَاءِ رَبِّكَ وَمَا كَانَ عَطَاءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا﴾ هـیچ کەسـێك توانـای قەدەغـەکردنی بەخشینی خوای گەورەی نیـیە، پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەفەرموودەیەکدا کـە ئیمامی بوخـاری و مسـلم دەیگێڕنـەوە دەفـەرموێت: ((اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ)) واتە: ((پەروەردگارا ڕێگر نییە بۆ ئەو شتەی تـۆ دەیبەخشـی و، بەخشـەریش نییە بۆ ئەوەی تۆ دەیگێڕیتەوە))، خوای گەورە لـە دونیـادا بـە خـەڵك دەبەخشێ و لەوەشدا جیاوازیان لە نێواندا دەکات، بە تێکڕای مرۆڤایـەتی دەبەخشێ، ئەگەر چی کافریش بن، جا ئەگەر کەسێك تەنها دونیای بوێت، بێگومان خوای گەورە ئارەزووی

هەرچی بکات پێی دەبەخشێ، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لاَ يُبْخَسُونَ﴾[هود: ١٥] واتە: هەرکەس دەیەوێت جوانی و ڕازاوەی ژیانی دونیا ئێمە (بەرهەمی) کردەوەکانیان بە تەواوی پێ دەدەین تیایدا و ئەوان لەم ژیانەدا کەم و کوڕی یان لەگەڵ ناکرێت. بۆیە بەلای کافرانەوە چەند زانستێکی زۆر و هێز و توانای زۆر دەبینیت کە بەلای موسڵمانانەوە نییە، چونکە بەپێچەوانەوە ئیمانداران ڕۆژی دوایان دەوێت، دونیایان وەکو خودی خۆی ناوێت مەگەر بەئەندازەی ئەوەی کە بەڕۆژی دواییان بگەیەنێت، بەڵام ئەوان خودی دونیایان دەوێت، ڕۆژی دواییان ناوێت، بۆیە ئەگەرچی بە تەواوی دونیایان پێدراوە، بەڵام لە ڕۆژی قیامەتدا لە بەهەشت بێبەش دەبن، خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِي الْآخِرَةِ إِلاَّ النَّارُ وَحَبِطَ مَا صَنَعُوا فِيهَا وَبَاطِلٌ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾[هود: ١٦] واتە: ئەوانە کەسانێکن لە ڕۆژی دوابیدا هیچیان بۆ نییە جگە لە ئاگر وە ئەوەی کردوویانە لە دونیا دا پوچ و بێ بەرهەم بووە و هەرچیان کرد بەردەوام بوو بەهیچ. خوای گەورە دونیای پێدان، بۆی فەراهەم کردوون، داواکاریەکانی بۆ جێبەجێ کردن، بەڵام لە بەر ئەوەی ڕۆژی دواییان نەویست هیچ بەشێکیان تێدا نەبوو _ پەنا بە خوا _، دونیاش هیچ سودێکیان پێ ناگەیەنێت، ﴿وَمَنْ أَرَادَ الآخِرَةَ وَسَعَى لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا﴾ لێرەدا تەماشا دەکەین خوای گەورە دەفەرموێت: هەر کەسێك مەبەستی ڕۆژی دوایی بوو بێت، هەوڵی بۆ بدات، نەك تەنها ڕۆژی دوایی بوێت هەوڵی بۆ نەدات، تەنها ویستن بەس نییە، بەڵکو پێویستە بە ئەنجام دانی کردەوەی چاك هەوڵی بۆ بدات و لە هەمان کاتدا ئیمانداریش بێت، کەوا بوو دوو مەرجی هەیە: هەوڵی بۆ بدات و ئیمانداریش بێت، باوەڕی بە هەموو ئەوانە هەبێت کە پێویستە باوەڕیان پێ بەهێز بێ، باوەڕی بە

پاداشت و بە بەهەشت و ئاگر هەبێت، ئەو کاتە خوای گەورە دەفەرموێت: ئا ئەوانە کردەوەو تێکۆشانەکەیان وەرگیراوە، خوای گەورە کردەوەکانیان وەردەگرێت، وونی ناکات، ﴿كُلًّا نُمِدُّ هَؤُلَاءِ وَهَؤُلَاءِ﴾ بەهەمووان دەبەخشین، ئیمانداران و کافران ﴿مِنْ عَطَاءِ رَبِّكَ وَمَا كَانَ عَطَاءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا﴾ لەبەخششی پەروەردگارت لەم دونیایەدا، بێگومان ڕۆزی و بەخشراوی پەروەردگارت قەدەغەکراو نەبووە، ﴿انظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَلَلْآخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَاتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلًا﴾ سەرنج بدە چۆن لە دونیادا باوی هەندێکمان داوە بەسەر هەندێکیاندا وە بێ گومان پلەکان لە ڕۆژی دوابیدا گەورەترە وە پێشخستنی هەندێکیشیان بەسەر هەندێکیان گەورەترە.

لێرەدا خوای گەورە بۆی ڕوون کردوینەتەوە بەوانە دەبەخشێت کە دونیایان دەوێت و بەوانەش دەبەخشێت کە ڕۆژی دواییان دەوێت، بێگومان بەخشینی پەروەردگار لە هیچ کەسێك قەدەغەکراو نەبووە، نەکەسانی چاك و، نەکەسانی خراپیش [(١)].

هەروەها خوای گەورە بۆی ڕوون کردوینەتەوە کەوا ئەهلی ڕۆژی دوایی جیاوازی لە پێشتری و پێشەکێتیان (التفاضل) یان تێدایە زۆر زیاتر لەوەی کە ئەهلی دونیا جیاوازی لە پێشتری و پێشەکێتیان (التفاضل) هەیە، پلەکانیشی لە پلەکانی دونیا گەورەترە [(٢)].

---

(١)_ واتە: نە لە کەسانی چاك و نە لە کەسانی خراپیش قەدەغە کراو نییە، خوای گەورە بە ئیمانداروکافریش دەبەخشێت، باشە کێ کافران ڕۆزی دەدات؟ خواردن و خواردەنەوەیان پێ دەبەخشێت، توانای خۆشگوزەرانی و ئەم داهێنانانەیان دەداتێ؟ بێگومان خوای گەورەیە، هەروەها کێ ئیمان و یەقین و کردەوەی چاك بە ئیمانداران دەبەخشێت و، لەدونیاشدا لەشتە خۆش و بە لەزەتەکانی دونیاو،ماڵ و سەروەتیان پێ دەبەخشێت، بێگومان خوای گەورەیە، لە دونیادا بەمان و بەوانیش دەبەخشێت، لەوانەشدا لە دونیادا جیاوازیان هەیە، بەڵام بێگومان پلەکان لە ڕۆژی دواییدا گەورەترە و باوی هەندێ کەس بەسەر هەندێکی تریشدا گەورە ترە.

(٢)_ نێوان هەر دوو پلەیەك بە ئەندازەی نێوان ئاسمان و زەویە وەکو ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی.

هـەروەها ڕێزدانـی هەنـدێ لـە پێغەمبـەرانی _علیهم الصلاة والسلام_ بەسەر هەندێکیاندا بۆ ڕوون کردوینەتەوە، بە هاوشێوەی ڕێزدانی هەندێ بەندەکانی لیکی خۆی بەسەر هەندێکیاندا[1]، لەم بارەوە دەفـەرموێت: ﴿تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ مِنْهُمْ مَنْ كَلَّمَ اللَّهُ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَاتٍ وَآتَيْنَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ الْبَيِّنَاتِ وَأَيَّدْنَاهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ﴾[2] [البقرة: ٢٥٣] واتـە: ئـەو پێغەمبەرانـەی (کـە باسکران) ڕێزمان داوە بە هەندێکیان بەسەر هێندێکیاندا ﴿مِنْهُمْ مَنْ كَلَّمَ اللَّهُ﴾ لەو پێغەمبەرانە هـی وایان بوو کە خوا قسەی لە گەڵ کردووە (بە بێ پەردە) ﴿وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَاتٍ﴾ وە هەندێکیانی بەرزکردۆتـەوە چـەند پلەیـەك ﴿وَآتَيْنَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ الْبَيِّنَاتِ﴾ وە دامـان بـە عیسای کوڕی مەریـەم چـەند بەڵگەیـەکی (موعجیزەیـەکی ئاشکرا) ﴿وَأَيَّدْنَاهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ﴾ و پشت گیریمان کرد بە فریشتەی سرووش (کە جبریلـە)، مـەلا موحەممـەد مـەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

---

(١)_ ڕێزدار بوونی پێغەمبەران بەسـەر یەکتریـدا، ڕێـزدار بـوونی هـاوەڵان بەسەر یەکتریدا، ڕێزدار بوونی سەرجەم ئیماندارانی تر لە ئیمـان و بـاوەڕدا یـەك ئاست نین بۆیە لە ڕۆژی قیامەتدا پاداشتەکانیشیان یـەك ئاسـت نییـە، هـەروەها پلەکانیشیان چونکە خوای گەورە ستەم لە هیچ کەس ناکات.

(٢)_ پێغەمبەران لە نێوان خۆیانـدا پـتر ڕێـزو چاکەیان بەسـەر یەکتریدا هەبە، ﴿مِنْهُمْ مَنْ كَلَّمَ اللَّهُ﴾ لەو پێغەمبەرانە هی وایان بووە کە خوای گـەورە بـە بێ پەردە قسـەی لـە گـەڵ کـردووە، وەکـو مووسا پێغەمبـەر _ علیه السلام _، ﴿وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَاتٍ وَآتَيْنَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ الْبَيِّنَاتِ وَأَيَّدْنَاهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ﴾، ئـیتر بـە لای مووسا پێغەمبەرەوە _ علیه السلام _ شتانێك هەیە کە بەلای پێغەمبەرانی ترەوە نییە، بەلای عیسا پێغەمبـەرەوە _ علیه السلام _ شـتانێك هەیـە کـە بـەلای بـرا پێغەمبەرەکانی دیکەیەوە نییە، بەلای موحەممەدیشەوە ﷺ شتانێك هەیە کە بە لای هەموانەوە

نییە، بە لای ئیبراهیم پێغەمبەرەوە _ علیه السلام _ شتانێك هەیە كە بە لای پێغەمبەرانی ترەوە نییە، پێغەمبەران پتر ڕێزدار بوون و چاكەیان بەسەر یەكتریدا هەیە، بەڵام پێغەمبەرانی تریش كە ڕێزو چاكەیان لە ئاست برا پێغەمبەرەكانیاندا كەمترە بە سووك تەماشا ناكرێن و گاڵتەیان پێناكرێت، درووست نییە هیچ كەسێك بە سووك تەماشای پێغەمبەران بكات، ئەگەر چی ڕێزو چاكەشیان لە ئاست برا پێغەمبەرەكانیاندا كەمتر بێت و، برا پێغەمبەرەكانی دیكەی لەو ڕێزدارترو چاكتریش بن، لە ڕێزی پێغەمبەران كەم ناكرێتەوە، بۆیە پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ فەرموویەتی: ((لا تفضلوني علی یونس بن متی)) ریوایەت؟؟ واتە: فەزڵی من بەسەر یونسی كوڕی مەتتای پێغەمبەردا مەدەن، بۆیە جایز نییە لە ڕووی شانازیكردن و بەسووك تەماشاكردنەوە لە ڕێزی پێغەمبەران كەم بكرێتەوەو بەسووك تەماشا بكرێن.

﴿مِنْهُمْ مَنْ كَلَّمَ اللَّهُ﴾ هەندێ لەو پێغەمبەرانە خوای بێ هاوتا قسەی لەگەڵ كردوون، جەعدی كوڕی دیرهەم و كەسانێك لەهاوەڵانی بەئەبا عەمری كوڕی عەلائیان گوت: دەمانەوێ ئەم ئایەتە بەم جۆرە بخوێنینەوە ((مِنْهُمْ مَنْ كَلَّمَ اللَّهَ)) واتە: وشەی (اللهُ) بكات بە (اللهَ) بۆ ئەوەی ئەو مانایە ببەخشێت كە خوای گەورە قسەی نەكردووە، بەڵكو موسا _ علیه السلام _ قسەی لە گەڵ خوادا كردووە، ئەبا عەمری كوڕی عەلائیش پێی گوت: با من بەو جۆرە بیخوێنمەوە كە تۆ دەیڵێیت، ئەی ■ لەو ئایەتەی خوای بێ وێنە دەكەی كە دەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا جَاءَ مُوسَى لِمِيقَاتِنَا وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ﴾[الأعراف: ١٤٣] واتە: كاتێ مووسا گەیشتە ژوانگە بۆ لای ئێمە و پەروەردگار ووتووێژی لە گەڵدا كرد، بۆیە كاتێ بەم شێوەیە وەڵامی دانەوە دەمیان بەستراو، ڕێگەكەیان لێ داخرا.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِمَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ النَّبِيِّينَ عَلَى بَعْضٍ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا﴾[١] [الإسراء: ٥٥] واتە: وە پەروەردگارت زاناترە بە هەر چی لە ئاسمانەکان و لە زەوی دایە و سوێند بە خوا بێ گومان باوی هەندێ لە پێغەمبەرانمان داوە ﴿عَلَى بَعْضٍ﴾ بەسەر هەندێکی تریاندا وە زەبوورمان بەخشی بە داوود.

وفي ((صحيح مسلم)) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ : ((الْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ خَيْرٌ وَأَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنَ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ))[٢]،

---

(١)_ ﴿وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ النَّبِيِّينَ عَلَى بَعْضٍ﴾ باوی هەندێ لە پێغەمبەرانی داوە بەسەر هەندێکی تریاندا، ﴿وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا﴾ وە زەبوورمان بەخشی بە داوود، داوود پێغەمبەر _ عليه السلام _ کتێبی زەبووری بە ئاوازو بەلارانەوەی دەنگەوە دەخوێندەوە، هەر کات زەبووری بە ئاوازو بە لارانەوەی دەنگەوە بخوێندایەتەوە سەرا پای کێو باڵندەکان خوشوع دەیگرتن و مل کەچ دەبوون بۆی، هەر هەموویان پێکەوە لە گەڵیدا دووبارەیان دەکردەوە، لە بەر دەنگە خۆشەکەی _ عليه السلام _ ئەمە فەزیلەت و چاکەیەك بوو تایبەت کرا بوو بە داوود پێغەمبەرەوە.

(٢)_ ئەوەی ئاماژە بۆ جیاکاری نێوان ئیمانداران دەکات لە بواری پتر رێزو چاکە بوون بەسەر یەکتریدا ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوایە _ صلى الله عليه وسلم _ کە دەفەرموێت: ((الْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ خَيْرٌ وَأَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنَ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ)) ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی موسڵمانان لەڕووی ئیمانەوە لە نێوان یەکتریدا جیاوازیان هەیە، ئیتر کەسی بەهێز لە ئیمانەکەیدا لە کەسی لاواز لە ئیمانەکەیدا چاکترە، ((وَفِي كُلٍّ خَيْرٌ)) هەموشیان هەر چاکن، ئیتر ئیماندار با ئیمانەکەشی لاواز بێت لە کافرو لە دووڕوو چاکترە، کەوا بوو درووست نیە موسڵمانانی ئیمان لاواز بەسووك تەماشا بکرێن، پێویستە بە چاوی سووکەوە تەماشا نەکرێن، چونکە لە هەر هەموو کافران بەلای خوای گەورەوە ﷻ خۆشەویستترن.

بێ ... كلٍّ خيرٌ، احرص على ما ينفعك، واستعن بالله ولا تعجز[1]، وإن أصابك شيءٌ فلا

ولا ... تقل: لو أني فعلت كان كذا وكذا، ولكن قل: قدر الله، وما شاء فعل[1]،

---

(١)_ ئەوە ئەوەی لێ وەردەگیرێ مرۆڤ پێویستە هۆکارەکان بەکار بێنێت، نەڵێت: من پشتم بەخوا بەستووە، من بڕوام بەخوا هەیەو، هۆکارەکان پەك بخات، بەڵکو پێویستە هۆکارەکان بەکار بێنێت، سووربە لەسەر ئەوەی سوودت پێ دەگەیەنێت، پشت بەخوا ببەستەو، دەستەپاچە مەبە، واز لە کار کردن بێنێت، واز لە کەسابەت بێنێت و، بڵێت: من پشتم بەخوا بەستووە، ئەمە درووست نییە.

(٢)_ داواکردنی ڕۆزی و بژێوی بەکارهێنانی هۆکارەکان لە قەدەری خوای گەورەن، لە قەدەری خوای کار بەجێ بەدەرنین و دژی قەدەر نین، مەڵێ: ئەگەر خوا شتێکی بۆ تەقدیر کرد بێتم دەستم دەکەوێت، لە خۆیەوە نایەت مەگەر بەهۆکار، مەگەر هۆکارەکان بەکاربێنێت، پێدەچێ هۆکارەکانیش بەکار بێنێت بەڵام شتەکەت دەست نەکەوێت، لەوەشدا هەر حیکمەتی خوا هەیە، پێدەچی دەست نەکەوتنی شتەکەت بۆ باشتر بێت، ئەوەت بۆ چاکتر بێت، بۆیە خەمبار مەبەو تووڕە مەبەو، مەڵێ: ئەگەر وام بکردایە ئاوەهاو ئاوەها دەبوو، بەڵکو بڵێ: ئەمە قەدەری خوایەو ئاوەی ویبیەوێ دەیکات، چونکە (لَوْ) واتە (ئەگەر وا بوایە) کاری شەیتان زیاتر دەکاتەوە. لەم بارەدا مرۆڤ بێ ئارامی ڕووی تێ دەکات و، دەڵێت: بۆ ئاوەهام نەکرد، من کەمتەرخەم بووم، نەسەرزەنشتی خۆت بکەو، نەسەرزەنشتی قەدەریش بکە، شتێك بوو هۆکارەکانت بەکارهێناو نەبوو، پێویستە بڕوات، بەخوای گەورە هەبێ، بڕوا بەوە دەکەی کە ئەگەر خوای گەورە تەقدیری بکردایە دەبوو، بەڵام تەقدیری نەکردووە ((قَدر اللَّهِ، وَمَا شَاءَ فَعَلَ)) ئەمە قەدەری خوایەو ئەوەی ویستی کردی.

شاهێد لە فەرموودەکە سەرەتاکەیەتی کە ئیمانداری بەهێز بە لای خوای گەورەوە خۆشەویسترە لە ئیمانداری لاواز، بەڵام هەردوکیشیان هەر چاکن.

فإنَّ لَوْ تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ))[(١)] واته: ((بڕواداری بەهێز چاکترو خۆشەویستترە بەلای خوای گەورەوە له بڕواداری لاواز، هەمووشیان چاکن، سوور بە لەسەر ئەوەی سوودت پێ دەگەیەنێت، داوای یارمەتیش تەنها لە خوای گەورە بکەو، دەستەپاچە مەبە ئەگەر شتێکت تووش بوو، مەڵێ: ئەگەر وام بکردایە ئاوەها دەبوو، بەڵکو بڵێ: ئەمە قەدەری خوایەو ئەوەی ویستی کردی، چونکە (لَوْ) واتە: (ئەگەر وا بوایە) کاری شەیتان دەکاتەوە)).

وفي ((الصحيحين)) عن أبي هريرة و عمرو بن العاص رضي الله عنهما عن النبي صلى الله عليه وسلم أنه قال: ((إِذَا اجْتَهَدَ الحَاكِمُ فَأَصَابَ، فَلَهُ أَجْرَانِ، وَإِذَا اجْتَهَدَ فَأَخْطَأَ، فَلَهُ أَجْرٌ))[(٢)] واتە: ((هەر کات حاکم ئیجتیهادی کردو پێکای، دوو پاداشتی بۆ دەنوسرێت و، هەر کات ئیجتیهادی کردو نەیپێکا، یەك پاداشتی بۆ دەنوسرێت)).

---

(١)_ صحيح: أخرجه مسلم (٢٦٦٤) من حديث أبي هريرة رضي الله عنه مرفوعاً.

(٢)_ صحيح: أخرجه البخاري (٧٣٥٢)، ومسلم (١٧١٦) من حديث عمرو بن العاص وأبي هُريرة رضي الله عنهما.

فەرموودەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە جیاوازی لە نێوان حاکمەکاندا هەیە سەبارەت بە پتر ڕێزو لە پێشتر بوونیان بەسەر یەکتریدا، زانایان جیاوازیان لە نێوان یەکتریدا هەیە لە بواری دەرهێنانی حوکم لەبەڵگە شەرعیەکانەوە، کەسانێکیان تێدایە بە ئیجتهادی خۆی حوکمە شەرعیەکە دەپێکێت، دوو پاداشتی بۆ دەنوسرێت، پاداشتێك بۆ ئیجتهادەکەی و پاداشتێکیش بۆ پێکانەکەی، بەڵام ئەوەی ئیجتیهاد دەکات و نایپێکێت، تەنها یەك پاداشتی بۆ دەنوسرێت، کە پاداشتی ئیجتیهادەکەیەتی، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە جیاوازیان لە نێوانداية سەبارەت بەپتر ڕێزو لە پێشتر بوونیان بەسەر یەکتریدا، زانایان و فوقەهاش جیاوازییان لە نێواندایە سەبارەت بەپتر ڕێزو بەسەردا بوون بەسەر یەکتریدا، فەرموودەکە هاندانی تێدایە سەبارەت بە ئیجتهاد کردن و هەڵهێنجانی حوکمی شەرعی لە بەڵگەکانەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لاَ يَسْتَوِي مِنْكُمْ مَنْ أَنْفَقَ مِنْ قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ أُولَئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِنَ الَّذِينَ أَنْفَقُوا مِنْ بَعْدُ وَقَاتَلُوا وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾(١) [الحديد: ١٠] واتە: یەکسان نین ئەوانەتان کە لە پێش گرتنی (مەککە)دا ماڵیان بەخشیووە جەنگاون (لەگەڵ ئەوانەی لە دوای فەتح ئەو کارانەیان کردووە) ئەوانە پلەو پایەیان زۆر گەورەترە لەوانەی کە لە دوای (گرتنی مەککە) ماڵیان بەخشیووە و جەنگاون وە خوا بەڵێنی بەهەشتی داوە بە هەر دوولا و خوا ئاگادارە بەوەی کە دەیکەن.

---

(١)_ هاوەڵان جیاوازن سەبارەت بە پتر ڕێزو لە پێشتر بوونیان بەسەر یەکتریدا، ئەوانەی پێش ڕزگار کردنی مەککە ئیمانیان هێناو ماڵ و نەفیان بەخشی لەوانە چاکترن کە لە دوای ڕزگارکردنی مەککە ئیمانیان هێناو بەخشیان، ﴿وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى﴾ وە بە هەر دوولا خوا بەڵێنی بەهەشتی داوە، ئەوانەی پێش ڕزگار کردنی مەککەو ئەوانەش کە لە پاش ڕزگار کردنی مەککە ئیمانیان هێناو بەخشیان، ئەم ئایەتەی خوای گەورە کە دەفەرموێت: ﴿وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى﴾ لەگەڵ ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوادا ﷺ کە فەرموویەتی: ((وفي كلٍّ خيرٌ)) یەك مانایان هەیە. هەروەها باقی ئیماندارانیش بەهاوشێوەی هاوەڵان جیاوازن لە پێشتر بوون فەزڵی هەندێکیان بەسەر هەندێکیان، ئەوەش تەنها لە سەر بنچینەی کارو کردەوەیە، نە بەنەسب و بنەماڵەیە، نە بە شەڕافەتە، نە بە هیچی ترە، تەنهاو تەنها بە کردەوەیە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((وَمَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ)) واتە: ((هەرکەسیش کردەوەکانی دوایخات، بێگومان چاکی و باشی نەسەب و بنەماڵە پێشی ناخات)).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ فَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى وَفَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا (٩٥) دَرَجَاتٍ مِنْهُ وَمَغْفِرَةً وَرَحْمَةً وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا (٩٦)﴾[1] [النساء: ٩٥_٩٦] واتە:

یەکسان نین دانیشتوان (لە جیهادی ڕێی خوادا) لە باوەڕداران جگە لە خاوەن عوزرەکان (نەخۆش، کوێر، شەل) لەگەڵ تێکۆشەرانی ڕێگەی خوا دا بەماڵ و گیانیان خوا باوی داوە بە تێکۆشەران بە ماڵ و گیانیان بەسەر دانیشتوان (لە جیهاد)دا بە پلەیەك و هەر یەك لەو دوو تاقمە خوا بەڵێنی پاداشتی زۆر چاکی پێداون (کە بەهەشتە) و خوا ڕێزی تێکۆشەرانی داوە بەسەر ئەوانەی کە دانیشتوون و جیهاد ناکەن بە پاداشتێکی گەورە لە لای (خوا) وە پلەی زۆر و لێخۆش بوون و میهرەبانیان بۆ هەیە وە خوا هەمیشە لێبوردەی میهرەبانە.

---

(١)_ خوای گەورە فەزڵی تێکۆشەرانی داوە بەسەر ئەوانەدا کە دانیشتوون و وازیان لە جیهاد هێناوە بە دوو فەزڵ، فەزڵی پێداون لە پلەیەکداو فەزڵیشی پێداون لە پلەیەکدا، خوای گەورە فەزڵی تێکۆشەرانی داوە بەسەر دانیشتواندا، جگە لەوانەی عوزریان هەیە (نەخۆش، کوێر، شەل) ئەمانە عوزریان هەیە و پاداشتی نیەتەکەی خۆیان هەیە لە جیهاددا، بەڵام ئەوانەی بە کردار تێکۆشاون بێگومان فەزڵیان لەوانە زیاترە کە تەنها نیەتی باشیان هەبووە بەرامبەر بە جیهاد، بەڵام نەخۆشی و عوزرەکانیان ڕێی پێنەداون بەشداری لە جیهاد دا بکەن، بەڵام فەزڵێکی گەورە نییە بەڵکو تەنها یەك پلەیە، چونکە ئەمانە عوزرو بەهانەکانیان ڕایگرتن، بۆیە پاداشتی ئەو کەسانەیان هەیە کە دەرچوون و بە کرداری تێکۆشاون، ﴿لَا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ یەکسان نین ئەوانەی دانیشتوون لە ئیمانداران، باشە بۆچی دانیشتوون؟ بێگومان دانیشتوون و وازیان لە جیهاد هێناوە، ﴿غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ﴾ جگە لە خاوەن عوزرەکان (نەخۆش، کوێر، شەل) ﴿وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ لە گەڵ تێکۆشەرانی

......................................................................................

......................................................................................

..............................................................................

رێگای خوادا، ﴿وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ﴾ وه هەر یەك لەو دوو تاقمە خوا بەڵێنی پاداشتی زۆر چاکی پێداون کە بەهەشتە، چونکە خوای گەورە هیچ کەس بێ ئومێد ناکات، ﴿وَفَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ وە خوا ڕێزی تێکۆشەرانی داوە بەسەر دانیشتووەکاندا بە پاداشتێکی گەورە، ئەو دانیشتووانەی کە عوزرو بەهانەیان نییە، ئەمە لە جیهادی فەرزی کیفایەدایە، چونکە جیهاد دوو جۆرە: جیهادی فەرزی عەین لەو کاتەیە، ئەگەر دوژمن گەمارۆی شارو وڵاتی دا بوو، بەڵام جیهادی فەرزی کیفایە ئەگەر جیهادی تەڵەب بوو، ئەم جۆرە جیهادە ئەگەر ژمارەیەك لە خەڵك پێی هەستان، لە سەر ئەوانی تر دەکەوێ، بەڵام ئەو کەسەی پێی هەڵدەستێت، خوای گەورە چەندەها پلە بەسەر ئەوانەدا بەرزی دەکاتەوە کە بەشداریان تێدا نەکردووە ﴿وَفَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا (٩٥) دَرَجَاتٍ مِّنْهُ وَمَغْفِرَةً وَرَحْمَةً وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾، ئەمە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە تێکۆشەرانیش لە پێناوی خوادا جیاوازن، ئەو کەسانەی بە عەمەلی و بە نەفسی خۆیان لە جیهاد دا بەشدار دەبن، بەیەك پلە فەزڵیان لەوانە زۆرترە کە عوزرو بەهانەیەك ڕایگرتوون، وە هەر کەسێکیش بەبێ هیچ بەهانەیەك دانیشت جایزە بەڵام ئەوانەی کە بە عەمەل و بە نەفسی خۆیان بەشداری جیهاد بوونە بە چەندین پلە کە هەر خوای گەورە دەیزانێت لە سەرووی ئەوانەوەن، چونکە خوای گەورە ئەو پلانەی دیاری نەکردووە.

هەروەها لە ئایەتێکی تر داخوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَجَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ لَا يَسْتَوُونَ عِنْدَ اللَّهِ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ (١٩) الَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِنْدَ اللَّهِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَائِزُونَ (٢٠)﴾[1]

---

(١)_ کردەوەکانیش جیاوازن و هەندێکیان لە هەندێکی تریان بەڕێزترو بەرزترن، ئاودان بەحاجیان و سەرپەرشتی کردن و ئاوەدانکردنەوەی مزگەوتی حەرام بێگومان کردەوە گەلێکی زۆر چاکن، بەلام تێکۆشان لە پێناوی خوادا لەوان چاکترە، چونکە هەمووان بە ئاوەدانکردنەوەی مزگەوتی حەرام و ئاودان بە حاجیان و خزمەتکردنی حاجیانەوە شانازیان دەکردو، وایان دەزانی ئەمە بەسە، کەچی خوای گەورە بۆی ڕوونکردوینەتەوە کە شتانێکی دیکە هەیە لەوانە چاکترە، کە بریتیە لە تێکۆشان لە پێناوی خوادا، ﴿سِقَايَةَ الْحَاجِّ﴾ بریتیە لە دابینکردنی ئاو لە بیری زەمزەم بۆ حاجیان، ئەم کارەش بۆ هەندێ لە تیرەکانی بەنی هاشم بوو، هەندێکی تریشیان (الرِّفادة)یان لە ئەستۆ گرت بوو، کە بریتی بوو لە خۆراکدانی حاجیان، هەندێکی تریشیان (السِدانة)یان لە ئەستۆ گرت بوو، کارەکانی حەجیان لە نێوان خۆیاندا دابەش کرد بوو، ئەمە کردەوەگەلێکی بەڕێزن، بەلام تێکۆشان لە پێناوی خوادا لەوانە بەڕێزترو چاکترە، ئەمە بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە کردەوەکانیش جیاوازیان هەیەو هەندێکیان لە هەندێکی تریان بەڕێزترن، بۆیە ئەوەی لە پێناوی خوا دا تێدەکۆشێت بێگومان لەو کەسە بەڕێزترو چاکترە کە لە مزگەتی حەرامدا ئیعتیکاف دەکات _ سبحان الله _ بە ڕاستی سەرسوڕمانە، نوێژێك لە مزگەوتی حەرام دا بەسەد هەزار نوێژە، لە گەڵ ئەوەشدا کەسی تێکۆشەر لە پێناوی خوا دا لەو بەڕێزترو چاکترە.

يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم بِرَحْمَةٍ مِنْهُ وَرِضْوَانٍ وَجَنَّاتٍ لَهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُقِيمٌ (٢١)[1] خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ (٢٢) ﴾[2] [التوبة: ١٩ _٢٢] واته: ئایا پێتان وایە ئاودان بە حاجیان و (سەرپەرشتی و) ئاوەدانکردنەوەی مزگەوتی حەرام وەکو کەسێکە کە باوەڕی هێنابێت بە خوا و بە ڕۆژی دوایی وە تێکۆشانی کرد بۆ لە ڕێی خوا دا؟ وەك یەك نین بە لای خواوە (و یەکسان نین) و خوا ڕێنموونی کۆمەڵی ستەمکاران ناکات ئەوانەی کە بڕابان هێناوەو کۆچیان کردووە تێکۆشاون لە ڕێگای خوا دا بە ماڵیان و بە گیانیان پلەیان بەرزترە لای خوا و هەر ئەوانەن سەرکەوتوون پەروەردگاریان موژدەیان دەداتێ بە میهرەبانی و ڕەزامەندی لە لایەن خۆیەوە هەروەها بەهەشتانێکیان بۆ هەیە نازو نیعمەتی بەردەوام و هەمیشەیی تێدایە دەمێننەوە تیایدا بەهەمیشەیی بە ڕاستی خوا پاداشتی هەرە گەورەی لایە.

---

(١)_ ئەمە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە تێکۆشان لە پێناوی خوادا لە ئاوەدانکردنەوەو سەرپەرشتیکردنی مزگەوتی حەرام و ئاودانی حاجیان بەڕێزترو چاکترە، ئەگەر چی ئەمانە کردەوە گەلێکی چاکن لە گەڵ خۆ یەکلاکردنەوە بۆ خوای گەورە، بەڵام تێکۆشان زۆر زۆر لەوانە بەڕێزترو چاکترە.

(٢)_ ئەمە بۆ تێکۆشەرانە لە پێناوی خوا دا بەتایبەت.

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاءَ اللَّيْلِ سَاجِدًا وَقَائِمًا يَحْذَرُ الْآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُو الْأَلْبَابِ﴾[١] [الزمر: ٩] واتە: (هاویەش دانەران چاکترن) یا کەسێ ملکەچ و پەرست کارە (بۆ خوا) لە کاتەکانی شەودا بەسوژدە بردن و ڕاوەستان (لە شەو نوێژدا) کە لە (سزای) دوا ڕۆژ دەترسێت و بە هیوای بەزەیی پەروەردگاریەتی (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ئایا ئەوانەی دەزانن یەکسانن لەگەڵ ئەوانەی کە نازانن بە ڕاستی تەنها خاوەنانی ژیریی ئامۆژگاری وەردەگرن.

---

(١)_ ﴿أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ﴾ مەبەست خواپەرستی و درێژی شەو نوێژە ﴿آنَاءَ اللَّيْلِ سَاجِدًا وَقَائِمًا يَحْذَرُ الْآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ﴾ لـە کاتـەکانی شـەودا بەسـوژدە بـردن و ڕاوەسـتان لـە شـەو نوێـژدا کـە لـە سـزای دوا ڕۆژ دەترسـێت و بـە هیـوای بەزەیی پەروەردگاریـەتی، ئایـا ئـەو کەسـە لـە گـەڵ کەسـێکی ئیمانـداری نوسـتوو یەکسانن؟ بێگومان یەکسان نین، پاشان خوای گەورە لەو ئایەتەدا دەفەرموێت: ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ ئایا ئەوانـەی دەزانـن یەکسـانن لـە گـەڵ ئەوانەی کە نازانن، ئەمـە بەڵگەیـە لـە سـەر ئـەوەی کـە زانایـان لـە کەسـانی ئیمانداران ئاسایی چاکترن.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قِيلَ لَكُمْ تَفَسَّحُوا فِي الْمَجَالِسِ فَافْسَحُوا يَفْسَحِ اللَّهُ لَكُمْ وَإِذَا قِيلَ انْشُزُوا فَانْشُزُوا يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾[1] [المجادلة: ١١] واتە: خواش پایەی ئەو کەسانە بەرز دەکاتەوە لە ئێوە کە بڕوایان هێناوە و ئەوانەی کە زانستیان پێ بەخشراوە بە چەند پلەیەك (پلەیان بەرز دەکاتەوە).

---

(١)_ لە سەرەتای ئایەتەکەدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قِيلَ لَكُمْ تَفَسَّحُوا فِي الْمَجَالِسِ فَافْسَحُوا﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە کاتێك لە کۆڕو دانیشتنەکانی زیکرو یادکردنەوەدا، ئەڵقەکانی زیکرو یادی خوای گەورەدا، پێتان گوترا جێگە بکەنەوەو فراوانی بکەن بۆ ئەو کەسانەی دوادەکەون و پاشان بەجێدەگەن، فراوانی بکەن چونکە پێدەچێ ویستی گوێگرتنی هەبێت و، جێگەیەك نەدۆزێتەوە بۆ دانیشتن، بۆیە خوای گەورە فەرمانی پێکردون جێگەی بۆ بکەنەوەو، هاوکاری بکەن بۆ ئەوەی بتوانێت لە کۆڕو دانیشتنەکانی فێربوونی زانست و زیکری خوای گەورە ئامادەبێت، ﴿يَفْسَحِ اللَّهُ لَكُمْ﴾ خواش فراوانی بە ئێوە دەدات، چونکە پاداشت لە بەرامبەر خودی کردەوەیە، هەر کاتێك مەجلیسەکانتان فراوانکردەوەو، ڕێگەی کەسانی دیکەتان کردەوە، خوای گەورەش بەهەشتتان بۆ فراواندەکات، لە دونیادا خۆشیتان پێ دەبەخشێت ﴿وَإِذَا قِيلَ انْشُزُوا فَانْشُزُوا﴾ ئەگەر پێتان گوترا هەستن بۆ نوێژ، ئێوەش هەستن، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ ئەمە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە ئیمانداران لە پاداشتدا جیاوازن و زانایانیش لە پاداشتدا جیاوازن، هەروەها کردەوەکانیش جیاکاریان هەیەو هەندێکیان لە هەندێکی تریان پتر ڕێزو بەسەردابونیان بەسەر یەکتریدا هەیە، هەروەها ئیماندارانیش جیاکاریان هەیەو هەندێکیان لە هەندێکی تریان پتر ڕێزو بەسەردابونیان بەسەر یەکتریدا هەیە.

## بەشێك

## سەبارەت بەوەی کە پارێزکاری (تەقوا) مەرجە بۆ دەستکەوتنی دۆستایەتی

بەندە نابێت بە دۆستی خوای گەورە مەگەر ئیماندارێکی لە خوا ترس نەبێت، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلا إِنَّ أَوْلِيَاء اللَّهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ (٦٢) الَّذِينَ آمَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ(٦٣) لَهُمُ الْبُشْرَى فِي الْحَياةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ لاَ تَبْدِيلَ لِكَلِمَاتِ اللَّهِ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ (٦٤)﴾ ﴿يونس: ٦٢ _ ٦٤﴾ واتە: ئاگادرابن بێ گومان دۆستانی خوا ترسیان لە سەر نی یە خەفەتیش ناخۆن ئەوانەی باوەڕیان هێناوە وە هەمیشە خۆیان دەپارێزن و لە خوا دەترسن هەر بۆ ئەوانە مزگێنی لە ژیانی دونیادا و لە دوا ڕۆژیشدا گۆڕان نی یە بۆ فەرمایش و (و بەڵێنەکانی خوا) هەر ئەوەیە سەرکەوتنی زۆر گەورە.

هەروەها لە فەرمایشتێکی قودسی دا هاتووە: ((وَمَا يَزَالُ عَبْدِيْ يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ)) واتە: ((بەندەکەم بەردەوام بە سووننەت و نافیلەکان لێم نزیك دەبێتەوە تا خۆشم دەوێت)).

وە ناشبێت بە ئیماندارێکی لە خوا ترس تا وەکو بە بەجێهێنانی فەرزەکان لە خوای گەورە نزیك نەبێتەوە، کە ئەوەی بەجێهێنا دەبێت بە یەکێك لە چاکان (الأبرار أهل اليمين)[1]،

---

(١)_ پێشتر بۆمان ڕوونکردنەوە کە ئیمانداران پلە پلەن، کۆمەڵێکیان لە پێشکەوتووە نزیکەکان(السابقون المقرّبون)، ئەمانە لە ڕێگەی بەجێهێنانی فەرزو نافیلەو سوونەتەکانەوە خۆشویستن و پشتگیری و سەرخستنی خوای گەورەیان بۆ خۆیان بە دەست هێناوە، چینێکی دیکەی ئیماندارانیش چاکانن (المقتصدون الأبرار أصحاب اليمين)ن ئەمانە تەنها واجیباتی سەرشانیان بەجێهێناوەو، خۆیان لە حەرامەکان لادا خستۆتەوە، کەوا بوو ئیمانداران جیاوازن.

دوای ئەوەش بەردەوام لە ڕێگەی ئەنجامدانی نوێژ و سوونەتەکان کردەوە خۆ بەندەیەکان خۆی لە خوای گەورە نزیك دەکاتەوە تا دەبێت بە یەکێك لە پێشکەوتووە نزیکەکان (السابقون المقرّبون)[١].

زانراویشە کە هیچ کەسێك لە کافران و دوو ڕووان نابن بە دۆستی خوای بێ وێنە[٢]، هەروەها ئەوانەش کە ئیمان و پەرستنەکانیان بە ڕاست دانانرێن، ئەگەر چی وا تەقدیر کراوە کە هیچ تاوانێکی نەبێت، وەکو منداڵانی کافران و، ئەوانەی کە بانگەوازی ئیسلامیان پێ نەگەیشتووەو هاوشێوەکانی وەکو ئەوان[٣].

---

(١)_ پێشکەوتووانی نزیك (السابقون المقرّبون) سەرەڕای فەرزەکان نافیلەو سوونەتیش ئەنجام دەدەن، بەڵام چاکان (المقتصدون) تەنها فەرزەکانیان ئەنجام داوە، ئەمیش خێرێکی گەورەیە، فەرزەکان خێرێکی گەورەن.

(٢)_ چونکە فەرمایشتەکەی خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ آمَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ﴾ کافرانە: ئەوانی لێ دەچێتەدەر.

(٣)_ ئەمە جۆری سێیەمە کە نەپاداشت و نەسزاشیان هەیە، ئەمانە بریتین لە منداڵی بچووك کە باڵغ نەبونەو، ئەو شێتانەی کە عەقڵیان نییەو، ئەو کەسانەی کە بانگەوازی ئیسلامییان پێنەگەیشتووە، ئەمانە ئیمان و پەرستنەکانیان بەڕاست دانانرێت، چونکە موکەللەف و پێسپێردراو نین، نەك لە بەر ئەوەی هەڵوەشێنەرێکی هەبەو ئیمان و پەرستنەکانی هەڵدەوەشێنێتەوە، نەخێر، ئەمانە ئیمان و پەرستنەکانیان بەڕاست دانانرێت، چونکە موکەللەف و پێسپێردراو نین، مەرجەکانی ڕاست و دروستی کارو کردەوەیان تێدا نییە.

ئەگەر چی گوتراوە: ئەوانە سزا نادرێن تا پێغەمبەرێکیان بۆ دەنێردرێت[1] ئەمانە نابن بە وەلی و دۆستی خوای گەورە مەگەر ببن بە ئیماندارێکی لە خوا ترس[2]، کەوا بوو هەر کەسێك نە بە ئەنجام دانی کردەوە چاکەکان و نە بە وازهێنان لە کردەوە خراپەکان لە خوای گەورە نزیك نەبێتەوە، بێگومان بە وەلی و دۆستی خوای گەورە دانانرێت[3].

---

(١)_ مەبەستی ئەوەیە کە زانایان سەبارەت بەوانەی کە بە هیچ شێوەیەك بانگەوازی ئیسلامیان پێنەگەیشتوەو، هەروەها منداڵانی موشریکان بیروڕای جیاوازیان هەبووە، بۆیە زانایانی وا هەبووە لەم مەسەلەیەدا ڕاوەستاون، کاروباریانی بۆ خوای گەورە گەڕاندۆتەوە، زانایانی واش هەبووە گوتوویانە: لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە پێغەمبەرێکیان بۆ دەنێرێت، هەر کەسێکیان ئیمانی پێ هێنا دەچێتە بەهەشتەوەو، هەر کەسێکیشیان ئیمانی پێ نەهێنا دەچێتە دۆزەخەوە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾[الإسراء: ١٥] واتە: ئێمە هەرگیز سزای (بەندەکان) نادەین هەتا پێغەمبەر نەنێرین (بۆیان). هەندێ لە زانایانیش فەرموویانە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَبَيْنَهُمَا حِجَابٌ﴾[الأعراف: ٤٦] واتە: لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا پەردەو جیاکەرەوەیەك هەیەو، منداڵانی هاوبەشدانەران ئەوانەی بە هیچ شێوەیەك بانگەوازی ئیسلامیان پێ نەگەیشتووە لەسەر ئەو پەردەو جیاکەرەوەیەن.

(٢)_ بەڵام سزا نادرێن، وەلی و دۆستی خوای گەورە نین، بەڵام کافریش نین، بۆیە سزا نادرێن، چونکە عوزریان هەیەو بەهانەدارن.

(٣)_ هیچ کەسێك نابێت بە وەلی و دۆستی خوای گەورە مەگەر لە خوای گەورە نزیك بێتەوە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((وَمَا يَزَالُ عَبْدِيْ يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ)) واتە: ((بەردەوام بەندەکەم لێم نزیك دەبێتەوە)) هەروەها لە هەمان فەرموودەدا

---------------------------------------------
---------------------------------------------
---------------------------------------------

فەرموویەتی: ((وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِيْ بِشَيءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ. وَمَا يَزَالُ عَبْدِيْ يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ))((وە بەندەکەم بەهیچ شتێك لێم نزیك نەبۆتەوەو خۆشەویستتر نەبووە بەلامەوە بە ئەندازەی ئەو فەرزانەی کە بەسەریدام سەپاندووە و بەندەکەم بەردەوام بە سووننەت و نافیلەکان لێم نزیك دەبێتەوە تا خۆشم دەوێ))، کەوا بوو هیچ کەسێك نابێت بە وەلی و دۆستی خوای گەورە کە فەرزەکان و پاشان سووننەت و نافیلەکانیشی بەجێنەهێنابێت.

## ئایا منداڵ و شێت دۆستی خوای گەورەن؟

هەروەها شێت و منداڵیش دۆست وەلی خوای بێ وێنە و نین، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثلاث: عَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يُفِيقَ، وَعن الصَّبِي حَتَّى يَحْتَلِمَ، وَعَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ)) وهذا الحديث قد رواه أهل السنن من حديث علي و عائشة رضي الله عنهما، واتفق أهل المعرفة على تلقيه بالقبول. واتە: ((پێنوسی سەپاندنی شەرعی و تاوان لە سەر سێ جۆر کەس هەڵگیراوە: لە سەر شێت تا بە ئاگا دێتەوەو چاک دەبێتەوە، لە سەر منداڵ تا باڵغ دەبێت، لە سەر نووستوو تا خەبەری دەبێتەوە)).

بەڵام منداڵی هۆشیاری زرنگ پەرستنەکانی بە ڕاست و دروست دادەنرێت، بە پێی بیروڕای جەماوەری زانایانیش پاداشتی دەدرێتەوە[1]، بەڵام شێت کە پێنوسی سەپاندنی شەرعی و تاوانی لە سەر هەڵگیراوە، بە پێی ڕێککەوتنی (إتفاق)ی زانایان هیچ پەرستنێکی بە ڕاست و دروست دانانرێت[2]،

---

(١)_ بەڵێ، لە بەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ ((مُرُوا أَوْلادَكُمْ بِالصَّلاةِ وَهُمْ أَبْنَاءُ سَبْعِ سِنِينَ، وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْهَا وَهُمْ أَبْنَاءُ عَشْرٍ)) واتـە: ((فـەرمانی نوێـژکردن بـە منداڵەکانتان بدەن کە تەمەنیان بوو بە حەوت ساڵان و، کە لە تەمـەنی دە ساڵانیشدا ئەنجامیان نەدا لێیان بدەن))، کەوا بوو ئەم فەرموودەیـە بەڵگەیـەکی ڕوونـە لـە سەر ئەوەی کە پەرستنەکانیان ڕاست و دروستەو، لـە سـەر ئـەنجام دانیشی پاداشتیان دەدرێتەوە، ئەگەر چی لە سەریان واجب نییە.

(٢)_ لەبەر نەبوونی (نیەت) هێنـان، چـونکە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتی: ((إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى)) واتـە: ((لـە ڕاسـتیدا ئەنجامدانی کردەوەکان تەنها بە نیەتەوە، وە لە ڕاستیدا هەموو مرۆڤێك بە گوێرەی چاك و خراپی نیەتەکەی خۆی پاداشت وەردەگرێت)) شێتیش هیچ نیەت و مەبەستێکی نییە.

بۆیە نە ئیمان و نە کوفرو، نە نوێژو، نە هیچ پەرستنەکانی دیکەی بە ڕاست و دروست دانانرێت[1]، بەڵکو بە لای سەرجەم ژیرو عاقڵانەوە بۆ هیچ کاروبارێکی دونیایی وەکو بازرگانی و پیشەسازی ناشێت[2]، لێهاتوویی و شیاوێتی تێدا نییە بۆ ئەوەی ببێت بە کوتاڵفرۆش، یا عەتار، یا ئاسنگەر، یا دارتاش، هەروەها بە ڕێکەوتنی زانایان گرێبەستەکانی بە ڕاست و دروست دانانرێن، بۆیە نەکڕینەکەی، نەفرۆشتنەکەی، نە نیکاح و هاوسەرگیریەکەی، نە تەڵاقەکەی، نەدانپێدانانەکەی، نەشایەتیەکەی و، سەرجەم گوفتارەکانی دیکەی بەڕاست و دروست دانانرێت[3]، بەڵکو سەرجەم گوفتارەکانی قسەی پڕوپووچ و بەتاڵن و هیچ حوکمێکی شەرعی و[4] پاداشت و سزایەکی[5] پێوە پەیوەست نابێت،

---

(١)_ چونکە موکەللەف و پێسپێردراو نییە، قەڵەم لەسەر هەڵگیراوە، هیچ مەبەستێکی خەیرو شەڕی لەکردەوەکانی خۆیدا نییە، هیچ نیەت و مەبەستێکی نییە.

(٢)_ ئەگەر بۆ کاروباری دونیایی نەشێت و هیچ کارێکی دونیایی پێ نەسپێردرێت، لەبەر نەبوونی لێهاتووی، کەوا بوو بۆ کاروباری ڕۆژی دواییش شیاو نییەو لێهاتوو نابێت.

(٣)_ چونکە عەقڵ و ژیری لە دەست داوە.

(٤)_ تا ئەو ئاستەی ئەو قسە ناشیرینانەش کە دەیکات وەکو جوێندان و کوفر کردن سەرزەنشت ناکرێت و، تاوانی ناگات، چونکە عەقڵی نییەو هیچ مەبەستێکی نییە.

(٥)_ ئەمەیە ڕەحمەت و بەزەیی و دادپەروەری خوای گەورە کە هیچ کەسێك سزا نادات، مەگەر ئەوەی کە پەیامی خوای گەورەی پێگەیشتبێت و لە ڕووی عەقڵ و ژیریشەوە لێهاتوو بێت.

بەڵام قسەو گوفتاری منداڵێک کە توانای جیاکردنەوەی هەبێ و عاقڵ و ژیر و هۆشیارە
بێ ضەرەرەو ماددەشی پێ دەدرێت لە زۆر جێگەدا بەپێی دەق و بە پێی کۆ دەنگی
زانایان وە لە زۆر جێگەی تیکەشدا کە جیاوازی و ناکۆکی زانایانی تێدایە.

ئەگەر شێت ئیمان و، نە لە خوا ترسان و، نە نزیک بوونەوە لە خوای گەورە بە
فەرزەکان و، نە نافیلەو سوونەتەکانی بەڕاست و دروست دانەنرێن، کەوا بوو نابێ ئەو
کەسە وەلی و دۆستی خوا بێت، بۆیە درووست نییە بۆ هیچ کەسێک بڕوای بەوە بێت
کە شێت دۆستی خوای گەورەیە[٢].

---

(١) بۆیە بە منداڵێک ناودەبرێت کە توانای جیاکردنەوەی باش و خراپی شتەکان
دەزانێت، چونکە توانای جیاکردنەوەی ڕاست و دروست و خراپ دەزانێت، توانای
جیاکردنەوەی زیانبەخش و بەسوود دەزانێت، وەکو ئەو منداڵە نیە کە لە تەمەنی
جیاکردنەوە بە خوارە، یان وەکو شێت نیە کە توانای جیاکردنەوەی هیچ شتێکی نیە،
کەوا بوو ئەو منداڵە عەقڵ و زیرەکە لە سەر یادکردنەوەو نوێژکردن و هەموو
پەرستنەکان پاداشت دەدرێتەوە، بە کردەوە گەلێکی نافیلەو سوونەت بۆی
دادەنرێت.

(٢) لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە شێت نە بە دۆست و نە بە دوژمنی خوای گەورە
وەسف ناکرێت، نەبە ئەوەو نەبەئەمە وەسف ناکرێت، چونکە موکەللەف و
پێسپێردراو نییەو، خوای گەورە سەپاندنە شەرعیەکانی لەسەر لابردووە، بەڵام
شەیخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێ بێت _ لێرەدا مەبەستی ئاماژەکردنە بۆ شتێکی
زۆر گرنگ کە بریتیە لەوەی صۆفیەکان شێتەکان بە دۆستانی تایبەتی خوای گەورە
دادەنێن، پێیان وایە ئەوەی کە شێتەکان دەیکەن کردەوەی وەلی و دۆستانی خوایە.
بە ڕاستی قسەکانی پێشەوا ئیبن و تەیمیە بەرپەرچدانەوەی ئەو صۆفیانەیە کە لەو
باوەڕەدان شێتەکان و بێ عەقڵەکان دۆستی خوان. پێویستە بزانین فریشتەکان

..............................................................................................

..............................................................................................

.........................................................................................

دابەش نابن و تەنها یەك جۆرن و هەر هەموویان دۆستی خوای گەورەن، بەلام نەوەی ئادەم و جنۆکەکان سێ بەشن، بەشێکیان دۆستی خوان و بریتین لە ئیمانداره لە خوا ترسەکان، بەشێکیان دوژمنی خوان و بریتین لە کافر و هاوەڵپەرستان و دوو ڕووان، بەشی سێیەمیش هەن کە نە بە دۆست و نە بە دوژمن وەسف ناکرێن و بریتین لەوانەی کە عەقڵ و هۆشیان نییە وەکو شێت و ئەو منداڵانی کە هێشتا عەقڵ و هۆشیان بۆ پەیدا نەبووە، ئەمانە نە بە دۆست ونە بە دوژمن خوا وەسف ناکرێن، بەلام کەسانێك لەو بڕوایەدان کە شێتەکان دۆستی خوان لێیان داوا دەکرێت و پاڕانەوەیان لێ دەکرێت یا زۆربەی صۆفیەکان و گۆڕپەرستان و خەڵەفا و و سەرلێشێواوەکان، ئەمانە لەو بڕوایەدان شێتەکان دۆستی خوان، لە کاتێکدا کە نە دۆست و نە دوژمنی خوای گەورە، چونکە موکەللف و پێسپێردراو نین.

بەو بەهانەیەی گوایە موکاشەفەیەکی لێوە بەدیکردووە[١]، یان جۆرە تەصەڕوفێک[٢]، بۆ نموونە: بینیویەتی ئاماژەی بۆ کەسێک کردووەو دەست بەجێ مردووە یان پەرکەم گرتویەتی[٣]، چونکە بە دڵنیایی زانراوەو ساغ بۆتەوە کە کافران و دوو ڕووان ـ لە هاوبەشدران و ئەهلی کیتاب ـ چەندین موکاشەفەو تەصەڕوفاتی شەیتانیان هەیە[٤]،

---

(١)_ واتە لەو بڕوایەدایە کە دۆستی خوایە، ئەگەر پێشی بگوترێت: بەڵگەت چی یە کە دۆستی خوایە؟ دەڵێت: لە سەر دەستی ئەو شێتە چەندین شتی نامۆ بەدی دێت وەکو موکاشەفە ـ موکاشەفە: بریتیە لە هەواڵدان بەشتگەلێکی نادیار یان شتگەلێک لە داهاتوودا دێتە دی، یان ئاماژە بۆ کەسێک دەکات و تووش دەبێت، ئەمەش کردەوە گەلێکی نائاسایی و لە سروشت بەدەرە، کەوا بوو ئەمە دۆستی خوایە، بۆیە بەم جۆرە کەسانە دەگوترێت: ئەگەر ئەو کردەوانە لە سەر دەستی عاقڵانیش بەدی بێت، بێگومان کردەوە گەلێکی شەیتانیەو، ئاماژە بۆ دۆستایەتی ناکات، چ جای ئەگەر ئەو کردەوانە لە سەر دەستی کەسانێکی شێت و بێ عەقڵ بەدی بێت، ئەوە زۆر پێشترە بەوەی کە دۆستی خوای گەورە نەبێت.

(٢)_ کە ڕەفتارێکی نامۆی نواند، ئیتر کەسانێک لەو بڕوایەدا دەبن ئەوە کەڕاماتەو، هەر کەسێکیش کەڕامەتی هەبێت وەلی و دۆستە، دڵنیا بن ئەمە لە کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەری شەیتانی دەرناچێت کە بۆ ئەم جۆرە کەسانەی ئەنجام دەدەن، بێگومان ئەگەر ئەو کردەوانە لە سەر دەستی کەسانێک بێتەدی کە لە چینی ئیمانداران و لە خوا ترسان نەبن بە وەلی و دۆستی خوای گەورە دانانرێن، چ جای ئەگەر لە سەر دەستی کەسانێکی وەکو ئەوانە بەدی بێت.

(٣)_ هۆکاری ئەمە تەنها شەیتانە بۆ ئەوەی سەر لە خەڵکی ئاسایی بشێوێنێت.

(٤)_ شەیتانیەو خودی خۆیان ئەنجامیان نەداوە، بەڵکو تەنها شەیتان بۆیان ئەنجام دەدات کە تێکەڵیان دەبێت.

وەکو خۆ بەغەیبزان و جادووگەران و، هاوبەشدران و، ئەهلی کیتاب[١]. کەوا بوو دروست نییە بۆ هیچ کەسێك ئەو کردەوە نائاسایانەی کە کەسێك ئەنجامی دەدات بکاتە بەلگەی ئەوەی گوایە ئەو کەسە وەلی و دۆستی خوا بێت، ئەگەر چی هیچ کردەوەو گوفتارێکیش لەو کەسەوە نەبینیبێت کە لەگەڵ دۆستایەتی خوادا پێچەوانەو نانەبا بێ[٢]، چ جای ئەگەر شتێکی لێوە بەدیکردو لە گەڵ وەلایەت و دۆستایەتیدا پێچەوانەو ناتەبا بوو[٣]،

---

(١)_ ئەوان کافرو هاوبەشداندرانن و شەیتانەکان چەندین شتی نامۆیان بۆ ئەنجام دەدەن، شەیتانەکان تێکەڵیان بوونەو، ئەوانەیان بۆ ئەنجام دەدەن بۆ ئەوەی سەر لە خەلك بشێوێنن، ئەمانە دۆستی خوای گەورە نین، تەنها ئەنجامدانی کردەوە گەلێکی نائاسایی نابێتە بەلگەی ئەوەی کە ئەو کەسە دۆستی خوا بێت تا تەماشای کردەوەکانی نەکرێت، ئەگەر لە ئیمانداره لە خوا ترسەکان بوو ئەوە دۆستی خوایەو، ئەو کردەوە نائاساییانەش کەرامەتە و خوای گەورە لە سەر دەستی هێناویەتیە دی ئەگەر گوناهکارێکی داوێن پیسی کافری موشریکیش بوو، بێگومان کردەوەکانی شەیتانیە، بۆیە هاوەلپەرستان خۆبەغەیبزان و فالچی و لە هەموو ئەو جۆرانەیان زۆرە ئەگەر چی هاوەلپەرستیشن.

(٢)_ بەلێ، ئەو کردەوە نائاساییانە ناکرێن بە هیچ بەلگەیەك بۆ بوونی دۆستایەتی خوای گەورە، لەبەر ئەوەی کەسێکی لە خواترس و ئیماندار نییە، بەلکو تەنها کەسێکی هاوەلپەرست یا کافر یا دوو ڕووە، کردەوە نائاساییەکانیشی تەنها شەیتانی دەبن.

(٣)_ ئەوانەی بانگەشەی دۆستایەتی خوای گەورە دەکەن، چەندەها کوفرو خراپەیان لێوە بەدەر دەکەوێت، وەکو فەوتاندنی فەرزەکان و، ئەنجام دانی کردەوە ناشیرینەکان، کە چی کەسانێکی نەفام دەلێن: ئەمانە بە خوای گەورە گەیشتوون،

سەپاندنە شەرعیەکانیان(واجبا) تەکانیان لە سەر هەلگیراوە، ئەمانە دۆستی خوان، بەلام با دلنیا بن تەنها شەیتانە کە سەریان لێ دەشێوێنێت و، بەلگە پوچەکانیان بۆ دەڕازێنێتەوە، لە ڕاستیدا ئەوان تەنها دۆستی شەیتانن و، دۆستی خوای گەورە نین، کردەوە نائاساییەکانیشیان شەیتانیەو، بەو کردەوانە سەر لە خەلك دەشێوێنن، ئەوان شیرك ئەنجام دەدەن، کردەوەی خراپ ئەنجام دەدەن، کەچی پێیان دەگوترێت: ئەمانە موکەللەف و پێ سپێردراو نین، حەلال و حەرامیان لە سەر هەلگیراوە، هەموو شتێك بۆ ئەوان ڕێپێدرا و موباحە، چونکە بە خوا گەیشتوون، دەلێن: لە ڕاستیدا سەپاندنە شەرعیەکان تەنها بۆ خەلکانی ئاساییە، بەلام ئەمانە دۆستانی تایبەتی تایبەتن، سەپاندنە شەرعیەکانیان لە سەر هەلگیراوەو، هیچ شتێکیان لێ حەرام ناکرێت، ئاوەها دەلێن.

...مونە کەسێکی بەدی کرد بڕوای بە شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ نەبوو، لە ...و لە ڕووخسار (باطناً وظاهراً)، بەڵکو بڕوای بە شوێنکەوتنی شەرعی ڕووکار (ظاهر) ...ەبوو بە بێ هەقیقەتی ناوەکی (اتباع الشرع الظاهر دون الحقيقة الباطنة)[1] یان لەو ...بڕوایەدا بێت کە وەلی و دۆستانی خوا ڕێگەیەکی دیکەیان هەیە بۆ بە خوا گەیشتن غەیری ڕێگەی پێغەمبەران[2].

یان بڵێن: پێغەمبەران ڕێگاکەیان تەسک کردۆتەوە[3].

---

(١)_ جیاوازی لە نێوان شەریعەت و هەقیقەتدا دەکەن، ئەوان دەڵێن: شەریعەت تەنها بۆ خەڵکانی ئاساییە، بەڵام هەقیقەت بۆ دۆستە تایبەتمەندەکانە، ئەوان شەریعەت و هەقیقەتیان هەیە، ئا ئەمە دابەشکردنی ئەهلی (باطلە)، بەڵام لە ڕاستیدا بەلای ئەهلی هەقەوە هیچ جیاوازییەك لە نێوان شەریعەت و هەقیقەتدا بوونی نییە.

(٢)_ وەکو پێشتریش ئاماژەی پێدرا دەڵێن: ئێمە پێویستمان بە پێغەمبەران نییە، پێغەمبەران تەنها بۆ خەڵکانی ئاسایی نێردراون، بەڵام ئێمە پێویستمان بە پێغەمبەران نییە، چونکە ڕاستەوخۆ لە خوای گەورەوە وەردەگرین، گوایە لە ڕێگەی سەرۆکەکانیانەوە کە ڕاستەوخۆ بە خوای گەورەوە پەیوەندی دەکەن، ڕاستەوخۆ شتی لێیەوە وەردەگرن، گوایە لە گەڵ خوای گەورەدا دادەنیشن و، ڕاستەوخۆ لێیەوە وەردەگرن، گوایە ئەوان لە پێغەمبەران چاکترن کە لە ڕێگەی سرووش و وەحیەوە لە ڕێگەی جبریلەوە شتەکان لە خواوە وەردەگرن، تەماشاکەن کوفری ئەم تاقمە لە چ ئاستێك، دەشکوترێت: ئەمانە دۆستانی خوای گەورەن.

(٣)_ دەڵێن: پێغەمبەران ڕێگەکەیان تەسك کردۆتەوە، دەڵێن: باشە هیچ ڕێگەیەکی تر نییە بۆ بەخوا گەیشتن تەنها ڕێگەی پێغەمبەران نەبێت؟ براکەم ڕێگەی بە خوا گەیشتن فراوانە، لە ڕێگەی پێغەمبەرانەوە بە خوا دەگەیت و، لە ڕێگەی کەسانی دیکەی غەیری ئەوانیشەوە هەر بە خوا دەگەیت، بەڵکو لە ڕێگەکانی ترەوە زۆر چاکترە.

یان بڵێن: پێغەمبەران تەنها پێشەنگی خەڵکانی ئاسایین نەك تایبەتمەندان و[1]، قسەی دیکەی لەو هاوشێوانە کە کەسانێك لەوانەی بانگەشەی دۆستایەتی خوا دەکەن دەیڵێن.

ئا ئەمانە کوفریان تێدایە کە لەگەڵ ئیماندا پێچەوانەو ناتەبایە[2]، سەرەرای وەلایەت و دۆستایەتی خوای گەورە، کەوا بوو هەر کەسێك ئەنجام دانی کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەری کەسێکیان بکاتە بەڵگە بۆ ئەوەی گوایە ئەو کەسە دۆستی خوایە[3]،

---

(١)_ دەڵێن: پێغەمبەران تەنها بۆ ڕەمەکی خەڵکن کە هەقیقەت نازانن و، جگە لە شەرعە ڕووکارەکە هیچی تریان نییە، بەڵام ئەوان پێویستیان بە پێغەمبەران نییە _ داواکارین خوای گەورە بمانپارێزێت _.

(٢)_ کوفر لەگەڵ ئیماندا کۆ نابنەوە، کوفری گەورە لەگەڵ ئیماندا کۆنابنەوە، شیرکی گەورە لەگەڵ یەکخواپەرستیدا هەر گیز کۆ نابنەوە، دوو دژن کۆبونەوەیان بۆ نییە، خوای گەورە مەرجی ئەوەی داناوە کە وەلی ئیمانداری لە خوا ترس بێت وەکو ئەوەی دەفەرموێت: ﴿أَلا إِنَّ أَوْلِيَاء اللَّهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ (٦٢) الَّذِينَ آمَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ(٦٣)﴾ [يونس: ٦٢ _٦٣].واتە: ئاگادار بن بێ گومان دۆستانی خوا ترسیان لە سەر نیە خەفەتیش ناخۆن ئەوانەی باوەڕیان هێناوە وە هەمیشە خۆیان دەپارێزن و لە خوا دەترسن، ئا ئەمانە وەلی و دۆستانی ڕاستی خوای گەورەن، بەڵام ئەو کەسەی ئیماندارێکی لە خوا ترس نەبێت بێگومان لە دۆستانی خوای گەورە نییە، بەڵکو دۆستی شەیتانە، ئەگەر چی چەند کردەوەیەکی نا ئاسایی لە سروشت بە دەریش ئەنجام بدات، هەر کردەوە گەلێکی شەیتانیەو هیچی تر، بە دڵنیایی کەرامەت نییە.

(٣)_ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُمْ مِنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ﴾ [البقرة ٢٥٧]

خوا دۆست و کارسازی ئەوانەیە کە بڕوادارن دەریاندەهێنێت لە تاریکستانی بێ باوەڕی بۆ ڕووناکی باوەڕو ڕێنموونیی و ئەوانەی کە بێ بڕوان شەیتان دۆستیانە دەریان دەهێنێ لە ڕووناکی (و بیروباوەڕ )ەوە بۆ تاریکستان. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ(٥٥) وَمَنْ يَتَوَلَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا فَإِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْغَالِبُونَ(٥٦)﴾[المائدة: ٥٥-٥٦] واتە: بێگومان دۆست و یارمەتی دەری ئێوە تەنها خواو پێغەمبەرەکەیی و بڕواداران ئەوانەی کە بەڕێك و پێکی نوێژەکانیان بەجێ دەهێنن و زەکات دەدەن بەردەوام مل کەچن بۆ فەرمانی خوا و هەر کەس خواو پێغەمبەرو ئیمانداران بکات بە پشتیوانی خۆی ئەوە بێگومان هەر کۆمەڵی خوا زاڵ و سەرکەوتوون. لەم ئایەتە پیرۆزە دا ئەو ئاماژە پێکراوانەی سەرەوە بۆمان ئاشکرا دەبێت کە قورئان زۆر زۆر بە ڕوونی دۆستانی خواو دۆستانی شەیتان جیا دەکاتەوە.

با دڵنیا بێت لە جولەکەو گاورەکان گومڕا ترە[1].

---

(١)_ بەڵێ، چونکە تەنها ئەنجام دانی چەند کردەوەیەکی نائاسایی لە سروشت بەدەر ئاماژە بۆ بوونی وەلایەت و دۆستایەتی خوای گەورە ناکات، مەگەر ئیمان و تەقواو لە خوا ترسانی لە گەڵ دا بێت، بەڵام ئەگەر کوفرو دوو ڕووی و هاوەڵپەرستی لە گەڵ دا بوو، ئەوە بێگومان لە دۆستانی شەیتانەو کردەوە نائاسایەکانیشی شەیتانیە، کەرامەتی خوای گەورە نییە، لەوانەیە ئەوان بە هەوا دا بفڕن، بەسەر ئاودا ڕێ بکەن، بچنە نێو ئاگرەوەو نەیان سوتێنێت، ئەو کردەوانەیان بە خودی خۆیان ئەنجام نەداوە، بەڵکو تەنها شەیتانە کە بۆیان ئەنجام دەدات، هەواڵی چەند شتێکی زۆر دوور یان نادیار بەخەڵك دەدەن کە خۆیان نەیانبینیوە، بەڵکو تەنها شەیتانەکان دەیزانن و پێیان ڕادەگەیەنن، ئەوانیش بەنێو خەڵکدا بڵاوی دەکەنەوە، شەیتانەکان خزمەتی دۆستانی خۆیان دەکەن، خوای گەورە لەو بارەوە دەفەرموێت: ﴿هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَى مَن تَنَزَّلُ الشَّيَاطِينُ (٢٢١) تَنَزَّلُ عَلَى كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ (٢٢٢) يُلْقُونَ السَّمْعَ وَأَكْثَرُهُمْ كَاذِبُونَ (٢٢٣)﴾[الشعراء: ٢٢١_٢٢٣] واتە: هەواڵتان بدەمێ شەیتانەکان دادەبەزنە سەر کێ؟ دادەبەزنە سەر هەموو (کەسێکی) زۆر درۆزنی زۆر تاوانبار باش گوێ دەگرن (بۆ شەیتانەکان) وە زۆربەیان درۆزنن (لەو هەواڵانەدا دەیدەن بە خەڵکی). خوای گەورە ئەو شتەی بەتەواوی ڕوون کردۆتەوە، بەڵام ئەوان گوێ بە قورئان نادەن، بەڵکو بەگوێی شەیتانەکان و شێخەکانیان دەکەن، ئەمە هەقە بەلایانەوە، بەڵام بە بۆچونی ئەوان قورئان تەنها ڕووکارەو (ظواهر) بۆ خەڵکانی ئاسایی چاکە.

هەروەها شێتیش، شێت بوونەکەی لە گەڵ ڕاستی و دروستی ئیمان و پەرستنەکانیدا پێچەوانەو نا تەبایە[١] چونکە ڕاست و دروستی ئیمان و پەرستنەکان مەرجن بۆ دۆستایەتی خوای گەورە[٢].

---

(١)_ پێدەچێ پشتگوێ خستنی ئیمان و تەقوا بەهۆی خودی مرۆڤەوە بێت، بریتیە لەو عاقڵ و ژیرەی کە دەرک بەشتەکان دەکات، بەڵام تاعەت و گوێڕایەڵی خوای گەورە پشتگوێ دەخات ، دەبێتە دۆستی شەیتان بە هەڵبژاردنی خودی خۆی، لاوانەشە بە هەڵبژاردنی خودی خۆی نەبێت، کاتێ کە واجیباتەکانی سەر شانی واز لێهێناوە یان هەندێ لە حەڕام کراوەکانی ئەنجام داوە بە ویستی خودی خۆی نەبووە، بەڵکو لە بەر ئەوەی شێت بوەو هیچ عەقڵ و ژیریەکی نەبووە بە هۆیەوە دەرک بە شتەکان بکات، چاك و خراپ، ئیمان و کوفر لە یەك جیا بکاتەوە، ئەم جۆرە کەسانە شێت و منداڵی بچوك دەگرێتەوە، بەکافر دانانرێن ئەگەر چی هەر شتێك ئەنجام بدەت، واز لە هەر شتێکیش بێنن، بە کافر دانانرێن، چونکە عەقڵ و هۆشیان نییەو، سەپاندنە شەرعیەکانیش تەنها لەسەر کەسانی ژیرو عاقڵە.

(٢)_ شێت پەرستنەکانی بە ڕاست و دروست دانانرێن، چونکە ڕاستی و دروستی پەرستنەکان مەرجن بۆ وەلایەت و دۆستایەتی خوای گەورە، بەڵام عاقڵ و ژیران چەند بەشێکن، پێغەمبەری خوا ﷺ لەم بارەوە فەرموویەتی: ((وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِيْ بِشَيءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ. ومَا يَزَالُ عَبْدِيْ يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ)) ریوایەت؟؟ ((وە بەندەکەم بەهیچ شتێك لێم نزیك نەبۆتەوەو خۆشەویستتر بێت بەلامەوە بە ئەندازەی ئەو فەرزانەی کە بەسەریدام سەپاندووە، بەندەکەم بەردەوام بە سووننەت و نافیلەکان لێم نزیك دەبێتەوە تا خۆشم دەوێ))، کەوا بوو ئەو کەسەی تەنها بە ئەنجام دانی فەرزەکان لە خوای گەورە نزیك دەبێتەوە، لە بەشی چاکانن (الأبرار أصحاب اليمين)و، ئەو کەسەش کە بە ئەنجام دانی فەڕزەکان و نافیلەو سووننەتەکان لە خوا نزیك دەبێتەوە، لە پێشکەواتووانی نزیکن(السابقين المقرَّبين).

بەلام سەبارەت بەو کەسەی کە جار بە جار شێت دەبێت و جار بە جاریش چاک

دەبێتەوە(١)، ئەگەر لە کاتی چاک بوونەوەیدا ئیمانی بەخوای پەروەردگار [illegible]

فەرزەکان ئەنجام بدات، خۆی لە حەرامەکان بە دوور بگرێت، ئەم جۆرە کەسە ئەگەر

چی شێتیش بێت، شێت بوونەکەی زیانی بۆ هیچ ناگەیەنێت و خوای گەورە لەسەر ئەو

ئیمان و تەقوای لە خوا ترسانەی کە لە کاتی بە ئاگا هاتنەوەکانیدا ئەنجامی داوە

پاداشتی دەداتەوە(٢)، بە گوێرەی [illegible] و [illegible]

بۆ خوای گەورە دەبێت(٣).

---

(١) شێت بوون دوو جۆرە: شێت بوونێکی پەتەوی تەواو، ئەم جۆرە قەڵەمی لەسەر نییەو سەرزەنشت ناکرێت، پێشی ناگوترێت دۆستی خوایە یان کافرە یان ئیماندارە، جۆری دووەم کەسانێکن جار بە جار شێت دەبن، جار بە جاریش چاک دەبنەوە، جۆری دووەم لە کاتی چاکبوونەوەیاندا کە پەرستنەکانیان ئەنجام دەدەن دۆستی خوای گەورەن، لە کاتی شێت بوون و نەمانی عەقڵ و هۆشیشیاندا نە بە دۆست و نە بە دوژمنی خوا وەسف ناکرێن.

(٢)_ چونکە خوای گەورە کردەوەی هیچ کەسێک وون ناکات، ئیتر کردەوەی پەرستنی ئەو کەسەی کە جار بە جار شێت دەبێت، ناساییەو بە هۆی شێتبوونەوەکەیەوە بە تاڵ نابێتەوە، بەڵکو خوای گەورە بۆی حیساب دەکات و لەسەری پاداشتی دەداتەوە.

(٣)_ وەلی و دۆستی خوایە لە کاتی بە ئاگاهاتن و لە خوا ترسان و کردەوە چاکەکانیدا، بەلام کە شێت بوونەکەی بۆ دەگەڕێتەوە سەپاندنە شەرعیەکانی لەسەر هەڵ دەگیرێت، ئیتر سەرزەنشت ناکرێت و، نە بە دۆستی خوا و نە بە دوژمنی خوا وەسف ناکرێت.

هەروەها ئەو کەسەی کە پاش ئیمان و تەقواو لە خوا ترسانەکەی کوتوپڕ شێت بوو بێت، بێگومان خوای گەورە لەسەر ئەو ئیمان و تەقواو لە خوا ترسانەی کە پێش شێتبونەکەی ئەنجامی دابوو پاداشتی دەداتەوە[١]، کردەوەکانی بەهۆی ئەو شێتبونەوە کە تووشی بووە پووچ ناکاتەوە، بەبێ ئەوەی هیچ تاوانێکی ئەنجام دابێت، لە کاتی شێتێکەشیدا تەکلیفی شەرعی لە سەر هەڵگیراوە[٢].

بەم پێیە هەر کەسێك بانگەشەی وەلایەت و دۆستایەتی خوای گەورە بکات، لە کاتێکدا فەرزەکان بەجێ نەهێنێت و خۆی لە حەرامەکان بە دور نەگرێت، بەڵکو شتانێکیش ئەنجام بدات کە لەگەڵ دۆستایەتی خوادا پێچەوانەو ناتەبا بێت، ئەو کاتە بۆ هیچ کەسێك نییە بڵێت: ئەو کەسە وەلی و دۆستی خوای گەورەیە[٣]،

---

(١)_ ئەگەر لە سەرەتای ژیانیدا ئیمانی بەخوا هەبێت، فەرزەکانی ئەنجام دابێت، خۆی لە حەرامەکان بە دور گرت بێت، پاشان لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا شێت بوبێت تاوەکو مردن، بێگومان خوای گەورە کردەوەو پەرستنەکانی پێشتری وون ناکات، بەڵکو بۆی حیساب دەکات و، پاداشتیشی دەداتەوە، چونکە خوای گەورە کردەوەی چاکەکاران وون ناکات، وە کردەوەو پەرستنەکان بە هیچ شتێك بەتاڵ نابێتەوە، مەگەر بە شیرك و کوفرو هەڵگەڕانەوە نەبێت، بەڵام شێت بوون کردەوەو پەرستنەکان بە تاڵ ناکاتەوە.

(٢)_ بۆیە نەپاداشتی دەدرێتەوەو، نەسزاشی دەدرێت.

(٣)_ بۆ هیچ کەسێك لە ئەهلی زانست و حیکمەت نییە، بەڵکو بۆ ئەو کەسە ئاسایانەی کە ئیمان و بیروباوەڕێکی دروستیشیان هەیە بۆیان نییە بڵێن: ئەو جۆرە کەسانە کە فەرزەکان بەجێ ناهێنن و، حەرام ئەنجام دەدەن وەلی و دۆستی خوای گەورەن، لە ڕاستیدا تەنها ئەهلی باتڵ ئەوە دەڵێن.

ئەم جۆرە کەسە ئەگەر شێتیش نەبێت، بەڵکو تەنها شەیداو سەرگەردان (الوَلَهْ) بێت بەبێ شێت بوون[1]، یاخود جار بە جار بەهۆی شێت بوونەوە عەقڵ و هۆشی نەمێنێ و، جار بە جاریش چاك بێتەوە، فەرزەکان بەجێ نەهێنێت و، باوەڕیشی وا بێت کە لەسەری پێویست نییە شوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەوێت، ئەو کەسە کافرە[2].

---

(١)_ (الوَلَهْ) واتە: شەیدا بوون و سەرگەردان بوون، بریتیە لە خۆشەویستی، چونکە خۆشەویستی چەند پلەیەکەو یەکێ لەو پلانەش (الوَلَهْ)ە واتە شەیدا بوون و سەرگەردان بوون.

(٢)_ ئەو کەسەی لەو باوەڕەدا بێت کە لەسەری پێویست نییە شوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەوێت، بەڵکو لەڕێگەیەکی دیکەی جگە لە ڕێگەکەی ئەوەوە بەخوا دەگات، بێگومان کافرە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنْ كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ﴾ [آل عمران: ٣١] واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت کەواتە دوای من بکەون تا خواش ئێوەی خۆش بوێت و لە گوناهەکانتان خۆش ببێت. ئەگەر تەنها خوای خۆشبوێت و بە پێی هەواو ئارەزووی خۆی و بە گوێرەی ئەوەی بۆ خودی خۆی دایناوە پەروەردگار بپەرستێت، بەبێ ئەوەی شوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەوێت، بێگومان کافرە هەر چەندە بانگەشەی ئەوەش بکات کە خوا دەپەرستێت، لە خوا نزیك دەبێتەوە، چونکە کردەوەو پەرستنەکانی ڕاست و دروست نیین، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهوَ رَدٌّ)) واتە: ((هەر کەس کردەوەیەك ئەنجام بدات و فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت، قبوڵ نییەو ڕەتکراوەتەوە)) کەوا بوو هیچ ڕێگەیەك بەخوای گەورە ناگات جگە لە ڕێگەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەمەش بەر پەرچدانەوەی ئەو کەسانەیە کە دەڵێن: ئێمە پێویستمان بە شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ نییە، ئێمە دەزانین و بەخوا دەگەین، بەبێ ئەوەی پێویستمان بە پێغەمبەر بێت ﷺ، بێگومان ئەو کەسەی ئەم قسانە بڵێت لە هەموو بێباوەڕان کافرترە.

...یشیانەکەش لەو باوەڕەدا بێت کە ئەو جۆرە کەسە وەلی و دۆستی خوایە دیسان
...ئەگەر ڕووخسار و ناوەڕۆکەوە بە تەواوی شێت بێت، ئەوا پێنوسی
...شەرعیەکانی لەسەر هەڵگیراوە[1] _ ئەم جۆرە شێتانە چۆن هاوشێوەی بە
...کافران سزا نادرێن _ ئەوا بەهەمان شێوە هاوشێوەی ئەهلی ئیمان و
...ئواش بە کەرامەت و ڕێزی خوای گەورە شایستەنین[2].

کەوا بوو سەبارەت بە هەر دوو جۆرەکەی سەرەوە درووست نییە بۆ هیچ کەسێك
لەو بڕی وا بێت کە وەلی وە دۆستی خوای گەورەن(٣)، بەم پێیە ئەگەر شێتێك
لەکاتەکانی بە ئاگا بوون و چاکبونیدا ئیمانی بەخوا هەبێ و تەقواو لە خوا ترسانی
هەبێت، بێگومان بە گوێرەی ئەوە وەلایەت و دۆستایەتی خوای گەورەشی دەبێت، وە
هەر کەسێکیش لە کاتەکانی بە ئاگا بوون و چاکبونیدا کوفرو دوو ڕوویی تێدا بێت،
یان کافر یان دوو ڕوو بێت، پاشان کوتوپڕ شێت بوبێت، ئەم جۆرە کەسە بە قەدەر
ئەوەندە کوفرو دوو ڕووییەی تێیدایە کە لە سەری سزادەدرێت[4]،

---

(١)_ بێگومان قەڵەمی تەکلیفی شەرعی لەسەر هەڵگیراوە، بۆیە نە بەکافر و، نە بە ئیماندارو، نە بە دۆست و نە بە دوژمنی خوای گەورە وەسف ناکرێت.

(٢)_ ئەو جۆرە شێتانە بە پلەی ئەهلی ئیمان و ئەهلی تەقواو لە خوا ترسان ناگەن، ئەگەر چی موکەللف و پێسپێردراو نین و، پێنووسی سەپاندنە شەرعیەکانیشیان لەسەر هەڵگیراوە، بێگومان ناتوانن بەپلەی بەندە ئیماندارە لە خوا ترسەکان و ئەهلی کردەوەو ئەهلی جیهاد بگەن.

(٣)_ ئەمە بەر پەچ دانەوەیە بۆ ئەو کەسانەی کە شێت بە دۆستی خوا وەسف دەکەن.

(٤)_ شێتی ئیمانداران و شێتی کافران جیاوازیان لە نێواندایە، شێتی ئیمانداران ئەو کردەوەو پەرستنانەی کە پێش شێتبوونەکەی ئەنجامی داوە ناسڕدرێتەوە، بەڵام

سەبارەت بەشێتی کافران ئەگەر پێش شێت بوونەکەی کافر بوو بێت و کردەوەی خراپ و حەرامەکان و شیرکی ئەنجام دابێت و، پاشان شێت بوو بێت ئەوا لە کاتی شێت بونیدا هیچی لەسەر نییەو سەرزەنشت ناکرێت، بەڵام لە کاتەکانی بە ئاگابونەوەو چاکبونیدا لەسەر کوفر و شیرکەکەی سزا دەدرێت.

شێت بونەکەشی نابێ بە هۆکاری سڕینەوەی ئەو کوفرو دوو ڕوویيەی کە لە کاتەکانی بە ئاگا بوون و چاکبونيدا ئەنجامی دەدات[١].

---

(١)_ خوای گەورە ئەو شێت بوونە ناکات بە هۆکاری سڕینەوەی ئەو کوفرو دوو ڕوويیەی کە لە کاتەکانی بە ئاگا بوون و چاك بونيدا ئەنجامی دەدات، لە ڕاستيدا وازی لە کوفر کردن هێناوە، چونکە بێ دەسەڵات بووە، بۆيە کافر بونەکەی هەر بەردەوامەو، ئەو شێت بونەش نابێ بە هۆکاری سڕینەوەی ئەو کوفرو سەرپێچيانەی کە نووشی بووە پێش شێت بوونەکەی.

ئەم بەشە زۆر گرنگە، چونکە مرۆڤ فێر دەکات چۆن وەڵامی ئەو کەسانە بداتەوە کە شێت بە وەلی و دۆستی خوای گەورە دادەنێن، ئەو شێتانە شێتی موسڵمانان يان شێتی کافرانن، شێتی موسڵمانانيش دوو جۆرن: جۆرێك شێتێکی پەتەڕی تەواوەو لە هەموو ژيانيدا چاك بونەوەی نييە، ئەم جۆرە نەهيچی هەيە و نەهيچيشی لەسەرە، جۆرێکی ديکەش جار بە جار شێتە و جار بە جاريش بە ئاگا دێتەوە چاك دەبێتەوە، بەڵام لە کاتی بە ئاگا بوونيدا خوای گەورە دەپەرستێت، بۆيە لەسەر کردەوە چاکەکانی کە لەو کاتەدا ئەنجامی دەدات پاداشت دەدرێتەوەو، بە ئەندازەی ئەو کردەوە چاکانەی کە لە کاتی بە ئاگا بوونيدا ئەنجامی دەدات وەلايەت و دۆستايەتيشی بۆ خوای گەورە دەبێت. شێتی کافرانيش دوو جۆرە: جۆرێکيان شێتێکی پەتەڕی تەواوە و بە درێژايی تەمەنی بونەوەی نييە، ئەمە وەکو جۆری يەکەمی شێتی موسڵمانان نە هيچی لەسەرەو نەهيچيشی هەيە، ئەگەر چی لە ڕيزی کافرانداية بەڵام حيسابی لەگەڵدا ناکرێت، چونکە نە کوفر و نەهاوڵپەرستی ئەنجام نەداوە، جۆرێکی ديکەش هەن جار بە جار شێتن و جار بە جاريش بە ئاگا دێنەوە و چاك دەبنەوە، ئەم جۆرە ئەگەر لە کاتی بە ئاگا بوونەکەيدا کوفر و شيرکی و کردەوە خراپەکان ئەنجام بدات، ئەوا لەسەر کردەوانە سزا دەدرێت و شێت بوونەکەی تاوانەی ئەو کردەوانەی کە لە کاتی بە ئاگا بوونيدا دەيکات ناسڕێتەوە.

## بەشێك

## سەبارەت بەوەی کە دۆستانی خوا بەشتە ڕێپێدراوە دیارەکانەوە لە خەڵکانی دیکە جیانابنەوە

دۆستانی خوای گەورە شتانێکی تایبەتی موباح و ڕێپێدراویان نییە کە لە بەر دەرەوە لە خەڵکانی دیکەیان جیا بکاتەوە[1]،

---

(١)_ ئەمە شتێکی زۆر گرنگە چونکە ئەو کەسە خەڵەفاوو سەرلێشێواوانە چەند نیشانەیەك بۆ جیاکردنەوەی وەلی و دۆستانی خوای گەورە لە خەڵکانی دیکە بەکاردێنن، وەکو نیشانەکانی جلوبەرگ و پلە و پایەو هیتر، خەرمانەیەك لە ڕێزگرتن و پیرۆزکردنی بە دەوردا دادەنێن، بەڵام وەلی و دۆستانی خوا بە لای ئەهلی سوننەت و جەماعەت هیچ نیشانەیەکی دیاریان نییە، بەڵکو دەر ناکەون، دۆستانی خوای گەورە پێدەچێ نە ناسرێنەوە، چونکە دۆستانی ڕاستەقینەی خوای گەورە حەزیان بەوە نییە بناسرێن، جلوبەرگێکی تایبەت ناپۆشن و بە خەڵکی بڵێن: ئێمە دۆستانی خواین، یا بەشتێکی دیکەی تایبەتەوە خۆی لە خەڵکی جیا بکاتەوەو بڵێت: من دۆستی خوام، دڵنیا بن ئەگەر شتانێکی وەکو ئەوە ئەنجام بدەن تەنها بۆ ڕووپامابییەو(ریاء)ەو هیچی تر، ئەوە ڕووپامابییەو دۆستایەتیەکەی کەم دەکاتەوە یان پوچی دەکاتەوە، کەوا بوو دۆستانی خوا جلوبەرگێکی تایبەت یا شێوەو سەروسیمایەکی تایبەتیان نییە، وەکو ئەوەی کەسانی خەڵەفاوو سەرلێشێواو کاری پێدەکەن، بەڵکو لەوانەیە دۆستانی ڕاستی خوای گەورە هەر نە ناسرێنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((رُبَّ أَشْعَثَ أَغْبَرَ مَدْفُوعٍ بالأبواب لو أَقْسَمَ عَلَى اللهِ لأَبَرَّهُ)) واتە: ((پێدەچێ کەسێکی قژ بژی زۆر تەپو تۆزاوی کە لە دەرگاکاندا پاڵ دەنرێت و دور دەخرێتەوە، ئەگەر سوێند بخوات خوای گەورە نزاکەی قبوڵ بکات، ئەوا قبوڵی دەکات)) تا ئەو ئاستەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر داوای تکا کردن بکات تکای بۆ

بکرێت و ئەگەر خوازبێنیش بکات ژنی پێ نادرێت)) لە کاتێکدا کە وەلی و دۆستی لە خوا ترسی خوای گەورەیە، چونکە خۆی بەشتێك لە تێکڕای جەماوەری خەڵك جیا نەکردۆتەوەو، کردەوەو پەرستنەکانیشی ئاشکرا نەکردووە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئیخلاصی بۆ خوای گەورە. بەڵام ئەو کەسەی خۆی ئاشکرا دەکات، یاخود خەڵکی ئاشکرای دەکەن و، خەرمانەیەك ڕێزو پیرۆزی بە دەوردا دادەنێن، ئەوە بەڵگەی دۆستایەتی نییە بۆ خوای گەورە، چونکە وەلایەت و دۆستایەتی بە نیشانە نییە، بەڵکو وەلایەت و دۆستایەتی خوای گەورە بە ئیمانە، بە ئەنجامدانی کردەوەی چاکە کە هیچ مەبەستێکی وەکو بە دەست هێنانی ناوبانگی و بەرزبونەوەو ڕووپامایی تێدا نەبێت، بەڵکو بە ئیخلاص بۆ خوای گەورەی ئەنجام بدات، سیفەتی خاکێتی تێدا بێت نەك لوت بەرزی و شانازی بە خۆ وەکردن، ئەمانە دۆستانی ڕاستەقینەی خوای گەورەن. لە ڕاستیدا ئەمە سودێکی زۆر گەورەی تێدایە ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە کە دۆستانی خوای گەورە هیچ نیشانەیەکی دیار و ئاشکرایان بۆ ناسینەوەیان نییە، بەڵکو پێدەچێ خۆیان بەدەر نەخەن، خاکێتی و مەڵکەچی زۆر بۆخوای گەورە دەنوێنن، خۆیان بە کەم تەرخەم دادەنێن لە ئاستی بە جێهێنانی هەقەکانی خوای گەورەدا، نە بە کردەوەکانی خۆیانەوەو، نە بە جل و بەرگ و سەروسیمایانەوە شانازی ناکەن، ئا ئەمانە وەلی و دۆستانی ڕاستەقینەی خوای گەورەن.

بۆیە بە جۆرە جلوبەرگێك تا جلوبەرگی تر جیانابنەوە، ئەگەر هەر دوکیان ڕێپێدراو بێت[١]، هەروەها بە جۆرە سەرتاشینێك یا کورت کردنەوەیەك یا بە هۆنینەوەیەك ئەگەر موباح و ڕێپێدراو بێت لە خەڵکانی دیکە جیا نابنەوە[٢]، لەسەر زمانی عەرەب قسەیەکی باو هەیە دەڵێن: (كَمْ مِنْ صديقٍ في قباء، وكَمْ مِنْ زنديقٍ في عباء)[٣]،

---

(١)_ بەڵکو دۆستانی خوا ئەوە دەپۆشن کە خەڵکانی تر دەیپۆشن، یاخود لە خەڵکانی دیکەش کەمتر دەپۆشن، مێزر گەلێکی زل ناپۆشن، یاخود سەرقۆڵەکەیان زۆر فراوان نییە بۆ ئەوەی بگوترێت: ئەمانە دۆستانی خوان، نەخێر، وەکو خەڵکن و لەگەڵیاندا تێکەڵن، نا ناسرێنەوە، بەڵام تەنها ئەوەیان زیادە کە دڵیان بە تەواوی لای خوای گەورەیە.

(٢)_ بە نیشانەی پرچ لە خەڵکی ئاسایی جیا نابنەوە، دۆستانی ڕاستەقینەی خوای گەورە پرچێکی تایبەتیان نییە، بەڵکو وەکو تێکڕای خەڵکانی ئاساین، ڕیشیان درێژ دەکەن و سمێڵیان کورت دەکەنەوەو، بە هیچ شتێك لە خەڵکانی ئاسایی خۆیان جیا ناکەنەوە.

(٣)_ (كَمْ مِنْ صديقٍ في قباء): (الصِّدِّيق) بریتیە لەو مرۆڤەی کە زۆر ڕاستگۆیە، ڕاستگۆیەکی گەورەیە، (في قباء) کە پۆشاکێکی بێبایەخی پۆشیوە، واتە: (چەندەها کەسی زۆر ڕاستگۆ هەن کە پۆشاکی بێبایەخیان پۆشیوە)، وە(وكَمْ مِنْ زنديقٍ في عباء) واتە: (وە چەندها زەندیق _ کەسێکی بێباوەڕەو خۆی بە ئیماندار دەر دەخات _ هەن کە عەبا و پۆشاکی بەنرخ و جوان دەپۆشن)، کەوا بوو وەلایەت و دۆستایەتی بە سەر و سیمای جوان و پۆشاکی جوان نییە، بەڵکو دۆستایەتی تەنها لە نێوان بەندەو خوای گەورەدایەو، تەنها خوای گەورە پێی دەزانێت.

ەڵ و دۆستانی خوای گەورە لە هەموو چین و توێژەکانی ئوممەتی موحەممەددا ﷺ
[١]، ئەگەر لە بیدەعەچیانی دیارو خراپەکاران نەبن، لە نێوان ئەهلی قورئان و
یەان زانستدا هەن، لە نێوان ئەهلی جیهادو شمشێردا هەن، لە نێوان بازرگانان و
ئەهلی پیشەسازان و، جوتیاران دا هەن.

---

(١)_ دۆستانی خوای گەورە لە کۆمەڵێکی تایبەتی خەڵکدا نابن، بەڵکو لەهەموو چین و توێژەکاندان، لە نێوان زانایاندان، لە نێوان خەڵکانی ئاساییدان، لە نێوان بازرگاناندان، لە نێوان جوتیاران دان، لە خەڵك جیا نابنەوەو دیار نین، ناگوترێت: دۆستانی خوای گەورە بەکارێکی دیاری کراو وەسف دەکرێن، نەخێر، تێکەڵ بە تێکڕای خەڵك دەبن، وەکو هەموو خەڵکی تر بە دوای پەیدا کردنی ڕۆزیی خۆیاندا دەگەڕێن، دەبن بە جوتیار، دەبن بە تێکۆشەر لە پێناوی خوادا، دەبن بە زانا، دەبن بە خەڵکی ئاسایی و یەکخواپەرستن، دەبن بەبازرگان، مانای وەلی دۆستی خوای گەورە ئەوە نییە کە واز لە بازرگانی بێنێت و خەڵك پێی ببەخشن و بەو جۆرە بتوانن خۆیانی لێ نزیك بکەنەوە، نەخێر، بەڵکو وەکو تێکڕای خەڵکانی تر کار دەکات، داوود پێغەمبەر _ علیه السلام _ پێغەمبەرو پادشاش بوو، هەموو جۆرە سامان و ماڵێکی هەبوو، کەچی لە بەرهەمی دەستی خۆی دەخوارد، قەڵغانی دروست دەکردو، دەیفرۆشت و لە بەرهەمی دەستی خۆی دەخوارد، لە (بيت المال)ی نەدەبرد، هەر چەند لە ژێر دەستی خۆشیدا بوو، هیچ شتێکی لێ نە دەبرد، ئا ئەمە وەلی خوای گەورەیە. بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((مَا أَكَلَ أَحَدٌ طَعَامًا قَطُّ خَيْرًا مِنْ أَنْ يَأْكُلَ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ، وَإِنَّ نَبِيَّ اللهِ دَاوُدَ- عليه السلام- كَانَ يَأْكُلُ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ)) رواه البخاري، واتە: ((هەرگیز هیچ کەسێك خۆراکێك ناخوات لەوە چاکتر بێت کە لە بەرهەمی کاری دەستی خۆی بخوات، دڵنیا بن داوود پێغەمبەریش _ علیه السلام _ لە بەرهەمی کاری دەستی خۆی دەخوارد))، لە کاتێکدا پادشاو پێغەمبەریش بوو.

خوای گەورە چین و توێژەکانی ئوممەتی موحەممەدی ﷺ لەم ئایەتەدا باس کردووە: ﴿إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَى مِنْ ثُلُثَيِ اللَّيْلِ وَنِصْفَهُ وَثُلُثَهُ وَطَائِفَةٌ مِنَ الَّذِينَ مَعَكَ وَاللَّهُ يُقَدِّرُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ عَلِمَ أَنْ لَنْ تُحْصُوهُ فَتَابَ عَلَيْكُمْ فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْآنِ عَلِمَ أَنْ سَيَكُونُ مِنْكُمْ مَرْضَى وَآخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي الْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِنْ فَضْلِ اللَّهِ وَآخَرُونَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَأَقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا وَمَا تُقَدِّمُوا لِأَنْفُسِكُمْ مِنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِنْدَ اللَّهِ هُوَ خَيْرًا وَأَعْظَمَ أَجْرًا وَاسْتَغْفِرُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾(١) [المزمل: ٢٠] واتە: بێگومان پەروەردگاری تۆ دەزانێ (ئەی موحەممەد ﷺ) کە تۆ هەڵدەستیت (بۆ شەو نوێژ) نەختێك کەمتر لە دوو بەش لە سێ بەشی شەوو نیوەی یا سێیەکی و دەستەیەك لەوانەی کە لە گەڵتان و خوا ئەندازەی شەو و ڕۆژ دیاری دەکات (خوا) زانی کە ئێوە ناتوانن ئەندازەی شەونوێژ ڕابگرن لە بەر ئەوە لێتان خۆش بوو دەی ئەوەندەی بۆتان ئاسانە لە قورئان دەوری بکەنەوە (خوا) دەزانێ کە لەمەولا کەسانێکتان نەخۆش دەبێت، وە کەسانێکی ترتان کە دەڕۆن بە زەویدا، بە شوێن ڕۆزیی خوادا دەگەڕێن، وەهی تری واتان دەبن کە دەجەنگن لە ڕێی خوا دا ئینجا بخوێننەوە لە قورئان ئەوەندەی بۆتان ئاسانە و نوێژ بکەن و زەکات بدەن وە قەرز بدەن بە خوا بە قەرزێکی چاك هەر چاکەیەك پێش بخەن بۆ خۆتان لای خوا دەستتان دەکەوێت ئەوەی لای خوا چاکترو گەورەترە لە ڕووی پاداشتەوە و داوای لێخۆش بوون بکەن لە خوا بە ڕاستی خوا لێخۆشبوویەکی میهرەبانە.

---

(١)_ خوای گەورە لەم ئایەتەدا بۆی ڕوون کردوینەتەوە کە دۆستانێکی خوای گەورە هەن بە زەویدا دەڕۆن و بە شوێن ڕۆزیی خوا دا دەگەڕێن، بۆ بازرگانی کردن سەفەر دەکەن و، واز لە شەو نوێژیش ناهێنن، بەڵکو بەجێی دەهێنن و، ئەوەی بۆیان ئاسان بێت لە قورئان دەیخوێنن، هەشیانە لە پێناوی خوادا تێدەکۆشن، لەگەڵ

کافراندا دەجەنگن بۆ بەرزکردنەوەی وشەکانی خوای گەورەو، پەرستنەکان و شەو نوێژ پشت گوێ ناخەن، ئەمە بەڵگەیەکی ئاشکرایە کە دۆستانی خوای گەورە بە تایەفەیەکی دیاریکراوەوە پەیوەست نین، لە نێوان تێکۆشەراندا هەن، لە نێوان ئەو بازرگانانەی کە بە زەویدا دەڕۆن و بەدوای ڕۆزی خۆیاندا دەگەڕێن هەن، لەنێوان زانایاندا هەن، لە نێوان خواپەرستاندا هەن.

## وشەی صۆفی و ماناکەی

پێشینانی چاك ئەهلی دین و زانستیان بە گشتی بە (القرّاء) ناو دەبرد، ئیتر زانایان و خواپەرستانیشی دەگرتەوە[(١)]، دواتر ناوەکانی (صوفي و الفقراء) پەیدا بوون[(٢)].

---

(١)_ وشەی (القُرَّاء) لە عورف و نەریتی پێشینانی چاکدا بریتی بوو لە زانایان، نەك تەنها ئەوانەی کە قورئان دەخوێنن، هاوەڵێك فەرموویەتی: ((أنهمْ كانوا إذا تعلموا عشرَ آياتٍ لمْ يُجاوِزوهنَّ إلى العشرِ الأُخَرْ حتى يتعلموا ما فيهنَّ من العملِ، قال: فتعلمنا العلمَ والعملَ جميعاً )) واتە: ((هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەرکات دە ئایەتی قورئان فێر بوویان، نە دەچونە سەردە ئایەتی دیکە تاوەکو چۆنیەتی کارپێکردنیشی فێر دەبوون، هاوەڵەکە فەرمووی: بۆیە زانین و کارپێکردن بە یەکەوە فێر بوین))، ئا ئەوانە (القُرَّاء) واتە: خوێنەری قورئان بوون بە مانا ڕاستەکەی، بەڵام ئەو کەسەی تەنها قورئان دەخوێنێت و هەر (دە) خوێندنەکەی قورئان دەزانێت، بەڵام کار بە قورئان ناکات، ئەمە لە دۆستانی خوای گەورە نییە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلَاوَتِهِ﴾ [البقرة: ١٢١] واتە: ئەوانە کە کتێبایان پێداوون بە ڕاستی دەوری دەکەنەوە. کار بە قورئان دەکەن و ماناکانی تێدەگەن و دەوری دەکەنەوە. کەوا بوو وشەی (القُرَّاء) بەلای پێشینی چاکەوە ئەو زانایانە دەگرێتەوە کە نێوان خوێندن و زانستیان کۆ کردۆتەوە، هەروەها خوا پەرستانیش دەگرێتەوە، ئەگەر چی قورئانیشیان نەخوێند بێت، بۆیە هەر کەسێك ئیمانی بە خوا هەبێ و بڕوای بە پێغەمبەر هەبێ و بڕوای بە قورئان هەبێت، ئەوە لە ئەهلی قورئانە با لەبەریشی نەبێت، هەر کەسێکیش قورئانی لەبەر بێت و کاری پێ نەکات، بێگومان لە ئەهلی قورئان نییە.

(٢)_ هەر سێ سەدە چاکەکە تێپەربوون و، تەصەوف پەیدا نەبوو، لە ڕاستیدا تەصەوف دواتر پەیدا بوو، لە بنچینەدا تەصەوف واتای هەوڵ دان و تێکۆشان لە

..........................................................................

..........................................................................

......................................................................

ەولپەرستی و زوهد له دونیا، بۆیه به (النُساك) ناو دەبران، واته: ئەوانەی خۆیان بۆ هوا پەرستی و، خوێندنی قورئان یەکلا کردبۆوەو، هیچ بیدعەو شیرکی یان تێ ەکەوت بوو، له ئەنجام دانی پەرستنەکاندا خۆیان ماندوو دەکردو، خۆیان خستبووه ارەحەتیەوە، ئەمانه ڕێگەیەکی قورس و گرانیان له خوا پەرستیدا گرته بەر که ەرمانیان پێ نەکرا بوو، ئەو کارەی ئەوان له ڕەگەزی ڕەهبانیەتی گاورەکان بوو، ئەو ڕەهبانیەتەی که خوای گەوره فەرمانی پێنەکردبوون، بەڵام له خۆیانەوە کۆششیان ەخواپەرستیدا دەکردو، بەو ئاقارەدا چوون، لەسەرەتادا صۆفیەکان خوا پەرست بوون و وازیان له دونیا هێنا بوو، ئەگەر چی ئەم شته ستایش کراو نەبوو، بەڵام له ڕێزی کەم نەدەکردنەوە، دواتر تەصەوف پەرەی سەند، تا بەم جۆره بیدعه پەرەدەسێنێت، تەصەوف پەرەی سەند تا له ئایین چوونه دەرەوەو، بێباوەڕ بوون و، بڕوایان به (وحدة الوجود) و پەرستنی گۆڕو هتد... هێنا. پاشان شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێ بێت _ هۆکاری ناونابیان به صۆفی ڕوون کردۆتەوە، بۆچونەکانی لەو بارەوە خستۆته ڕوو، پاشان یەکلای کردۆتەوه که ناوی صۆفی بۆ (صوف) واته خوری دەگەڕێتەوە، چونکه خوریان دەپۆشی بۆ خۆ ڕاهێنان لەسەر ژیانی قورس و دونیا به کەم گرتن بۆیه به صۆفی ناونران، کەتان و لۆکەو شتی نەرمیان نەدەپۆشی، بەڵکو شتی زبریان دەپۆشی، به هۆی زوهدو وازهێنان له دونیا، ئەمه ڕاسترین بۆچونه له بارەی ناونانیانەوە.

ناوی صۆفی: بۆ پۆشینی (صوف) واتـه: خـوری دەگەڕێتـەوە[1]، ئەوەیە بۆچوونی ڕاستەوە گوتراوە بۆ وشـەی (صفوة)[2] دەگەڕێتـەوە، وە گـوتراوە بـۆ پیاوێك بەناوی (صوفة)ی کوڕی (مُرّ)ی کوڕی (إدّ)ی کوڕی (طابخة)[3] کە سەر بە هۆزێکی عەرەب بوون و بەزوهدو تەقەشوف ناسرا بوون دەگەڕێتەوە، وە گوتراوە بۆ (أهل الصُّفَّة)[4]،

---

(١)_ بەڵێ، ئەمە ڕاستە، ئەمە شێوازی جل و بەرگیان بوو.

(٢)_ گوتراوە بۆ وشەی (صفوة) واتە هەڵبـژاردە، دەگەڕێتـەوە، بـەڵام بۆچـوونێکی ڕاست نییە، چونکە ئەگەر بۆ وشەی (صفوة) بگەڕایەتەوە، پێیان دەگوترا: صـەفەری، نەك صۆفی، لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە.

(٣)_ گوتراوە ناوەکەیان بۆ پیاوێك بـەناوی (صوفة)ی کـوڕی (مُرّ)ی کـوڕی (إدّ)ی کوڕی (طابخة) دەگەڕێتەوە، گوایە یەکەم کەس بـووە کـە تەصـەوفی بـە دەرخستووە. واتە: وشەی صۆفی بۆ ئەو پیاوەی کە ناوی (صوفة) بووە دەگەڕێتەوە.

(٤)_ مەبەست بە (أهل الصفَّة) هەژارانی هاوەڵانی پێغەمبەری خوایە ﷺ ئەوانەی کە هیچ ماڵ و شوێنێکی نیشتەجێ بونیان نەبوو، بۆیە پێغەمبەری خوایە ﷺ ژوورێکی لە مزگەوتەکەدا بـۆ دروسـت کـرد بـوون، خـەڵکیش خێـرو صـەدەقەی پێدەبەخشـین، هاوەڵی واشیان تێدا بوو بەڕۆژ کاری دەکردو، بە شەوانیش لـەوێ دەمایـەوە، چونکە ماڵ و شوێنی نیشتەجێبوونی نەبوو، بۆیە بە(أهل الصُفَّة) ناسران، ئەمانـە پێیـان وایە کە ناوی صۆفی بۆ (أهل الصُفَّة) دەگەڕێتەوە، ئەمە بۆچونێکی هەڵەیە، چـونکە ئەگەر بۆ (أهل الصُفَّة) بگەڕایەتەوە پێیان دەگوترا (صُفّي) نەك صۆفی، لە نێوان ئەوان و (أهل الصُفَّة)دا جیاوازیەکی زۆر هەیە.

من اولياء الرحمن ...

...ده گوتراوه بۆ (الصفاء)[1] دەگەڕێتەوە، دەش گوترێت بۆ (الصف المقدَّم بين يدي الله

...ـهانی)[2].

هەموو ئەو بۆچونانە لاوازن[3]، چونکە ئەگەر بە پێی ئەو بۆچونانە بوایە، پێیان دەگوترا: (صُفّيّ) و (صفائي)، يان (صفوي)، يان (صَفّي)، وە بە صۆفی ناو نە دەبران.

هەروەها ناوی: (الفقراء) واتە: هەژارانیش پەیدا بوو، کە واتای ئەهلی سلوکی دەبەخشی، ئەمەش عورفێکی تازە داهێنراوە(عُرفُ حادث)[4].

---

(١)_ (صفاء) واتە: (صفاء القلب) واتە: دڵ سافی و دڵ پاکی، بەڵام ئەم بۆچونە هەڵەیە، چونکە ئەگەر بۆ وشەی (صفاء) بگەڕایەتەوە، پێیان دەگوترا (صفائي) نەك صۆفی، وشەی صۆفی بۆ (صوف) دەگەڕێتەوە، ئەم شتە روون و ئاشکرایە، ئەمە مەسەلەی زمانە.

(٢)_ واتە: بۆ ڕیزی پێش خراو لەبەر دەستی خوای گەورەدا لە ڕۆژی قیامەتدا دەگەڕێتەوە، ئەمە هەڵەیە چونکە ئەگەر بەو جۆرە بوایە پێیان دەگوترا (صَفّي) نەك صۆفی، ئەوەش تەنها بە باش ناوهێنان و، تەزکیەدانە بەنەفسی خۆیان.

(٣)_ هەر هەموو ئەو بۆچونانە لاوازن و، بۆچونی ڕاستیش یەکەمە کە ناوی صۆفی بۆ (صوف) دەگەڕێتەوە، چونکە خوریان دەپۆشی بۆ ئەوەی پۆشاکی زبر بپۆشن، بۆ دونیا بە کەم گرتن و خۆدورخستنەوە لە خۆش گوزەرانی.

(٤)_ هەروەها خۆیان بە(الفقراء) واتە: هەژاران ناو دەبەن، هەژاریش دوو جۆرە: هەژاریەك هەیە مانای پێویستی و دەست کورتیی دەبەخشێت، هەژاریەکیش هەیە مانای پێویست بوون بە خوای گەورە دەبەخشێت، لە ڕاستیدا هەموو مرۆڤایەتی پێویستیان بە خوای گەورەیە، ئەگەر چی ملیارەهاو ملیونەها پارەشیان هەبێت، خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنْتُمُ الْفُقَرَاءُ إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ﴾ [فاطر: ١٥] واتە: ئەی خەڵکینە هەر ئێوە هەژاری لای خوان و تەنیا خوایە بێ نیازی ستایش کراوە. کەوا بوو ئەگەر مرۆڤ سەروەت و سامانی زۆرو قەبەشی هەبێت هەر هەژاری لای خوای گەورەیە.

خەڵکیش جیاوازیان تێکەوت سەبارەت بەوەی کامیان چاکترە: ناوی صۆفی یاخود ناوی فەقیر[(١)]، هەروەها جیاوازیشیان تێکەوت سەبارەت بەوەی کامیان چاکترە: دەوڵەمەندی سوپاس گوزار یاخود هەژاری ئارامگر[(٢)]؟.

لە ڕاستیدا لە کۆنەوە جیاوازیەکی زۆر لە نێوان جونەید و ئەبی ئەلعەباسی کوڕی عەتادا سەبارەت بەم مەسەلە هەبووە[(٣)]،

---

(١)_ کەسانێك دەڵێن: (الفقراء) و نالێن: صۆفیەکان، بەڵام بۆچونی ڕاست ئەوەیە کە هەر هەموو مرۆڤایەتی هەژاری لای خوای گەورەن، بەڵام وشەی صۆفی هیچ مانایەکی ڕاست و دروستی نییە.

(٢)_ پێشەوا ئیبنولقەیم _ ڕەحمەتی خوا لێ بێت _ کتێبێکی داناوە بە ناوی (عدة الصابرين)، لەوێدا بۆی ڕوون کردوینەتەوە کە چاکترینیان پارێزگارترین و لە خوا ترسترینیانە، خوای گەورە لەو بارەوە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾ [الحجرات: ١٣] واتە: بە ڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا پارێزگارتینتانە.

(٣)_ پێشینانی ئەهلی تەصەوف وەکو فوزەیلی کوڕی عیاض و، بیشری حافی لە خوا پەرستان بوون و، ئەو بیدعەو شەڕەیان لێوە بە دەرنەکەوت کە لە پاشینانیانەوە بە دەرکەوت، پێشینانی تەصەوف تەنها خواپەرستی و کۆششکردن لە خواپەرستی و زوهد و تەقەشوفیان ئەنجام دەداو، شوێنکەوتووی سوونەت بوون. جونەیدو، فوزەیلی کوڕی عیاض و، ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم و، ئەبی ئەلعەباسی کوڕی عەتا کەسانێك بوون لەبەڕێزترینی خواپەرستان و ئەهلی شوێنکەوتووی ڕاستی سوونەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بوون، ئەگەر چی خۆیان زیاد لە پێویست لە خواپەرستیدا ئازار دەدا.

هەروەها لە پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیشەوە دوو ڕیوایەت باس کراوە[١]، بەڵام ڕاست و دروست ئەوەیە کە خوای گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرموێت: ﴿يا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾[٢]، [الحجرات: ١٣] واتە: ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە دروستمان کردوون لە نێرو مێ یەك و کردومانن بە چەند گەل و هۆزەوە تا یەکتری بناسن بە ڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا پارێزگارتینتانە بێگومان خوا زانای ئاگادارە.

---

(١)_ واتە: سەبارەت بەوەی کامیان چاکترە؟ دەوڵەمەندی سوپاس گوزار یان هەژاری ئارام گر، دوو ڕیوایەت لەپێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەلەوە باس کراوە، هەروەها پێشەوایان ئیبنولقەییم و، ئیبنوتەیمیە ئاماژەیانداوە بەوەی کە چاکترینیان پارێزگارترین و لە خواترسترینیانە.

(٢)_ ﴿يا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى﴾ هەموو مرۆڤایەتی بۆ نێرو مێیەك کە ئادەم و حەوایە دەگەڕێنەوە، کەوابوو سەرجەم مرۆڤایەتی لەنەسەب و ڕەچەڵەکدا یەکسانن و بۆ ئادەم دەگەڕێنەوەو هەر هەمووشیان نەوەی ئادەمن، ﴿وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ﴾ گوتراوە: ﴿شُعُوبًا﴾ واتە: گەلان بۆ عەجەمەو ﴿قَبَائِلَ﴾ واتە هۆزەکانیش بۆ عەرەبە، بۆچی؟ بیرۆکەکە چییە؟ ﴿لِتَعَارَفُوا﴾ بۆ ئەوەی یەکتر بناسن، کەوا بوو لێکۆڵینەوەو فێر بوونی نەسەب و ڕەچەڵەك تەنها بۆ یەکترناسین و بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتییە، ئەمەش هیچی تێدا نییە، بەڵام ئەگەر بۆ شانازی کردن بێت ئەمە دروست نییە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((لا فَضْلَ لِعَرَبِيٍّ عَلَى أَعْجَمِيٍّ، وَلا لأَبيضَ على أَسْوَد، إلا بِالتَّقْوَى)) واتە: نەعەرەبییەك فەزڵی بەسەر ئەعجەمیەکدا هەیە، نەسپی پێستێکیش فەزڵی بەسەر ڕەش پێستێکدا هەیە، مەگەر بە تەقواو لە خواترسان، بۆیە لە فەرموودەدا هاتووە: ((إنَّ الفخرَ بالأنسابِ من أمورِ الجاهليةِ)) واتە: ((بەڕاستی شانازی کردن بەنەسەب و بنەماڵەو ڕەچەڵەکەوە لە کردەوەکانی سەردەمی نەفامییە))، خوای گەورە نەسەب و ڕەچەڵەکی بۆ شانازی کردن دانانەوە، بەڵکو تەنها بۆ ناسینەوەو بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتی و یەکتر ناسین داناوە.

وفي ((الصحيح)) عَنْ أَبي هُريرَةَ ﷺ عَنْ النبي ﷺ أَنَهُ سُئِلَ: أيُّ النَّاسِ أفضلُ ؟ قَالَ: (( أتقَاهُمْ)) قِيلَ لَهُ: لَيسَ عَنْ هَذا نَسْأَلُكَ، قَالَ: ((يُوسُفُ نَبِيُّ اللَّهِ ابْنُ يَعْقُوب نَبِيِّ اللهِ ابْنِ إِسْحاقَ نَبِيِّ اللَّهِ ابْنِ إبراهيمَ خَلِيلِ اللَّه"، فقيل له: لَيسَ عنْ هَذا نَسْأَلُكَ، قَالَ: ((فعنْ مَعَادِنِ الْعَرَبِ تَسْأَلُونِي؟ النَّاسُ مَعَادِنُ، كَمَعادِنِ الذَّهَبِ والفِضَّةِ، خِيَارُهُمْ فِي الجَاهِلِيَّةِ خِيَارُهُمْ فِي الْإِسْلَامِ إِذَا فَقُهُوا))[1] صحيح: أخرجه البخاري (٣٣٨٣)، ومسلم (٢٣٧٨) عن أبي هريرة ﷺ. واتـه: ((لـه پێغەمبـەری خوایـان ﷺ پرسـی: چ کەسانێك چاکن ؟ فـەرمووی: ((کامیان له خوا ترس و تەقواکار تر بێت))، پێی گوترا: پرسیاری ئـەوەت لێناکـەین، فەرمووی: ((یوسف پێغەمبەری خوا کوڕی یەعقوبی پێغەمبەری خوا کوڕی ئیسحاقی پێغەمبـەری خـوا کـوڕی ئیبراهیمی خۆشەویستی خـوا))، پێـی گـووترا: پرسیاری ئەوەشت لیٚ ناکـەین، فـەرمووی: ((کـەوا بـوو سـەبارەت بـە بنەچـەکانی عـەرەب لێم دەپرسن؟ بێگومان بنەچەکانی خەڵك وەکو کـانزان، هـەر وەکـو کانزاکـانی زێـڕو زیو، کامیان له سەردەمی نەفامیدا چاك بوبێت له ئیسلامیشدا هەر چاك دەبێت، ئەگەر لە ئاییندا شارەزا بن)).

کەوا بوو قورئان و سـوونەتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئامـاژە بـۆ ئەوەدەکـەن کـە چاکترین کەسان بەلای خواوە تەقواکارترین و له خوا ترسترین و پارێزگارترینیانە.

---

(١)_ ئەگەر موسڵمان بن و له ئاییندا شارەزا بـن ئـەوا دەبـن بـە هەڵبـژێردراوانی خەڵك.

وفي ((السنن)) عن النبي ﷺ أنه قال ((لا فَضْلَ لِعَرَبِيٍّ عَلَى أَعْجَمِيٍّ، وَلاَ لِعَجَمِيٍّ عَلَى عَرَبِيٍّ، وَلاَ لِأَسْوَدَ عَلَى أَبْيَضَ، وَلا لأَبْيَضَ على أَسْوَد، إلا بِالتَّقْوَى، كُلُّكُمْ لِآدَمَ، وَآدَمُ مِنْ تُرَابٍ))[1] واته: **((نەعەرەبیەك فەزڵی بەسەر نەعجەمیەكدا هەیەو، نەئەعجەمیەكیش فەزڵی بەسەر عەرەبیەكدا هەیە و نەڕەش پێستێك فەزڵی بەسەر سپی پێستێكدا هەیەو نەسپی پێستێكیش فەزڵی بەسەر ڕەش پێستێكدا هەیە، مەگەر بە تەقواو لە خوا ترسان نەبێ، هەمووتان لە ئادەمن و، ئادەمیش لە خاكە)).**

وعنه أيضاً ﷺ أنه قَالَ: ((إِنَّ للَّهَ تعالى قَدْ أَذْهَبَ عَنْكُمْ عُبِّيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ وَفَخْرَهَا بِالآبَاءِ، النَّاسُ رَجُلاَنِ: مُؤْمِنٌ تَقِيٌّ، وَفَاجِرٌ شَقِيٌّ))[2]

---

(١)_ صحيح: أخرجه أحمد (٤١١/٥)، وله شاهد عند أحمد (١٤٥/٤و ١٥٨)، ولمزيد أنظر ((تفسير ابن كثير))(٢١٧/٤).

**بنەڕەت ئەوەیە كە یەكسانین، هەموومان نەوەی ئادەمین، لە ڕاستیدا جیاوازی چاكێتی نێوان بەندەكانی خوای گەورە تەنها بە تەقواو لە خوا ترسانە، بەڵام نەسەب وبنەماڵەو ڕەچەڵەك هیچ چاكێتیەك دروست ناكات.**

**(٢)_ لە ڕاستیدا شانازی كردن بە باو باپیران و نەسەبەوە لە كردەوەكانی سەردەمی نەفامیەتە، پێویستە مرۆڤ بەنەسەب و بنەماڵەو باو باپیرانی خۆیەوە شانازی نەكات و بەكەم تەماشای خەڵكی نەكات.**

في هشام بن سعد كلام: أخرجه أبوداود (٥١١٦)، والترمذي (٣٩٥٦)، من طريق هشام بن سعد، عن سعيد بن أبي سعيد، عن أبيه، عن أبي هُريرة. واته: هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بە ڕاستی خوای گەورە لووت بەرزی و خۆ بەزل زانینی سەردەمی نەفامێتی و شانازی کردن بە باو باپیرانەوەی لەسەر لا بردن، خەڵکی دوو جۆرە پیاون: ئیماندارێکی لە خوا ترس و خراپەکارێکی بەد بەخت))، ئیتر هەر کەسێك لەم جۆرانە لە هەمووان لە خوا ترس تر بێت بێگومان لە هەموانیش بەلای خوای گەورەوە بەڕێز تر دەبێت، وە ئەگەر لە تەقواو لە خوا ترساندا یەکسان بوون ئەوا لە پلەشدا یەکسان دەبن[1].

---

(١)_ عەرەبی و ئەعجەمی لە ڕووی بنەڕەتەوە یەکسانن، بەڵام ڕەنگە لە ڕووی تەقواو لە خوا ترسانەوە ئەعجەمی لە عەرەبی چاکتر بێت، لەوانەشە عەرەبی لە ئەعجەمی چاکتر بێت، تەماشای سەلمانی فارسی و بیلالی حەبەشی و صوهەیبی ڕوومی و کەسانی دیکەی بەو هاوشێوانە بکە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەوانەی کە خوای گەورە نیعمەتی ئیمانی پێدان، بوون بە کەسانێك لەسەردارانی ئیمانداران و پێشەنگە یەکەمینەکان لە کۆچکردندا، بیلال لە کۆچکردووان بوو، وە کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ مەدینەی پیرۆز کۆچی کرد سەلمان بەندەی کەسێکی یەهودی بوو پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا بە کڕینی و ئازادکردنی، ئەم دوو هاوەڵە بەڕێزە یەکێکیان حەبەشی و، ئەویتریان فارسی بوو، کەچی ئەم شتە زیانی پێنەگەیاندن و، بوون بە کەسانێکی پایە بەرزیش، خزمایەتیش هیچ سوودێکی بۆ ئەبی جەهل و، ئەبی لەهەب نەبوو، کە کەسانێکی هاشمی و، قورەیشی بوون، نزیکی و خزمایەتیەکەیان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هیچ سوودێکی پێ نەگەیاندن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((وَمَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُه)) واتە: ((هەر کەسێك بەهۆی کردەوە خراپەکانی خۆیەوە دواکەوێت با دڵنیا بێت کە نەسەب و بنەماڵە سوودی بۆ نابێت و بەرزی ناکاتەوەو پێشیشی ناخات)).

له شەرعدا مەبەست بەبێژەی (الفقرْ) واتە: هەژاریی: نەبوونی ماڵ و سەروەتە، خوای گەورە لەو بارەوە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ﴾[1] [التوبة: ٦٠] واتە: بە ڕاستی خێرەکان بۆ بێ نەوایان و هەژارن. هەروەها مەبەست بەو بێژەیە پێویست بوونی کەسی خوڵقێنراوە بە خوای خوڵقێنەر[2]، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنْتُمُ الْفُقَرَاءُ إِلَى اللَّهِ﴾[3] [فاطر: ١٥] واتە: ئەی خەڵکینە هەر ئێوە هەژاری لای خوان.

---

(١)_ ئەمە بەڵگەیە بۆ جۆری یەکەم کە بریتیە لە هەژاری و نەبوونی ماڵ و سەروەت و سامان کە خاوەنەکەی بەخێرو صەدەقە شایستە دەبێت.

(٢)_ چونکە خواپەرستەکانیان خۆیان دەدایە پاڵ تەصەووف، کەسانێکیان خۆیان بە فەقیر ناو دەبرد، یان کەسانی تر لە جیاتی صۆفی بە فوقەرائیان ناو دەبردن، شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێ بێت _ فەرموویەتی: هەژاریی دوو جۆرە، جۆری یەکەم: هەژاریی و نەبوونی ماڵ و سەروەتە، جۆری دوومیش: هەر هەموو خەڵك هەژاری لای خوای گەورەن، ئەگەرچی سامانی هەر هەموو دونیاشیان هەبێت. بە واتایەکی تر صۆفیەکان دەستەواژەیەکی دیکەی جگە لە تەصەووفیان هەیە ئەویش ئەوەیە کە خۆیان بە فەقیر ناودەبەن شێخولئیسلام_ ڕەحمەتی خوا لێ بێت _ فەرموویەتی: هەژاریی دوو جۆرە، جۆری یەکەم: هەژاریی و نەبوونی ماڵ و سەروەتە کە خاوەنەکەی بە خێرو صەدەقە شایستە دەبێت، جۆری دووەمیش هەر هەموو مرۆڤایەتی دەگرێتەوەو هەمووان هەژاری لای خوان، ئەو جۆرە تەنها بە صۆفیەکانەوە تایبەت نەکراوە تا بیکەن بە درووشمی خۆیان، بەڵکو گشتییە بۆ هەر هەموو مرۆڤایەتی، چونکە هەمووان پێویستیان بە خوای گەورەیە.

(٣)_ ئەمەش بەڵگەی جۆری دووەمەو هەر هەموو مرۆڤایەتی دەگرێتەوەو تەنها بە تایەفەیەکەوە تایبەت نەکراوە.

## هەندێ جۆر لە هەژارانی ستایشکراو

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دوو جۆری لە هەژاران ستایشکردووە: ئەهلی شایستە بەخێرو صەدەقات و ئەهلی شایستە بە (الفئ).

خوای گەورە سەبارەت بەجۆری یەکەم دەفەرموێت: ﴿لِلْفُقَرَاء الَّذِينَ أُحصِرُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ لاَ يَسْتَطِيعُونَ ضَرْباً فِي الأَرْضِ يَحْسَبُهُمُ الْجَاهِلُ أَغْنِيَاء مِنَ التَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم بِسِيمَاهُمْ لاَ يَسْأَلُونَ النَّاسَ إِلْحَافاً﴾[1] [البقرة: ٢٧٣] واتە: (ئەو کە خێرە) بۆ ئەو هەژارانەیە کە دەست و پێ بەستراون لە ڕێی خوادا کە ناتوانن (بۆ ڕۆزی پەیدا کردن) بگەڕێن بە زەویدا نادانی بێخەبەر وا هەست دەکات ئەوان کە دەوڵەمەندن بەهۆی بێنیازیانەوە(سواڵ نەکردنیانەوە) تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ) دەیان ناسیت بەشێوەیاندا داوای هیچ لە کەس ناکەن بە زۆر (وەك سواڵکەرانی تر).

---

(١)_ خوای گەورە دوو جۆری لە هەژاران ستایشکردووە، یەکەمیان: ئەهلی شایستە بەخێرو صەدەقاتە، وەکو ئەوەی لەو ئایەتەی سورەتی (البقرة) دا باسی دەکات، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لِلْفُقَرَاء الَّذِينَ أُحصِرُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾ ئەم خێرە بۆ ئەو هەژارانەیە کە دەست و پێ بەستراون لە ڕێی خواداو، ناتوانن بۆ پەیداکردنی ڕۆزی بە زەویدا بگەڕێن، لەگەڵ ئەوەشدا بێنیازن و سواڵ ناکەن و، هەژاریەکەیان بۆ خەڵك بەدەرناخەن، ﴿يَحْسَبُهُمُ الْجَاهِلُ أَغْنِيَاء مِنَ التَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم بِسِيمَاهُمْ لاَ يَسْأَلُونَ النَّاسَ إِلْحَافاً﴾ نەزانی بێ خەبەر وا هەست دەکات ئەوان دەوڵەمەندن بەهۆی بێنیازی و سواڵ نەکردنیانەوە، داوای هیچ لە کەس ناکەن بە زۆر، وەك سواڵکەرانیتر. خوای گەورە بەو سیفاتانە ستایشی کردوون، ئەوانەش کە سواڵ ناکەن زۆر لەو کەسانە شایستەترن بەخێرو صەدەقە بەراورد بەو کەسانەی کە سواڵ دەکەن، دەست پان دەکەنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لەم بارەوە فەرموویەتی: (( لَيْسَ الْمِسْكِينُ هَذَا الطَّوَّافِ الَّذِي يَطُوفُ عَلَى النَّاسِ فَتَرُدُّهُ اللُّقْمَةُ وَاللُّقْمَتَانِ، وَالتَّمْرَةُ وَالتَّمْرَتَانِ،

--------------------------------------------

--------------------------------------------

--------------------------------------------

قَالُوا: فَمَا الْمِسْكِينُ يَا رَسُولَ اللَّهِ ؟ قَالَ: الَّذِي لاَ يَجِدُ غِنًى يُغْنِيهِ، وَلاَ يَفْطَنُ النَّاسُ لَهُ فَيُتَصَدَّقَ عَلَيْهِ، وَلاَ يَقُومُ فَيَسْأَلَ النَّاسَ)) واتـە: (( هـەژار ئـەو کەسـە نییـە کـە بەسـەر خەڵکیـدا دەگەڕێت و، پارویەك و دوو پاروو، یاخود خورمایەك و دوخورمـای دەسـت دەکـەوێت، هاوەڵانیش فـەرموویان: باشـە هـەژار کێیـە ئـەی پێغەمبـەری خـوا؟ فـەرمووی: ئـەو کەسەیە کە ئەوەنـدەی نییـە بەشـی بکـات و، خـەڵکیش هەسـتی پێناکـەن تـا خێـرو صەدەقەی بدەنێ و لە هیچ کەسیش داوا ناکات)).

سەبارەت بە جۆری دووەمیش خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَاناً وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُوْلَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ﴾[1] [الحشر:٨] واتە: (ئەو دەسکەوتەی لە بەنی نضیر گیرا) بۆ نەدارانی کۆچکەرانە ئەوانەی کە دەرکران لە ماڵ و سامانیان هەوڵی بەهرەی خواو ڕەزامەندی ئەو دەدەن و یارمەتی (دینی) خواو پێغەمبەری خوا دەدەن هەر ئەوانن ڕاستگۆیان.

---

(١)_ جۆری دووەمیش هەژارانی کۆچکردوانە (مهاجرین)، ئەوانەی ماڵ و سەروەت و سامان و نیشتمانی خۆیانیان بەجێهێشت و، بەهۆی ئیمانەکەیانەوە بۆ وڵاتی ئیسلام کۆچیان کرد، هاوەڵان کۆچیانکردو ویستیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ جیهاد بکەن، ﴿لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ﴾ هەژارانی کۆچکردووان ئەوانەی لە ماڵ و سامانیان دەرکران خوای گەورە بە دوو شت وەسفی کردوون، یەکەم: ﴿يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَاناً﴾ هەوڵی بەهرەی خواو ڕەزامەندی ئەو دەدەن، دووەم: ﴿وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ وە یارمەتی (دینی) خواو پێغەمبەری خوا دەدەن، پاشان خوای گەورە پێیاندا هەڵدەداو دەفەرموێت: ﴿أُوْلَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ﴾ هەر ئەوانن ڕاستگۆیان، بۆیە لەپێدانی (الفيء)یشدا __ پێش دەخرێن، ماڵ و سامانی بێباوەڕانە کە بە بێ جەنگ دەستی موسڵمانان دەکەوێت یەکەم جار بە کۆچکردوان دەدرێت، لە دوای ئەوانیش بە پشتیوانان دەدرێت، خوای گەورە لەو بارەوە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالإِيمَانَ مِنْ قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ [الحشر: ٩] واتە: بۆ ئەو هەژارانەی کە لە پێش کۆچکەراندا نیشتەجێ بوون لە مەدینە و کردیان بە بارەگای باوەڕ ئەوەی کۆچ بکات بۆ لایان خۆشیان دەوێ وە شك نابەن لە دڵی خۆیاندا هیچ جۆرە

-----------------------------------------------

-----------------------------------------------

----------------------------------------

...موردی و بەخیلیەك لەبەر ئەوەی بە کۆچکەران درا و باوی ئەوان ئەدەن بەسەر خۆیاندا با خۆشیان زۆر پێویست بن پێی و ئەو کەسەی خۆی لە ڕژدیی دەروونی بپارێزێت (بە ڕاستی) هەر ئەوانن سەرفەرازان. تایەفەی سێیەم ئەوانەن کە لە پاش کۆچکردوان و پشتیوانانەوە هاتوون و، ئەمانیش بەشیان لە(الفيء)دا هەیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾ [الحشر: ١٠] واتە: ئەوانەش لە پاش ئەمانەوە هاتوون ئەڵێن ئەی پەروەردگارمان خۆشببە لە ئێمە و لەو براانەشمان (خۆشببە) کە پێشمان کەوتوون لە ئیمان هێناندا و هیچ ڕق و کینەیەك مەخەرە دلمانەوە دەربارەی باوەڕداران ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی هەرتۆی دلسۆزی میهرەبانی. زانایان فەرموویانە کەوابوو هەرکەس ڕقی لە هاوەڵان بێتەوە هیچ مافێکی لەدەستکەوتەکانی (الفيء)دا نابێت بەبەڵگەی ئەم ئایەتە.

ئا ئەمەیە سیفەتی ئەو کۆچکردوانەی کە وازیان لە خراپەکاری هێناو بە ڕووکاریی و ناوەکی بەرامبەر بە دوژمانی خوای گەورە تێکۆشان[(١)]،

---

(١)_ له زمانی عەرەبیدا وشەی (الهجرة) واتای وازلێهێنان دەگەیەنێت، بەو بەلگەیەی کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ﴾ [المدثر: ٥] واتە: بەردەوام بە له وازهێنان لە بت پەرستی و گوناه. دەگوترێت: (هَجَرَهُ): واتە: وازیلێهێنا، بەلام وشەی (الهجرة) وازلێهێنان لە شەرعدا دوو جۆرە: (عامة) گشتی و (الخاصة) تایبەت، (الهجرة العامة) وازلێهێنانی گشتی: بریتیە لە وازهێنان لە هەر هەموو ئەو سەرپێچی و خراپەکاریانەی کە خوای گەورە قەدەغەی کردوون، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((المسلمُ مَنْ سَلِمَ المسلمونَ مِن لسانِهِ ويدِهِ والمهاجرُ مَنْ هَجَرَ ما نَهى اللهُ عنهُ)) واتە: ((موسلمانی ڕاست ئەو کەسەیە کە موسلمانان لە ئازارەکانی زمان و دەستی بە دوورن و، موهاجیری ڕاستیش ئەو کەسەیە کە وازی لە هەر هەموو ئەو سەرپێچی و خراپانە هێنا بێت کە خوای گەورە قەدەغەی کردوون))، کەوا بوو (الهجرة العامة) واتە: وازهێنان له هاوەڵپەرستی، وازهێنان لەسەرپێچی، وازهێنان لەو ئازاروو قسە خراپانەی کە خوای گەورە قەدەغەی کردوون... و هتد. بەلام (الهجرة الخاصة) واتا کۆچکردن دەگەیەنێت له وولاتی کوفرەوە بۆ نێو وەلاتی ئیسلام لە پێناو پاراستنی دین و ئیماندا، ئەمەش یەکێکە له هەرە کردەوە چاکەکان، پێشەوا ئیبنولقەییم _ ڕەحمەتی خوای لێ بێت _ فەرموویەتی: (الهجرة) دوو جۆرە: (هجرةُ الأبدان) واتە: کۆچکردنی جەستەکان لە وولاتی کوفرەوە بۆ نێو وەلاتی ئیسلام، (هجرةُ القلوب) واتە وازهێنانی دڵەکانە لە کوفر بۆ ئیمان، لە هاوەڵپەرستی بۆ یەکخواپەرستی، لە بیدعە بۆ سووننەت، ئا ئەمەیە (هجرة القلوب)، کە بە درێژایی ژیانی بەندەی موسڵمان بەردەوام دەبێت، بەلام کۆچ کردن و بەجێهێشتنی نیشتیمان لە کاتی پێویست بوندا ئەنجام دەدرێت، هاوەڵان هەردوو جۆرەکەیان ئەنجام دا، (الهجرة العامة) کە بریتی بوو لە وازهێنان لەهەر هەموو ئەوانەی کە خوای گەورە قەدەغەی کردوون و، (الهجرة الخاصة) کە بریتیبوو لە کۆچکردن لە وولاتی کوفرەوە بۆ نێو وولاتی ئیسلام.

لەو بارەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((الْمُؤْمِنُ مَنْ أَمِنَهُ النَّاسُ عَلَى دِمَائِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ))[1]

[1] صحيح: أخرجه أحمد (٢/٦. و ٢٢)، وابن ماجة (٣٩٣٤)، من حديث فضالة بن عبيد رضي الله عنه مرفوعاً.

---

(١)_ ئەمە پێناسەی گشتی ئیمان نییە، بەڵکو ئەمە تەنها بەشێکە لە ئیمان، ئیمانداری ڕاست ئەو کەسەیە کە خەڵکی دەیکەن بە ئەمیندارو دەستپاك و سەر ڕاستی سەر خوێن و ماڵی خۆیان، بەڵام ئەو کەسەی کە خەڵك نایکەن بە ئەمیندار و دەستپاك و سەر ڕاستی سەر خوێن و ماڵ و موڵکیان با دڵنیا بێت ئیمانەکەی کەم و کورتی تێدایە، موسڵمانێکە ئیمانی تەواو نییە، بەڵکو ئیمانەکەی کەموکورتی تێدایە، بەواتایەکی دیکە ئیمانداری تەواو ئەو کەسەیە کە ئازاری هیچ موسڵمانێك نادات، خوێنی هیچ موسڵمانێك بە ناهەق ناڕێژێت، با موسڵمان بێت (معاهد) بێت _ ئەو کەسەیە کە لە نێوان ئێمەو ئەودا پەیمانی ڕاگرتنی شەڕ هەیە _، یا (المستأمَن) بێت _ ئەو کەسەیە کە لە لایەن موسڵمانانەوە مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی وولاتی پێدراوە بۆ ڕاپەڕاندنی ئیشوکارێکی خۆی _، خوای گەورە لەو بارەوە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ﴾ [الاسراء: ٣٣] واتە: کەسێك مەکوژن کە خوا کوشتنی ئەوەی حەرام کردووە مەگەر بە (هۆیەکی) ڕاست و ڕەوا. خوای گەورە کوشتنی نەفسی موسڵمان یا نەفسی (المعاهد) و هەر کەسێکی تری حەرام کردووە، کەوا بوو ئیمانداری ڕاست ئەو کەسەیە کە خەڵکی بڕوایان پێیەتی و کردویانە بە ئەمیندارو دەست پاك و سەر ڕاستی سەر خوێن و ماڵ و موڵکی خۆیان، فێڵ و دزی و غەش ناکات، ناپاکی ناکات، دزی ناکات، ناپاکی تەنها لە دزیکردنا نییە، بەڵکو گزی و غەش و فێڵیش ناپاکییە، گزی و غەش و فێڵ لە کڕین و فرۆشتندا دەکرێت، ئا ئەمەیە گزی و غەش بەو ئاستەی کە ئیتر خەڵك بە ئەمینداری سەر ماڵ و موڵکی خۆیانی دانانێن، لێشی دڵنیا نابن مامەڵەی لەگەڵدا بکەن، ئا ئەمە کەم و کورتیە لە ئیمانەکەیدا.

وأخرجه أحمد أيضاً (٣/٥٤)، من حديث أنس رضي الله عنه مرفوعاً، وأخرجه الترمذي (٢٦٢٧)، والنسائي (٨/ ١٠٥)، من حديث أبي هريرة رضي الله عنه مرفوعاً. واتـه: **((موسـڵمانی ڕاست ئەو کەسەیە کە خەڵکی دەیکەن بەئەمینداری سەر خوێن و ماڵ و سامانی خۆیان))**.

((المسلمُ مَنْ سَلِمَ المسلِمونَ من لِسانهِ ويدِهِ[1] والمهاجِرُ مَنْ هَجَرَ ما نَهَى اللهُ عنهُ))

صحيح: أخرجه البخاري (١٠ و ٦٤٨٤) من حديث عبدالله بن عمرو رضي الله عنه مرفوعاً مطولاً بذكر المهاجر وأقتصر مسلم على إخرج الجزء الأول منه (٤٠) من حديث عمرو رضي الله عنه أن رجلاً سأل رسول الله ﷺ أي المسلمين خير؟ قال: ((مَنْ سَلِمَ المسلِمونَ من لِسانهِ ويدِهِ)). واته: **((موسڵمانی ڕاست ئەو کەسەیە کە موسڵمانان لە ئازارەکانی زمان و دەستی بەدوور و، موهاجیری ڕاستیش ئەو کەسەیە کە وازی لە هەر هەموو ئـەو سەرپێچی و خراپانە هێنابێت کە خوای گەورە قەدەغەی کردوون))**.

---

**(١)_ ئا ئەمەیە ئیسلامی کامڵ و تەواو، موسڵمانی تەواو ئەو کەسەیە کە سەرجەم موسڵمان لە ئازارەکانی زمان و دەستی بێوەی بن، بەڵام ئەگەر موسڵمانان لە زمانی بێوەی نەبوون و قسەی پێکردن و، لە ڕێزی کەم کردنەوە، یان لە ئازارەکانی دەستی بێوەی نەبوون و، لێیدان و کوشتنی و بەو هاوشێوانە، با دڵنیا بێت موسڵمانێکی تەواو نییە، مانای ئەوە نییـە کـافر بێت بـەڵکو موسـڵمانێکە ئیسلامەتیەکەی تـەواو نییە، چونکە خەسڵەتێك لە خەسڵەتەکانی ئیسلامی پشتگوێ خستووە، بۆیە کـەم و کوڕتی تێدایە.**

هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرمووێ: ((والمجاهدُ مَنْ جاهدَ نفسَهُ في ذاتِ الله))[١] واتە: ((تێکۆشەری ڕاست ئەو کەسەیە کە بەرامبەر بەنەفسی خۆی تێدەکۆشێ وەکو گوێڕایەڵیەك بۆ خوای گەورە)).

بەڵام ئەو فەرموودەیەی کەسانێك دەیگێڕنەوە کە گوایە پێغەمبەری خوا ﷺ لە غەزای تەبوکدا فەرمووی: ((رَجَعْنا مِنَ الجِهادِ الأَصْغَرِ إلى الجِهادِ الأَكْبَرِ))[٢]

---

[١] صحيح: أخرجه أحمد (٦/ ٢٠ و ٢٢)، والترمذي، من حديث فضالة بن عبيدالله مرفوعاً.

(١)_ ئەمە جۆرێکە لە جۆرەکانی جیهاد، بەوەی مرۆڤ بەرامبەر بە نەفسی خۆی تێکۆشێت، بەکەمینی ئەو دوژمنانەی کە بەرامبەریان تێدەکۆشیت نەفسی خۆتە، چونکە جیهاد چەندین بەشە، تێکۆشان بەرامبەر بە نەفس یەکەم جۆرەکانی جیهادە، پاشان تێکۆشان بەرامبەر بەشەیتانەکانی ئینس و جنۆکە، پاشان تێکۆشان بەرامبەر بە دوو ڕووان و فاسیقان، پاشانیش تێکۆشانە بە چەك بەرامبەر بە کافران، ئیتر جیهاد چەندین جۆرە. بە واتایەکی دیکە یەکەم لەو جۆرانە تێکۆشانە بەرامبەر بە نەفس، چونکە ئەو کەسەی نەتوانێت بەرامبەر بە نەفسی خۆی تێکۆشێت ناشتوانێت جۆرەکانی دیکەی تێکۆشان ئەنجام بدات.

(٢)_ ضعيف: قال العجلوني في ((كشف الخفاء)) (١٣٦٢)، قال الحافظ ابن حجر في ((تسديد القوس)): وهو مشهور على الألسنة وهو من كلام إبراهيم بن عبلة. أنتهى.

قلت: الحديث في ((الإحياء)) قال الحافظ العراقي فيه: رواه البيهقي بسند ضعيف عن جابر، ورواه الخطيب عن جابر (في التاريخ ١٣/ ٤٩٣)، وانظر: ((الدرر المنتشرة في الأحاديث المشتهرة)) (٢٤٥).

واته: ((له تێكۆشانی بچوك گەڕاینەوە بۆ تێكۆشانی گەورە)) هیچ بنچینەیەكی ڕاست و دروستی نییە[1]، هیچ كەسێكی شارەزا بە گوفتارو كردارەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ نەیگێڕاوەتەوە.

وە تێكۆشان بەرامبەر بە كافران یەكێكە لە كردەوە هەرە گەورەكان[2]، بەڵكو بریتیە لە چاكترین ئەو كردەوە خۆبەخشانەی كە مرۆڤ ئەنجامی دەدات،

---

(١)_ جیهادی گەورە جیهادە بەرامبەر بە كافران نەك جیهاد كردنی نەفس، جیهادی گەورە جیهادە بەرامبەر بەكافران بەچەك و نەفس و ماڵ لە پێناوی خوای گەورەدا، كەوا بوو تێكۆشان بەرامبەر بە كافران چاكترین جۆرەكانی تێكۆشانە، بەڵام گوایە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە تێكۆشانی بچوك _ كە غەزای تەبوكە _ گەڕاینەوە بۆ تێكۆشانی گەورە _ كە تێكۆشانە بەرامبەر بەنەفس _ هیچ سەنەدێكی ڕاست و دروستی نییە و، ناكرێت بە بەڵگەو، ناوەڕۆك (مَتْنْ) ەكەشی ڕاست و دروست نییە، لە ڕاستیدا تێكۆشان بەرامبەر بە نەفس لە تێكۆشان بەرامبەر بە كافران گەورەتر نییە، بەڵكو تێكۆشان بەرامبەر بە كافران گەورەترە، چونكە خوای گەورە ستایشی تێكۆشەرانی كردوەو، ڕێزیشی داون بەسەر كەسانی تردا، كەوا بوو چۆن دەبێ بە جیهادێكی بچوك لە كاتێكدا خوای گەورە زۆر بە گەورەی باسی كردوەو، ستایشی ئەو تێكۆشەرانەشی كردووە كە پێی هەڵدەستن.

(٢)_ ئەگەر تێكۆشان بەرامبەر بەنەفس گەورەتر بوایە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیانفەرموو: لە ماڵەوە دادەنیشین بەرامبەر بە نەفسی خۆمان تێدەكۆشین، بۆ كوێ بچین؟ بچین بۆ جیهادی بچووك و جیهادی گەورە بەجێ بێڵین؟ ئەمە ڕاست نییە، ئەوە دەگەیەنێت كە هاوەڵان بە هەڵەدا چوونە بەوەی لە ماڵدا دانەنیشتوون و بەرامبەر بە نەفسی خۆیان تێ نەكۆشاون و، وازیان لە جیهادی كافران نەهێناوە.

لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَآ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي [الضَّرَرِ] وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ فَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ [عَلَى] الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى وَفَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا [عَظِيمًا]﴾[1] [النساء: ٩٥] واتە: یەکسان نین دانیشتوان (لە جیهادی ڕێی خوادا) لە [باوە]ڕداران جگە لە خاوەن عوزرەکان (نەخۆش، کوێر، شەل) لەگەڵ تێکۆشەرانی [ڕێ]گەی خوا دا بە ماڵ و گیانیان خوا باوی داوە تێکۆشەران بە ماڵ و گیانیان بەسەر دانیشتوان (لە جیهاد)دا بە پلەیەك و هەر یەك لەو دوو تاقمە خوا بەڵێنی پاداشتی زۆر چاکی پێ داون (کە بەهەشتە) و خوا ڕێزی تێکۆشەرانی داوە بەسەر دانیشتووەکاندا بە پاداشتێکی گەورە.

---

(١)_ ئەوانەی لە جیهاد کردن دادەنیشن لە دوو بارودۆخ بەدەر نین، حاڵەتی یەکەم: خاوەن عوزرن، واتە: ئازارو زیانێکیان دەبێت کە دەرچوونیان بۆ جیهاد [ق]ەدەغە دەکات، حاڵەتی دووەم: ئەو کەسانەن کە بۆ جیهادی موستەحەب دەر [نا]چوونە، بە بێ ئەوەی هیچ بەهانەو عوزرێکیان هەبێت، خوای گەورە هەر دوو جۆرەکەی لەم ئایەتەدا بۆ باس کردوین ﴿فَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ عَلَى [الْ]قَاعِدِينَ دَرَجَةً﴾ خوای گەورە باوی تێکۆشەرانی داوە بە ماڵ و گیانیان بەسەر دانیشتوان لە جیهاد کە بەهانەو عوزریان هەیە بەپلەیەك، ﴿وَفَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى [الْ]قَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ وە خوای گەورە ڕێزی تێکۆشەرانی داوە بەسەر دانیشتووەکاندا [ک]ە هیچ بەهانەو عوزرێکیان نییە بەپاداشتێکی گەورە، جیهادیش وەکو زانراوە دوو جۆرە (فرض عين) _کە لەسەر هەمووان پێویستە _ و (فرض كفاية) _ کە ئەگەر [ب]ەشێکی خەڵك پێی هەستان لەسەر ئەوانی دیکە دەبێ بە فەرزی کیفایە، ئەنجام دانی [ئە]و فەرزی کیفایەیە یەکێکە لە چاکترین کردەوەکان.

هەروەها خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿ أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَجَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ لَا يَسْتَوُونَ عِنْدَ اللَّهِ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ (١٩) الَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِنْدَ اللَّهِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَائِزُونَ (٢٠) يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُمْ بِرَحْمَةٍ مِنْهُ وَرِضْوَانٍ وَجَنَّاتٍ لَهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُقِيمٌ (٢١) خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ (٢٢) [التوبة: ١٩ ـ ٢٢] واتە: ئایا پێتان وایە ئاودان بەحاجیان و (سەرپەرشتی و) ئاوەدان کردنەوەی مزگەوتی بەڕێز وەکو کەسێکە کە باوەڕی هێنا بێت بە خوا و بە ڕۆژی دوایی و تێکۆشانی کردبێ لەڕێی خوادا؟ چوون یەك نین بەلای خواوە (و یەکسان نین) و خوا ڕێنموونی کۆمەڵی ستەمکاران ناکات ئەوانەی کە بڕوایان هێناوەو کۆچیان کردووە و تێکۆشاون لە ڕێگای خوادا بە ماڵیان و بە گیانیان پلەیان بەرزترە لای خوا وە هەر ئەوانەن سەرکەوتوون پەروەردگاریان موژدەیان دەداتێ بە میهرەبانی و ڕەزامەندی لە لایەن خۆیەوە هەروەها بەهەشتانێکیان بۆ هەیە نازو نیعمەتی بەردەوام و هەمیشەیی تێدایە دەمێننەوە تیایدا بەهەمیشەیی بە ڕاستی خوا پاداشتی هەرە گەورەی لایە.

وثَبَتَ في ((صحيح مسلم)) وغيره عن النُّعمانِ بنِ بَشيرٍ قالَ: كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ رَجُلٌ: مَا أُبَالِي أَنْ لاَ أَعْمَلَ عَمَلًا بَعْدَ الإِسْلاَمِ، إِلاَّ أَنْ أَسْقِيَ الْحَاجَّ، وَقَالَ آخَرُ: مَا أُبَالِي أَنْ لاَ أَعْمَلَ عَمَلًا بَعْدَ الإِسْلاَمِ، إِلا أَنْ أَعْمُرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ! وَقَالَ عَلِيَ بنِ أَبِي طَالِبٍ: الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَفْضَلُ مِمَا ذَكَرْتُمَا ! فَقَالَ عُمَرُ: لاَ تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ عِنْدَ مِنْبَرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَلَكِنْ إِذَا قُضِيَتِ الصَّلاَةُ سَأَلْتُهُ فَسَأَلَهُ فَأَنزَلَ الله تعالى هذهِ الآية ﴿ أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ﴾[1]

---

(١)_ ئەو فەرموودەیەی کە شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێ بێت _ لێرەدا نووسیویەتی هۆکاری دابەزینی ئایەتەکەیە، هەندێ لەو هاوەڵانە ئامادەکردنی ئاویان بۆ حاجیان بە چاکترین کردەوە دانا، هەندێکیشیان ئاوەدانکردنەوەی مزگەوتی

---

حەرامی لە جیهاد بەچاکتر دانا، بەڵام پێشەوا عەلی کوڕی ئەبی تالب بە فیقهزانێتی و زانینی خۆی جیهادی لەهەر کردەوەیەکی دیکە بە چاکتر دانا، وە کە ئەوەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕایەوە، خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند، لەو ئایەتەدا خوای گەورە بە چاکتر دانانی ئاو پێدانی حاجیان و ئاوەدان کردنەوەی مزگەوتی حەرام و پێشخستنی بەسەر جیهادا بەستەم دانا، چونکە ستەم واتە: دانەنانی شتەکان لە جێگەی شایستەی خۆیان کەوا بوو کە فەزیڵەت و چاکێتی جیهاد لە جێگەی شایستە بووی خۆیدا دانەنرێت ستەمە، لەو ئایەتەدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِنْدَ اللَّهِ﴾ ئەمە وەڵامدانەوەیە بۆ ئەو کەسانەی کە ئاوەدانکردنەوەی مزگەوتی حەرام و ئاو پێدانی حاجیان لە جیهاد بە چاکتر دادەنێن.

صحيح: أخرجه مسلم (١٨٧٩)، من حديث النعمان بن بشير، وأخرجه أحمد (٤/ ٢٦٩)، وابن جرير الطبري (١٠/٩٥)، وليس فيه ذكر علي بن أبي طالب، وعزاه ابن كثير أيضاً الى أبي داود، وابن حجر الى ابن مردوية وابن أبي حاتم في تفسيرهما، وابن حبان. **واته: هاوەڵی بەڕێز نوعمانی کوڕی بەشیر فەرموویەتی: لەخزمەتی پێغەمبەری خوادا بووم ﷺ، پیاوێك گووتی: پاش موسڵمان بوونم گوێ بەوە نادەم هیچ کردەوەیەکی تر نەکەم جگە لە ئاود پێدانی حاجیان، کەسێکی دیکەش گووتی: پاش موسڵمان بوونم گوێ بەوە نادەم هیچ کردەوەیەکی تر نەکەم جگە لە ئاوەدان کردنەوەی مزگەوتی حەرام، عەلی کوڕی ئەبی تاڵبیش فەرمووی: تێکۆشان لە پێناوی خوادا لەوانە چاکترە کە هەردووکتان گووتتان! عومەریش گووتی: دەنگتان بەرزمەکەنەوە لای مینبەری پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڵام کە نوێژی هەینی تەواو بوو لێی دەپرسم، ئەوە بوو لێی پرسی و خوای گەورەش ئەو ئایەتەی دابەزاند:** ﴿ أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾.

وفي ((الصحيحين)) عن عبدالله بنِ مسعود رضي الله عنه قالَ: قلتُ: يا رَسُولَ اللّهِ ﷺ أَيُّ الأعمالِ أَفْضَلُ عند اللهِ ؟ قَالَ: ((الصَّلاةُ عَلَى وَقْتِهَا))، قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: ((بِرُّ الْوَالِدَيْنِ))، قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ ؟ قَالَ: ((ثُمَّ الجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّه))، قَالَ: حدَّثَنِي بِهِنَّ رسولُ الله ﷺ وَلَوِ اسْتَزَدْتُهُ لَزَادَنِي))[1] **واتە: لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە رضي الله عنه فەرموویەتی: گووتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چاکترین کردەوە بە لای خواوە چییە؟ فەرمووی: ((ئەنجامدانی نوێژە لە کاتی خۆیدا))، گووتم: ئەی پاش ئەوە؟ فەرمووی: ((چاکە کردنە لەگەڵ دایك و باب))، گووتم: ئەی پاش ئەوە؟ فەرمووی: ((پاشان تێکۆشانە لە پێناوی خوادا))، فەرمووی: هەموو ئەوانە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی باس کردم، ئەگەر زیاتریشم داوا لێکردایە بۆی زیاد دەکردم.**

---

(١)_ صحيح: أخرجه البخاري (٥٢٧)، وفي عدة مواضع من صحيحه، ومسلم (٨٥) من حديث ابن مسعود رضي الله عنه مرفوعاً.

---

---

---

*لەم فەرموودەیەدا عەبدوللای کوڕی مەسعود ﷺ لە پێغەمبەری خوای ﷺ پرسی: ((چاکترین کردەوە بەلای خواوە چییە؟ فەرمووی: ((ئەنجام دانی نوێژەکان لە کاتی خۆیدا)) چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الصَّلَاةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَوْقُوتًا﴾[النساء: ١٠٣] واتە: ﴿إِنَّ الصَّلَاةَ﴾ بەڕاستی نوێژ ﴿كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾ هەمیشە لە سەر باوەڕداران ﴿كِتَابًا مَوْقُوتًا﴾ ئەرزکراوێکی کات بۆ دیاری کراوە، پاشان دووبارە لێی پرسی، فەرمووی: ((چاکەکردنە لەگەڵ دایك و باوك))، لە پلەکانی فەزڵ و چاکێتیدا چاکە کردن لەگەڵ دایك و بابدا دوای ئەنجامدانی نوێژەکانە لەکاتی خۆیدا، پاشان دووبارە لێی دەپرسێتەوە؟ پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێ: ((تێکۆشانە لە پێناوی خوادا))، ئەوە ئاماژەدەکات بۆ گەورەیی نوێژو ئەنجامدانی لەو کاتانەدا کە خوای گەورە دیاری کردووە، هەروەها ئاماژە بۆ چاکەکردن لەگەڵ دایك و بابدا دەکات، پاشانیش تێکۆشانە لە پێناوی خوادا، ئاگاداربن چاکە کردن لەگەڵ دایك و بابدا خراوەتە پێش تێکۆشانەوە لە پێناوی خوادا، جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ يَسْتَأْذِنُهُ فِي الْجِهَادِ، فَقَالَ: ((أَحَيٌّ وَالِدَاكَ))، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: ((فَفِيهِمَا فَجَاهِدْ)) واتە: ((پیاوێك چووە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی مۆڵەتی جیهادکردنی پێ بدات، فەرمووی: ((ئایا دایك و بابت زیندوون))، فەرمووی: بەڵێ، ئەوە بوو پێی فەرموو: ((ئەو پەری توانای خۆت بۆ چاکە کردن لەگەڵیاندا بەکاربێنە چونکە ئەوە جێگەی جیهادت بۆ دەگرێتەوە))، ئەرکەسانەی ئێستا دەچنە دەرەوە گوایە جیهاد دەکەن، لە کاتێکدا دایك و بابیان بە جێهێشتووە و مۆڵەتیان لێ وەرناگرن، بانگەشەی ئەوە دەکەن کە جیهاد لە چاکە کردن لەگەڵ دایك و بابدا لە پێشترو چاکترە، بە ڕاستی نەفامی یە _ پەنا بە خوا _، چونکە چاکە کردن لەگەڵ دایك و بابدا لەجیهاد لەپێشترە.

وفي ((الصحيحين)) عنه ﷺ أنه سئل: أي الأعمال أفضل؟ قال: ((إيمان بالله و جهاد في سبيله)) قيل: ثم ماذا؟ قال: ((حج مبرور))[1]، واته له پێغەمبەری خوایان ﷺ پرسی: کام کردەوەیەك چاكە؟ فەرمووی: ((ئیمان هێنان بە خواو تێکۆشان له پێناویدا))، گوتیان: ئەی پاش ئەوە؟ فەرمووی: ((حەجێکی پاك و پوخت)).

---

(١)_ ئەو فەرموودانەی کە سەبارەت بە کردەوە چاکەکان (فضائل الأعمال) هاتوون زۆرن، لەوەدا جیاوازن کە پێغەمبەر خوا ﷺ جار بە جار ئەمەو جار بە جاریش ئەوە باس دەکات، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە کردەوە چاکەکان زۆرن _ سوپاس بۆ خوا _ خوای گەورەش دەروازەکانی خەیری فراوان کردووە، کەوا بوو چاکترینی کردەوەکان ئیمان هێنانە بە خوا پاشان تێکۆشانە لە پێناوی خوا دا بۆ بەرز ڕاگرتنی وشەی خوای گەورە پاشان حەجێکی پاك و پوختە، نەك هەموو حەجێك بەڵکو حەجێکی پاك و پوخت کە خوای گەورە لە خاوەنەکەی وەری دەگرێت و، خاوەنەکەشی بەگوێرەی شەرع بەجێی هێناوە، خوای گەورە لەو بارەوە دەفەرموێ: ﴿وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ﴾ [البقرة: ١٩٦] واتە: حەج و عومرە (تان کە دەست پێکرد) تەنها بۆ خوا بە تەواوی بیکەن. کەوا بوو حەج دەبێ بە دڵسۆزی و تەنها بۆ خوای گەورە ئەنجام بدرێت و، ڕاستیش بێت بەوەی کە لەسەر سوونەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجام بدرێت، هیچ تاوان و سەرپێچیەکیشی تێکەڵ نەکرێت، ئەوەیە حەجی پاك و پوخت.

وفي ((الصحيحين)) أن رجلاً قال له ﷺ: يا رسولَ الله، أَخْبِرْنِي بِعَمَلٍ يَعْدِلُ الجهادَ في سبيل الله؟ قال: ((لا تَسْتَطِيعُهُ أَوْ لا تُطِيقُهُ))، قال: فأخبرني به؟ قال: ((هَلْ تَسْتَطِيعُ إِذا خَرَجَ المجاهد أَنْ تَصُومَ ولا تُفْطِرَ، وَتَقُومَ ولا تَفْتُرَ))[1] صحيح: أخرجه البخاري (٢٧٨٥)، ومسلم (١٨٧٨)، من حديث أبي هُريرة ﷺ. واته: پیاوێك به پێغەمبەری خوای ﷺ فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا، کردەوەیەکم پێ بڵێ که خێرەکەی به ئەندازەی تێکۆشان بێت لە پێناوی خوا دا؟ فەرمووی: ((ناتوانیت ئەنجامی بدەیت یا بەرگەی ناگریت))، پیاوەکەش پێی فەرموو: کەوا بوو پێم بڵێ؟ ئەویش فەرمووی: ((ئایا دەتوانیت هەرکاتێك تێکۆشەر لە پێناوی خوادا چووە دەرەوە بەڕۆژوو بیت و نەیشکێنیت، شەو نوێژ بکەیت و سستی نەنوێنیت)).

---

(١)_ فەرموودەکە ئاماژە بۆ فەزڵ و گەورەیی جیهاد دەکات، ئەو کەسەی تێدەکۆشێت لە پێناوی خوادا لەو کەسە چاکترە که بەڕۆژوو دەبێت و نایشکێنێت و، ئەو کەسەش چاکترە که به بەردەوامی شەو نوێژ دەکات و سستی نانوێنێت، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی که جیهاد لە هەر هەموو کردەوەکان چاکترە، مەبەستی شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێ بێت _ لە هێنانەوەی ئەو فەرموودانەدا ئەوەیە که سیفاتی وەلی و دۆستانی ڕەحمانمان بۆ باس بکات، بەوەی که دۆستانی خوای گەورە ئەنجام دەری ئەو کردەوە چاکانەن، دۆستایەتی خوای گەورە به بانگەشە کردن یا به ڕوخسار و پۆشاك یا بەدانانی خەرمانەیەك لە ڕێز نییە بەدەوری کەسەکەدا، بەڵکو دۆستایەتی خوای گەورە پێویستی بەم کردەوە چاکانەیە، ئەنجام دەرانی ئەو کردەوە چاکانە دۆستانی خوای گەورەن، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ﴾ [يونس: ٦٣] ﴿الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە ﴿وَكَانُوا يَتَّقُونَ﴾ وە هەمیشە خۆیان دەپارێزن و لە خوا دەترسن.

وفي ((السنن)) عن معاذ رضي الله عنه عن النبي ﷺ أنه وصاه لما بعثه إلى اليمن، فقال: ((اتَّقِ اللَّهَ حَيْثُمَا كُنْتَ، وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا، وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ))[1] إسناده ضعيف، ومعناه صحيح: أخرجه الترمذي (١٩٨٧)، وأحمد (٥/١٥٣و١٥٨)، والدارمي (٣/ ٣٢٣)، والحاكم (١/ ٥٤)، وهذا لمعاني الحديث شواهد متكاثرة من الكتاب والسنة، فمن ناحية المعنى فمعناه صحيح. واته: كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵی بەڕێزی خۆی موعاذی رضي الله عنه بۆ یەمەن نارد، ئامۆژگاری کردو، پێی فەرموو: ((لە هەر کوێ بوویت لە خوا بترسەو تەقوای خوا بکە، وە کە خراپەیەك دەکەیت چاکەیەکی بە دوا دا ئەنجام بدە دەیسڕێتەوە، وە بە ڕەوشتی چاك لەگەڵ خەڵکدا تێکەڵ بە)).

---

(١)_ کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ موعاذی کوڕی جەبەلی رضي الله عنه لەبەر زۆری فەزڵ و چاکێتی و زانستەکەی وەکو بانگەوازخواز و مامۆستاو دادوەرێك بۆ دەوروبەری وڵاتی یەمەن نارد، ئەو ئامۆژگاریە گەورەیەی کرد، بەسێ شت ئامۆژگاری کرد ((اتَّقِ اللَّهَ حَيْثُمَا كُنْتَ)) لە خوا ترسان و تەقوای خوا پێویستە، مەککە چ بوون بۆ فەرمانەکانی خواو، وازهێنان لە قەدەغە کراوەکانی لە هەر شوێنێکدا بیت، لە یەمەن بیت، لە شام بیت، لە مصر بیت، لە دەشت بیت، لەنیو دەریادا بیت، لە ئاسمان بیت، لە هەر شوێنێك بوبیت لە خوا بترسەو تەقوای خوا بکە، یاخود لەگەڵ خەڵکدا بوبیت، یاخود بە تەنیا بوبیت و هیچ کەسێکت لەگەڵدا نەبوو، لە هەر باروحاڵێکدا تەقوای خوا پێویستە، ئا ئەمەیە لە خواترسان و تەقوای ڕاستی خوای گەورە، بەڵام ئەو کەسەی لە شوێنێك تەقوا دەکات و لە شوێنێکی تردا نایکات، یان ئەگەر لەگەڵ خەڵکیدا بێت تەقوا دەکات و ئەگەر بە تەنیا بوو باروحاڵی دەگۆڕێت، ئەو کەسە تەقوای خوای نەکردووە، ئەو بەشەیان حەقی خوای گەورەو هەقی نەفسی خۆشتە، ((وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا)) مرۆڤ پارێزراو نییە، چەندین هەڵە دەکات، چەندین سەرپێچی

دەكات، پێویستە تەوبەبكات و پەشیمان بێتەوە، بەدوای هەر خراپەیەكدا با چاكەیەك ئەنجام بدات دەیسڕێتەوە، خوای گەورە لە ئایەتێكدا دەفەرموێت: ﴿وَأَقِمِ الصَّلَاةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ﴾[هود: ١١٤] واتە: وە نوێژ ئەنجام بدە لەم سەرو ئەو سەری ڕۆژدا و لە بەشێك لە شەودا چونكە بە ڕاستی (كردەوە) چاكەكان (كردەوە) خراپەكان لا دەدەن. بەو جۆرە سەرپێچی دەبێ بە ملكەچی و، ملكەچیش سەرپێچیەكان لا دەدەن و دەیسڕنەوە، ئەم بەشە لە نێوان مرۆڤ و نەفسی خۆیدایە، بەوەی مرۆڤ چاودێری نەفسی خۆی دەكات و، وازی لێناهێنێت هەموو شتێك بە ئارەزووی خۆی ئەنجام بدات، ((وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ)) بەسنگێكی فراوانەوە پێشوازیان دەكات و شادی و دڵخۆشی و كەیف خۆشی دەنوێنێت، هۆگریان دەبێت، ئا ئەمەیە ڕەوشتی جوان كە خوای گەورە بە پێغەمبەری خواوە ﷺ تایبەتی كردووەو، لەو بارەوە دەفەرموێت: ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِنَ اللَّهِ لِنْتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنْتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانْفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ﴾[آل عمران: ١٥٩] واتە: بە هۆی بەزەیی خواوەیە بۆ ئەوان نەرم و نیان بووی ئەگەر تۆ خوو نا پەسندو قسە ڕەق و دڵ ڕەق بوویتایە ئەوە هەموو بڵاوەیان دەكرد لە دەورت. هەروەها سەبارەت بە پێغەمبەرەكەی دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾[القلم: ٤] وە بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشت و خویەكی ئێجگار بەرزو گەورەیت. سەبارەت بەڕەوشتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە خاتوو عائیشەیان پرسی، فەرمووی: ((كَانَ خُلُقُهُ القُرآنُ )) واتە: ((ڕەوشتی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەوشتی قورئان بوو واتە: {كردەوە كردن بوو بە قورئان})) واتە: ملكەچی فەرمانەكانی قورئان بوو، كردەوەی پێدەكرد، ئا ئەمە بوو ڕەوشتی پێغەمبەری خوا ﷺ، بۆیە ئەو كەسانەی كاری بانگخوازی دەكەن پێویستیان بە ڕەوشتی جوانە، خوای گەورە لەو بارەوە دەفەرموێت:

﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ [النحل: ١٢٥]
واتە: (خەڵکی) بانگ بکە بۆ ڕێبازی پەروەردگارت بە لێزانی و دانایی و ئامۆژگاری چاك و شیرین وە لە گەڵیان بدوێ (موجادەلە بکە) بە چاکترین شێوە. ئا ئەمە سیفاتانێکە پێویستە لە کەسی بانگخوازدا هەبێ و خۆی پێبڕازێنێتەوە، بانگەوازخواز لە هەر شوێنێکدا بێت پێویستە تەقوای خوا بکات، بە دوای هەر خراپەیەکدا چاکەیەك ئەنجام بدات دەیسڕێتەوە، بە ڕەفتاری جوانەوە تێکەڵ بە خەڵك بێت، ئەوەیە گەورەترین سیفاتەکانی بانگەوازخوازان بۆ ڕێگای ڕاستی خوای گەورە.

ئەمانەن دۆستانی خوای گەورە کە ئەم سێ سیفەتانەیان تێدایە لە هەر شوێنێك دابن تەقوای خوا دەکەن، بە دوای هەر خراپەیەکدا چاکەیەك ئەنجام دەدەن دەیسڕێتەوە، ناهێڵن تاوان لە هەموو لایەکەوە ئابلۆقەیان بدات، بە ڕەفتاری جوانەوە تێکەڵ بە خەڵك دەبن، خوای گەورە لەو بارەوە دەفەرموێت: ﴿وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْناً﴾ [البقرة: ٨٣] قسەی جوان بکەن لەگەڵ خەڵکیدا.

وقال: (( يَا مُعَاذُ إِنِّي لأُحِبُّكَ، فلاَ تَدَعَنَّ أَنْ تَقُولَ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ: اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَى ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ))[1] صحيح: أخرجه أبو داود (١٥٢٢)، من حديث معاذ ﷺ، ولمزيد انظر كتابي: ((الصحيح المسند من أذكار اليوم والليلة)). واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەی موعاذ دڵنیا بە خۆشم دەوێی، واز مەهێنە لەوەی کە لە دوای هەموو نوێژێك بڵێی: پەروەردگارا یارمەتیم بدە لەسەر یادکردنەوەو سوپاس گوزاری و بە جوانی پەرستنت)).

---

(١)_ دیسان بە موعاذی فەرموو: خۆشم دەوێی، ئەمە فەزڵ و چاکەیە بۆ موعاذ ﷺ، لە ڕاستیدا گەورەترین فەزڵ و چاکەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی بفەرموێت: خۆشم دەوێی، ئەو سوودەی لەو فەرموودەیەوە وەردەگیرێت ئەوەیە کە هەرکەسێك یەکێکی خۆشویست لەبەر دین و ئیمانەکەی با پێی ڕاگەیەنێت، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ بە موعاذی ڕاگەیاند کە خۆشی دەوێ، پاشان پێی فەرموو: واز مەهێنە لەوەی کە لە دوای هەموو نوێژێکدا بڵێی: پەروەردگارا یارمەتیم بدە لەسەر یادکردنەوەو سوپاس گوزاری و بە جوانی پەرستنت، ئەو سوودەی لێرەوە فێری دەبین ئەوەیە کە هەر کەسێکت خۆشویست هەستە بە ئامۆژگاری کردنی بەوەی سوودی بۆ دەبێت، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ موعاذی خۆشویست ئەو ئامۆژگاریە گەورەیەی پێشکەش کرد بۆ ئەوەی لە پاش هەموو نوێژێکەوە بیخوێنێت. دەستەواژەی ((دبُرِ كُلِّ صَلاَة)) بەدوو شێوە تەفسیر کراوە: یەکەم: کۆتایی نوێژەکەو پێش سڵاودانەوە، دووەم: پاش نوێژەکەو دوای سڵاودانەوە، ئیحتیمالی هەردوو بۆچوونەکە دەکات، بەڵام ئیحتمالەکەی یەکەم بۆچوون بەهێزترە، چونکە دوعاو نزا لەنێو پەرستنەکەدا چاکترە لەوەی کە لەدەرەوەیدا ئەنجام بدرێت، کەوا بوو بە چاکتر دادەنرێت کە لە پاش نوێژو پێش سڵاودانەوە بخوێندرێت، بەڵام ئەگەر دوای سڵاودانەوەش بخوێندرێت هیچی تێدا نییە، بەڵام لە یەکەم کەمترە، ((اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَى ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ))، ئەمە سیفاتی دۆستانی خوای گەورەیە، هەر کەس ئەو سیفاتانەی تێدا بێت دۆستی خوای گەورەیە.

وقال له ـ وهو رديفه: ((يَا مُعاذُ أَتَدْرِي ما حَقَّ اللهِ عَلى عِبادِهِ ؟ ))، قُلْتُ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: ((حَقُّهُ عليهم: أَنْ يَعْبُدُوهُ وَلا يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، أتدري ما حَقُّ العِبادِ عَلى اللهِ إذا فعَلوا ذلك ؟)) قُلْتُ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قالَ: ((حَقُّهُمْ عَليهِ ألا يُعَذِّبَهُمْ))(١) صحيح: أخرجه البخاري (٧٣٧٣)، ومسلم (٣٠)، من حديث مُعاذ ﷺ. واته: پێغەمبەری خوا ﷺ بە موعاذی فەرموو: ((ئەی موعاذ ئایا دەزانیت هەقی خوای گەورە بەسەر بەندەکانیەوە چی یە؟))، گوتم: خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: ((هەقی بەسەریانەوە ئەوەیە کە بە تەنها بیپەرستن و هیچ هاوبەشێکی بۆ بڕیار نەدەن، ئایا دەزانیت هەقی بەندەکان بە لای خواوە چی یە ئەگەر ئەوەیان ئەنجام دا؟ گوتم: خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: ((هەقیان بەلای خواوە ئەوەیە کە سزایان نەدات)).

---

(١)_ ئەمە فەرموودەی سێیەمە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هاوەڵی بەرێز موعاذی باس دەکات، موعاذ لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ سواری گوێ درێژێك بوو بون، ئەو سوودەی لەو گێرانەوە وەردەگیرێت شیاوێتی سوار بوونی دوو کەسە لەسەر چوار پێیەك ئەگەر توانای بەرگەگرتنی ئەوەی هەبێت، هەروەها فەرموودەکە خاکێتی پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەر دەخات، چونکە سواری گوێدرێژ دەبوو و کەسانێك لە هاوەڵانیشی لەگەڵ خۆیدا سوار دەکرد، ئەوەش فەزیلەت و چاکەیەکی زۆر گەورەیە بۆ موعاذ کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ سواری گوێدرێژێك بێت. فەرموودەکە ئامۆژگاری و فێربونیشی تێدایە ((يَا مُعاذُ أَتَدْرِي ما حَقَّ اللهِ عَلى عِبادِهِ؟))، ((قُلْتُ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ)) ئەو سوودەی لێرەوە وەردەگیرێت ئەوەیە کە ئەگەر مرۆڤ لێیان پرسی و هیچ زانیاریەکی سەبارەت بەوە نەبوو با پەلەی وەڵام دانەوە نەکات، با لە کەسی پرسیارکار داوا بکات زیاتر بۆی ڕوون بکاتەوەو، بە درۆ وەڵام نەداتەوە، فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە بەدەر دەخات کە خوای گەورە هەقی

---------------------------------

---------------------------------

---------------------------------

بەسەر بەندەکانی خۆیەوە هەیە کە یەکەمین و واجبترین هەقە و بریتیە لە پەرستنی خوای گەورە بە تەنها، واتە: بیپەرستن و هاوبەشی بۆ بڕیار نەدەن، ئەمەش ئەو مزگارەیە کە خوای گەورە بەندەکانی خۆی لە پێناویدا بەدی هێناوە، خوای گەورە لەو بارەوە دەفەرموێت: ﴿مَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾[الذاريات: ٥٦] واتە: وە من جنۆکەو ئادەمیزادم تەنها بۆ ئەوە دروست کردووە کە بەندایەتی من بکەن. ئا ئەوەیە هەقی خوای گەورە بەسەر بەندەکانیەوە. کەسانێك خوای گەورە دەپەرستن، لە هەمان کاتیشدا هاوبەشی بۆ بڕیار دەدەن، ئەو کەسانە با دڵنیا بن ئەو جۆرە پەرستنانە سوودیان پێ ناگەیەنێت، بەڵکو پێویستە خوای گەورە بە تەنها بپەرستن و هیچ هاوبەشێکی بۆ بڕیارنەدەن، خوای گەورە نەیفەرمووە: بیپەرستن و هیچی تر بەڵکو پێویستە هاوبەشیشی بۆ بڕیارنەدەن، چونکە هاوبەش دانان پەرستنەکان پوچەڵ دەکاتەوە. هەقی خوای گەورە بەسەر بەندەکانیەوە واجیبە، بەڵام هەقی بەندەکان لای خوا واجیب نییە، بەڵکو ئەو هەقە بەخششێکەو خوای گەورە پێی بەخشیون، چونکە هیچ کەسێك لەتوانایدا نییە شتێك لەسەر خوای گەورە واجیب بکات، بەڵام خوای گەورە لەسەر بەندەکان واجیب دەکات، بۆیە پەرستن و یەکتاپەرستی خۆی لەسەر واجیب کردوون، ئەو کەسانەش بە تەنها دەیپەرستن و هاوبەشی بۆ بڕیار نادەن خوای گەورە بەخششی خۆی پێداون و، سزایان نادات، ئەمە مژدەیەکی زۆر گەورەیە، هەروەها چاکەیەکی گەورەشە بۆ هاوەڵی بەڕێز موعاذ ﷺ، بە ڕاستی ئا ئەمەیە سیفاتی دۆستانی خوای گەورە کە خوای گەورە بە تەنها دەپەرستن و، هیچ هاوبەشێکی بۆ بڕیار نادەن، هەروەها فەرموودەکە فەزڵی یەکخواپەرستی بەدەر دەخات کە خوای گەورە تاوانەکانی پێ دەسڕێتەوە.

وقال أيضاً لمعاذ: ((رَأْسُ الْأَمْرِ الْإِسْلَامُ، وَعَمُودُهُ الصَّلَاةُ، وَذِرْوَةُ سَنَامِهِ الْجِهَادُ في سبيل الله))[1]

---

(١)_ ((رَأْسُ الْأَمْرِ الْإِسْلَامُ )) مەبەستی ئەوە بوو کە یەکەم شتێك لەسەر موسڵمان یان لەسەر بەندە ئەوەیە کە خۆی بە تەسلیم خوای گەورە بکات، بچێتە نێو ئایینە ڕاستەکەی خواوەو، موسڵمان ببێت، ((وَعَمُودُهُ الصَّلَاةُ)) کۆڵەکەی ئایینی ئیسلام نوێژە، لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئیسلامی بە بەخێوەتێك کە لە تووك یان پێستە دروست کرا بێت چواندووە، خێوەتیش بە بێ کۆڵەکە ڕاناوەستێت و بەرز نابێتەوە، ئەمەش شتێکە مرۆڤ هەر بە فیترەت و تاقیکردنەوە دەیزانێت و شتێکی ئاساییە، بۆیە ئەگەر خێوەتێکت هێنا کە لە تووك یان پێستەو شتی تر دروست کرا بێت و، هیچ کۆڵەکەیەکیشت پێنەبێت بە دڵنیایی نەسوودی لێ دەبینیت، نە لە سێبەرەکەشی دا دەحەسێیتەوە، تا ئەو کاتەی کۆڵەکەیەکت پێدەبێت و خێوەتەکەی پێ ڕادەوەستێنیت، دڵنیا بن ئایینی ئیسلامیش ئاوەهایە کە لەسەر نوێژ نەبێت ڕاناوەستێت، ئەو کەسەی نوێژی نەبێت ئایینەکەشی ڕاوەستاو نابێت، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەرکەسێك بە ئەنقەست واز لە نوێژکردن بێنێت کوفری کردووە، چونکە کۆڵەکەی ئایینی ئیسلامی پێ نییە، کۆڵەکەکەی نوێژ کردنە، ((وَذِرْوَةُ سَنَامِهِ)) واتە: بڵندترین و بەرزترین کردەوەکانی ئایینی ئیسلام ((الْجِهَادُ فِي سبيلِ الله)) تێکۆشانە لەپێناوی خوادا، لێرەدا فەزڵ و چاکێتی جیهادمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، بەوەی کە چاکترین جۆرەکانی تاعەت و پەرستنەکانە. کەوا بوو دەروازەکانی خێر و تاعەت فراوان و زۆرن.

وقال: (( يا مُعاذُ، ألآ أُخبِرُكَ بأبْوابِ البِرِّ؟ الصَّوْمُ جُنَّةٌ(١)، وَالصَّدَقَةُ تُطْفِئُ الْخَطِيئَةَ كَمَا يُطْفِئُ الْمَاءُ النَّارَ(٢)، وَقِيامُ الرَّجُلِ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ(٣)

---

(١)_ ((الصَّوْمُ جُنَّةٌ)) ڕۆژوو قەڵغانە، وشەی ((جُنَّةٌ)) واتە: ئەو قەڵغانەی کە بەهۆیەوە مرۆڤ خۆی لە چەکی دوژمن دەپارێزێت، بریتیە لەو پارچە ئاسنەی کە لەنێوان خۆت و تیرەکانی دوژمندا دایدەنێیت و، خۆتی پێدەپارێزیت، لێرەدا ڕۆژووی بەقەڵغان چواندووە، چونکە لەسەرپێچی و تاوان دەتپارێزێت، پارێزەرە کەوا بوو ئەگەر مرۆڤ بەڕۆژوو بوو لە تاوانەکان دوور دەکەوێتەوەو، ڕوو لە بەجێهێنانی پەرستنەکان دەکات، ئەمەش یەکێکە لە فەزڵ و چاکەکانی ڕۆژوو، چونکە مرۆڤ لە هەواو ئارەزوو دور دەخاتەوەو، تەنها بە پەرستنەکانەوە خۆی سەر قاڵ دەکات.

(٢)_ ((وَالصَّدَقَةُ تُطْفِئُ الْخَطِيئَةَ كَمَا يُطْفِئُ الْمَاءُ النَّارَ)) خێرو صەدەقەدان بە هەژاران و دەست کورتان، خوای گەورە تاوان و خراپەکانی پێدەکوژێنێتەوە، وەکو چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە، تاوانیش ئاگرە، جۆرێکە لەئاگر، خێرو صەدەقەدانیش دەیکوژێنێتەوە، ئەو ئاگرە دەکوژێنێتەوە، لێرەدا فەزڵ و چاکەی خێرو صەدەقەدان بە هەژارو و دەست کورتانمان بۆ ڕوون دەبێتەوە.

(٣)_ ((وَقِيامُ الرَّجُلِ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ)) هەروەها شەو نوێژ کە یەك لەسەر سێی کۆتایی شەوە، یا لە نیوە شەودا کە کاری داود پێغەمبەر بووە _ عليه السلام _، نیوە شەو دەنوست و یەك لەسەر سێی هەڵ دەستاو، یەك لەسەر شەشی دەنوستەوە، واتە: پاش شەو نوێژەکە، ئا ئەمەیە مەبەست بە ((جَوْفِ اللَّيْلِ))، باشترین شەونوێژیش لەو کاتەدایە چونکە هەموو کارو سەرقاڵیەکان دەوەستن، خەڵك نوستوون، ئیخلاص زیاترە، لە ڕووپامایییەوە بە دوورە، هەروەها دڵ ئامادەیە، خوای گەورە لەو بارەوە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ نَاشِئَةَ اللَّيْلِ هِيَ أَشَدُّ وَطْئًا وَأَقْوَمُ قِيلًا﴾[المزمل: ٦] واتە: بە ڕاستی هەستانی شەو دوای خەو (بۆ خواپەرستی) قورسترو گرانترە لە ڕووی کردارەوە (لە هی ڕۆژ بەهێزترە بۆ دڵ) دروست ترە لە ڕووی ووتنەوە.

ثُمَّ قَرأَ قولهُ تعالى ﴿تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفاً وَطَمَعاً وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ (١٦) فَلاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاء بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ (١٧)﴾(١)

---

(١)_ ﴿تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ﴾ لەسەر نوێنەکانیان هەڵ دەستن لە کاتێکدا کە حەزیان بەنووستنە، حەزیان بەجێگەی گەرم و گورە ئەگەر کەش و هەوا سارد بێت، حەزی بە نووستنە لەگەڵ خێزانەکەیدا، بەڵام بۆ خوای گەورە هەموو ئەو خۆشیانە بەجێدێڵن، نوێنەکانیان بەجێدێڵن لەگەڵ ئەوەی حەزیان لێیەتی، تەنها بۆ بە دەست هێنانی ئەو خێرەی کە بەلای خواوەیە ﴿يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفاً وَطَمَعاً﴾ هەڵدەستن لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە، چونکە لە سزاکانی دەترسن و بەتەمای پاداشتەکەشین، ئەمە بەڵگەیە لەسەر کۆکردنەوەی هەر دوو عیبادەتی ترس و ئومید، وە پێویستە مرۆڤ تەنها لەبەر ترس پەرستنەکانی ئەنجام نەدات، بەڵکو پێویستە کە پەرستنەکان ئەنجام دەدات بە ئومێدی بەهەشتەکەشی بێت، کەوا بوو نابێت لەبەر ترس پەرستنەکان ئەنجام بدەیت و بە ئومێد بوون پشتگوێ بخەیت، وە ناشبێت تەنها بە ئومێدی بەهەشتەوە پەرستنەکان ئەنجام بدەیت و، ترسی سزای خوای گەورە پشتگوێ بخەیت، بەڵکو گوێڕایەڵی هەموو فەرمانەکانی خوای گەورە دەبین چونکە لە سزای سەختی دەترسین و، لە هەمان کاتیشدا بە ئومێدی بەهەشتەکەشین ﴿خَوْفاً وَطَمَعاً﴾ ئەمە ڕێبازی هەر هەموو پێغەمبەران بووە _ عليهم الصلاة والسلام _ ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴾ خێرو صەدەقە بەهەژاران و دەست کورتان دەدەن، ئەوان هەر هەموو ئەو خەسڵەتانەیان لە خۆیاندا کۆ کردۆتەوەو، لە نێوانیشیاندا خێرو صەدەقە بەهەژاران و دەستکورتان دەدەن. پاشان خوای گەورە لە ئایەتەکەی دیکەدا باسی پاداشتەکەشیان دەکات و، دەفەرموێ: ﴿فَلاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ﴾ وەکو چۆن ئەوان کردەوەکانی خۆیان دەشاردەوەو، دوای نیوە شەو ئەنجامیان دەدا،

---------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------
-----------------------------------------------------

لە کاتێکدا کە هەر هەموو خەڵکی نووستوون، ئەوەهاش خوای گەورە پادەشتێکی گەورەی بۆ شاردونەتەوە، بە جۆرێك بە خەیاڵی هیچ کەسێکدا نەیەت ئەوەی کە خوای گەورە دەیناداتێ، ﴿جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ پاداشت لە ڕەگەزی کردەوەیە، وەکو چۆن ئەوان پەرستنی پەروەردگاریان لە نووستن و حەوانەوەی خۆیان بەچاکتردانا، ئەو ماڵ و سامانەی کە خوای گەورە پێی بەخشیون دەیبەخشن، هەر چەندە ماڵ و سامانیان خۆش دەوێ، ئاواش خوای گەورە پاداشتێکی بۆ داناون کە لە توانای هیچ کەسێکدا نییە وەسفی بکات، ئەوەیە سیفاتی دۆستانی خوای گەورە.

ثم قالَ: ((يا مُعاذُ ألاَ أُخبِرُكَ بِمَلاَكِ ذَلِكَ كُلِّهِ ؟)) فقالَ: ((أَمْسِكْ عَلَيْكَ لِسانَكَ هذا))[١] فَأَخَذَ بِلِسَانِهِ[٢]،

---

(١)_ بەڵێ، ئەگەر هەموو ئەو کردەوانەت بەجێهێنا، ئاگاداری خۆت بە لەهەموو ئەوانەی کە پوچیاندەکاتەوە، گەورەترین شتیش کە هەموو ئەو کردەوە چاکانە پوچ بکاتەوە زمانە، بۆیە تەماشا دەکەیت مرۆڤی وا دەبینیت جوێن بەمە دەدات و لە پاشم لە بە خراپی باسی ئەو دەکات، زمانی زاڵ دەکاتە سەر خەڵکانی دەوروبەری خۆی تا هەموو کردەوە چاکەکانی پووچ دەبنەوە، کەوا بوو پێویستە مرۆڤ زمانی خۆی لە قسەی خراپ و بەد گۆیی ڕابگرێت، تەنهاو تەنها لەزیکرو یادکردنەوەی خوای گەورەدا بەکاری بێنێت، بە پێچەوانەوە زمانی زیانی پێ دەگەیەنێت، زمانی تووشی دەکات.

(٢)_ پێغەمبەری خوا ﷺ زمانی پیرۆزی خۆی گرت، مەبەستی ئەوە بوو هەڵەکانی زمان بۆ هاوەڵی بەڕێز موعاذ رضي الله عنه ڕوون بکاتەوە.

... رسول الله، وَإِنَّا لَمُؤَاخَذُونَ بِمَا نَتَكَلَّمُ بِهِ؟ فقال: ((ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ يا مُعاذُ، وَهَلْ يَكُبُّ ... في النار عَلَى مَنَاخِرِهِمْ إِلاَّ حَصَائِدُ أَلْسِنَتِهِمْ ))[1]. حسن بمجموع طرقه: أخرجه الترمذي (...)، وقال: هذا حديث حسن صحيح، وأخرجه ابن ماجة (٣٩٧٣)، وأحمد (٥/٢٣١). واتە: دیسان پێغەمبەری خوا ﷺ بەهاوەڵی بەڕێز موعاذی فەرموو: ((سەری (لووتکەی) ئایینەکە موسڵمان بوونە، کۆڵەکەکەشی نوێژە، لووتکەی کرپارەکەشی تێکۆشانە لە پێناوی خوادا))، فەرمووی: ((ئەی موعاذ، ئایا دەروازەکانی خەیرت پێ بڵێم؟ ڕۆژوو قەڵغانە، خێرو صەدەقە تاوان دەکوژێنێتەوە وەکو چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە، هەستانی پیاویش بۆ شەو نوێژ، پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە ﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ﴾ تەینشتیان دوور ئەکەوێتەوە لە جێگای خەوتنیان (لە خەو هەڵدەستن شەونوێژ دەکەن) ﴿يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفاً وَطَمَعاً﴾ هاوارو نزا لەپەروەردگاریان دەکەن بەترس و هیواوە ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴾ و لەو ڕۆزی و سامانەی پێمانداوون دەبەخشن ﴿فَلاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ﴾ ئینجا هیچ کەس نازانێ ﴿مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ﴾ چی شاراوەتەوە بۆیان لە (بەهەشت دا کە هۆی) گەشبوونی چاوانن ﴿جَزَاء بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ ئەم پاداشتە (دەدرێتەوە) بەهۆی ئەو کردەوانەوەی کە کردویانە، پاشان فەرمووی: ((ئەی موعاذ ئایا ڕاگری هەموو ئەوانەت پێ بڵێم ؟)) فەرمووی: ((ئا ئەم زمانەی خۆت بپارێزە)) ئەوەبوو زمانی خۆشیگرت، موعاذیش فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا: ئایا لەسەر ئەوانەش سزا دەدرێین کە دەیڵێین؟ فەرمووی: ((ئەی موعاذ لەباری دایکت بچوایەیت، ئایا دەرەنجامی دروێنەی زمانیان نییە کە خەڵك بە ڕوویاندا دەخرێنە ئاگرەوە)).

---

(١)_ موعاذ ﷺ سەری سوڕماو، فەرمووی: ((ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا لەسەر ئەوانەش سزا دەدرێین کە دەیڵێین))، مرۆڤ گوێی بەهیچ نادات و هەموو قسەیەکی بە دەم دا دێت، بەلایەوە شتەکە ئاسایی بۆتەوە، بەردەوام چەنە بازی دەکات و، جوێن

بەمە دەدات و ستایشی ئەمە دەکات، ئیشی بووە بە قسەکردن بە ئەم و ئەو، خەڵکی گوێ بەو شتە نادەن، قسەکردنیان بە لاوە ئاسانە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو ((ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ يا مُعاذُ)) ئەمە وشەیەکە لە بنەڕەتدا دوعا لێکردنە، ((ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ)) واتە لە باری دایکت بچوایەیت، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ نایەوێ دوعا لە موعاذ بکات، بەڵکو تەنها وشەیەکەو بەسەر زاری خەڵکدا دەهات و، هیچی تر، ((ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ يا مُعاذُ)) پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕووی نکۆڵیکردنەوە ئەمەی بە موعاذ فەرموو، مەبەستی ئەوەبوو کە هەست بەمەترسیێتی زمان ناکات، پاشان دەفەرمووێ: ((وَهَلْ يَكُبُّ النَّاسَ فِي النَّارِ عَلَى مَنَاخِرِهِمْ إِلاَّ حَصَائِدُ أَلْسِنَتِهِمْ)) خەڵکی بەهۆی زمانیانەوە فڕێدەدرێنە ئاگرەوە، جوێن، غەیبەت، دوو زمانیی و چەندەها شتی تری پێدەڵێن، شایەتی درۆی پێدەدەن، لە هەمووشی گەورەتر ئەوەیە کە کوفرو هاوەڵپەرستی پێدەکەن، کارەکە زۆر مەترسیدارە بەڵام خەڵکی هەستی پێناکەن، ئەم زمانە مەترسیەکەی زۆر گەورەیە، عَنْ جُنْدُبٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَدَّثَ: ((أَنَّ رَجُلاً قَالَ: وَاللَّهِ لاَ يَغْفِرُ اللَّهُ لِفُلاَنٍ، وَأَنَّ اللَّهَ تَعَالَى قَالَ: مَنْ ذَا الَّذِي يَتَأَلَّى عَلَيَّ أَنِّي لاَ أَغْفِرُ لِفُلاَنٍ، فَإِنِّي قَدْ غَفَرْتُ لِفُلاَنٍ وَأَحْبَطْتُ عَمَلَكَ)) رواه مسلم، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (( پیاوێك گوتویەتی: سوێند بەخوا خوای گەورە لە فلان کەس خۆشنا بێت، خوای گەورەش فەرمووی: ئەوە کێیە بە ناوی منەوە سوێند دەخوات گوایە لە فلان کەس خۆش نابم، دڵنیا بە لە فلان کەس خۆش بووم و کردەوەکانی تۆشم پووچ کردەوە))، تەماشاکەن قسەیەکی کرد دونیاو دوای ڕۆژی خۆشی فەوتاند، تەنها قسەیەکی کرد، پێویستە مرۆڤ زمانی خۆی بەرەڵلا نەکات بۆ گوتنی هەموو قسەیەکی خراپ.

## بێدەنگبوونی ستایشکراو و بێدەنگ بوونی زەم کراو

فەرموودەکەی پێشوو بەم فەرموودەیە تەفسیر دەکرێت، ثبت في ((الصحيحين)) عنه ﷺ أنه قال: ((مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ))[1] واتە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەسێك بڕوای بە خواو ڕۆژی دوای هەیە، با قسەی خێر بکات یان بێدەنگ بێت)).

کەوا بوو قسەکردن لە بواری خێردا لەوە چاکترە کە لێی بێدەنگ بێت[2]،

---

(١)_ ئەو فەرمایشتەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەهاوەڵی بەڕێز موعاذی رضي الله عنه فەرموو: ((أَمْسِكْ عَلَيْكَ لِسانَكَ هذا)) واتە ((ئەو زمانەی خۆت بپارێزە)) بەم فەرموودەیەی تر تەفسیری کردووە ((مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، فَلْيَقُلْ خَيْرًا)) ((هەر کەسێك بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە، با قسەی خێر بکات)) وەکو زیکرو یادی خوای گەورە، بانگەواز کردن بۆ ئایینە ڕاستەکەی خوای گەورە، فەرمان بە چاکەو ڕێگریکردن لەخراپە، قورئان خوێندن، بە گوفتارگەلێکی خێر بدوێت ((أَوْ لِيَصْمُتْ)) ئەگەر نا با بێ دەنگ بێت، ئەگەر بێدەنگیش بوو، بێوەی و پارێزراو دەبێت، ئەگەر زمانی خۆی لە قسەکردنی خراپ پاراست ئەوا لەتاوان دوردەکەوێتەوە، کەوا بوو مرۆڤ با قسەی خێر بکات یان بێدەنگ بێت و قسەی شەڕ نەکات.

(٢)_ تەماشاکەن، قسە کردن لە بواری خێردا لەوە چاکترە کە بەرامبەر بەگوتنی خێر بێدەنگی بنوێنێت، ئێمە ناڵێین: بێدەنگ بەو هیچی تر، هەرگیز هیچ شتێك مەڵێ، نەخێرو نەشەڕ، بەڵکو دەڵێین: بەرامبەر بە گوتنی شەڕ بێدەنگ بەو، لەبوارەکانی خێردا بدوێ، وە قسەکردنیش لە بوارەکانی خێردا لەوە چاکترە کە لە بەرامبەری گوتنی خێردا بێدەنگی بنوێنێت، کەوا بوو پێدەچێ جار بە جار بێدەنگ بوون خێر بێت و جار بە جاریش کەم و کورتی بێت.

بێدەنگ بوونیش بەرامبەر بە گوتنی شەڕ لەوە چاکترە کە لە بواری شەڕدا قسە بکرێت، بەلام سەبارەت بە بێدەنگ بوونی بەردەوامیش، بیدعەیەو قەدەغە کراوە[١].

هەروەها وازهێنان لەنان و گۆشت خواردن و خواردنەوەی ئاو، دیسان لەبیدعە زەم کراوەکانە[٢]،

---

(١)_ فەرمان بە مرۆڤ نەکراوە بەردەوام بێدەنگ بێت، کە پێغەمبەر خوا ﷺ فەرموویەتی: ((أَمْسِكْ عَلَيْكَ لِسانكَ هذا)) مانای ئەوە نابەخشێت کە بەردەوام تۆ بێدەنگ بێت، مانای ئەوەش نییە کە لە بواری خێرو شتە ڕێپێدراوەکاندا قسەنەکەیت، نەخێر، ئەمە مەبەست نییە، مەبەست ئەوەیە کە تەنها لە شەڕ زمانت بپارێزیت، لە گوتنی شەڕ بیپارێزیت و هیچی تر، مەبەست بێدەنگ بوونی بەردەوام نییە، مەبەست بە فەرموودەکەی موعاذ رضي الله عنه ئەوە نییە کە مرۆڤ تەنها بیسەر بێت، نە لە بواری خێرو نە لە بواری شەڕدا قسە نەکات، ئەمە عیبادەت نییە، بێدەنگ بوون عیبادەت نییە مەگەر لە بواری شەڕدا، بێدەنگ بوون لە بواری شەڕدا عیبادەتە. بە واتایەکی تر هەر کەس بانگەشەی بێدەنگ بوونی بەردەوام بکات و، گوایە مرۆڤ قسە نەکات و، بلێت: چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((أَمْسِكْ عَلَيْكَ لِسانكَ هذا))، ئەمە تێگەیشتنێکی هەڵەیەو بیدعەیە. خوای گەورە فەرمانی زیکرو، فەرمان کردن بە چاکەو، قەدەغە کردن لە خراپەی پێکردوین، فەرمانی پێکردوین بانگەوازی بۆ ڕێگە ڕاستەکەی خوای گەورە بکەین، فەرمانی قسەکردنی پێکردوین بەلام لە بوارەکانی خێردا.

(٢)_ بەڵێ، بێدەنگ بوونی بەردەوام بیدعەیە، کەسانێك بە عیبادەتی دادەنێن و دەڵێن: لە دەرەنجامە خراپەکانی زمان بیوەی دەبین، زمانی لە هیچ بوارێکدا ناجوڵێنێت، لە زیکری خوای گەورەدا نایجوڵێنێت ئەگەر کەمیش بێت، ئەمە بیدعەیە.

هەروەها ئەو کەسانەش کە شتە ڕێپێدراوە خۆشەکان واز لێدێتن و، دەڵێن: ئەوە

---------------------------------

---------------------------------

---------------------------------

عیبادەتە، ئەماشا دەکەیت گۆشت ناخوات، میوە ناخوات، واز لە پۆشاکی چاك و جوان دێنێت و، دەڵێت: ئەمە عیبادەتە، نەخێر، هەموو ئەوانە ڕێپێدراوەو، خوای گەورە ڕێپێدراوێتی ئەوانەی پێبەخشیوێت، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ قُلْ هِيَ لِلَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ [الأعراف: ٣٢] واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ کێ ئارایش و جوانی یە خواییەکانی حەرام کردووە کە خوا بۆ بەندەکانی دروستی کردووە هەروەها ڕۆزی و خۆراکە پاك و خۆشەکان (کێ حەرامی کردوون) (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ئەوانە بۆ بڕوادارانە لە ژیانی دونیادا (بێ بڕوایانیش لە پەنای ئەواندا بەشداری دەکەن) (بەڵام) لە ڕۆژی دوایی دا تایبەتە بەبڕوادارانەوە. کەوا بوو ئەو کەسەی واز لە ڕێپێدراوەکان بێنێت و، بڵێت: عیبادەتە، ئەمە بیدعەیە، وازهێنان لەشتە ڕێپێدراوەکان وەکو عیبادەتێك بۆ خوای گەورە بیدعەیە.

لەو بارەوە لە((صحیح))ی ئیمامی بوخاریدا هاتووە: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى رَجُلًا قَائِمًا فِي الشَّمْسِ، فَقَالَ: ((مَا هَذَا ؟))، فَقَالُوا: أَبو إِسْرائِيلَ، نَذَرَ أَنْ يقومَ فِي الشَّمسِ، وَلَا يَسْتَظِلَّ، ولا يَتَكَلَّمَ، وَيَصُومَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: ((مُرُوهُ فَلْيَجْلِسْ، وَلْيَسْتَظِلَّ، وَلْيَتَكَلَّمْ، وَلْيُتِمَّ صِيَامَهُ))(١)،

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی بەدیکرد لەبەر هەتاوەکەدا بەپێوە وەستا بوو، فەرمووی: ((ئەمە چییە ؟)) وتیان: ئەبو ئیسرائیلە، نەزری کردووە لەبەر هەتاوەکەدا بوەستێ و، نەچێتە بەر سێبەرو، قسە نەکات و، بە ڕۆژووش بێت، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((فەرمانی پێبەن با دانیشێ و، بچێتە بەر سێبەرو، قسەبکات و، ڕۆژووەکەشی تەواو بکات)).

---

(١)_ ئەم پیاوە نەزری چوار شتی کرد بوو، یەکەم: بوەستێت و دانەنیشێت، دووەم: لەبەر سێبەردا دانەنیشێت و لەبەر هەتاودا بوەستێت، سێیەم: قسە نەکات، چوارەم: بە ڕۆژوو بێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دانەیەکیانی پێکرد کە ڕۆژووەکە بوو، لەوانی دیکەش قەدەغەی کرد، کە بریتی بوو لە وەستانی بەردەوام و، لەبەر سێبەر دانەنیشتن و، بێدەنگ بوونی بەردەوام، قەدەغەی ئەنجام دانی ئەم شتانەی لێکرد، کەوا بوو ئەمە ئاماژە بۆ بیدعە بوونی ئەو شتانە دەکات، بۆیە لەڕێگەی ئەنجام دانی ئەم شتانەوە ناتوانیت خۆت لە خوای گەورە نزیک بکەیتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((فەرمانی پێ بکەن با دانیشێت)) چونکە پیاوەکە وەستا بوو، فەرمووی: ((با لە بەر سێبەر دانیشێت)) ئەمە فەرمانە بە چوونە بەر سێبەرو لەبەر هەتاونەمانەوە، فەرمووی: ((با قسە بکات)) چونکە نەزری کرد بوو قسە نەکات، فەرمووی: ((با ڕۆژووەکەی تەواو بکات)) چونکە لە فەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرموێت: ((مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطِيعَ اللَّهَ فَلْيُطِعْهُ، وَمَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْصِيَ اللَّهَ فَلا يَعْصِهْ)) واتە: فەرموویەتی: ((هەرکەسێك نەزری گوێڕایەڵیتی خوای گەورەی کردووە، با گوێڕایەڵی بێت، هەر کەسێکیش نەزری سەرپێچی کردنی خوای گەورە

---------------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------------

کردووە، با سەرپێچی نەکات))، ڕۆژووش تاعەت و گوێڕایەڵ بوونە کەوابوو تەواوی دەکات، ئەم فەرمووده بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەرکەسێك نەزری ئەنجامدانی شتێکی حەرام بکات، نەزرەکەی دانامەزرێت، لەسەریشی واجیب نییە جێبەجێی بکات، هیچ کەفارەتێکیشی لەسەر نابێت.

وثبت في ((الصحيحين)) عن أنس: ((أنَّ رجالاً سألوا عن عبادةِ رسول الله ﷺ في السر فكأنهم تقالُّوها، فقالوا: وأيُّنا مثلَ رسول الله ﷺ؟ قَالَ أحدُهُمْ: أمَّا أنا فأصُومُ ولاَ أُفطِرُ، وقالَ الآخر: أما أنا فأقوم ولا أنام، وقال آخر: أما أنا فلا آكل اللحم، وَقَالَ آخرُ: فَلاَ أتزوَّجُ النساء، فقالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ((مَا بَالُ رجال يقول أحدهم كذا وَكَذا ؟! لَكِنِّي أصُومُ وَأُفطِرُ، وَأقومُ وَأنامُ، وآكُلُ اللَّحْمَ، وَأتزوَّجُ النِّسَاءَ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي))[1]، صحيح: أخرجه البخاري (٥٠٦٣)، ومسلم (١٤٠١)، من حديث أنس رضي الله عنه.

واتـه: هـاوەڵی بـەڕێز ئەنـەس رضي الله عنه دەگێڕێتـەوە: ((کـه پیاوانێـك پرسـیاری ئـەو پەرستنانەیانکرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەنهێنی ئـەنجامی دەدات، بـەڵام بەکـەمیان دانا، گوتیان: کام لە ئێمە وەکو پێغەمبەری خواین ﷺ؟ بۆیە یەکێکیان گـوتی: من بەڕۆژوو دەبم و نایشکێنم، یەکێکی تریشیان گوتی: منیش بەردەوام شەو نوێژ دەکەم و ناخەوم، یەکێکی تریشیان گوتی: من چیتر گۆشت نـاخۆم، ئـەوی تریشـیان گـوتی: هەر گیز لەگەڵ ژناندا هاوسەرگیری ناکەم، ئەوە بوو پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمووی: ((ئەوە بۆ پیاوانێك ئەوەهاو ئاوەها دەڵێن؟! بەڵام من بە ڕۆژوو دەبم و دەشیشـکێنم، شـەو نوێـژ دەکـەم و دەشـخەوم، گۆشـتیش دەخـۆم، لەگـەڵ ژنانیشـدا هاوسـەرگیری دەکەم، بۆیە هەر کەسێك واز لە سووننەتی من بێنێت لە من نییە)).

---

(١)_ فەرموودەکە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە هەر کەسێك وەکو عیبادەتێك بـۆ خـوای گەورە واز لە شتە ڕێپێدراوەکان بێنێت، با دڵنیا بێت کەسێکی بیدعەچییەو، لە هەمان کاتیشدا زێدڕۆیی کردنـە لـە پەرستندا، چـونکە نێـوەنجێتی و میـانڕەویی داواکراوە، پێغەمبەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: ((مـن بـە ڕۆژوو دەبم و دەشیشـکێنم، شـەو نوێژ دەکەم و دەشخەوم، گۆشتیش دەخۆم، لەگەڵ ژنانیشـدا هاوسـەرگیری دەکـەم، بۆیە هەرکەسێك واز لە سووننەتی من بێنێت لە من نییە))، ئەمە ئاماژەیەکی بەهێزە بۆ

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

-----------------------------------------------------

ئەوەی کە هەرکەسێك واز لەو شتانە بێنێت وەکو عیبادەتێك بۆ خوای گەورە

کەسێکی بیدعە چییەو، عیبادەتی خوای گەورەی نەکردووەو، پێغەمبەری خواش ﷺ

لە کەسێکی ئاوەها بەرییە، ((هەر کەسێك واز لە سوونەتی من بێنێت لە من نییە))

ئەمە بەریبوونەکەی پێغەمبەری خوایە ﷺ. کەوا بوو ئەو سوودانەی لەو

فەرموودەیەوە بەدەست دێت بریتیە لەوەی کە بەوازهێنان لە شتە ڕێپێدراوەکان

عیبادەتی خوای گەورە ناکرێت، ئایینی ئیسلام ئایینی میانڕەوییە، زێدەڕۆیی وە

فەرامۆش کردن ڕێگەی پێ نەدراوە.

فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ ((فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي)) واتە: کەسێك سوونەت و ڕێبازێکی دیکە پەیڕەو بکات بەو گومانەی کە سوونەت و ڕێبازێکی دیکە لە سوونەت و ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ چاکترە[1]، ئەگەر هەر کەسێك ئەو جۆرە گومانەی هەبێت بە دڵنیایی لە خواو پێغەمبەرەکەی بەرییە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ يَرْغَبُ عَنْ مِلَّةِ إِبْرَاهِيمَ إِلاّ مَنْ سَفِهَ نَفْسَهُ﴾[2] [البقرة: ١٣٠]

---

(١)_ واتە: هەر کەسێك گومانی وا بێت کە سوونەت و ڕێبازێکی دیکەی جگە لە ڕێبازو سوونەتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ چاکتر بێت کەسێکی گومڕایە، ئەو کەسەی لەو باوەڕەدا بێت کە عیبادەتێك دەکات لە عیبادەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ چاکتر بێت کەسێکی گومڕایەو پێغەمبەری خوا ﷺ لە کەسێکی بەو جۆرە بەرییە، ئەمەش ڕەتدانەوەی بیدعەچیانە کە واز لە سوونەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دێنن و لە خۆیانەوە عیبادەت گەلێك ئەنجام دەدەن کە خوای گەورە فەرمانی پێ نەکردوون، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهوَ رَدٌّ)) واتە: ((هەرکەسێك کردەوەیەك ئەنجام بدات کە فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ڕەتکراوەتەوە))، هەروەها فەرموویەتی: ((أَمَّا بَعْدُ فَإِنَّ خَيْرَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللَّهِ وَخَيْرُ الْهُدَى هُدَى محمد وَشَرُّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَة)) واتە: پاشان ڕاست ترین گوتە و فەرموودە کیتابەکەی خوایەو چاکترین ڕێنموویی ڕێنموویی پێغەمبەرە ﷺ وە خراپترینی کاروبارەکان تازەگەریەکانێتی وە هەموو تازەگەریەکیش لە دیندا (کە تیایدا نەبێت) داهێنراوەو هەموو داهێنراوێکیش گومڕاییەو هەموو گومڕاییەکیش لە ئاگردایە.

(٢)_ سوونەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایینی ئیبراهیم پێغەمبەرە _ علیه السلام _، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ يَرْغَبُ عَنْ مِلَّةِ إِبْرَاهِيمَ﴾ ئایا هیچ کەسێك هەیە لە ئایینەکەی ئیبراهیم پێغەمبەر ڕووگێڕێت مەگەر کەسانێکی هەرزەو گەمژە کە هیچ

----------------------------------------------------------------

----------------------------------------------------------------

----------------------------------------------------------------

عەقڵ و ژیریەکیان نەبێت. ﴿وَمَنْ يَرْغَبُ عَنْ مِلَّةِ إِبْرَاهِيمَ إِلاَّ مَنْ سَفِهَ نَفْسَهُ﴾ واتە: هیچ کەسێك لە ئاینەکەی ئیبراهیم پێغەمبەر _ علیه السلام _ ڕووناگێڕێت مەگەر ئەو کەسەی کە گەمژەو هەرزە بێت، چونکە ئایینی ئیبراهیم ئایینێکی حەنیفی پاکی ناواوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەو ئایینەوە نێردراوە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ أَنِ اتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفاً﴾ [النحل: ١٢٣] واتە: پاشان نیگامان بۆ کردی کە پەیڕەوی ئایینی ئیبراهیم بکە چونکە پاك و ڕاست بوو. پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: ((فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي)) واتە: هەر کەسێك واز لە سوونەتی من بێنێت لە ئوممەتی من نییە، کەوابوو ئەو کەسەی کە سوونەت و ڕێبازێکی دیکەی هەڵبژاردووە، وازی لە سوونەتی پێغەمبەری خوا ﷺ هێناوە، هەروەها وازی لە سوونەتی ئیبراهیم پێغەمبەریش هێناوە.

واتــە: ﴿وَمَنْ يَرْغَبُ عَنْ مِلَّةِ إِبْرَاهِيمَ﴾ کــێ ڕوو وەرئــەگێڕێ لــە ئــایینی ئیــبراهیم ﴿إِلاَّ مَنْ سَفِهَ نَفْسَهُ﴾ مەگەر کەسێك کە خۆی هەرزە کرد بێت. بە پێچەوانەوە لەسەر هەموو کەسێك واجیبە بڕوای وا بێت کـە چاکترین و ڕاست تـرین گوتـە و فـەرموودە کیتابەکـەی خوایـەو چـاکترین ڕێنمـوویی پێغەمبـەرە ﷺ چـونکە بـە فـەرموودەی (صحیح)[1] جێگیر بـووە کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە ووتـاری هـەموو ڕۆژێکی هەینیدا ئەوەی دەفەرموو[2].

---

(١)_ صحیح: أخرجه مسلم (٨٦٧) من حدیث جابر بن عبدالله رضي الله عنه مرفوعاً.

(٢)_ بـەڵێ، پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەیفـەرموو ڕاسـت تـرین گوتـە و فـەرموودە کیتابەکـەی خوایـەو چـاکترین ڕێنمـوویی پیغەمبـەرە ﷺ وە خراپترینـی کاروبارەکان تازەگەریەکانیەتی، هـەموو ڕۆژێکـی هـەینی ئـەوەی دەفـەرموو، خـەڵکی ئاگادار دەکردەوە، هانیدەدان بۆ دەستگرتن بە کیتابەکـەی خـواو سـووننەتی ڕاستی پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ.

## بەشێك

## سەبارەت بەوەی کە مەرج نییە دۆستی خوای گەورە لەهەڵەو تاوان پارێزراو بێت

### مەرج نییە وەلی و دۆستی خوای گەورە پارێزراو بێت هەڵەو تاوان نەكات[1]

---

(١)_ خوای گەورە لەبارەی دۆستانی خۆیەوە دەفەرموێت: ﴿أَلا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ (٦٢) الَّذِينَ آمَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ(٦٣)﴾[يونس: ٦٢ _٦٣]. واتە: ﴿أَلا إِنَّ﴾ ئاگادرابن بێ گومان ﴿أَوْلِيَاءَ اللَّهِ﴾ دۆستانی خوا ﴿لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ﴾ ترسیان لە سەر نییە ﴿وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ خەفەتیش ناخۆن ﴿الَّذِينَ آمَنُواْ﴾ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە ﴿وَكَانُواْ يَتَّقُونَ﴾ وەهەمیشە خۆیان دەپارێزن و لە خوا دەترسن. کەوا بوو هەر کەسێ ئیمانداری لە خوا ترس بێ دۆستی خوایە، پێشتریش ئاماژەمان بەوەدا کە دۆستانی خوای گەورە هیچ نیشانەیەکیان نییە کە پێی بناسرێنەوە، نە لە پۆشاك و، نە لە مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵکیشدا، بەڵکو ئەوان وەکو تێکرای جەماوەری خەڵکن، نا ناسرێنەوە، هیچ نیشانەیەك بۆ خۆیان دانانێن، جلوبەرگێك ناپۆشن کە تێکرای جەماوەی خەڵکی نەیپۆشن، هیچ دەست و پێوەندێکیان نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەر چەند دۆستانی خوای گەورە شاراوە بن ئەوەندە دۆستایەتیەکەیان تەواو تر دەبێت، چونکە دۆستایەتی خۆ ساغ کردنەوەی تەواوە بۆ خوای گەورە، کەوا بوو هەر کەسێك حەزی لە خۆ دەرخستن بێت ئەوە کارەکەی ڕووپامابیەو، وەلی و دۆستی خوا نییە، چونکە دۆستانی خوای گەورە حەزیان بە خۆ دەرخستن نییە، حەزیان بەوە نییە ستایش و پیاهەڵدانیان بکرێن، حەزیان بەوە نییە لە نێو خەڵکیدا پلە و پایەیان هەبێت، ئەمەش ڕێکی فەرموودەکەی پێغەمبەری خوایە ﷺ کە دەفەرموێ: ((رُبَّ أَشْعَثَ أغبرَ مَدْفُوعٍ بالأبوابِ لو أَقْسَمَ عَلَى اللهِ لأَبَرَّه)) واتە: ((پێدەچێ هەژارێکی قژبژی تۆزاوی کە لە دەرگای

مـالآن دور دەخرێتـەوەو هـیچ شـەڕافەت و بەڕێزیـەکی بـە لای خەڵکـەوە نییـە ئەگـەر سوێند بخوات خوای گەورە شتێکی بـۆ جێبـەجێ بکـات، بـە دڵنیـایی بـۆی جێبـەجێ دەکات)) خوای گەورە نزاکانی قبوڵ دەکات، چونکە دۆستی خوای گەورەیە، ئەمەش ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە خۆی یەکلاکردووە بۆ خوا، وەکو چیرۆکی ئوەیسی قەرەنی کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵەکەی پێ ڕاگەیاندوین، کەسێك بوو لەو شاندەی کە لە یەمەنەوە هات بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵانی خۆی فەرموو: هەر کەسێکتان پێی گەیشت با داوای لێ بکات نزای بۆ بکات، بۆیە کە لەگەڵ شاندەکەی یەمەندا هات، کەسێتی خۆی شاردبۆوە، ئیمامی عومەر ؓ بە دوای دا گەڕا تا پێی گەیشت، داوای لێکرد نزای بۆ بکات، پاشان ئیمامی عومەر پێی فەرموو: ئەی بۆت نەنووسم بۆ ئەهلی عێراق، گوتی: حەزم بەوەیە لەگەڵ تێکڕای خەڵکدا بم، ئـەوە بـوو لەگـەڵ خەڵکـەدا چوو و ئیتر نەدۆزرایەوە. پاشان مەرج نییە دۆستی خوای گەورە پارێزراو بێـت و هـیچ هەڵەیەك نەکات، بەڵکو لە بـواری ئیجتهـاد کردنـدا هەڵـە دەکـات مەگـەر پێغەمبـەران، پێشەوایانی دۆستانی خوای گەورە پێغەمبەرانن، ئەمانە مەعصوم و پـارێزراون، بـەڵام جگە لەوان تێکڕای مرۆڤایەتی هەندێ جار دەیپێکت و هەندێ جاریش نا یپێکت، بۆیە ناگوترێت: ئەوان دۆستانی خوان و هەڵە ناکەن، قسەکانیان وەردەگیرێت وەکو ئەوەی پێغەمبەر بن، نەخێر، ئەمە قسەی صۆفیەکانە کە بەرامبەر بەسەرکردەو شـێخەکانیان دەیکەن، لەو بڕوایەدان کە لە هەڵەو تاوان پارێزراون، دەڵێن: مورید لەگەڵ شێخەکەیدا بە هاوشێوەی مردووە لەگەڵ ئەو کەسەدا کـە هـەڵ دەسـتێت بـە شوشـتنی، لە هیچ شتێکدا ڕێگری لـە شـێخەکەی ناکـات، بـە تـەواوی خـۆی تەسـلیمی دەکـات، ئەمەبە بیروباوەڕی تەصەوفی گومڕا، دواتـریش شێخولئیسـلام _ ڕەحمـەتی خـوا لێ بێـت _ ئەمەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە. بە ڕاستی ئەمە وەڵام دانەوەیە بۆ ئەو کەسانەی کە

---------------------------------------------------
---------------------------------------------------
---------------------------------------------------

بڕوایان بەمەعصومیەت و پارێزراوێتی وەلی هەیە، بۆیە شێخ هەر چی شتێك بڵێت ڕەخنەی لێناگرن و نکۆڵیی لێناکەن، وەکو ئەوەی صۆفیەکان دەربارەی شێخەکانیان دەڵێن یان گۆڕپەرستان سەبارەت بەشێخەکانیان دەیڵێن، لەڕاستیدا ئەمە مەسەلەیەکی زۆر گرنگە.

بەڵكو دەشێت هەندێ لەزانستی شەریعەتیشی بە لاوە نادیار بێت[1] پێدەچێ هەندێ کاروباری ئایینەکەشی بە لاوە ئاڵۆزبێت، تا ئەو ئاستەی وا بزانێت خوای گەورە فەرمانی بە هەندێ شت کردووە، بەڵام لە ڕاستیدا خوای گەورە ڕێگریی لێکردوون[2]

---

(١)_ جایزە وەلی هەندێ زانستی شەریعەتیشی بە لاوە نادیار بێت و هەڵە بکات، فەتوایەك دەدات، گوفتارێك دەڵێت و لە شەریعەتدا شتانێکی تر هەن لەگەڵ فەتواکەی ئەودا، لەگەڵ قسەکانی ئەودا پێچەوانەن، چونکە نەیبینیوەو نەیخوێندۆتەوە، بە قەستی موخالەفەی نەکردووە، بەڵکو تەنها نەیبینیوەو نەیخوێندۆتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾[یوسف: ٧٦] واتە: لەسەر هەموو خاوەن زانستێکەوە زاناتر هەیە. هەروەها خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێت: ﴿وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا﴾ [طه: ١١٤] واتە: وە بڵێ ئەی پەروەردگارم زانست و زانیاریم زیاد بکە. کەوا بوو نابێت مرۆڤ لەو باوەڕەدا بێت کە وەلی و دۆستان لە هەڵەو تاوان پارێزراون، بەڵکو هەڵەش دەکەن و ڕاستیش دەکەن، بەڵام بۆ هەق دەگەڕێنەوە، ئامۆژگاری قبوڵ دەکەن، ڕاوێژ بە زانایان دەکەن، وەکو ئیمامی عومەر ﷺ ئەگەر شتێك ڕووی بدابا ڕاوێژی دەکرد بە هاوەڵانی کۆچ کردو و پشتیوانان.

(٢)_ پێدەچێ هەندێ کاروباری ئایینەکەشی بەلاوە نادیار بێت، ئیتر وا دەزانێت ئەمە سووننەتە بەڵام لە ڕاستیدا سووننەت نییە، ئەمە (صحیح)ە بەڵام (صحیح) نییە، چونکە مرۆڤ هەڵە دەکات و ڕاستیش دەکات، مانای ئەوە نییە کە بوو بە وەلی ئیتر لە ڕەگەزی مرۆڤایەتی دەچێتە دەرەوە، نەخێر، بەڵکو تەنها مرۆڤێکە جاروبار هەڵە دەکات و جاروباریش دەیپێکێت.

پێدەچێ وابزانێت هەندێ کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەر کەراماتی وەلی و دۆستانی خوای گەورەیە، بەلام لە ڕاستیدا تەنها شەیتانە کە بۆی جێبەجێ دەکات، چونکە پلەکەی کەم و کورتی تێدایە[1]، ناشزانێت لە لایەن شەیتانەوەیە، ئەگەر چی بە هۆی ئەوانەوە لە چوار چێوەی دۆستایەتی خوای گەورە نەشچێتەدەرەوە[2]،

---

(١)_ دۆستی ڕاستگۆ نابێ لەو باوەڕەدابێت کە هەموو کارێکی نائاسایی لە سروشت بەدەر کەرامەتە، بەڵکو دەبێ بترسێت ئەوانە کاری شەیتان بن، بۆیە پێویستە بەو کردەوە نائاساییانەی کە لەسەر دەستی دێنەدی فریو نە خوات، کە گوایە کەرامەتە، با لەسەر ئەم شتە پێداگریی نەکات، چونکە لەوانەیە ئەمە فریودانێکی شەیتان بێت بۆ ئەوەی تەنها سەری لێ تێك بدات، ئەمەیە سیفاتی دۆستانی خوای گەورە، یەکێك لە سیفاتەکانیان ئەوەیە کە بە کەرامەت فریو ناخۆن، ناشیکەن بە هۆکارێك بۆ فیز نواندن و لوت بەرزی نواندن، بەڵکو دەیشارنەوەو پشتی پێ نابەستن. وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا ئەگەر کاری نائاسایی لە سروشت بەدەر لەسەر دەستی ئیماندارێکی تەقواداری لە خواترس هاتەدی کەرامەتەو، ئەگەر لەسەر دەستی کەسێکی خراپی بەد بەختیش هاتەدی ئەوا کردەوەیەکی نائاسایی لەسروشت بەدەری شەیتانیەو، کەرامەت نییە، بۆ ئەوەی پلەکەی کەم بکاتەوەو لەو ڕێگەیەوە زیانی پێ بگەیەنێت. دڵنیا بن دۆستانی خوای گەورە بە کەرامەت فریو ناخوات.

(٢)_ ئەگەر چی بە هۆی هەڵەکانیەوە لە چوارچێوەی دۆستایەتی خوای گەورە ناچێتە دەرەوە، ئەو دۆستی خوایە ئەگەرچی هەڵەش بکات، چونکە بە قەستی هەڵەکانی نەکردووە، تا ئەو ئاستەی پێغەمبەر خوا ﷺ فەرموویەتی: ((اذَا أجتهدَ الْحَاكِمُ فَأَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ وَإِذَا اجْتَهَدَ فَأَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ)) رواه البخاري، واتە: ((ئەگەر دادوەر ئیجتیهادی کردو پێکای دوو پاداشتی بۆ دەنوسرێت و، ئەگەر ئیجتیهادی کردو هەڵەی کرد یەك پاداشتی بۆ دەنوسرێت))، کەوا بوو ئەو پاداشت دراوەتەوە، لەسەر هەڵەکانی تاوانبار نابێت، لەسەر ڕاست پێکانەکەشی دوو جار پاداشت دەدرێتەوە.

خوای گەورە لە هەڵەو لە بیر چوونی ئەم ئوممەتە چاوپۆشی کردووە، هەروەها ل
کردەوەی ئەو کەسانەش خۆش دەبێت کە بە ناچاریی و بە زۆر پێیان کراوە[1]،

---

(١)_ لەم بارەوە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ لِأُمَّتِي عَنْ الْخَطَأِ وَالنِّسْيَانِ)) ابن ماجه والبيهقي وغيرهما، واتە: ((بە ڕاستی خوای گەورە لە هەڵەو بیرچوونەوەی ئەم ئوممەتەی بوردووە))، خوای گەورە لە کردەوەی ئەو کەسانەش خۆش دەبێت کە لەسەر ئەنجام دانی ناچار کراون و بە زۆر پێیانکراوە، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ﴾[النحل: ١٠٦] واتە: مەگەر کەسێك زۆری لێ کرا بێت وە دڵیشی دامەزراو بێت بە باوەڕ.

بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ((آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ
ـلّهِ وَمَلآئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا
ـيْكَ الْمَصِيرُ(٢٨٥) لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لاَ
ـؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلاَ
ـحَمِّلْنَا مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنتَ مَوْلاَنَا فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ
ـكَافِرِينَ))[1]، واتە: پێغەمبەر بڕوای هێنا بەو نامەیەی کە بۆی نێرراوە لە پەروەردگاریەوە لە گەڵ بڕواداراندا هەموو بڕوایان هێناوە بە خوا و فریشتەکانی و نامەکانی و پەیامبەرانی جیاوازی ناکەین لە نێوان هیچ یەکێك لە پەیامبەرانی (بڕوادارەکان) گووتیان (پێغەمبەر ئایینی خوای پێ گەیاندین ئێمەش) بیستمان فەرمانبەرییمان کرد داوای لێ خۆشبوونت لێدەکەین ئەی پەروەردگارمان و هەر بۆ لای تۆیە گەڕانەوە خوا داوا لە هیچ کەسێك ناکات مەگەر بە ئەندازەی توانای خۆی (سوودی) بۆ خۆی هەیە هەر چاکەیەك بکات (با هەر بە دڵیش بێت) و (زیانی) بۆ خۆیەتی هەر خراپەیەك بکات (بەعەمدی و ئەندامی لەش) ئەی پەروەردگارمان لێمان مەگرە ئەگەر کردەوەیەکی پێویستمان لە بیرچوو یا بە هەڵە گوناهێکمان کرد ئەی پەروەردگار لە سەرمان دامەنێ باری قورس وەك داتناوە لە سەر ئەوانەی پێش ئێمە ئەی پەروەردگارمان بەڵای وامان بەسەردا مەدە کە بۆمان هەڵنەگیرێت و گوناهەکانمان بسڕەوە وەلێمان خۆش بە و میهرەبانیمان لەگەڵ دا بکە تۆی باریدەدەرو کارسازمان کەواتە سەرمان بخە بەسەر گەلی بێ بڕوایاندا.

---

(١)_ ئەمە ئایەتەکانی کۆتایی سورەتی (البقرة)یە، سیفاتی دۆستانی خوای گەورەی تێدایە، ئەوان بڕوایان بە خواو هێناوەو ئەوەی کە خوای گەورە دایبەزاندووە، بە خواو، فریشتەکانی و، کتێبەکانی و پێغەمبەرانی بڕوایان هێناوە، سیفاتیان ئەوەیە کە بڕوا بە خوا دەکەن و، هەر گیز لەو بڕوایەدا نین بتوانن لە شەریعەتەکەی بچنە

---------------------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------------------

دەرەوە، بەڵام گومڕاکان لەو بڕوایەدان کە بەخوای گەورە گەیشتوون و پێویستیان بە شەریعەت نییە، بەڵام دۆستانی ڕاستی خوای گەورە بڕوایان بە خوای گەورە هێناوە، شوێنی دەکەون و، هەرگیز لەو بڕوایەدا نین کە پێویستیان بە شەریعەت نەما بێت، لەو بڕوایەدا نین کە پێویستیان بەوانە نەما بێت کە خوای گەورە دایبەزاندووە، سیفەتێکی دیکەیان ئەوەیە کە دان بە هەڵەو بیرچوونەوەی خۆیاندا دەنێن و، بەردەوام لە خوای گەورە داوای لێخۆشبوون دەکەن. سیفەتێکی دیکەیان ئەوەیە کە دەڵێن: بیستمان و گوێڕایەڵی دەبین، گوفتارەکانی خواو گوفتارەکانی پێغەمبەرەکەی دەبیستن و قبوڵی دەکەن و گوێڕایەڵیی خواو پێغەمبەرەکەی دەبن، ئا ئەمەیە سیفاتی دۆستانی خوای گەورە.

بەفەرموودەی (صحیح)یش جێگیربووە کە خوای گەورە ئەو دوعایەی قبوڵ فەرموویەتی: (قد فعلت) واتە: بە دڵنیایی جێبەجێم کرد[1].

عن ابن عباس رضي الله عنه قال لما نزلت هذه الآية: ﴿وإن تبدوا ما في أنفسكم أو تخفوه يحاسبكم به الله فيغفر لمن يشاء ويعذب من يشاء والله على كل شيء قدير﴾[البقرة: ٢٨٤]، دخل قلوبهم منها شيء لم يدخلها قبل ذلك شيء أشد منه، فقال النبي ﷺ: ((قولوا سمعنا وأطعنا وسلمنا))، قال: فألقى الله الإيمان في قلوبهم، فأنزل الله تعالى: ﴿لا يكلف الله نفسا إلا وسعها﴾[2] [البقرة: ٢٨٦] الآية.

---

(١)_ لە هەموو ڕستەیەکدا خوای گەورە دەفەرموێت: (قَدْ فَعَلْتُ) واتە: بە دڵنیایی جێبەجێم کرد، ﴿رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا﴾ [البقرة: ٢٨٦] خوای گەورە دەفەرموێت: (قَدْ فَعَلْتُ) واتە: بە دڵنیایی جێبەجێم کرد، ﴿رَبَّنَا وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا﴾ [البقرة: ٢٨٦] خوای گەورە فەرمووی: (قَدْ فَعَلْتُ) واتە: بە دڵنیایی جێبەجێم کرد، ﴿رَبَّنَا وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ﴾ [البقرة: ٢٨٦] خوای گەورە فەرمووی: (قَدْ فَعَلْتُ) واتە: بە دڵنیایی جێبەجێم کرد، ﴿وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنْتَ مَوْلاَنَا فَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾[البقرة: ٢٨٦] خوای گەورە فەرمووی: (قَدْ فَعَلْتُ) واتە: بە دڵنیایی جێبەجێم کرد. خوای گەورە ئەم نزایانەی قبوڵ کردووە، وەکو ئەوەی لە (الصحیحین) دا هاتووە، ئەمەیە سیفەتی دۆستانی خوای گەورە کە لەو ئایەتە پیرۆزانەوە بە دەست دێت. تەماشاکەن ئەوان دان بەوەدا دەنێن کە هەڵە دەکەن و بیریان دەچێتەوە، دانیان بەوەدا ناوە، بانگەشەی ئەوەیان نەکردووە کە پارێزراون و هەڵەو تاوان ناکەن.

(٢)_ بەڵێ، کە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿وَإِن تُبْدُواْ مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللهُ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ وَاللهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ [البقرة: ٢٨٤] ئەوەیان بە لاوە قورس و سەخت بوو، کە خوای گەورە لەسەر ئەوەی

-----------------------------------------------------------
-----------------------------------------------------------
-----------------------------------------------------------

که لـه دەروون و ویـژدان و ناخیـان دایه لێیـان دەپرسێتەوە، بـە ڕاستی بەلایانەوە سـەخت و دژوار بـوو، بـە چـۆکدا هـاتن، فـەرموویان: چـەند کـارو کردەوەیـەکمان پێسپێردرا کە توانای بەرگـە گرتنیمـان هـەبوو، بۆیـە گوێڕایـەڵ بـووین، بـەڵام توانای بەرگە گرتنی ئەمەمان نابێت، ئەوەی لەم ئایەتەدا هاتووە بەرگەی ناگرین، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووین: ((ئایا دەتانـەوێ ئـەو قسـانە بکـەن کـە نـەوەکانی ئیسرائیل کردیان و، گوتیان: بیستمان و سەرپێچیمان کـرد، ئێـوە بڵـێن: بیسـتمان و گوێڕایـەڵ بووین، ئیتر گوتیان: بیستمان و گوێڕایەڵ بووین))، بۆیـە خـوای گـەورە ئـەو ئایەتـەی دابەزاند: ﴿آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا﴾ [البقرة: ٢٨٦] پاشـان خـوای گـەورە ئـەم ئایەتەی (نَسْخ) کرد بەم ئایەتـەی تـر ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾ [البقرة: ٢٨٦]، کـەوا بـوو ئـەو ئایەتـە (نَسْخ)ی ئایەتەکـەی پـێش خـۆی دەکـات، پـاش ئـەوەی کـە ئامادەیی خۆیان بۆ قبوڵ کردنـی ئایەتەکە پێشانداو، ئیمانیـان پێهێنـا، هـەر چـەند قورسی و نارەحەتیشی تێدا بوو، بۆیـە خـوای گـەورە لێیـانی بـوری و ئایەتەکەشی (نَسْخ) کردو، فەرمووی: ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾[البقرة: ٢٨٦].

في قوله: ﴿أَوْ أَخْطَأْنَا﴾[البقرة: ٢٨٦]، قال الله: قد فعلت: ﴿رَبَّنَا وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا﴾[1] [البقرة: ٢٨٦]،

---

(١)_ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿رَبَّنَا وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا﴾ وشەی (إصْرٌ) واتای قورسی و ناڕەحەتی دەگەیەنێت، پەروەردگارا باری قورسمان لەسەر دامەنێ وەکو ئەوەی کە لەسەر ئوممەتانی پێش ئێمەت داناوە، چونکە پێشتر خوای گەورە بەنی ئیسرائیلی سزا داو تووشی قورسی و ناڕەحەتی کرد بوون، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَبِظُلْمٍ مِّنَ الَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَاتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ﴾ [النساء: ١٦٠.] واتە: بە هۆی ستەم کردنەوە لە لایەن جوولەکانەوە حەراممان کرد لێیان چەند خۆراکێکی پاك و خاوێن کە حەڵاڵ کرا بوو بۆیان. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَعَلَى الَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٍ وَمِنَ الْبَقَرِ وَالْغَنَمِ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ شُحُومَهُمَا إِلاَّ مَا حَمَلَتْ ظُهُورُهُمَا أَوِ الْحَوَايَا أَوْ مَا اخْتَلَطَ بِعَظْمٍ ذَلِكَ جَزَيْنَاهُم بِبَغْيِهِمْ وِإِنَّا لَصَادِقُونَ﴾﴿الأنعام: ١٤٦﴾ واتە: تەنها لەسەر ئەوانەی بوونە جوولەکە حەراممان کرد هەموو چڕنووك دارێك (باڵدار یان ئاژەڵ) و لە (گۆشتی) ڕەشە وڵاخ و مەڕو بزنیش پێوەکانیانمان لێ حەرام کردن مەگەر ئەوەی کە بەسەر پشتیانەوە بێت یا ئەوەی بەڕیخۆڵەکانیانەوە بێت یا تێکەڵ بوو بێ و لکابێ بە ئێسکەوە بەهۆی سەرکەشیانەوە ئەو تۆڵەو سزایمان دان و بێ گومان ئێمە ڕاستگۆین. تەماشاکەن کاتێ کە جوولەکەکان دڵڕەقیان نواند خوای گەورە شتانێکی لەسەر شان دانان کە توانای بارگە گرتنیان نەبوو، بەو شێوە سزای دان. بەڵام ئەم ئوممەتە کاتێ کە گوتیان: (بیستمان و گوێڕایەڵ بووین) خوای گەورە باری سەر شانی سووك کردن.

قَالَ: قَدْ فَعَلْتُ: ﴿رَبَّنَا وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنتَ مَوْلاَنَا فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾[البقرة: ٢٨٦]، قَالَ: قَدْ فَعَلْتُ[1]. واته: له ئیبن وعەبباسەوە ﷺ دەڵێت: کاتێك ئەو ئایەتە دابەزی ﴿وَإِن تُبْدُواْ مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللهُ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَاء وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاء وَاللهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ [البقرة:٢٨٤] واتە: ئەگەر ئاشکرای بکەن ئەوەی لە دڵتاندایە یا بیشارنەوە خوا مەحاسەبەتان دەکات لە سەری ئەوسا خۆش دەبێت لەو کەسەی کە بیەوێت و سزای کەسێك دەدات کە بیەوێ و خوا بە توانایە بەسەر هەموو شتێکدا، ئیبن وعەبباس فەرمووی: لەو بارەوە شتێك چوو بە دڵیانەوە کە هەرگیز پێشتر شتی لەوە بەهێزتر نەچوو بووە نێوی، ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: ((بڵێن بیستمان و گوێڕایەڵ بووین و تەسلیم بووین))، دەڵێت: ئیتر خوای گەورە ئیمانی خستە دڵیانەوە، بۆیە خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند:﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾[البقرة: ٢٨٦] تا ﴿أَوْ أَخْطَأْنَا﴾[البقرة: ٢٨٦]، خوای گەورە فەرمووی: (قَدْ فَعَلْتُ) واتە بە دڵنیایی جێبەجێم کرد: ﴿رَبَّنَا وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا﴾[البقرة: ٢٨٦] خوای گەورە فەرمووی: (قَدْ فَعَلْتُ) واتە: بە دڵنیایی جێبەجێم کرد: ﴿رَبَّنَا وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنتَ مَوْلاَنَا فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾ [البقرة: ٢٨٦] خوای گەورە فەرمووی: (قَدْ فَعَلْتُ) واتە: بە دڵنیایی جێبەجێم کرد .

---

(١)_ صحيح: أخرجه مسلم (١٢٦)، من حديث ابن عباس ﷺ بلفظ قريب جداً من هذا الذي ساقه شيخ الإسلام، ونحوه عند مسلم أيضا (١٢٥)، من حديث أبي هريرة ﷺ.

هەروەها خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُم بِهِ وَلَكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾[1] [الأحزاب: ٥] واتە: **هیچ گوناهێکتان لەسەر نییە لەو (بانگ کردنەدا) کە بە نەزانین گوتبێتتان (پێش هاتنی ئەو ئایەتە) بەلام گوناهبار دەبن) ئەگەر بە دڵ و بە دەست ئەنقەست بیکەن و خوا لێبوردەی میهرەبانە.**

وقد ثبت في ((الصحيحين)) عن النبي ﷺ من حديث أبي هُريرة وعمرو بن العاص مرفوعاً أنه قال: ((ذَا إجتهدَ الْحَاكِمُ فَأَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ وَإِذَا اجْتَهَدَ فَأَخْطأَ فَلَهُ أَجْرٌ))[2] واتە: **لە ئەبی هورەیرەوە و عەمری کوڕی عاصەوە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕنەوە فەرموویەتی: ((ئەگەر دادوەر ئیجتیهادی کردو پێکای دوو پاداشتی هەیەو ئەگەر ئیجتیهادی کردو هەڵەی کرد تەنها پاداشتێکی هەیە)).**

---

(١)_ ﴿وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُم بِهِ﴾ **هیچ گوناهێکتان لەسەر نییە لەو بانگ کردنەدا کە بە نەزانین گوتبێتتان پێش هاتنی ئەم ئایەتە،** ﴿وَلَكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ﴾ **بەلام گوناهبار دەبن ئەگەر بە دڵ و بە قەستی بیکەن، ئا ئەمە تاوانی تێدایە، چونکە ئەوەی دڵ بە قەستی بیکات تاوانە، بەلام ئەوەی کە بە هەڵەو لە بیر چوون کرا بێت خوای گەورە ئەم ئوممەتەی لەسەر سزا نادات، رەحم و بەزەییان پێدەکات، لەسەریان سووک دەکاتەوە، چونکە تەسلیم بوون و ئیمانیان هێناو هیچ بەرهەڵستیەکیان نەکرد، بە هاوشێوەی ئەو بەرهەڵستیەی کە بەنو ئیسرائیل نواندیان، بەڵکو ئەم ئوممەتە گوتیان: ((بیستمان و گوێڕایەڵ بووین)).**

(٢)_ **ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە دادوەر هەڵە دەکات، ئەو کەسەی ئیجتهادیش دەکات هەڵە دەکات، بەلام بە قەستی هەڵەیان نەکردووە، بۆیە خوای گەورە لێی بووردوون و، لەسەر ئیجتیهادەکەشیان پاداشتی کردوون، ئەمە بەشێکە لەبەزەیی و نەرمی خوای گەورە، مەبەست بەو کەسەی ئیجتیهاد دەکات زانایەکە کە بە پلەی**

---

---

---

ئیجتیهاد گەیشتبێت، تەماشاکەن ئەگەرچی بە پلەی ئیجتیهادیش بگات ڕەنگە هەڵە بکات، بەڵام خوای گەورە لێی دەبورێ و لەسەر ئیجتیهادەکەشی پاداشتی بۆ دەنوسێت. کەسانێك دەڵێن: ئیجتیهاد کردن مافی هەموو کەسێکە، کەسی ئاسایی و نەفامیش توانای ئیجتیهاد کردنی هەیە، هەموو کەسێك ئیجتیهاد دەکات، دڵنیا بن ئەو جۆرە قسانە گومڕاییە _ پەنا بە خوا _، دڵنیا بن کەسانێك دەڵێن: ئیجتیهاد کردن مافی هەموو موسڵمانێکە، کەسانی ئاسایی و نەفامیش مافی ئیجتیهاد کردنیان هەیە، بەڵام دڵنیا بن قسەکانیان گومڕاییەکی پەتییە _ پەنا بە خوا _، لە ڕاستیدا ئیجتیهاد کردن تەنها مافی زانایانی شایستەی خۆ بۆ ئامادەکردووە وەکو چوار پێشواکەی خاوەن مەزهەبەکان و هاوشێوەکانیان، ئەوانەی کە مەرجەکانی ئیجتیهادیان تێدا بەدی هاتووە، ئەمە بەرزترین پلەکانی ئیجتیهادە. ئیجتیهادێکی دیکەش هەیە کە پلەکەی لەیەکەم کەمترەو بریتیە لە تەرجیح و پەسەند کردن لە نێوان گوفتاری زانایاندا، واتە: گوفتاری ئەو زانایانەی کە بەڵگەکان پاڵپشتی دەکەن، وەردەگرێت، ئەمە بە (المذهبي) ناودەبەن کە بریتیە لە ئیجتیهاد کردن بەتەرجیح و پەسەندکردن، جۆری یەکەم بە(الأجتهاد المطلق) ناو دەبەن، جۆری یەکەم جگە لەو کەڵە زانایانەی کە مەرجەکانی ئیجتیهادیان تێدایە هیچ کەسێکی دیکە توانای بەسەریدا نابێت، بەڵام ئیجتیهادی جوزئی یا ئیجتیهادی تەرجیحی ئەمە ئەو کەسانەی کە زانستی شەرعی دەخوێنن و، گوفتاری زانایان و بەڵگەکانیان دەزانن دەتوانن ئەنجامی بدەن، ئەو کەسانە نابێت وەکو جۆری یەکەم ئیجتیهاد بکەن، نەخێر، بەڵکو تەنها تەماشای گوفتاری زانایان دەکەن و، ئەوەی کە بەڵگەکان پاڵپشتی دەکەن وەردەگرێت، شاهێد لە فەرموودەکە ئەوەیە کە فەرموویەتی: ((وَإِذَا اجْتَهَدَ فَأَخْطَأَ)) ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە کەڵە زانایانیش ڕەنگە هەڵە بکەن، هیچ کەسێك مەعصوم و پارێزراو نییە.

کەوا بوو خوای گەورە موجتەهیدی هەڵەکاری تاوانبار نەکردوە، بەڵکو بۆ ئیجتیهادەکەی پاداشتی داناوە، لە هەڵەکەشی خۆش بووە، بەلام ئەو موجتەهیدەی کە دەیپێکێت دوو پاداشتی هەیە، بۆیە ئەم لەئەو چاکترە.

کەوا بوو لەبەر ئەوەی وەلی و دۆستی خوای گەورە شیاوە هەڵە بکات، بۆیە لەسەر خەڵکی واجیب نییە باوەڕ بە هەموو ئەوانە بکەن کە وەلی و دۆستی خوا دەیلێت[1]،

---

(١)_ ئەمەیە دەرەنجامی ئەو لێکۆڵینەوەیە کە لەسەرەتای ئەو بەشەوە تا ئێرە باس کراوە، ئەمەیە ئەنجامەکە، ئەگەر وەلی جار بە جار هەڵە بکات و مەعصوم و پارێزراو نەبێت، واجیب نییە ئێمە هەموو ئەو شتانە قبوڵ بکەین کە دەیلێت، نابێت باوەڕمان بە مەعصومیەت و پارێزراوێتیشی هەبێت، بەڵکو ئەگەر بەڵگەکانی قورئان و سوننەت پاڵپشتی گوفتارەکانی بکەن ئەوا وەری دەگرین و، ئەگەر پێچەوانەی قورئان و سوونەتیش بوون ئەوا ڕەتکراوەتەوە، بەلام ئەمە لەڕێزی کەم ناکاتەوە، چونکە ئەو پاداشتی دراوەتەوە، وەکو ئەوەی لە فەرموودەکەدا هاتووە ((وَإِذَا اجْتَهَدَ فَأَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ)) ئەو پاداشت دراوەتەوە، بۆیە لەڕێزی کەم نابێتەوە، چونکە توانای خۆی خستۆتە کارو، بە قەستی هەڵەی نەکردووە، کەوا بوو پێویستە لە ڕێزی ئەهلی زانست کەم نەکەینەوەو، بە دوای کەم و کورتیەکانیاندا نەگەڕێین و لە مەجلیسەکاندا قسەیان پێ نەڵێین و، ناو و شۆرەتیان نەزڕێنین نەخێر، ئەمە ئەگەر زانا بن. بەلام ئەگەر ئەهلی ئیجتیهاد نەبن لە بنەڕەتەوە جایز نییە بە هیچ جۆرێك نزیکی ئیجتیهاد ببنەوە، چونکە لە هەر حاڵ و بارێکدا ئەو هەڵەیە، تا ئەو ئاستەی ئەگەر پێکابێتیشی هەر بە هەڵەدا چووە، چونکە مەرجەکانی ئیجتیهادی تێدانییە، لە بارەوە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَن قالَ الْقُرْآنَ بِرَأْيِهِ وبِما لا يعلمْ فَلْيَتَبَوَّأ مقْعَدَهُ مِنَ النّار وأخطأ ولو أصابَ)) واتە: فەرموویەتی: ((هەر کەسێك بە گوێرەی هەواو ئارەزوواتی خۆی و بەبێ ئەوەی زانستی هەبێت قورئان تەفسیر بکات ولێکی بداتەوە، با جێگەیەك لە

ئاگردا بۆ خۆی دیاری بکات، وە هەڵەی کردووە ئەگەر چی پێکابێتی))، چونکە پێکانەکەی دەرەنجامی زانین و لێهاتوویی نەبووە بەڵکو تەنها ڕێککەوت بووە، هەڵەی چونکە لە قورئاندا ئیجتیهادی کردووە بەبێ زانستی تەواو.

مەگەر پێغەمبەر بێت[١]، بەڵکو جایز نییە دۆستی خوا پشت بەو شتانە ببەستێت کە بە دڵی دادێت[٢] مەگەر موافیق و سازیاری شەرع بن وە نابێت پشت بەوە ببەستێت کە بە دڵیدا دێن و، بە بۆچوونی خۆی ئیلهام و نیگاو ڕاسپاردەیەکە لە خوای هەقەوە، بەڵکو پێویستە هەموو ئەوەی کە بەدڵیدا دێن بگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی کە موحەممەد ﷺ هێناویەتی، ئەگەر موافیق و سازیاری بوو با قبوڵی بکات و، ئەگەر موخالیفیشی بوو با قبوڵی نەکات، ئەگەر نەشیزانی ئایا موافیق و سازیارێتی یان موخالیف و پێچەوانەیەتی با تیایدا بوەستێت[٣].

---

(١)_ چونکە پێغەمبەران لە هەڵەو تاوانکردن پارێزراون و مەعصومن.

(٢)_ نابێ خەڵك هەموو ئەوەی کە وەلی دەیڵێت بەبێ چەن و چوون وەریگرن، مەگەر لەوە دڵنیابێت کە بەڵگەکان پاڵپشتی دەکەن. هەتا خودی خۆشی نابێت پشت بەو ئەندێشەو خەیاڵ و شتانە ببەستێت کە بە بیری دا دێن، مەگەر لەوە دڵنیابێت کە بەڵگەکانی قورئان پاڵپشتی بکەن، با نەڵێت: ئەمە کەرامەتە ئەمە موکاشەفەیە وەکو ئەوەی کەسانێکی گومڕا دەیڵێن، بەڵکو هەموو ئەو شتانەی کە بە دڵیدا دێن با بۆ بەڵگەکانی قورئان و سوونەتی بگەڕێنێتەوە، با یەکسەر وەری نەگرێت، چونکە ڕەنگە لە لایەن شەیتانەوە بێت، عومەر رضي الله عنه ئەو پیاوە هیچ شتێکی وەرنەدەگرت تا لەوە دڵنیا دەبوو کە قورئان و سوونەت پاڵپشتی دەکەن.

(٣)_ موافیق و سازیاری شەرع بن بەوەی کە بیگەڕێنیتەوە بۆ بەڵگەکانی قورئان و سوونەت، بە نموونە ئەگەر لە حوکمێکی شەرعی دا بیرۆکەیەکی بۆ دروست بوو، تەماشات کرد واجیبە یان موستەحەبە یان حەرامە یان مەکروهە بیگەڕێنەوە بۆ قورئان و سوونەت. ئەو بیرۆکەو ئەندێشەو شتانەی کە بیریدا دێن با بۆ قورئان و سوونەتی بگەڕێنێتەوە، ئیتر ئەگەر سازیاری بوون ئەوا هەقەو ئەگەر پێچەوانەشی بوو با وازی لێ بێنێت، لە کاتێکدا ئەگەر یەکێك لەو دوانەشی بۆ ڕوون نەبویەوە با بوەستێت.

## هەڵوێستی خەڵك بەرامبەر بەوەلایەت و دۆستایەتی

لەم دەروازەیەدا جەماوەری خەڵك سێ جۆرن[1]: دوو لاو ناوەڕاستێك.

لەوانە: کەسانێك هەن ئەگەر باوەڕیان وابوو کە کەسێك دۆستی خوای گەورەیە ئیتر موافیق و سازیاری دەبن لە هەموو ئەو شتانەدا کە وا دەزانێت دۆستەکە ئەو کەسەی دۆستی خوایە هەر شتێك بە دڵێ دابێ ئەوە لە پەروەردگارەوەیە[2]، ئیتر هەموو کاروکردەوەکان بۆ خودی خۆی دەگەڕێنێتەوە[3].

---

(١)_ هەڵوێستی جەماوەری خەڵك بەرامبەر بە وەلّی و دۆستانی خوای گەورە سێ جۆرە: لەوانە کەسانێك لەو باوەڕەدان کە دۆستانی خوا لە هەڵەو تاوان پارێزراون و هەموو ئەوەی کە دەیڵێن ڕاستن، دڵنیا بن ئەمە ڕۆچوون و زێدەڕۆییەو پێچەوانەی قورئان و سوونەتیشە، جۆرێکی دیکەی خەڵکیش گوێیان پێ نادەن و بە هیچیان دانانێن ئەمەش دیسان پێچەوانەی قورئان و سوونەتە، جۆرێکی تری خەڵك میان ڕەون و دەڵێن: ئەگەر گوفتاری وەلی و دۆستانی خوای گەورە سازیاری قورئان و سوونەت بن هەقەو، ئەگەر پێچەوانەی قورئان و سوونەتیش بوون هەڵەیە، ناڵێن: باتڵ و پووچە، چونکە لە نێوان هەڵەو باتڵدا جیاوازی هەیە، باتڵ ئەو قسانەیە کە کەسەکە بە قەستی دەیکات، بەڵام هەڵە ئەو کارو گوفتارەیە کە بە قەستی نایکات بۆیە بە هەڵە ناودەبرێت.

(٢)_ ئەمە قسەی صۆفیەکانە کە دەربارەی شێخەکانیان دەیکەن، دەڵێن: ئەوان ئەولیاو دۆستانن، قوتبن و ... هتد.

(٣)_ چونکە دەڵێن: دۆستانی خوا ڕاستەوخۆ شت لە خواوە وەردەگرن، پێویستیان بە قورئان و سوونەت نییە، بەڵام دڵنیا بن ئەو جۆرە قسانە ڕۆچوون و زێدەڕۆیە _ پەنا بە خوا _، بەگوێرەی ئەم قسانە بێت ئەوان لە پێغەمبەران پلە بەرزترن، بۆیە وا دەزانن کە دۆستان لە پێغەمبەران پلە بەرزترن.

لەوانە: کەسانێکی دیکەش هەن ئەگەر وەلی و دۆستانی بینی قسەیەکی کرد یان کردەوەیەکی پێچەوانەی شەرعی ئەنجام دا ئەوا بە تەواوی لە وەلایەت و دۆستایەتی خوای گەورە دەیکاتە دەرەوە[1]، ئەگەرچی کەسێکی موجتەهیدی هەڵەکاریش بووبێت[2].

---

(١)_ ئەمە تەرەفی دووەمە، وا تێگەیشتوون کە تەنها بە هەڵە کردنی زانا لە چوار چێوەی شەرع بە تەواوی دەچێتە دەرەوەو، ئیتر دۆستی خوا نینە، لە ڕاستیدا ئەمە زێدەڕۆییە لە بە هەڵە دانانی دۆستانی خوادا، چونکە ئەو کەسە وەلی و دۆستی خوای گەورەیە ئەگەر چی هەڵەش بکات و، لە هەڵەکەشی بوردراوە لە لایەن خواوە، وەکو ئەوەی لە فەرمودەکەدا هاتووە: ﴿رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا﴾[البقرة: ٢٨٦] خوای گەورە دەفەرموێت: (قَدْ فَعَلْتُ) واتە: بە دڵنیایی جێبەجێم کرد. دۆستی خوای گەورە تەنها بە هەڵە کردن لە چوار چێوەی وەلایەت و دۆستایەتی ناچێتە دەرەوە، کە ئیجتیهادی کردو هەڵەی کرد لە دۆستایەتی خوای گەورە ناچێتە دەرەوە، دۆستی خوای گەورەشەو هەڵە دەکات.

(٢)_ ئەگەر گوفتارو کردارەکانی بە قەستی نەکرد بێت، بەڵکو ئیجتیهادی کرد بێت وای زانیبێت پێکاویەتی بەڵام هەڵەی کرد بێت، لە هەڵەکەی بوردراوەو لەسەر ئیجتیهادەکەشی پاداشت دەدرێتەوە، لە وەلایەت و دۆستایەتی خوای گەورەش ناچێتە دەرەوە، چونکە دۆستانی خوا لە بواری ئیجتیهادیشدا هەڵە دەکەن، بەڵام ئەگەر بە قەستی سەرپێچی شەرعی خوا بکات، حەڕام کراوەکان حەڵاڵ بکات، ئەوا لە وەلایەت و دۆستایەتی خوای گەورە دەچێتە دەرەوە، بۆ نموونە بە قەستی خراپەو کردەوەی ناشیرین ئەنجام بدات و بانگەشەی دۆستایەتی خوای گەورەش بکات و بانگەشەی ئەوە بکات کە ئەو کردەوانە زیانی پێناگەیەنن، ئەوا با دڵنیابێت کە لە دۆستایەتی خوا دەچێتە دەرەوەو، دەبێ بە دۆستی شەیتان.

چاکترین و باشترین بۆچوونیش لەم بابەتە دا مام نێوەندییە، کە هیچ کەسێك بە مەعصوم و پارێزراو یان بە تاوانبار دانەنرێت، لە کاتێکدا ئەگەر کەسەکە موجتەهیدێك بێت و هەڵەی کرد بێ، ئیتر نابێت لە هەموو ئەوانەدا کە دەیڵێت شوێنی بکەوێت، هەروەها دەبێ بڕیاری کوفرو لە ڕێی ڕاست لادانیشی بەسەردا نەدات ئەگەر ئیجتیهادی کرد بێت[1].

بە ڕاستی واجیبی سەرەکی لەسەر تێکڕای جەماوەری خەڵك ئەوەیە کە شوێنی ئەوە بکەون کە خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەیدا ناردویەتی[2]

---

(١)_ ئەگەر ئیجتیهادی کرد بێت، بەڵام ئەگەر بە قەستی ئەنجامی دابێت بڕیاری کوفرو لە ڕێ لادانی بەسەردا دەدرێت، چونکە ئەمە لە ڕووی ئیجتیهادەوە نەکراوە، بەڵکو ئەوە سەرکەشی و یاخیبوونە، کەوابوو بە باشی لەمە وردبنەوە.

(٢)_ لە سەر تێکڕای جەماوەری خەڵك ئەولیاو غەیری ئەولیاش واجیبە شوێنی ئەوە بکەون کە خوای گەورە بۆی دابەزاندوین، هیچ کەسێك توانای ئەوەی نییە لە چوارچێوەی ئەوەی کە خوای گەورە بۆی دابەزاندوین بچێتە دەرەوە، هەموان بەندەی خوان و واجیبە شوێنی ئەوە بکەون کە خوای گەورە بۆی دابەزاندووین، یا هیچ کەسێکیش بانگەشەی ئەوە نەکات کە دەتوانێت لە چوارچێوەی شەرع بچێتە دەرەوەو، شوێنی ئەوە نەکەوێت کە خوای گەورە بۆی دابەزواندوین، یا وا نەزانێت کە بوە بە ولی و دۆست و ئیتر هیچی تێدا نییەو هەر شتێك بکات دەیکات و هەر شتێك بڵێت دەیڵێت، چونکە بوە بە دۆست، ئەمە دۆستی شەیتانەو دۆستی ڕەحمان نییە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾ [النساء: ٦٥] واتە: نەخێر خۆیان بەباوەڕدار نیشان دەدەن) بڕوا دارنین تا تۆ نەکەنە دادوەر لە هەر ئاژاوە و دووبەرەکی یەکی نێوانیان دا لە پاشان لە دەرونیان دا هەست بە هیچ بێزاری یەك نەکەن لەو بڕیارەی تۆ داوتە و مل کەچ بن بە ملکەچی یەکی تەواو، لێرەدا خوای گەورە سوێند دەخوات کە هیچ کەسێك ئیمانی نییە تا پێغەمبەری خوا ﷺ نەکاتە دادوەر بۆ هەموو ئەو ئاژاوەو دووبەرەکیانەی کە لە نێوانیاندا ڕوو دەدەن.

ئەگەر کەسێك موخالەفەی گوفتاری هەندێ لە زانایان بکات و گوفتاری هەندێکی ترداو قبوڵ بێت، ئەوا بۆ هیچ کەسێك نییە تۆمەتی ئەوەی بداتە پاڵ کە موخالەفەی گوفتاری هەندێ لە زانایانی کردوەو[1]، بڵێت: ئەمە موخالەفەی شەرعی کردووە[2].

---

(١)_ تەماشاکەن، ئەگەر خیلاف و جیاوازی لە نێوان زانایاندا هاوسەنگ بوو، بەڵگەی ڕاست بەلای هیچ کامیانەوە دەر نەکەوت، بەڵکو هەر یەکێکیان بانگەشەی ئەوە بکات کە بەڵگە ڕاستەکە بەلای ئەوەوەیەو پێکاویەتی، لێرەدا هیچ نکۆڵیەك لەو کەسانە ناکرێت کە ئەگەر شوێنی یەکێك لە مەسەلە ئیجتیهادیەکان کەوتن، بەڵام ئەگەر بەڵگەی ڕاست بە لای یەکێك لە زانایانەوە دەرکەوت، ئەوا پێویستە شوێنی ئەو بەڵگە ڕاستە بکەوین کە بە لای ئەوەوە دەرکەوتووە. پێویست بە یەکێك لەو شتەی سەرەوە دەکات، یەکەم: ئەوەیە کە بەڵگەی ڕاست بە لای هیچ کامیانەوە دەرنەکەوێت و هەر کەسێکیان بانگەشەی ئەوە بکات کە ڕاست بەلای ئەوەوەیەو خۆی پێکاویەتی، ئەو کاتە هیچ نکۆڵیەك لەو کەسانە ناکرێت کە ئەگەر شوێنی یەکێك لە مەسەلە ئیجتیهادیەکان کەوتن، چونکە لێرەدا ناتوانرێت گوفتاری یەکێك لە زانایان بەسەر ئەوی تردا فەرز بکرێت، چونکە هەموویان یەکسانن، دووەم: ئەوەیە کە بەڵگەی ڕاست بەلای یەکێکیانەوە بێت، لێرەدا پێویستە گوفتاری ئەو زانایە وەرگرین کە بەڵگە ڕاستەکەی پێیە، ئەگەرچی لە گەڵ هەواو ئارەزوواتی ئێمەدا بگونجێت یان نەگونجێت.

بۆ هیچ کەسێکیش نییە نکۆڵیی لە مرۆڤێك بکات کە گوفتاری زانایەکی موخالیفی وەرگرتووە، لە حاڵەتێکدا ئەگەر بەڵگەی ڕاست بە لای هیچ زانایەکەوە دەرنەکەوت.

(٢)_ چونکە موخالەفەی شەرعی نەکردووە، بەڵکو تەنها موخالەفەی گوفتاری زانایەکی کردوەو، گوفتاری زانایەکی تری وەرگرتووە، کە لە گەڵ ئەودا یەکسان بووە، چونکە هەردوو زاناکە بەڵگەی ڕاستیان بەلاوە دەرنەکەوتوەو، هەر یەکێکیشیان بانگەشە بۆ ڕاستێتی خۆی و پێکاوێتی خۆی کردووە، بۆیە لێرەدا هیچی تێدا نییە ئەگەر گوفتاری یەکێك لەو زانایانە وەرگرێت و، هیچ نکۆڵیەکی لێ ناکرێت.

وقد ثبت في ((الصحيحين)) عن النبي ﷺ أنه قال: (( قَدْ كَانَ فِي الأُمَمِ قَبْلَكُمْ مُحَدَّثُونَ، فَإِنْ يَكُنْ فِي أُمَّتِي أَحَدٌ فَعُمَرُ مِنْهُمْ))[1] صحيح: أخرجه البخاري (٣٦٨٩)، من حديث أبي هريرة رضي الله عنه مرفوعاً، ومسلم (٢٣٩٨) من حديث عائشة مرفوعاً. **واته: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((لە ئوممەتانی پێش ئێوەدا کەسانێك هەبوون خاوەنی ئیلهام بوون، ئەگەر لە ئوممەتەکەی مندا کەسانێك هەبن ئەوا عومەر لەوانە)).**

---

**(١)_ ئەوە عومەری کوڕی خەتتابە رضي الله عنه مولهەم بووە _ مولهەم: ئەوەیە کە خوای گەورە شتێك دەهاوێتە نێو دڵی بەندەکەیەوەو وای لێدەکات شتێك ئەنجام بدات یان وازی لێ بێنێت، ئەوەش پلە و پایەیەکە خوای گەورە بەهەندێ لە بەندەکانی خۆیەوە تایبەتی دەکات_ بە شایەتی دانی پێغەمبەری خوا ﷺ، چەندین شتی فەرمووە کە قورئانی پیرۆزی لەسەر دابەزیوە، لە زانست و لێهاتوویی و باشێتیدا بەم پلەیە گەیشتووە، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا جار بە جار عومەر رضي الله عنه هەڵە دەکات، دواتریش شیخ الإسلام _ ڕەحمەتی خوای لێ بێ _ چەند نموونەیەکمان لەو هەڵانە بۆ دەهێنێتەوە، کە خودی خۆشی دانی پێداناوە، کەوا بوو لە هەڵەو تاوان پارێزراو نەبووە لە کاتێکدا کە لە گەورە دۆستانی خوای گەورەیەو، پێغەمبەری خواش ﷺ شایەتی بۆ داوە کە فریشتەکان قسەیان لەگەڵدا کردووە، پارێزراو نەبووە ئیتر دەبێ باروحاڵی کەسانی غەیری ئەو چۆن بێت.**

وروى الترمذي وغيره عن النبي ﷺ أنه قال: (( لو لم أبعث فيكم لبعث فيكم عمر ))[1]

موضوع: قاله العجلوني في ((كشف الخفاء)) (٢١٢٠). وقال الشوكاني في ((الفوائد المجموعة)) (ص٣٣٦): رواه ابن عدي عن بلال رضي الله عنه وفي إسناده وضاع.

قلت: أخرجه ابن عدي في ((الكامل)) (ص١٠٧١)، ترجمة زكريا بن يحيى أبو يحيى الوقار المصري، وزكريا قد أتهم بوضع الحديث.

قلت: ولمزيد بحث، انظر تعليق المعلمي ـ رحمه الله ـ على ((الفوائد المجموعة)).

**واته: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر منتان بۆ نەنێردرایە بە دڵنیایی عومەرتان بۆ دەنێردرا)).**

---

**(١)_ بەڵێ، ئەو فەرموودە لەپێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، بەڵام چەند شتێکیان لەبارەیەوە گوتووە، لێرەشدا کە شیخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوای لێ بێ _ باسی دەکات، پشتی بەقسەی ئەو کەسانە بەستووە کە فەرموودەکە بەهێز دەکەن، چەند فەرموودەیەکی دیکەش شاهێدی بۆ دەدەن کە عومەر رضي الله عنه کەسێکی خاوەن ئیلهام بووە.**

وفي حديث آخر: ((إِنَّ اللَّهَ ضَرَبَ الْحَقَّ عَلَى لِسَانِ عُمَرَ وَقَلْبِهِ))[١] **واته: ((به ڕاستی خوای گەورە هەقی خستۆتە سەر زمان و دڵی عومەرەوە)).**

وفيه: ((لَوْ كَانَ بَعْدِي نَبِيٌّ لَكَانَ عُمَرَ))[٢] **واته: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر پێغەمبەرێکی تر لە دوای من بوایە بە دڵنیایی عومەر دەبوو)).**

---

(١)_ صحيح بمجموع طرقه: أخرجه الترمذي (٣٦٨٢)، وأحمد (٩٥/٢) من طريق خارجة بن عبدالله (بن سليمان بن زيد بن ثابت)، عن نافع، عن ابن عمرو مرفوعاً.

وخارجة ضعفه أحمد والدارقطني، وقال ابن معين: ليس به بأس، وقال ابن عدي: عندي لا بأس به.

قلت: لكنه قد توبع تابعه نافع بن أبي نعيم (وهو ابن عبدالرحمن بن أبي نعيم)، كما عند أحمد (٥٣/٢).

قلت: وقد ورد الحديث من طريق أخرى من حديث أبي ذر رضي الله عنه مرفوعاً عند أبي داود (٢٩٦٢)، وأحمد (١٦٥/٢و ١٧٧)، وابن ماجة في الفتن (١١)، وابن أبي شيبة (٢١/١٢)، وأخرجه أبونعيم في ((الحلية)) (٤٢/١)، من حديث أبي هُريرة رضي الله عنه مرفوعاً، وابن أبي شيبة (٢٥/١٢).

**شایەتیدانێکە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆ عومەر رضي الله عنه لەگەڵ ئەوەشدا هەڵە دەکات، کەوا بوو دەبێ کەسانی دیکە چۆن بن کە بانگەشەی پارێزراویان بۆ دەکرێ.**

(٢)_ في إسناده مقال: أخرجه الترمذي (٣٦٨٦)، من طريق مشرح بن هاعان، عن عقبة بن عامر رضي الله عنه مرفوعاً، وهو عند أحمد أيضاً (١٥٤/٤)، وفي مشرح بعض الكلام.

وعن علي بن أبي طالب رضي الله عنه يقول: ما كنا نبعد أن السكينة تنطق على لسان عمر[1] من رواية الشعبي، واتە: عەلی کوڕی ئەبی تالب رضي الله عنه دەیفەرموو: بە دوورمان نەدەزانی کە هێمنی و شکۆداری لە سەر زمانی عومەر قسە بکات.

وقال ابن عمر: ما كان عمر يقول في شيء: إني لأراه كذا، إلا كان كما يقول[2] واتە کوڕی عومەر دەیفەرموو: عومەر لە هیچ شتێکدا نەیدەگووت: وا بزانم ئاوەهایە، بە ئیلا بەو جۆرە دەبوو کە ئەو دەیفەرموو.

وعن قيس[2] ابن طارق قال: كُنَّا نَتَحَدَّثُ أَنَّ عُمَرَ يَنْطِقُ عَلَى لِسَانِهِ مَلَكٌ، واتە: قەیسی کوڕی تاریق دەیفەرموو: لە نێو خۆماندا دەمانگووت کە فریشتەیەک لەسەر زمانی عومەر قسە دەکات.

---

(١)_ أخرجه ابن أبي شيبة في المصنف (٢٣/١٢)، من طريق الشعبي عن علي رضي الله عنه.

وأخرجه أبونعيم في ((الحلية)) (٤٢/١)، من طريق الشعبي، عن أبي جحيفة، عن علي رضي الله عنه، ومن طريق عمرو بن ميمون، عن علي رضي الله عنه، وأخرجه عبدالرزاق من طريق زر بن حبيش، عن علي (٢٢٢/١١)، ولمزيد أنظر التعليق على مصنف عبدالرزاق.

(٢)_ أخرجه البخاري (٣٨٦٦).

(٣)_ صوابه عن قيس عن طارق، وقيس هو ابن مسلم وطارق هو ابن شهاب، والأثر أخرجه ابن أبي شيبة في المصنف (٣٥/١٢)، أخرجه أبونعيم في ((الحلية)) (٤٢/١).

وَكَانَ عُمَرُ يَقُولُ: اقْتَرِبُوا مِنْ أَفْوَاهِ الْمُطِيعِينَ، وَاسْمَعُوا مِنْهُمْ مَا يَقُولُونَ، فَإِنَّهُ تَتَجَلَّى لَهُمْ أُمُورٌ صَادِقَةٌ[1] واتـه عومـەر دەیفـەرموو: لـە زاری گوێڕایـەڵکاران و خواپەرستان نزیك بنەوە، گوێبیستی ئەوە بن کە دەیڵێن: چونکە شتگەلێکی ڕاستیان بۆ ئاشکرا دەبێت.

وە ئەو شتە ڕاستانەش کە پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ پێی ڕاگەیاندوین کە بۆ خواپەرستان و گوێڕایەلکاران ئاشکرا دەبێت، بریتیـە لـەو شتانەی کـە خوای گەورە بۆ ئەو خواپەرستانەی ئاشکرا دەکات، چونکە جێگیر بووە کە دۆستانی خوای گەورە چەندین موخاتەبات و موکاشـەفاتیان بـۆ دەکرێـت، وە چـاکترین کەسانی ئـەم ئوممەتەش کە موخاتـەبات و موکاشـەفاتیان بـۆ دەکرێـت پـاش ئـەبو بـەکر عومـەری کوڕی خەتتابە ﷺ[2]، چونکە چاکترین کەسانی ئەم ئوممەتە پـاش پێغەمبـەری خوا ﷺ ئەبو بەکرە پاشان عومەرە ﷺ[3].

---

(١)_ لم أقف عليه بهذه اللفظ، لكن أخرج أبونعيم في ((الحلية)) (٥١/١)، عن عمر قال: جالسوا التوابين فإنهم أرق أفئدة.

بەڵێ خوای گەورە خواپەرستان گوێڕایەڵ کاران بۆ ڕاستێتی ڕێنمـوونیی دەکات، شـتانێکیان لـێ قبـوڵ دەکـات کـە لەغـەیری ئـەوانی قبـوڵ ناکـات، بـەڵام بانگەشـەی ئەوەیان بۆ ناکرێت کە لە هەڵـەو تـاوان مەعصـووم و پـارێزراو بن، بـەڵام لـە ڕاستیدا ئەوان شایستەترن بە ڕاستێتی.

(٢)_ بەڵێ، ئەو موخاتەبات و موکاشەفات و ئیلهامە لە ڕاستیدا تەنها فریشتەکان دەیانخستە سەر زمانی پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب ﷺ یاخود کەسانی تر بـەهۆی بەهێزی ئیمان و یەقین و زانستەکەیانەوە.

(٣)_ پێشەوا ئەبوبەکر ﷺ ڕاستگۆیە، پێشەوا عومەری کوڕی خەتابیش خـاوەن ئیلهام (مولهم)بـووە، صـیدیقیش لەمولهـەم چـاکترە، صـیدیق ئـەو کەسـەیە کە ئەو ڕاستگۆیەو، درۆی لێناوەشێتەوەو، هیچ شتێکیش لەوانەی کە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ

ئەوە بەدرۆ دانانێت، هیچ گومانێکی خراپیش ناکەوێتە دڵیەوە سەبارەت بەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجامی داوە، جگە لە پێشەوا ئەبوبەکر ؓ هیچ کەسێکی تر بەم شێوە نەگەیشتووە، چیرۆکی حودەیبیەو، کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ و جەنگی هەڵگەڕاوەکان کە زەکاتیان نەدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، ئەمانە چەند هەڵوێستێکی ئەبوبەکرن ؓ کە بۆ هیچ کەسێکی تر ڕووینەداوە، هەمووان لەو هەڵوێستانەدا هەندێ ڕاڕایی و دوو دڵییان بۆ دروست بوو، جگە لە پێشەوا ئەبوبەکر ؓ کە وەکو کێو و شاخەکان جێگیربوو، دەرەنجامیش پاکی و چاکی بوو، ئیتر بۆیان ڕوون بویەوە کە ئەبوبەکر لەسەر ڕاستییە، بۆیە لە پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب ؓ چاکترە.

لە فەرموودەی (صحیح)دا جێگیر بووە کە عومەر بە خاوەن ئیلهامی ئەم ئوممەتە دەست نیشانکراوە، ئیتر هەر کەسێکی مولهەم و موحەددەس لە ئوممەتی موحەممەددا دەست نیشان بکرێت، بێگومان عومەر رضي الله عنه لە و چاکترە[1]، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا عومەر رضي الله عنه ئەوەی جێبەجێدەکرد کە لەسەری واجیب کرا بوو، بۆیە هەموو ئەوەی کە دەکەوتە دڵیەوە بۆ ئەو شەرعەی دەگەڕاندەوە کە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزیبوو[2]، جار بە جار موافیق و سازیاری شەرعەکە دەبوو ئیتر دەبووە یەکێك لە فەزیلەت و چاکەکانی عومەر رضي الله عنه، وەکو ئەوەی چەندین جار قورئان لەسەر گوفتارەکانی دابەزیووە[3]،

---

(١)_ ئەم شتە لەسەر پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه سنووردار نەکراوە، پێدەچێ لە نێو موسڵمانانیشدا کەسانێکی تری لەو جۆرە هەبن بەڵام بێگومان عومەر لەهەر هەموو ئەوانە بەرێزترو چاکترە کە شتانێکی لەو جۆرەیان بۆ هاتۆتە دی. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا عومەر هەڵە دەکات. ئا ئەمەیە مەبەستی سەرەکی شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێ بێ _ کە ئەگەر مرۆڤ لە بەرزترین پلەدا بێت هەرگیز مەعصوم و پارێزراو نابێت.

(٢)_ ئەمە پێشەوا عومەری کوڕی خەتتابە رضي الله عنه خوای گەورە لە زانست و موکاشەفەو شتی تری پێبەخشیوە، لەگەڵ ئەوەشدا پشت بەو ئیلهام و تەحدیس و موکاشەفەو شتانە نابەستێ کە دەکەوێتە دڵیەوە، بەڵکو هەموو ئەوانەی بۆ سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دەگەڕاندەوە.

(٣)_ لە سێ شتدا قورئان لەسەر گوفتارەکانی پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه دابەزیوە، یەکەم: دەربارەی بەدیل گیراوەکانی بەدر، چونکە موسڵمانان حەفتا کەسیان لە ئازاو بە جەرگەکانی قورەیش بە دیل گرت، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاوێژی بە هاوەڵانی خۆی کرد، سەبارەت بەوەی کە چ بکەن؟، کەسانێکیان وایان پێ باش

بوو که فیدیەیان لێ وەرگیرێ و ئازاد بکرێن، لەوانەش پێشەوا ئەبوبەکر ﷺ بوو، بەڵام عومەر ﷺ فەرمووی: نەخێر، پێویستە لە ملیان بدرێت، پێویستە لە ملیان بدرێت، تا کەسانی تر بسلمێنەوەو وازبێنن، بۆیە ئەمە یەکەم غەزای موسڵمانانە، خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الأَرْضِ تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللَّهُ يُرِيدُ الآخِرَةَ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (٦٧) لَّوْلاَ كِتَابٌ مِّنَ اللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَا أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ (٦٨)﴾ [الأنفال: ٦٧_٦٨] واتە: بۆ هیچ پێغەمبەرێك ڕەوا نییە کە دیلی (لە دوژمنان) هەبێ هەتا کوشتاری زۆریان لێ نەکات لە زەویدا ئێوەماڵی دونیاتان دەوێ (بە وەرگرتنی فیدیە) وە خواش (پاداشتی) ڕۆژی دوایی دەوێ (بۆ ئێوە) وە خوا تواناو زاڵی کار دروستە ئەگەر نووسراو (و بڕیارێك) لە لایەن خواوە پێش نەکەوتایە (کە حەڵاڵ بوونی دەستکەوت و غەنیمەتی جەنگە) بێگومان لە بەر ئەو (فیدیە)ی کە وەرتان گرت سزایەکی گەورە تووشتان دەبوو، لەو شوێنەدا قورئان لەسەر گوفتارەکانی ئیمامی عومەر ﷺ دابەزی، سەبارەت بەوەی کە کاری ڕاست و دروست ئەوەیە کە بەدیل گیراوەکان بکوژرێن و فیدیەیان لێ وەرنەگیرێت، ئەمە یەکەم بوو، دووەم: ئیمامی عومەر ﷺ بە پێغەمبەری خوای ﷺ فەرموو: ئەوەبۆ شوێنی ئەو بەردەی کە پێغەمبەر ئیبراهیم _ علیه السلام _ لەسەری ڕادەوەستا لە کاتی دروستکردنی کەعبەدا ناکەی بە جێگەی نوێژ، ئەوە بوو خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى﴾[البقرة: ١٢٥] واتە: (پێمان گوتن) شوێنی ئەو بەردەی کە ئیبراهیم _ علیه السلام _ لەسەری ڕادەوەستا (کاتی دروستکردنی کەعبە) بکەنە جێگای نوێژ، سێ یەم: مەسەلەی باڵا پۆشی بوو، ئیمامی عومەر ﷺ بە پێغەمبەری خوای ﷺ فەرموو: بۆ خێزانەکانت باڵا پۆشی ناکەن، پێشی فەرموو: خەڵکی دیدەنیت دەکەن، باشتر وایە خێزانەکانت باڵا پۆشیی

بپۆشن، ئەوە بوو خوای گەورە ئایەتی حیجابی دابەزاند ﴿وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ﴾[الأحزاب: ٥٣] واتە: هەر کاتێ داوای شتێکی ناوماڵتان کرد لە (هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ) ئەوە لە پشتی پەردەوە لێیان داواکەن ئەو (شێوە داواکردنە)تان خاوێن ترە بۆ دڵی ئێوەو ئەوانیش.

کەوا بوو خوای گەورە لە سێ شتدا قورئانی لەسەر گوفتارەکانی ئیمامی عومەر ﷺ دەبەزاندووە.

جار بە جاریش قورئـان موخالەفـەی بـە دڵ داهـاتن و بۆچـونەکانی عومـەری ؓ دەکرد، ئیتر لێی پاشگەز دەبویـەوە، وەکـو ئـەوەی لـە ڕۆژی حودەیبیـەدا پـاش گەزبویەوە(١)، چونکە لـەو ڕۆژەدا وای پـێ باش بـوو کـە لەگـەڵ هاوبـەش دانەرانـدا بجەنگن، فەرموودەکەش ناسراوەو لە بوخاری و ئەوانی تریشدا هەیە.

---

(١)ـ ڕۆژی حودەیبیـە، ئـەوە یـەکێك بـوو لـە هەڵـەکانی ئیمـامی عومـەر ؓ، سەرەڕای ئەو پلەو پایە و ڕێزەی کـە هـەیبوو کەچـی لـە مـەدا هەڵـە دەکـات، چـونکە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی و هاوەڵانی بەنیازی عەمرە هات بـوون، قوربانیەکانیشیان پێبوو، ساڵی شەشـەمی کۆچـی، هاوەڵپەرسـتان ڕێگریـان لێکـردن و، نـەیانهێڵا بـە مزگەوتی حـەرام بگـەن، بۆیـە لـە حودەیبیـە چـەند ڕۆژێـك مانـەوە، لـەو ماوەیـەدا هاوەڵپەرستان نوێنەری خۆیان دەنارده لای پێغەمبەری خوا ﷺ بە نیازی دانوسـتان و گفتوگـۆ کـردن لەگەڵیـدا، لـە ئەنجامـدا ڕێککـەوتن لەسـەر ئـەوەی کـە پێغەمبـەرو هاوەڵانی ئەو ساڵە بگەڕێنەوە بۆ مەدینەی پیرۆز، ساڵی داهـاتوو بـۆ عـەمرە بچنـەوە، کە بە (عُمرة القضيّة) ناسراوە، ئـەو شـتە بـە لای ئیمـامی عومـەرەوە ؓ زۆر سـەخت بوو، فەرمووی: چۆن بگەڕێینەوە؟ ئایا ئێمە لەسەر هەق نین؟ ئایا ئەوان لەسـەر باتـڵ ناهەق نین؟ پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمووی: بـەڵێ، ئیمـامی عومـەر فـەرمووی: ئایا کوژراوانی ئێمە لە بەهەشتدا نین و کوژراوانی ئەوان لە ئـاگردا؟ پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئیمامی عومەر فەرمووی: ئەی تۆ پێت ڕانەگەیاندین کە ئێمە دەچینە نێو کەعبەی پیرۆزەوە سـەرمان تاشیوەو کورتمـان کردۆتـەوەو ناترسـین، ئـیتر بـۆی دەرکەوت کە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەسـەر هەڵوێسـتی خـۆی سـوورە، بۆیـە ئیمـامی عومەر ؓ چووە لای ئیمامی ئەبوبەکر ؓ پێی فەرموو: شتەکەمان بە لاوە ئاسـان نیـە، پێشـەوا ئەبوبـەکر پێـی فـەرموو: ئـەوە پێغەمبـەری خوایـە، گوێڕایـەڵی مەبەستەکانی بە. لە ڕاستیدا ئەمە فەزیڵەت و چاکەیەك بوو بۆ ئەبوبەکر ؓ کە بەوە لە عومەر جیاکرایەوە، بەئیمامی عومەری فەرموو: ئەو پێغەمبەری خوایەو پێویستە

..........................................................
..........................................................
..........................................................

گوێڕایەڵی بین، ئەو کاتە ئیمامی عومەر ﵁ تەسلیم بوو، دەرەنجامیش بۆ موسڵمانان بوو، خوای گەورە بە (فتح) ناوزەندی کردووە فەرمووی: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا﴾ [الفتح: ١] واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) بێگومان ئێمە سەرکەوتنێکی ئاشکرامان پێ دایت (کە ڕێکەوتنی حودەیبییەیە). بەڵام ڕزگارکردنی مەککە لە سوڕەتی (النصر)دا باسکراوە ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ﴾ [النصر: ١] واتە: کاتێك کە یارمەتی و کۆمەکی خوا هات لەگەڵ سەرکەوتن (شاری مەککە ئازاد کرا). ڕێککەوتنی حودەیبییە بۆ موسڵمانان بوو بە (فتح)ێك، خوای گەورە ئیسلامی سەرخست، کوفری سەر شۆڕ کرد، ئیتر خەڵکی ئازاد بوون، ئەوەی ویستی ئیسلامی هەبوایە موسڵمان دەبوو، هیچ کەسێك بەرهەڵستی نەدەکردن، ئەوەی ویستی کۆچکردنی بوایە، کۆچی دەکرد، جەنگ هێور بویەوە، بەرژەوەندی و دەرەنجامی باش بۆ موسڵمانان بوو، ئەو کاتە ئیمامی عومەر ﵁ بۆی دەرکەوت کە هەڵەی کردووە، بۆیە فەرموویەتی: ((يَا أَيُّهَا النَّاسُ: اتَّهِمُوا الرَّأْيَ عَلَى الدِّينِ، فَلَقَدْ رَأَيْتُنِي يَوْمَ أَبِي جَنْدَلٍ أَنْ أَرُدَّ أَمْرَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وأجتهد ولا آلو)) واتە: ((ئەی خەڵکینە: لە کاروباری ئاییندا بە ڕای تایبەتی خۆتان کار مەکەن، دڵنیا بن لە ڕۆژی ئەبو جەندەلدا _ واتە: لە ڕۆژی حودەیبییەدا بە موسڵمانیەتی هات و گەڕێندرایەوە _ وام بەدی کرد کە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەت بکەمەوەو، ئیجتیهاد بکەم و گوێی پێنەدەم))، ئەبو جەندەلی کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمر، موسڵمان بوو، لە ژێر دەستی هاوەڵپەرستاندا بوو، لە ڕۆژی حودەیبییەداو پاش ڕێککەوتنەکە هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵام وەرینەگرت و فەرمووی: خوای گەورە دەرویەکی ڕزگار بوونی بۆ دەکاتەوە، ئەو شتە بە لای عومەرەوە زۆر سەخت بوو، چونکە درکی بەو دەرەنجامە نەکرد بوو کە خوای گەورە دەیویست، دواتر بە هەڵەکەی خۆی زانی و پاش گەزبویەوەو دەرەنجامەکەی زانی.

## فەزڵی ڕاستگۆیی ( صدیق ) بەسەر خاوەن ئیلهام ( مولهەم ) دا[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ ساڵی شەشەمی کۆچی عومرەی کرد، نزیکەی هەزارو چوار سەد هاوەڵی لەگەڵدا بوو، بریتی بوون لەوانەی کە لە ژێر درەختەکەدا بەیعەتیان پێدا، پاش چاوپێکەوتن و دانوستانێك کە لەنێوان پێغەمبەری خوا ﷺو بێباوەڕاندا ڕوویدا، لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە ئەو ساڵە بگەڕێنەوە، ساڵی داهاتوو بۆ عومرە کردن بچنەوە، چەند مەرجێکیشی تێدا بوو بە ڕووخسار بۆ موسڵمانان جۆرێك لە ناتەواوی بۆ دروست دەکردن، ئەوشتە بەلای زۆرێك لە موسڵمانانەوە سەخت بوو، بەڵام خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ زاناترو داناتر بوون سەبارەت بەو بەرژەوەندیانەی کە لەو ڕێککەوتنەدا بوو، ئیمامی عومەر ﷺ لەڕیزی ئەو کەسانەدا بوو کە ئەوەی بە لاوە ناخۆش بوو، ئەوە بوو بە پێغەمبەری خوای ﷺ فەرموو: ((يا رسول الله، أَلَسْنَا عَلَى الْحَقِّ وَعَدُوُّنَا عَلَى الْبَاطِلِ؟ قَالَ: ((بلى))، قالَ: أَفَلَيسَ قَتْلانا في الجَنَّةِ وَقَتْلاهُمْ في النارِ ؟ قَالَ: ((بَلَى))، قالَ: فَعَلامَ نُعْطِي الدَّنِيَّةَ فِي دِينِنا ؟ فقالَ لهُ النَّبِيُّ ﷺ: ((إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ وَهُوَ نَاصِرِي وَلَسْتُ أَعْصِيهِ))، ثُمَّ قالَ: أَوَلَمْ تَكُنْ تُحَدِّثُنا أَنَّا نَأْتِي الْبَيْتَ وَنَطُوفُ بِهِ ؟ قَالَ: ((بَلَى))، قالَ: ((أَفَقُلْتُ لَكَ: إِنَّكَ تَأْتِيهِ الْعَامَ ؟)) قَالَ: لَا، قَالَ: ((إِنَّكَ آتِيهِ وَمُطَّوِّفٌ بِهِ))[2].

---

(١)_ لە زمانی عەرەبیدا وشەی (مُحَدَّث) واتای (مُلْهَمْ) دەبەخشێت، وشەی (مُلْهَمْ)یش لە (الإلهام)ەوە هاتووە، ئەمیش بریتیە لەوەی شتێك بخرێتە نێو دڵەوە، دەروون پێ ی ئارام بێت، ئیلهام خستنە دڵیش حاڵەتێك و پلەو پایەیەکە پەروەردگار بە هەندێك لەبەندە هەڵبژاردەکانی خۆیەوە تایبەتی دەکات، بڕوانە: قاموسی ڕستە، مەلا مەحمەدی گەلالەیی، وەرگێڕ.

(٢)_ پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئیمامی عومەری فەرموو: ((دڵنیابە دەچیتە کەعبەو بەدەوریشیدا تەواف دەکەی)) ئەمەش هاوڕێکی ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ صَدَقَ اللَّهُ رَسُولَهُ الرُّؤْيَا بِالْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِن شَاءَ اللَّهُ﴾ [الفتح: ٢٧] واتە: سوێند بە خوا بێگومان خوا ئەو خەوەی پێغەمبەرەکەی دیبوی بە ڕاستی گێڕاو هێنایەدی کە (ووتبووی) دڵنیا بن دەچنە ناو کەعبەی پیرۆزەوە بە ویستی خوا.

واته: ((ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا ئێمە لەسەر هەق نین و دوژمنەکەمان لەسەر باتڵ نییە؟ فەرمووی: ((با))، عومەر ﷺ فەرمووی: ئایا کوژراوانمان لە بەهەشتدا نین و کوژراوانی ئەوان لە ئاگردا؟ فەرمووی: ((با))، عومەر ﷺ فەرمووی: کەوا بوو بۆ لە دینەکەماندا ناتەواوی و زەلیلی بنوێنین؟ پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ((من پێغەمبەری خوام و ئەو زاتە پشتگیریم دەکات و منیش سەرپێچی ناکەم))، پاشان عومەر ﷺ فەرمووی: ئایا بۆت باس نەدەکردین کە دەچینە ماڵەکەی خواو بە دەوریدا تەواف دەکەین؟ فەرمووی: ((با))، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەی پێم گوتیت: تۆ ئەمساڵ دەچیتە کەعبە؟))، عومەر ﷺ فەرمووی: نەخێر، ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((دە دڵنیا بە دەچیتە کەعبەو بە دەوریشیدا تەواف دەکەی)). پاشان ئیمامی عومەر ﷺ چووە لای ئیمامی ئەبو بەکر ﷺ هەمان ئەو شتەی پێگووت کە بە پێغەمبەری خوا ﷺ گووت بوو، ئەویش بە هاوشێوەی وەڵامەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ وەڵامی دایەوە، بەبێ ئەوەی پێشتر گوێبیستی وەڵامەکەی پێغەمبەری خواش ﷺ بوبێت، بۆیە موافەقەت و هاوڕێکی و سازانی ئیمامی ئەبو بەکر ﷺ بۆ خواو بۆ پێغەمبەر ﷺ لەئیمامی عومەر ﷺ تەواوتر و کامڵ تر بوو، ئیتر ئیمامی عومەر ﷺ پاش گەزبویەوەو، فەرمووی: چەندین کردەوەی چاکم ئەنجام دا بۆ ئەوەی ئەو تاوانەی پێ بسڕمەوە[1].

---

(١)_ واتە: دانی بە هەڵەکەی خۆیدا ناو، چەندین کردەوەی چاکی ئەنجامدا بۆ ئەوەی ئەو شتەی پێ بسڕێتەوەو، بۆ ئەوەی خوای گەورە لێی خۆشبێت.

هەروەها کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد[1]

---

(١)_ ئەمە هەڵویستی دووەم بوو کە ئیمامی عومەر رضي الله عنه هەڵەی تێدا کرد، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد، ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنه لە (السَّنخ) بوو، شوێنێکی مەدینەی پیرۆز بوو، ئاو و دارەخورمای تێدا بوو، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد خەڵکەکە هەژان و جولان و تێکچوون، ئیمامی عومەریان تێدا بوو، هەڕەشەی لێدەکردن و، دەیفەرموو: پێغەمبەری خوا ﷺ نەمردووە، ئەو لای پەروەردگاری خۆیەتی وەکو چۆن مووسا پێغەمبەر _ علیه السلام _ بۆ لای پەروەردگارەکەی خۆی چوو، پاشان دەگەڕێتەوە، لەو کاتەدا ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنه هاتە ژوورەوە تەماشای کرد پێغەمبەری خوا ﷺ مردووە، داپۆشەری سەر دەم و چاوی پیرۆزی لاداو ماچی کرد، لەوە دڵنیا بوو کە مردووە، ئیتر چووە مزگەوت و ئیمامی عومەری رضي الله عنه لەسەر مینبەرەکە هێنایە خوارەوەو، خۆی چووە سەر مینبەرەکەو وتارێکی بۆ خەڵکەکە داو، فەرمووی: ((هەر کەس موحەممەدی دەپەرست با دڵنیا بن موحەممەد مرد، ئەو ئایەتەشی خوێندەوە ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ﴾[الزمر: ٣٠] واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) بە ڕاستی تۆ دەمری و ئەوانیش دەمرن. پاشان ئەم ئایەتەشی خوێندەوە ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ﴾[آل عمران: ١٤٤] واتە: موحەممەد (ﷺ) تەنها پێغەمبەرێکە نەمر نییە، بێگومان لە پێش ئەو پێغەمبەرانی تر ڕابوردون جا ئەگەر وەفاتی کرد یان کوژرا دەگەڕێنەوە بۆ دواوەی خۆتان (پاشگەز دەبنەوە)؟ ئەو جا ئیمامی عومەر رضي الله عنه بۆی دەرکەوت کە پێغەمبەری خوا ﷺ مردووە، ئیتر دانیشت و نەیتوانی بجوڵێتەوە، لەسەر زەوی چوو بە چۆکداو نەیدەتوانی هەستێت کاتێ بۆی ڕوون بویەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ مردووە، ئەوەش هەڵوێستی ئەبوبەکر رضي الله عنه بوو، کە هەڵوێستی بڕوادارێکی پتەو بوو کە هەرگیز لەق نە دەبوو،

بەڵام ئیمامی عومەر رضي الله عنه لەمەدا ڕاڕایی و دوودڵیی بۆ دروست بوو، بەڵام ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنه هیچ ڕاڕایی و دوو دڵیەکی بۆ دروست نەبوو، بەڵکو وەکو شاخ و کێوەکان بەرامبەر بەو کارەساتە ڕاوەستاو جێگیر بوو، کە هەرگیز کارەساتێکی دیکەی بەو جۆرە بەسەر مرۆڤایەتیدا نەهاتبوو، ئا ئەمە بوو بەهێزی ئیمان و ئازایەتی پێشەوا ئەبوبەکر رضي الله عنه، ئەمە ئاماژەیەکی بەهێزە کە ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنه چاکترینی ئەم ئوممەتەیە. هەڵوێستی سێ یەم: مەسەلەی هەڵگەڕاوەکان بوو، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد، زۆرێك لە عەرەبەکان هەڵگەڕانەوە، زەکاتیان نەدا، بۆیە ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنه سوور بوو لەسەر ئەوەی لە دژیان بجەنگێت، ئیمامی عومەرو هاوەڵانێکی تر پێیان فەرموو: چۆن دژیان دەجەنگیت لە کاتێکدا ئەوان شایەتومان دەهێنن، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی ((فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵکیدا بجەنگم، هەتا دەڵێن: (لا إلهَ إلا الله وَأَنِّي رسولُ اللهِ)، جا ئەگەر ئەوەیان بەجێهێنا خۆیان و ماڵ و سامانیشیان لە من پارێزراوە، مەگەر بە هەقی خۆی نەبێت))، ئیتر ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنه پێی فەرموو: ئایا نەیفەرموو: ((مەگەر بەهەقی خۆی نەبێت))، بێگومان زەکاتیش لەو هەقەیە، سوێند بەخوا ئەگەر کاریلەیەکم نەدەنێ کە بە پێغەمبەری خوایان ﷺ داوە، لە سەر ئەو نەدانە لەگەڵیاندا دەجەنگم، ئیتر کاتێك سووربونی ئیمامی ئەبوبەکریان بینی بۆیان ڕوون بویەوە کە لەسەر هەقە، بۆیە بە هەڵوێستەکەی قایل بوون و، لەگەڵ هەڵگەڕاوەکاندا جەنگان و، دەرەنجامی باشیش تەنها بۆ موسڵمانان بوو، هەڵگەڕاوەکان سەر شۆڕ بوون، ئەوە بوو پاش کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ ئیسلام بە تەواوی جێگیر بوو، ئا ئەمە هەڵوێستەکانی ئیمامی ئەبوبەکر رضي الله عنه کە هیچ کەسێکی دیکەی جگە لەو نەیتوانیوە بەو جۆرە لەسەر هەق جێگیر بێت، ئەو هەڵوێستانە بۆ موسڵمان سەختترین و قورسترین هەڵوێستەکان بوون، لەگەڵ ئەوەشدا بە هاوشێوەی جێگیر بوونی شاخ و کێوەکان لە سەر هەق جێگیر بوو _ خوای لە هەموویان ڕازی بێت _ لە کاتێکدا کە کەسانی تر شڵۆق بوون.

...جار ئیمامی عومەر ﷺ نکوڵی لە مردنەکەی کرد، بەڵام کە ئیمامی ئەبو بەکر ﷺ فەرمووی: بە ڕاستی ئەو مردووە، ئیمامی عومەر ﷺ پاش گەڕایەوە[1]، هەروەها سەبارەت بە جەنگان دژبە بەوانەی کە زەکاتیان نەدا (هەڵگەڕاوەکان)، ئیمامی عومەر ﷺ بە ئیمامی ئەبو بەکر ﷺ فەرموو: كيف تقاتل الناس وقد قال رسول الله ﷺ: ((أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ، حَتَّى يشهدوا أَنْ لا إِلَهَ إِلا اللهُ وَأَنِّي رسولُ اللهِ، فإذا فعلوا ذلك عصموا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إِلا بِحَقِّهَا))، فقال له أبوبكر ﷺ ألم يقل: ((إلا بحقها))، فإن الزكاة مِنْ حَقِّهَا، والله لَوْ مَنَعُونِي عَنَاقاً كانوا يؤدُّونها الى رسول الله ﷺ لَقَاتَلْتُهُمْ على منعه، قال عُمَرُ: فَوَاللهِ مَا هُوَ إِلاَّ أَنْ رَأَيْتُ اللهَ قَدْ شَرَحَ صَدْرَ أَبِي بكرٍ للقتال فَعَرَفْتُ أَنَّهُ الحق[2] صحيح: أخرجه البخاري (١٣٩٩)، (٦٩٢٤)، (٧٢٨٥)، ومسلم (٢٠)، من حديث أبي هريرة. واتە: ئیمامی عومەر ﷺ بە ئیمامی ئەبوبەکر ﷺ فەرموو: چۆن لە گەڵ خەڵکەدا بجەنگین لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((فەرمانم پێکراوە لە گەڵ خەڵکیدا بجەنگم، هەتا دەڵێن: (لا إله إلا الله وأني رسول الله)، جا ئەگەر ئەوەیان بەجێهێنا خۆیان و ماڵ و سامانیشیان لە من پارێزراوە، مەگەر بەهەقی خۆی نەبێت)). ئیتر ئیمامی ئەبو بەکر ﷺ پێی فەرموو: ئایا نەیفەرموو: ((مەگەر بە هەقی خۆی نەبێت))، بێگومان زەکاتیش لەو هەقەیە، سوێند بەخوا ئەگەر کاریلەیەکم نەدەنێ کە بەپێغەمبەری خوایان ﷺ داوە، لە سەر ئەو نەدانەیان لە گەڵیان دەجەنگم. ئیمامی عومەر ﷺ فەرمووی: سوێند بەخوا خێرا بۆم دەرکەوت کە خوای گەورە دڵی ئیمامی ئەبو بەکری ﷺ بۆ جەنگ کردۆتەوە، ئینجا بۆشم دەرکەوت ئەو لە سەر هەقە.

---

(١)_ ئەمە ئیمامی عومەرە ﷺ وەلی و دۆستێکی گەورەی خوایە لەگەڵ ئەوەشدا لەمەدا هەڵە دەکات، ئەو گێڕانەوانەش ئەوەیان لێ وەردەگیرێ کە وەلی هەڵە دەکات و مەعصوم نییە.

(٢)_ ئیمامی عومەر ﷺ فەرمووی: سوێند بەخوا خێرا بۆم دەرکەوت کە خوای گەورە دڵی ئیمامی ئەبوبەکری ﷺ بۆ جەنگ کردۆتەوە، ئینجا بۆشم دەرکەوت ئەو

لەسەر هەقە. ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە هەر کەسێك هەڵە بکات و، لە قورئان و سوونەت بەڵگەیەك بۆ هەڵەکانی خۆی بێنێتەوە، ئەوا با دڵنیا بێت کە لە نێو هەمان ئەو بەڵگەیەدا شتانێکی دیکە هەیە کە بەر پەرچی هەڵەکەی دەداتەوە، ئەوە بوو ئیمامی ئەبوبەکر ﷺ بە وشەیەك لە نێو هەمان ئەو بەڵگەیەی کە پێیان بوو وەڵامی دانەوە، کە بریتی بوو لە: ((إلا بحقها)).

چەندین نموونەی دیکەش هەن کە لە پێشتر بوونی ئیمامی ئەبو بەکر بەسەر ئیمامی عومەر دا ئاشکرا دەکەن، لە کاتێکدا کە عومەر ﷺ (مُحَدَّث) بووە، بەلام پلەی (صِّدِّیق) لە سەرووی پلەی (مُحَدَّث)ەوەیە[1]، چونکە (الصِّدِّیق) لە پێغەمبەری مەعصوم و پارێزراوەوە هەموو ئەوەی کە پێغەمبەر دەیلێت و ئەنجامی دەدات وەردەگرێت، بەلام (مُحَدَّث) لە دلی خۆیەوە چەندەها شت وەردەگرێت و، دلیشی مەعصوم و پارێزراو نییە[2]، بۆیە ناچار دەبێت بۆ ئەوە بگەرێتەوە کە بۆ پێغەمبەری مەعصوم و پارێزراو دابەزیووە ﷺ، بۆیە ئیمامی عومەر ﷺ راوێژی بە هاوەلان، بیلدا گۆرینەوەی دەکردو لەهەندێ کاروباردا راپرسی پێ دەکردن[3]،

---

(١)_ ئیمامی ئەبوبەکر ﷺ (الصِّدِّیق)ە، بەلام ئیمامی عومەر ﷺ (مُحَدَّث)ە، پلەی (الصِّدِّیق)یتی لەپلەی (مُحَدَّث) چاکترە، ئەمەمان لە هەلوێستەکانی ئەبوبەکرەوە ﷺ بۆ روون دەبێتەوە، کە بەرامبەر بە هەلوێستە زۆر سەخت و دژوارەکان جێگیر دەبوو، لە کاتێکدا شاخ و کێوە مەزنەکانیش هێندەی ئەمابوو لە پێشیدا ووردو خاش بن.

(٢)_ بەلێ، ئەمە جیاوازیەکەی نێوان (الصِّدِّیق) و (مُحَدَّث)ە، چونکە (الصِّدِّیق) هیچ شتێك لەخودی خۆیەوە ئەنجام نادات، بەلکو هەر هەموو شتەکان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ وەردەگرێت، بەلام (مُحَدَّث) هەندێ شت لەوەوە وەردەگرێت کە دلی پێی دەلێت، ئەمەش لەوانەیە هەندێ جار هەلە بن. واتە: مرۆڤ ئەگەر پشت بەشتانێکی تیکەی جگە لە قورئان و سووننەت ببەستێت هەلە دەکات.

(٣)_ لەگەل ئەو هەموو ئیلهام و ئیدراکەی کە خوای گەورە پێی بەخشیبوو، پشتی بە رای تایبەتی خۆی نەدەبەست، بەلکو لەو کاروبارانەدا کە دەهاتە پێش بە هاوەلان راوێژی دەکرد، کۆچ کردوان و پشتیوانانی کۆ دەکردەوەو کێشەکەی دەخستنە پێش و، بیروڕای وەر دەگرتن، نەیدەفەرموو: من جێنشینم، من (مُحَدَّث)م، من (مُلْهَم)م، پێغەمبەری خوا ﷺ شایەتی بۆ داوم، لە چەندەها شوێندا قورئان لەسەر بیروای من دابەزیووە، بەم شتانە فریوی نە دەخوارد، بەلکو بە هاوەلان راپرسی دەکرد.

کەوا بوو هەرکەسێك بانگەشەی کرد یان هاوەڵانی بانگەشەیان بۆ کرد کە گوایە وەلی و دۆستی خوایەو (مُخاطَب) ەو، لەسەر دەست و پێوەندەکانی پێویستە قبوڵی هەموو ئەو شتانە بکەن کە دەیڵێت و بەرهەڵستی نەکەن، ملکەچی بن بەبێ هیچ گوێدانێك بە قورئان و سوونەت، بە دڵنیایی خۆی و ئەوانیش هەڵەن[1]، ئەگەر وا دانرا کەسێکی بەم جۆرە چاکترینی خەڵك بێت، با دڵنیا بن ئیمامی عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه زۆر لەو چاکترە، لە کاتێکدا ئەمیری موسڵمانان بوو لەو شتانەدا کە دەیفەرموو موسڵمانان کێشمەکێشمیان لەگەڵ دەکرد، لە کاتێکدا هەردوو لاشیان لەسەر قورئان و سوونەت بوون.

---

(١)_ ئا ئەمەیە دەرەنجامەکە، بەڵێ، هەر دۆستێکی خوا لەو باوەڕدا بێت کە قسەکانی نەگۆڕەو، بۆ هیچ کەسێك نییە ڕەخنەی لێ بگرێت، با دڵنیا بێت بە هەڵەدا چووە، دۆستی ڕاستەقینەی خوای گەورە ئەوەیە کە نەفسی خۆی تاوانبار دەکات، بیروڕاکانی تاوانبار دەکات، بۆ قورئان و سوونەت دەگەڕێتەوە، تەسلیمی خواو پێغەمبەرەکەی دەبێت و، تەنها بەبیروڕای تایبەتی خۆی کار ناکات، ئا ئەمەیە دۆستی ڕاستەقینە، ئیمامی عومەر رضي الله عنه بەو شێوە بوو. کەوا بوو هەر کەسێك لەو باوەڕەدا بێت کە وەلی خوا مەعصوم و پارێزراوە، با بۆ قورئان و سوونەت نەگەڕێتەوە، با دڵنیا بێت گومڕاترین کەسە _ پەنا بە خوا _.

## چەند جیاوازییەکی نێوان پێغەمبەران و کەسانی دیکە

پێشینی چاك و پێشەوایانی ئەم ئوممەتە هاوڕان لەسەر ئەوەی کە هەموو کەسێك لەگوفتارەکانی وەردەگیرێت و ڕەتدەکرێتەوە، مەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ، ئا ئەمە یەکێکە لەجیاوازیەکانی نێوان پێغەمبەران و کەسانی دیکە[1]، چونکە سەبارەت بە پێغەمبەران _ صلوات الله عليهم وسلامه _ واجیبە ئیمان بە هەر هەموو ئەوانە بکرێت کە لە خوای گەورەوە ڕایدەگەیەنن، هەروەها واجیبە گوێڕایەڵیان بکرێت لە هەر هەموو ئەو شتانەدا کە فەرمانی پێ دەکەن، ئەمە بە پێچەوانەی ئەولیاو دۆستانەوەیە کە واجیب نییە گوێڕایەڵیان بکرێت لە کۆی هەموو ئەو شتانەدا کە فەرمانی پێدەکەن، هەروەها واجیب نییە باوەڕ بەکۆی هەموو ئەو شتانە بکرێت کە ڕایدەگەیەنن، بەڵکو کاروبارو هەواڵەکانیان بۆ قورئان و سوونەت دەگەڕێنرێتەوە، ئەوەی لەگەڵ قورئان و سوونەتدا بگونجێت قبوڵ کردنی واجیبە، ئەوەشی کە موخالەفەی قورئان و سوونەت بێت ڕەتدەکرێتەوە، ئەگەر چی خاوەنەکەی لە دۆستانی خواش بێت و[2] موجتەهیدێکی خاوەن عوزریش بێ لەوەدا کە دەیڵێت و لەسەر ئیجتیهادەکەشی پاداشتی هەبێت، چونکە ئەگەر موخالەفەی قورئان و سوونەت بکات ئەوا هەڵەی کردوە، بەڵام هەڵەیەکی چاوپۆشی لێکراوە ئەگەر خاوەنەکەی بە گوێرەی توانای خۆی لە خوا ترسا بێت و تەقوای خوای کرد بێت،

---

(١)_ پێغەمبەران مەعصوم و پارێزراون بە هیچ جۆرێك گومان و هەڵەیان لێ نزیك نابێتەوە، بەڵام غەیری وان هەموو کاتێك ئەگەری هەڵەکردنیان هەیە ئەگەرچی چاکترین خەڵکی ئەم ئوممەتەش بن وەکو پێشەوایان ئەبوبەکرو عومەر ﵄.

(٢)_ ئەو شتە لە وەلایەت و دۆستایەتیەکەیان بۆ خوای گەورە کەم ناکاتەوە، چونکە بە قەستی هەڵەی نەکردووە، بەڵکو ئیجتیهادی کردو هەڵەی کرد، بە دوای هەقدا دەگەڕا بەڵام پێی نەگەیشت، بۆیە ئەو مەعزورو بەهانەدارە، ئەو شتە لەڕێزی کەم ناکاتەوە، لەدۆستایەتی خوای گەورەش ناچێتە دەرەوە.

خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ﴾[التغابن: ١٦] واتە: کەوا بوو لە خوا بترسن ئەوەندەی کە دەتوانن، ئەوەش تەفسیری ئەم ئایەتەیە ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ﴾[1] [آل عمران: ١٠٢] واتە: ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە بترسن لە خوا ترسانێك کە شیاوی خوایە.

ئیبن و مەسعود ﷺ و کەسانی دیکەش فەرموویانە: مانای: ﴿حَقَّ تُقَاتِهِ﴾ ئەوەیە کە گوێڕایەڵی خوای گەورە بکرێت و سەرپێچی نەکرێت، یادو زیکریی بکرێت و لە بیر نەبرێتەوە، سوپاس گوزاری بکرێت و کوفری پێنەکرێت، بە واتای ئەوەندەی کە دەتوانن، چونکە خوای گەورە داوا لە هیچ کەسێك ناکات مەگەر بە ئەندازەی توانای خۆی، خوای گەورە لەو بارەوە دەفەرموێت: ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ﴾ [البقرة: ٢٨٦] واتە: خوا داوا لە هیچ کەسێك ناکات مەگەر بە ئەندازەی توانای خۆی (سوودی) بۆ خۆی هەیە هەر چاکەیەك بکات (با هەر بە دڵیش بێت) وە (زیانی) بۆ خۆیەتی هەر خراپەیەك بکات (بەعەمدی و ئەندامانی لەش).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ لاَ نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا أُوْلَئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ [الأعراف: ٤٢] واتە: وە ئەوانەی کە بڕوایان هێناوەو کردەوەی چاکیشیان کردووە داوا لە هیچ کەس ناکەین زیاد لە توانای خۆی ئا ئەوانە هاوەڵانی بەهەشتن ئەوان هەمیشەیین تیایدا.

---

(١)_ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ﴾[آل عمران: ١٠٢] لە خوا بترسە ترسانێك کە شیاوی خوایە، مانای ﴿حَقَّ تُقَاتِهِ﴾ واتە: ترسانێك کە شیاویەتەی خوایە، ئەوەیە کە گوێڕایەڵی خوای گەورە بکرێت و سەرپێچی نەکرێت، یادو زیکریی بکرێت و لە بیر نەبرێتەوە، سوپاس گوزاری بکرێت و کوفری پێنەکرێت، ئەمەش سەختە کە مرۆڤ بەم ئاست و پلەیە بگات، بەڵام خۆشبەختانە ئایەتەکەی تر تەفسیری ئەو ئایەتە دەکات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ﴾ [التغابن: ١٦] واتە: کەوا بوو لە خوا بترسن ئەوەندەی کە دەتوانن، کەوا بوو هەر کەسێك ئەوەندەی کە دەتوانێت تەقوای خوا بکات، ئەوا تەقوای خوای کردووە بەو جۆرەی کە شیاویەتی.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَوْفُواْ الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ لاَ نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾(١) [الأنعام: ١٥٢] واتە: وە پێوانەو کێشانە بێ زیادو کەم ئەنجامی دەن بە دادگەری داوای ئەرك لە کەس ناکەین مەگەر بە ئەندازەی توانای خۆی .

خوای گەورە لە چەندین جێگەی قورئاندا باسی پێویستێتی ئیمان هێنانی کردووە بەوەی کە پێغەمبەران هێناویانە، وەکو ئەوەی کە دەفەرموێت: ﴿قُولُواْ آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ﴾(٢) [البقرة: ١٣٦] واتە: بڵێن: (ئەی موسڵمانینە) بڕوامان هێنا بە خوا و بەو قورئانەی کە بۆ خۆمان نێرراوەتە خوارەوە و بەو نامەیەی کە نێرراوە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و کوڕەکانی یەعقوب و بەوەی کە دراوە بە مووسا و عیسا و بەوەی کە دراوە بەهەموو پێغەمبەران لە لایەن پەروەردگاریانەوە جیاوازی ناکەین لە نێوان هیچ کامێکیان دا و ئێمە فەرمانبەری خواین.

---

(١)_ ئەم ئایەتانە لە قورئاندا زۆرن، ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە خوای گەورە لە هیچ کەس داوا ناکات مەگەر بە ئەندازەی توانای خۆی، لەسەر ئەو شتانە سزایان نادات کە توانای بەرگە گرتنیان نییە، چونکە ئەو شتانەی لێ داوا نەکردوون، خوای گەورەش زاناترە، لە ڕاستیدا ئەم بەشە باسێکی بە پێزە پێویستە زۆر گرنگی پێ بدرێت.

(٢)_ میانەی باسەکە دەربارەی وەرگرتنی گوفتاری زانایانە بێ چەن و چوون، بە تایبەت قسەی ئەو کەسانەی کە بە ئەولیایان ناو دەبەن، چونکە صۆفیەکان تەقدیسی ئەولیاکان دەکەن و زۆر بە گەورەو بەڕێزیان دادەنێن، گوفتارەکانیان وەردەگرن وەکو مەسەلەیەك کە چەن و چونی ناوێ و گومان و مشتومڕ هەڵنەگرێت، ئەمەش گومڕایی و کوفرە _ پەنا بە خوا _، چونکە ئەو کەسانەی کە واجیبە گوفتارەکانیان بێ چەن و چوون و دوو دڵیی وەرگیرێت تەنها پێغەمبەرانن _ علیهم الصلاة والسلام _، بەڵام بەدەر لەوان گوفتاری هیچ کەسێکی دیکە وەرناگیرێت مەگەر لەگەڵ گوفتاری

پێغەمبەراندا موافیق و سازیار بێت، چونکە کەسانی دیکەی غەیری پێغەمبەران بەردەوام لەبەردەم لێشاوی هەڵەکردندان، بەڵام پێغەمبەران _ علیهم الصلاة والسلام _ مەعصوم و پارێزراون و گومان لە هیچ گوفتارێکیان ناکرێت، صۆفیەکان و هەروەها ئەوانەی کە لاساییان دەکەنەوە پێشەوایان و سەرکردەکانی خۆیان زۆر بە گەورەو مەزن و شکۆمەند دادەنێن، قسەکانیان وەردەگرن بێ چەن و چوون و بێ ئەوەی هیچ مشتومڕێك هەڵبگرێت، تا ئەو ئاستەی لە سەر ئەوە گفتیان پێ دەدەن، گفتیان پێ دەدەن لەسەر وەرگرتنی تەریقەت، خۆ تەسلیم کردن بە شێخی تەریقەت، پێویستە مشتومڕو کێشمەکێشمی لەگەڵدا نەکرێت، گومان لە قسەکانی نەکرێت، لەسەر شتانێکی وەکو ئەمانە گفتیان پێدەدەن، ئەمەش گومڕایەکی ئاشکرایە، چونکە کەسانی دیکەی جگە لە پێغەمبەران بەردەوام لەبەردەم هەڵەکردن و ڕاستکردن دان، پێشتر شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێ بێ _ گەورە دۆستانێکی خوای گەورەی بۆ باسکردین وەکو عومەری کوڕی خەتتاب و رضي الله عنه هاوەڵانی دیکەش کە لە هەندێ ئیجتیهاداتدا یان لە هەندێ گوفتاردا ڕوو بە ڕووی هەڵە کردن بونەتەوە، هەڵەیان کردووە، ئەوان لە هەڵەو تاوان پارێزراو نین، ئەمەیە مەبەستی ئەو باسەی کە شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێ بێ _ تا ئێستا باسی دەکات و، بە بیری هێناوینەتەوە کە بەڵگەی وەرگرتنی گوفتاری پێغەمبەران _ علیهم الصلاة والسلام _ بەبێ هیچ دوو دڵیی و گومانێك ئەو ئایەتەیە، لەو ئایەتەوە ئەوەمان دەستگیر دەبێت کە گوفتاری پێغەمبەران _ علیهم الصلاة والسلام _ وەردەگیرێت و، موناقەشە ناکرێت و گومان و دوو دڵیی لێ ناکرێت، کەوا بوو هەر مرۆڤێك گوفتاریان وەرنەگرێت و گومانی خراپی لێ بکات، با دڵنیا بێت هیچ ئیمانێکی بەپێغەمبەران _ علیهم الصلاة والسلام _ نییە، ﴿قُولُواْ آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى﴾ چونکە پێغەمبەران هیچ شتێکیان لە خۆیانەوە نەهێناوە،

---

---

---

بەلکو ئەوەمان پێ ڕادەگەیەنن کە لە خوای گەورەوە بۆیان دابەزیوە، پاشان بە
...ورنیش باسیان دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ
...نْهُمْ﴾، ئەمەیە بیروباوەڕی ئەهلی سوونەت و جەماعەت، ئەوان لە نێوان پێغەمبەراندا
جیاوازی ناکەن، بە جۆرێك باوەڕیان بەهەندێکیان هەبێت و کوفر بە هەندێکیان بکەن،
وەکو جوولەکەو گاورەکان، بەڵکو بڕوایان بە هەر هەموو پێغەمبەران _ علیهم الصلاة
...سلام _ هەیە، بڕوایان بە هەر هەموو ئەو کتێبانە هەیە کە خوای گەورە بۆی
دابەزاندوون، خوای گەورە لەو بارەوە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِاللّهِ وَرُسُلِهِ وَيُرِيدُونَ
أَن يُفَرِّقُواْ بَيْنَ اللّهِ وَرُسُلِهِ وَيقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً
(١٥٠) أُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقّاً وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ عَذَاباً مُّهِيناً (١٥١) وَالَّذِينَ آمَنُواْ بِاللّهِ وَرُسُلِهِ وَلَمْ
يُفَرِّقُواْ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ أُوْلَـئِكَ سَوْفَ يُؤْتِيهِمْ أُجُورَهُمْ وَكَانَ اللّهُ غَفُوراً رَّحِيماً (١٥٢)﴾ [النساء:
١٥٠_١٥٢] واتە: بە ڕاستی ئەوانەی بێ باوەڕن بە خواو پێغەمبەرەکانی و دەیانەوێ
جیاوازی بخەنە نێوان خواو پێغەمبەرەکانی و دەڵێن باوەڕ بەهەندێك (لە پێغەمبەران)
دەهێنین و باوەڕ ناهێنین بە هەندێکی تریان و دەیانەوێ لەو نێوانەدا ڕێگەیەك بدەنە
بەر ئائەوانە بە ڕاستی بێ باوەڕی تەواون و ئامادەمان کردووە بۆ بێ باوەڕان سزایەکی
ڕسواکەر و ئەوانەی بڕوایان هێناوە بە خواو پێغەمبەرەکانی و هیچ جیاوازیەکیان
نەخستە نێوان هیچ کام لەو پێغەمبەرانە ئا ئەوانە لە داهاتوودا خوا پاداشتیان دەداتەوە
وە خوا هەمیشە لێبووردەی میهرەبانە، بە ڕاستی ئەمە بنچینەیەکی هەرە گەورەیە لە
بنچینەکانی بیروباوەڕ، بڕواهێنان بە هەر هەموو کتێبەکان و بڕواهێنان بەهەر هەموو
پێغەمبەران، بەبێ ئەوەی جیاوازی لەنێوان کتێب و کتێبێکی تردا یان پێغەمبەرێك و
پێغەمبەرێك تردا بکرێت.

هەروەها خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿الم (١) ذَلِكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ (٢) الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ (٣) وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ وَبِالْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ (٤) أُولَئِكَ عَلَى هُدًى مِنْ رَبِّهِمْ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (٥)﴾[1] [البقرة: ١_٥].

---

(١)_ خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿الم (١) ذَلِكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ﴾ ئەم قورئانە هیچ گومانێکی تێدا نییە ڕێنیشاندەرە بۆ پارێزگارو تەقواکاران، کەوا بوو ئەو پارێزگارو تەقواکارانە کێن؟ ئەوانەن کە بڕوایان بەغەیب و پەنهان و نادیارەکان هەیە کە نەیانبینووە، بەڵکو تەنها پشت بەو هەواڵە ڕاستانە دەبەستن کە بۆ پێغەمبەران دابەزیوە‌و، کتێبی لە بارەوە دابەزیووە، ﴿الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ﴾ ئەوانەی کە بڕوا بە غەیب و بە شتە پەنهان و نادیارەکان دەهێنن، بۆ ئەو بڕوا هێنانەش پشت بە بەڵگە سەلماندن و ئایەتە ڕێ نیشان دەرەکان دەبەستن، ئەگەر چی بە چاویش نەیان بینیبێ، ئەوەش بڕوا هێنان بە خواو، بڕوا هێنان بە فریشتەکان و، بڕوا هێنان بە هەواڵی گەلانی پێشتر و هەواڵەکانی داهاتووە دەگرێتەوە، هەر هەموو ئەمانە دەچنە چوار چێوەی بڕوا بوون بەغەیب و پەنهان و نادیارەکانەوە کە ناتوانن بیانبینن، بەڵکو تەنها پشت بەو وەحی و سروشە دەبەستن کە بۆ پێغەمبەران دابەزیووە، ﴿وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ﴾ هەر پێنج نوێژە فەرزەکە بەجێ دێنن، ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ﴾ لەوەی کردوومانە بەڕۆزی بۆیان لە بەر خوای گەورە دەبەخشن، ئەمەش زەکات دەگرێتەوە، کەپایەی سێ یەمە لە پایەکانی ئیسلام، ﴿وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ﴾ ئەمەیە شوێنی بەڵگە و مەبەستی ئێمە، تەقواکاران بڕوا بەوانە دێنن کە بۆ تۆ دابەزیووە ئەی موحەممەد ﷺ، وە بڕوا بەوانەش دەکەن کە بۆ پێغەمبەرانی پێشی تۆ دابەزیووە، لەوەدا هیچ گومان و دو دڵیەکیان بۆ دروست نابێت، قسەی هیچ کەسێك پێش ناخەن، ﴿وَبِالْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ﴾ وە بڕوایان بە ڕۆژی

-----------------------------------------

-----------------------------------------

-----------------------------------

بروابی هەیە، ئەمەیە پایەکانی ئیسلام، بروا بوون بە خواو، فریشتەکانی و، کتێبەکانی و، پێغەمبەرانی و، ڕۆژیی دوایی، خوای گەورە لەو بارەوە دەفەرموێت: ﴿وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَالْمَلائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ﴾ [البقرة: ١٧٧] واتە: ﴿وَلَكِنَّ الْبِرَّ﴾ بەڵکو چاکە ئەوەیە ﴿مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ﴾ کە مرۆڤ بڕوای ببێ بەخوا ﴿وَالْيَوْمِ الآخِرِ﴾ و ڕۆژی دوایی ﴿وَالْمَلائِكَةِ﴾ و فریشتەکان ﴿وَالْكِتَابِ﴾ و کتێبەکان ﴿وَالنَّبِيِّينَ﴾و پێغەمبەران، مەلا موحەممەد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان. ئەمە بە زۆری لە قورئاندا دووبارە دەبێتەوە، ئەمەیە بنچینەکانی ئیمان، بنچینەکانی ئیمان شەشن، بڕوا بوون بەخواو، فریشتەکانی و، کتێبەکانی و، پێغەمبەرانی و، بە ڕۆژی دوایی و، بەنەدەر خەیرو شەڕی، ﴿أُولَئِكَ﴾ واتە: ئەوانەی کە ئەو سیفاتانەیان لە خۆگرتووە، ﴿عَلَى هُدًى مِنْ رَبِّهِمْ﴾ خوای گەورە لە سەر ڕێی ڕاست جێگیری کردوون و، دەستیان پێوە گرەتووە، ﴿وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ وە هەر ئەوانن ڕێگای ڕزگاریان لە دونیاو ڕۆژیی دوایدا بە دەست هێناوە، بەڵام کەسانی دیکەی غەیری ئەوان لەسەر ڕێگە ڕاستەکە نین، بەڵکو گومڕان، خوای گەورە لەم سوڕەتەدا سێ جۆری خەڵکی باس کردووە، جۆری یەکەم: بڕوادارن بە ڕوخسار و ناوەڕۆك، ئەوانەن کە لە سەرەتای سورەتەکەدا باس کراون، جۆری دووەم: کافرن بە ڕوخسار و ناوەڕۆك، هیچ بڕوایەکیان بە پێغەمبەران و، کتێبەکان و، فریشتەکان نییە، بڕوایان بەهیچ شتێك نییە، لە ڕووکارو ناوەکیەوە کافرن، جۆری سێیەم: ئەوانەن کە بە ڕوخسار ئیمانیان هێناوەو، لە ناخەوە کافرن، ئەمانە دوو ڕووەکانن، ئەمانە زۆر لە کافرە تەواوەکان خراپترن، چونکە بە گومانی خۆیان فێڵ لە خواو ئیماندارانیش دەکەن.

هـەروەها خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿لَيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قبل المشرق وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وآتى المال على حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصلاة وآتى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ أولئك الذين صَدَقُوا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ﴾[1] [البقرة: ١٧٧] واتە: چاکە ئەوە نییە کە ڕوو بکەن بەرەو ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا بەڵکو چاکە ئەوەیە کە مرۆڤ بڕوای ببێ بەخوا و ڕۆژی دوایی و فریشتەکان و کتێبەکان و پێغەمبەران و دارایی ببەخشێ لەگەڵ ئەوەی کە خۆشی دەوێت بە خزمان و هەتیوان و بێ نەوایان (هەژاران) ڕێبوارانی کەم دەست و سواڵکەران و لە ڕێی ئازاد کردنی کۆیلەکاندا وە نوێژی بە چاکی کرد بێت و زەکاتی دابێت و پەیمان بەجێ هێنەران ﴿إِذَا عَاهَدُوا﴾ کاتێك کە پەیمانیان دابێت و خۆڕاگران لە کاتی تەنگ دەستی و نەخۆشی و لەکاتی جەنگدا ئائەوانەن کە ڕاستیان کرد وە هەر ئەوانن پارێزکاران.

---

(١)_ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ﴾ چاکە بریتی نییە لەوەی کە ڕوو بکەنە بەرەو ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاندووە بە بۆنەی گۆڕینی قیبلەوە لە (بیت المقدس) ەوە بۆ کەعبەی پیرۆز، وە سوربونی جوولەکە لەسەر قیبلەکەی خۆیان بۆ (قودس)، وە قبوڵ نەکردنی کەعبە لە لایەن ئەوانەوە وەکو قیبلە، خوای گەورە دەفەرموێت: چاکە بریتی نییە لەوەی کە ڕووبکەنە و ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا، بەڵکو چاکەی ڕاست ئەوەیە کە بڕوات بەخوای گەورە هەبێت، ڕوو کردنە قیبلەش بەشێکە لە بڕوا بوون بە خوای گەورە، چونکە خوای گەورە فەرمانی بەو شتەکردووە، ئەو کەسەی بڕوای بە خوای گەورە هەبێت ملکەچی فەرمانەکانی دەبێت، ڕوو لە قیبلە دەکات، ئا ئەمەیە چاکە، چاکە بریتیە لەوەی کە ڕووبکەیتە ئەو شوێنەی کە خوای گەورە ڕووی بۆ وەرگێڕاوی، نەك

----------------------------------------
----------------------------------------
----------------------------------------

به گوێرەی هەواو ئارەزواتی خۆت ڕوو بکەیت، بەلکو بە گوێرەی فەرمانی خوای گەورە ڕوو دەکەیت، سەرەتا خوای گەورە فەرمانی بەوە کرد بوو کە موسڵمانان ڕوو بکەنە (بیت المقدس)، پاشان فەرمانی بە موسڵمانان کرد ڕوو بکەنە کەعبە، کاروبارەکانیش تەنها بە دەستی خۆیەتی، لە کاتی خۆیدا ڕووکردنە بەرەو (بیت المقدس) گوێڕایەڵیی بوو بۆ خوای گەورە، پاشان ڕووکردنە کەعبەش بوبە گوێڕایەڵ بوون بۆ خوای گەورە، هەمووی گوێڕایەڵ بوونی خوایە، کاروبارەکانیش تەنها بە دەستی خۆیەتی، لەم ئایەتەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە هەموو چاکەیەك لە گوێڕایەڵیێ و ملکەچبووندایە بۆ خوای گەورە، فەرمانەکانی قبوڵ بکەیت، فەرمانی پێکردیت بۆ ڕوو لە هەر کوێ بکەیت قبوڵت بێت، بۆ (بیت المقدس)یان بۆ کەعبە.

وە ئەوەی کە باسم کرد سەبارەت بەوەی کە واجیبە دۆستانی خوای گەورە دەست بە قورئان و سووننەتەوە بگرن و، هیچ کەسێکی مەعصوم و پارێزراویان تێدا نییە کە بۆی ڕەوا بێت یان بۆ غەیری ئەو ڕەوا بێت شوێنی ئەو شتانە بکەوێت کە دەکەونە دڵیەوە بەبێ هیچ بایەخ پێدانێك بە قورئان و سوننەت: ئەوەیە کە ئەولیاو دۆستانی ڕاستەقینەی خوای گەورە لەسەری یەکڕاو هاودەنگن[1]،

---

(١)_ دۆستانی خوای گەورە تەقواکارانن، ﴿أَلا إِنَّ أَوْلِيَاء اللَّهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ (٦٢) الَّذِينَ آمَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ(٦٣)﴾ [يونس: ٦٢ _٦٣].واتـە: ئاگادرا بن بێ گومان دۆستانی خوا ترسیان لە سەر نیە خەفەتیش ناخۆن ئەوانەی باوەڕیان هێناوە وە هەمیشە خۆیان دەپارێزن و لە خوا دەترسن. ئەمانـە دۆستی ڕاستەقینەی خوای گەورەن، بەڵام ئەو کەسانەی گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خـوا نـابن و، خۆیـان لـە حەرام کراوەکانی ناپارێزن و شوێنی هەواو ئـارەزوو و مواجیـدو چـەندین دەسـتەواژەی تـری صۆفیەکان دەکەون، ئـەو جـۆرە کەسـانە دۆسـتی ڕاسـتەقینەی خـوای گـەورە نـین، دۆستانی خـوای گـەورە ئەوانـەن کـە بـەم ئایەتـە سـنوردار کـراون ﴿الَّذِينَ آمَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ﴾ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، وەهەمیشە خۆیـان دەپـارێزن و لـە خـوا دەترسن، هەر کەس ئەو دوو مەرجەی تێدا بێت دۆستی خوای گەورەیە، ئەگینا نەخێر، ئەو دوو مەرجە سنووری ڕێکخـەرو جیاکـەرەوەی نێـوان دۆسـتان و غـەیری دۆسـتانە، دۆستی ڕاستەقینە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەیەتی و سەرپێچی فەرمانەکانیان ناکات ئەگەر چـی لەگـەڵ هـەواو ئـارەزوواتی خۆشـیدا نـەگونجێت، وەلـی و دۆسـتی خوای گەورە ئەوەنییە کە صۆفی و بیدعەچیان مەرجیان بۆ داناوە کە ئاوەهاو ئاوەها ئەنجام بدات، کردەوەی ناسروشتی ئاسابەدەر لەسەر دەستی ڕووبدات، نەخێر، هـەموو ئـەم شتانە مەرج نین بۆ دۆستایەتی خوای گەورە.

کەسێکیش موخالەفەی ئەوە بکات بێگومان لە دۆستانی خوای گەورە نییە، بەڵکو پێدەچێ کافر بێت وە یان نەفامێکی لە ڕادەبەدەر بێت[1].

ئەمەش لە قسەی شێخەکاندا زۆرن، ئەوە ئەبی سولەیمانی دارانییە گوتوویەتی: زۆر جار خاڵ و بیرۆکەیەك لە خاڵ و بیرۆکەکانی ئەو قەومە دەکەوێتە دڵمەوە، بەڵام قبوڵی ناکەم مەگەر بە دوو شاهێد: قورئان و سووننەت[2].

---

(۱)_ ئەو کەسەی سەرپێچی ئەم مەرجە بکات، کە بریتیە لە گوێڕاڵی کردنی خواو پێغەمبەرەکەی ئەوا لە دۆستانی خوای گەورە نییە، بەڵکو دۆستی شەیتانە.

(۲)_ لە ڕاستیدا لەو شتە بەدەرنییە، یا کافرە ئەگەر بزانێت بەڵام بەقەستی سەرپێچی کردبێت و، شوێنی هەواو ئارەزوواتی خۆی کەوتبێت، وەیا نەفامە، بە قەستی سەرپێچی نەکردووە چونکە لەو شتەدا نەفام بووە، ئەو جۆرە کەسە لاسایی ناکرێتەوەو نابێ شوێنیشی بکەوێت، ئەو کەسە گومڕایە، ئەو کەسەش کە گومڕا بوو لاسایی دەکرێتەوەو نە شوێنیشی دەکەوێت.

(۳)_ خاڵ و بیرۆکەیەکی صۆفیەکانی دەکەوێتە دڵەوە، بەڵام بەو دوو شاهێدە نەبێ قبوڵی ناکات: قورئان و سوننەت، وەکو چۆن دادوەر داواکاریش کات کار قبوڵ ناکات مەگەر بە دوو شایەت، بە هەمان شێوە شێخ هیچ خاڵ و بیرۆکەیەك قبوڵ ناکات مەگەر بە دوو شایەت: قورئان و سوننەت، واتە ئەگەر لە قورئان و سوننەتدا بەڵگەی لەسەر هەبوو ئەوا هەقەو وەری دەگرێت، وە ئەگەر موخالەفەی قورئان و سوننەتیش بوو، ئەوە باتڵە، واتە قورئان و سووننەت تەرازوون.

هەروەها ئەو ئەبولقاسم ئەلجونەیدە[1] ڕەحمەتی خوا لێبێت _ دەڵێت: ئەم زانستەمان بە قورئان و سوننەتەوە بەستراوەتەوە، بۆیە هەر کەسێك قورئان نەخوێنێتەوەو فەرموودە نەنوسێت گونجاو نییە بۆی لە زانستەکەماندا قسەبکات[2]، یا گووتی: پەیڕەو ناکرێت و لاسایی ناکرێتەوە.

ئەوە ئەبو عوسمان ئەلنەیسابورییە[3] دەڵێت: هەر کەسێك سوننەتی بەسەر سوننەت خۆیدا پێشخست بە گوفتارو کردەوە ئەوە بە حیکمەتەوە دەدوێت،

---

(١)_ ئەوە ئەلجونەیدە، لەو پێشەوایانەن کە پەیڕەوی دەکەن و شوێنی دەکەون و لاسایی دەکەنەوە، خۆیان دەدەنە پاڵی، _ ڕەحمەتی خوا لێبێت _ هەرچەندە شێخی ئەو ڕێبازەیە بەڵام شوێنی قورئان و سوننەت دەکەوێت، باشە بۆچی ئەوان لەوەدا شوێنی ناکەون و لاسایی ناکەنەوە، لە کاتێکدا بانگەشەی ئەوە دەکەن کە لە ئەتباع و شوێنکەوتوانی ئەو پیاوەن و، گوایە شێخیانە.

(٢)_ ئەوە ئەلجونەیدە کە یەکێکە لە پێشەوایانیان، یەکێکە لەو خواپەرستان و زاهیدانەی کە صۆفیەکان بەسەرکردەی خۆیانی دەزانن، دەڵێت: زانستەکەمان بە قورئان و سوننەتەوە پابەند کراوە، کەوا بوو هەر کەسێك قورئان وەرنەگرێت و فەرموودە نەنوسێت لە سەر تەریقەتی ئێمە نییە.

(٣)_ ئەم پیاوەش دیسان لەو پێشەوا زاهیدە خواپەرستانەیە کە صۆفیەکان خۆیانی دەدەنە پاڵ، بەڵام ئەو موخالەفەیان دەکات.

هەر کەسێکیش هەواو ئارەزووات بەسەر نەفسی پێش خست بە گوفتارو کردەوە ئەوە بە بیدعە قسە دەکات[1]، چونکە لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنْ تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا﴾ ﴿قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيْكُمْ مَا حُمِّلْتُمْ وَإِنْ تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ﴾ [النور:٥٤] واتە: بڵێ فەرمانبەرداری خواو فەرمانبەرداری پێغەمبەر ﷺ بن ئینجا ئەگەر پشتیان هەڵکرد ئەوە ئەو (پێغەمبەر ﷺ) تەنها بەر پرسیارە لەوەی دراوە بەسەریدا (کە گەیاندنی پەیامی خوایە) وە ئێوەش بەرپرسن لەوەی دراوە بەسەرتاندا (کە باوەڕهێنانە)وە ئەگەر گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ بکەن، ئەوە هیدایەت وەردەگرن وە پێغەمبەر هیچی لەسەر نییە بێجگە لەگەیاندنی ڕوون و ئاشکرا (ی پەیامی خوا).

ئەوە ئەبوعەمری کوڕی نوجەیدە دەڵێت: هەر سۆزو خۆشەویستیەکی بەهێزو (وَجد)ێك قورئان و سوننەت شایەتی بۆ نەدەن پوچ و باتڵە[2].

---

(١)_ ئەوە ئەلنەیسابوریە دەڵێت: هەر کەسێك قورئان و سوننەت بەسەر نەفسی خۆیدا پێش خست ئەوە بەحیکمەت و دانای دەدوێت، واتە هەرکەسێك قورئان و سوننەت بکات بە ئەمیری خۆی و فەرمانەکانیان بەجێبێنێت و گوێڕایەڵیان بێت، چونکە فەرمانەکانی ئەمیر دەبیسترێت و گوێڕایەڵیی دەکرێت، کەوا بوو هەر کەسێك قورئان و سوننەت بەسەر نەفسی خۆیدا پێش بخات ئەوە بەدانایی دەدوێت و، هەر کەسیش هەواو ئارەزووات نەفسی خۆی پێش بخا ئەوە بە بیدعە قسە دەکات. بە ڕاستی ئەمە قسەیەکی زۆر گەورەیە.

(٢)_ (وَجْد) و (ذَوْق) دوو لەو دەستەواژانەن کە صۆفیەکان بەکاری دێنن و، هیچ بنەڕەتێکی ڕاستی لە قورئان و سوننەتدا نییە، پووچ و باتڵن. ئا ئەمە بوو قسەی ئەو شێخانەی کە شوێخولیسلام ـ ڕەحمەتی خوا لێبێت_ بۆی باسکردوین. گوفتاری هەر هەموویان لەسەر ئەوە کۆبۆتەوە.

خەڵكێكی زۆر لەم شوێنەدا هەڵە دەكەن، ئەگەر واتێگەیشت كەسێك وەلی و دۆستی خوایە، ئیتر وا تێدەگات هەموو ئەوەی دۆستی خوا بیڵێت لێی قبول دەكرێت، وە هەموو گوفتارەكانی بۆ خودی خۆی دەگەڕێنێتەوە (سلم إليه جميع ما يقوله)[1]،

---

(١)_ ئەمە یەكێكە لەهەڵەكانیان، ئەوان لەو باوەڕەدان كە وەلی خوا موناقەشە ناكرێت، وە هەموو گوفتارێكی لێوەردەگیرێت، تا ئەو ئاستەی دەڵێن: مورید واتە خوێندكار لای شیخەكەی خۆی وەكو مردووە لەبەردەم كەسی مردوو شۆردا، كە بەئارەزووی خۆی دەیجولێنێت، خوێندكار مافی هیچ هەڵبژاردنێكی نییە، وە هەق ناپێكێت مەگەر دوای ئەوەی كە هەر هەموو شتێك لەشێخەكەیەوە قبول بكات، هەتا ئەگەر گوتی بچۆرە نێو ئاگرەوە، دەچێتە نێو ئاگرەوە، ئاگرێكی بۆ دادەگیرسێنرێت و، فەرمانی پێدەدات بچێتە نێوی، دەچێتەنێوی، سەرپێچی ناكات، ئەمە یەكێكە لە بیروباوەڕەكانی تەصەوف، بەڵام ئەمە باتڵە، ئەمە دۆستی شەیتانە، ئەو كەسەی فەرمانێك بدات پێچەوانەی فەرمانی خواو فەرمانی پێغەمبەرەكەی بێت، با دڵنیا بێت دۆستی شەیتانە، ئەو دۆستی خوای گەورە نییە، ئەوان تەسلیم بە شێخەكانی خۆیان دەبن، لەسەر ڕاستی بن یان لەسەر هەڵە بن، موناقەیان ناكەن، ئەمە هەڵەیە، هەموو كەسێك لە گوفتارەكانی وەردەگیرێت و ڕەتدەكرێتەوە، جگە لەپێغەمبەری خوا ﷺ، هەرچەند مرۆڤ لە زانست و خواپەرستیدا لە پێش و گەورە بێت، گوفتارەكانی بەڕەهایی وەرناگیرێت، مەگەر هاوڕێكی قورئان و سوونەت بێت، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ والْيَوْمِ الآخِرْ﴾[النساء: ٥٩] واتە: جا ئەگەر دووبەرەكیتان هەبوو لە شتێكدا ئەوە بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ئێوە باوەڕتان هەیە بەخوا و بە ڕۆژی دوایی. بە واتایەكی دیكە ئەوەیە مانای وەلایەت و دۆستایەتی بەلای ئەوانەوە، گوایە وەلی موناقەشەی ناكرێت و، قسەكانی بەڕەهایی وەردەگیرێت، چونكە مەعصوم و پارێزراوە، هەڵەناكات، ئەو شتەی ئەوان دەیڵێن تەنها بۆ پێغەمبەری

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

-----------------------------------------------

حوابە ﷺ بەلام کەسانی تری غەیری ئەو هەرچەند لە زانست و خواپەرستیدا
پەرزبوونەوە لە هەڵە و تاوان پارێزراونیین، هەڵە دەکەن، باشە چ شتێك ڕاست و هەڵە
لە یەك جیادەکاتەوە، قورئان و سوننەت، بۆیە گوفتارەکانی وەلی دەخرێتە تەرازووی
قورئان و سوننەت، ئەوەی لەگەڵ قورئان و سوننەتدا گونجاو بێت هەقەو، ئەوەشی
کە موخالەفەی قورئان و سوننەت بێت پووچە، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت:
﴿فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إِلاَّ الضَّلالُ فَأَنَّى تُصْرَفُونَ﴾ [یونس: ٣٢] واتە: دەی لە پاش ڕاستی هیچ
هەیە، جگە لە گومڕایی دەی چۆن لە ڕێگەی ڕاست لادەدرێن؟! دڵنیابن هیچ هەقێك لە
ئارادانییە مەگەر ئەوەی قورئان و سوننەت ئاماژەی بۆ کرد بێت، تەنها ئەوە هەقە،
جگە لەو دووانە هەموو شتێك گومڕایی سەر لێشێوانە.

وە هەموو کردارەکانی بۆ خودی خۆی دەگەڕێنێتەوە (سلم إليه جميع ما يفعله)، ئەگەر چی موخالەفەی قورئان و سوونەتیش بکات[١]، ئیتر تەماشادەکەی موافیق و سازیاری ئەو کەسە دەبێت و، موخالەفەی ئەوە دەکات کە خوای گەورە بەپێغەمبەرەکەی خۆیدا ناردویەتی و بەسەر هەموو خەڵکیشدا فەرزی کردووە کە بە ڕاستگۆی دابنێن لەهەموو ئەوانەدا کە هەواڵی پێداوە، گوێڕایەڵیشی بکرێت، لە هەموو ئەوانەدا کە فەرمانی پێداووە[٢]،

---

(١)_ تەنانەت ئەگەر گوتی: بچۆرە نێو ئاگرەوە، دەچێتە نێوی و موناقەشە ناکات، بەڵام مەرجنییە وەلی لەهەڵەو تاوان پارێزراوبێت و، ئەوەی ئەو بیڵێت بەبێ هیچ چەن و چونێك قبوڵ بکرێت، ئەمە مەرج نییە، ئەمە درۆیە، بەڵکو وەلی بەندەیەکە لە بەندەکانی خوای گەورە، دڵنیا بن وەلی و دۆستی ڕاستەقینەی خوای گەورە لە هەمووان زیاتر شوێنکەوتوتری قورئان و سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ، دۆستی ڕاستەقینە قبوڵ ناکات گوفتارەکانی پێش قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بخرێت، بەمە ڕازی نابێت، ئەگەر بەوە ڕازی بوو ئەوە دۆستی ڕاستەقینە نییە.

(٢)_ لە ڕاستیدا خوای گەورە بەسەر هەموو خەڵکیدا فەرزیکردووە تەنها گوێڕایەڵی فەرمانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بن، بەڕاست دابنرێت لەوانەدا کە هەواڵی پێداوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ﴾[النساء: ٨٠] واتە: هەر کەسێك گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ بکات ئەوە بەڕاستی گوێڕایەڵی خوای کردووە، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا﴾[النور: ٥٤] واتە: وە ئەگەر گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ بکەن، ئەوە هیدایەت وەردەگرن، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءَهُمْ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ

---------------------------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------------------

بَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ اللَّهِ﴾[القصص: ٥٠] واتە: ئینجا ئەگەر بە گوێیان نەکردی (و وەڵامیان نەدایتەوە) ئەوە بزانە کە تەنها شوێن هەواو ئارەزووی خۆیان دەکەون وە کێ لەو کەسە گومڕاترە کە شوێن ئارەزووی خۆی بکەوێت بێ ڕێنموونیی لەلایەن خواوە، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿مَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾[الحشر: ٧] واتە: وە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێی دان وەری بگرن وە ئەوەی لێتانی قەدەغەکرد وازی لێ بێنن وە لە خوا بترسن بێگومان خوای گەورە سزای سەختە. ئەمە تەنها بۆ پێغەمبەری خوایە ﷺ بەڵام زانایان و شێخ و دۆستانی تر گوێڕایەڵیان ناکرێت، تەنها لەوانەدا نەبێت کە فەرمانی پێغەمبەری خوایان ﷺ تێدا جێبەجێ کردووە.

وە كردویەتی بە سنووری جیاكاری نێوان دۆستان و دوژمنانی خۆی، نێوان بەختەوەران و بەد بەختان[1]، كەوا بوو هەر كەس بە ڕاستی شوێنی كەوێت ئەوا لە دۆستە تەقواكارەكان و، سەربازە سەركەوتوەكان و، بەندە چاكەكانی خوای گەورەیە[2]، هەركەسیش شوێنینەكەوێت ئەوە یەكێكە لەدوژمنە دوورلوە ناونبارەكانی خوای گەورە[3] ئینجا سەرپێچیكردنی پێغەمبەری خوا ﷺ و، ملكەچكردن و سازیار بوون بۆ ئەو كەسەی كە گوایە وەلی خوایە یەكەم هار بۆ بیدعەو گومڕایی كەمەندكێشی دەكات، دواتریش بۆ كوفرو نیفاق و دوو ڕووی[4].

---

(١)_ خوای گەورە پێغەمبەرەكەی خۆی كردووە بە جیاكاری نێوان دۆستان و دوژمنانی خۆی، هەروەها كردویەتی بەجیاكاری نێوان ئەهلی بەهەشت و ئەهلی دوزەخ، نێوان بەختەوەران و بەدبەختان، تەنها پێغەمبەری خوا ﷺ جیاكارە، گوێڕایەڵی كردنی خوای گەورە، بەجێهێنانی فەرمانەكانی، خۆ دوورخستنەوە لە قەدەغەكراوەكانی، پێغەمبەری خوا ﷺ جیاكارە، بەڵام بەدەر لەو هەموو كەسێكی تر شیاوی تووشبوونە بە هەڵەكردن و ڕاستكردن و، مەعصوم و پارێزراو نییە.

(٢)_ هەر كەسێك بە ڕاستی شوێنی ئەو پێغەمبەرە ﷺ بكەوێت، ئەوە یەكێك لەسەربازە تەقواكارەكان و حیزبە سەركەوتووەكەی خوای گەورە.

(٣)_ هەر كەسێك شوێنی نەكەوێت ئەوە یەكێكە لە دوژمنانی خوا ئەگەر چی بەدۆستی خوای گەورە ناوبرێت، ئەو دۆستی خوای گەورە نییە.

(٤)_ بەڵێ، سەرپێچی كردنی پێغەمبەری خوا ﷺ یەكەم جار بەرەو گومڕا بوون و بیدعە و داهێنان مرۆڤ كەمەندكێش دەكات، دووەمیش بەرەو دەرەنجامی خراپی ڕۆژی دوایی، بەواتایەكی دیكە بۆ كوفر بۆ گومڕایی، پلە بەپلە لەسەر پێچیكردنەوە بۆ بیدعە بۆ گومڕایی و كوفر كەمەندكێش دەبێت، ئەمە بۆ ئەو كەسانەیە كە سەرپێچی پێغەمبەری خوا ﷺ دەكەن، پلە بەپلە لەسەر پێچیكردنەوە بۆ بیدعە دەچێت و، لە بیدعەشەوە بۆ گومڕابوون و كوفر دەچێت.

پەشیمانیەکی دەبێت لەو ئایەتەدا کە خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلًا (٢٧) يَا وَيْلَتَى لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا (٢٨) لَقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ الذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَاءَنِي وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِلْإِنْسَانِ خَذُولًا (٢٩)﴾[1]

هەروەها پەشیمانیەکی لەو ئایەتەدا دەبێت: ﴿يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِي النَّارِ يَقُولُونَ يَا لَيْتَنَا أَطَعْنَا اللَّهَ وَأَطَعْنَا الرَّسُولَا (٦٦) وَقَالُوا رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءَنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلَا (٦٧) رَبَّنَا آتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنَ الْعَذَابِ وَالْعَنْهُمْ لَعْنًا كَبِيرًا (٦٨)﴾[1].

---

(١)ـ هەر کەسێك گوێڕایەڵی مرۆڤێکی تری غەیری پێغەمبەری خوا ﷺ بکات لەسەر پێچی کردنی خوای گەورە ئابە و جۆرە پەشیمان دەبێتەوە، ﴿وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ﴾ ڕۆژێکە کە ستەمکار قەپ دەکات بە هەر دوو دەستی خۆیدا، لەبەر پەشیمان بوونەوە ئەوەها دەکات، ﴿يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلًا﴾ دەڵێت خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەردا ڕێگای ڕاستم بگرتایەتە بەر، کاتێ لە ڕۆژی قیامەتدا خرایە دۆزەخەوە ئەو قسانە دەڵێت: ﴿يَا وَيْلَتَى لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا﴾ تیاچوون بۆ من خۆزگە فلان کەسم نەکردایە بە هاوەڵ و خۆشەویستی خۆم، ﴿لَقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ الذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَاءَنِي وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِلْإِنْسَانِ خَذُولًا﴾ بەڕاستی ئەو کەسەی کردم بەهاوەڵ منی لە قورئان وێڵ کرد، دوای ئەوەی قورئانم پێگەیشت و باوەڕم پێ هێنا، وە شەیتان هەمیشە پشتێکەرو پشتبەردەرە بۆ ئادەمیزاد، ئەمە دەرەنجامەکەیە ـ پەنا بە خوا ـ بۆ ئەو کەسانەی کە سەرپێچی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەن و، گوێڕایەڵیی کەسانی تر دەکەن لە سەرپێچی پێغەمبەری خوا ﷺ ، لە کاتێکدا خۆیان بە وەلی و دۆستی خوای گەورە دەزانن.

(٢)ـ ﴿يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِي النَّارِ يَقُولُونَ يَا لَيْتَنَا أَطَعْنَا اللَّهَ وَأَطَعْنَا الرَّسُولَا﴾ ڕۆژێ کە دەموچاوەکان لە ئاگری دۆزەخدا ئەمدیو ئەودیو دەکرێن، دەڵێن: خۆزگە

گوێڕایەڵی خواو گوێڕایەڵی پێغەمبەرمان بکردایە، خۆزگە دەخوازن، بۆ یاندەرکەوت ئەوەی کە خستنیە نێو ئاگری دۆزەخەوە تەنها سەرپێچی خواو سەرپێچی پێغەمبەرەکەی ﷺ بوو، هەڵەکەی خۆیان بۆ دەرکەوت، ئەوەی تووشی کردن بریتی بوو لە گوێڕایەڵیی نەکردنی خواو گوێڕایەڵیی نەکردنی پێغەمبەرەکەی ﷺ، ﴿وَقَالُوا رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءَنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلَا﴾ دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان بە ڕاستی ئێمە بەگوێی سەران و گەورەکانمان کرد ئیتر لە ڕێگای ڕاست گومڕایان کردین، ئەمە بە هاوشێوەی ئەو ئایەتەیە کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾[التوبة: ٣١] واتە: زاناو عابیدەکانیان کردوە بە پەروەردگار لە جیاتی خوا. پاشانیش سەرزەنشتی یەکتر دەکەن ﴿رَبَّنَا آتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنَ الْعَذَابِ وَالْعَنْهُمْ لَعْنًا كَبِيرًا﴾ ئەی پەروەردگارمان دوو بەرامبەر سزایان بدەو بەر نەفرینی گەورەی خۆتیان بخەی، بەڵام ئەمە هیچ سوودێك نابەخشێت، سەرزەنشتکردنی یەکتر هیچ سوودێکی نییە _ پەنا بە خوا _.

هەروەها بەشێکیشی لە ئایەتەدا دەبێت: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ وَلَوْ يَرَى الَّذِينَ ظَلَمُواْ إِذْ يَرَوْنَ الْعَذَابَ أَنَّ الْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعَذَابِ(١٦٥) إِذْ تَبَرَّأَ الَّذِينَ اتُّبِعُواْ مِنَ الَّذِينَ اتَّبَعُواْ وَرَأَوُاْ الْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ الأَسْبَابُ(١٦٦)وَقَالَ الَّذِينَ اتَّبَعُواْ لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّؤُواْ مِنَّا كَذَلِكَ يُرِيهِمُ اللَّهُ أَعْمَالَهُمْ حَسَرَاتٍ عَلَيْهِمْ وَمَا هُم بِخَارِجِينَ مِنَ النَّارِ(١٦٧) يَا أَيُّهَا النَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِي الأَرْضِ حَلاَلاً طَيِّبًا وَلاَ تَتَّبِعُواْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ(١٦٨)﴾[1] واتە: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن﴾ وە کەسانی وا هەیە لە خەڵکی کە هاوبەشی زۆر بۆ خوا پەیدا دەکەن خۆشیان دەوێن وەك خۆشەویستی (ئیمانداران بۆ) خوا بەڵام ئەوانەی بڕوایان هێناوە زۆر زیاتر خوایان خۆش دەوێت ئەگەر ببینن ئەوانەی ستەمیان کردووە (بە هۆی هاوبەشی پەیداکردن بۆ خوا) کاتێك کە چاویان دەکەوێت بەسزا (ی خوا دەزانن کە هەرچی دەسەڵات هەیە هەمووی بۆ خوایە وە بێگومان سزای خوا زۆر سەختە کاتێك کە پێشەواکان یەخە هەڵتەکێنن لەوانەی (لە دونیادا) دوایان کەوتوون وە سزایان (بەچاوی خۆیان) بینی وە هەموو پەیوەندی یەکیان بچڕایەوە، وە ئەوانەی کە دوایان کەوتبوون گوتیان خۆزگە ئێمە بگەڕاینایەتەوە (بۆ دنیا) تا یەخەمان لێ هەڵ بتەکاندنایە هەروەك (ئەوان) یەخەیان لە ئێمە هەڵتەکاند ئاوا خوا کردەوەکانیان نیشان ئەدات بە داخ لە سەر دڵیان وە ئەوان دەرچوونیان نییە لە ئاگر ئەی خەڵکینە بخۆن لەوەی کە لە زەویی دایە بە حەڵاڵی و پاکی وە دوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون بەڕاستی شەیتان دوژمنێکی ئاشکراتانە.

---

(١)_ کەسانی وا هەن لە نێو خەڵکیدا کە هاوبەشێکی زۆر بۆ خوا پەیدادەکەن، هاوبەشێکی زۆر کە بە خوایان دەچوێنن، بە هاوبەشی خوای گەورەیان دەکەن، ئەمە ڕێبازی گۆڕپەرستان و درەخت و بەرد پەرستانە، هەر کەسێك شتێکی تری غەیری

خـوای گـەورە بپەرستێت، با دڵنیا بێت لەبەر ئەوە دەیپەرستێت چونکە خۆشی دەوێت، کافران ئەو بت و درەخت و بەردەیان خۆش دەوێت کە دەیپەرستن، گۆڕیان خۆی دەوێت، ئەگەر خۆشیان نەویستبا نەیان دەپەرست، ئەگەر ڕقیان لێبوایە نەیاندەپەرست، بەڵام ئیمانداران خوای گەورەیان خۆشی دەوێت بە خۆشویستنێکی پاك و بێگەرد بۆیە بە تەنها ئەو زاتە دەپەرستن، کە هیچ هاوبەشێکی نییە، تەنها خوایان خۆشی دەوێت بە (محبة العبادة) واتە: بەخۆشەویستی پەرستن، (محبة العبادة) خۆشەویستی پەرستن: جگە لە خوای گەورە بۆ هیچ کەسێکی تر شیاو نییە، ئەو مەحەبەت و خۆشەویستییە کە زەلیلبوون و ملدان و ملکەچێتی لەگەڵدایە، ئەمەش جگە لە خوای گەورە بۆ هیچ کەسێکی تر شیاو نابێت، بەڵام ئەو مەحەبەت و خۆشویستنەی کە زەلیلی و ملکەچی لەگەڵ دا نییە بریتییە لە مەحەبەتێکی سروشتی و ئاسایی وەکو ئەوەی مرۆڤێك خێزان و منداڵ و سەروەت و سامانەکەی خۆی خۆشی دەوێت، ئەو خۆشویستنە زەلیلی و ملکەچ بوونی لەگەڵدا نییە و تەنها مەحەبەت و خۆشویستنێکی سروشتی و ئاساییە. کافران بتیان خۆشی دەوێت بۆیە دەیپەرستن، ئیمانداران خوای گەورەیان بەتەنها خۆشویست بۆیە بەتەنها زیاتر لە هەموو شتێك ئەو زاتەیان پەرست، ئەنجامەکەش لە ڕۆژی قیامەتدا ئاشکرا دەبێت، ئەوانەی لە جیاتی خوای گەورە بتیان خۆشی دەوێت، لەو ڕۆژەدا خۆی لە شوێنکەوتوانی بەری دەکات، ئەوانەی فریشتەیان دەپەرست، ئەوانەی ئەولیایان دەپەرست، ئەوانەی پێغەمبەرانیان دەپەرست، هەموو ئەمانە خۆیان لە شوێنکەوتوانیان بەری دەکەن، خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُو مِن دُونِ اللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَن دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ (٥) وَإِذَا حُشِرَ النَّاسُ كَانُوا لَهُمْ أَعْدَاءً وَكَانُوا بِعِبَادَتِهِمْ كَافِرِينَ(٦)﴾[الأحقاف: ٥ـ٦] واتە: کێ گومڕاترە لەو کەسەی کە هاوار لە غەیری

خوا دەكات كە وەڵامی ناداتەوە تا ڕۆژی دوایی وە ئەو (هاوارلێكراو)انە لە هاواری ئەوان بێ ئاگان كاتێكیش خەڵك كۆدەكرێنەوە (لە قیامەت) پەرستراوەكان دەبنە دوژمنیان وە (پەرستراوەكان) بەپەرستنەكەیان باوەڕ ناكەن. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ فَيَقُولُ أَأَنتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِي هَؤُلَاء أَمْ هُمْ ضَلُّوا السَّبِيلَ(١٦) قَالُوا سُبْحَانَكَ مَا كَانَ يَنبَغِي لَنَا أَن نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ مِنْ أَوْلِيَاء وَلَكِن مَّتَّعْتَهُمْ وَآبَاءَهُمْ حَتَّى نَسُوا الذِّكْرَ وَكَانُوا قَوْمًا بُورًا(١٧)﴾[الفرقان: ١٦_١٧] واتە: وە لەو ڕۆژەدا خوا ئەو (بت پەرست)انە كۆدەكاتەوە لەگەڵ ئەو پەرستراوانەی كە پەرستونیان جگە لە خوا ئینجا خوا (بە پەرستراوەكان) دەڵێ ئایا ئێوە ئەو بەندانەی منتان گومڕا كرد یا خۆیان ڕێگای (ڕاستیان) ونكردو گومڕا بوون (پەرستراوەكان) دەڵێن پاك و بێگەردی بۆ تۆ بۆ ئێمە شایستە نەبووە كە بێجگە لە تۆ پەرستراوێك بۆ خۆمان دابنێین، بەڵام نازو نیعمەتت دا بەوان و باوو باپیرانیان هەتا (وایان لێهات) یادی تۆیان لە بیرچوو وە ئەوانە كۆمەڵێكی تیاچووی بێ خێر بوون. لە ڕۆژی قیامەتدا پەرستراوەكان ئەو كەسانەی كە دەیانپەرستن بەدرۆ دەخەنەوەو، دەڵێن: هەرگیز ئێمە فەرمانمان پێنەداون و، ڕازی نەبوین لەجیاتی خوای گەورە بمانپەرستن، ئا ئەمەیە دەرەنجامی ئەو كەسانەی كە گوێڕایەڵی غەیری پێغەمبەری خوا ﷺ دەبن، ئەوەیە دەرەنجامی كۆتاییان لە ڕۆژی قیامەتدا، بۆیە دەڵێن: ﴿يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلًا﴾[الفرقان: ٢٧] واتە: دەڵێ خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەردا ڕێگای ڕاستم بگرتایەتە بەر.

ئەم جۆرە كەسانە هاوشێوەی ئەو گاورانەن[1] كە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ[2] وَمَا أُمِرُواْ إِلاَّ لِيَعْبُدُواْ إِلَـهًا وَاحِدًا لاَّ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾[3] [التوبة: ٣١] واتە: زاناو عابیدەكانیان كردوە بەپەروەردگار لە جیاتی خوا هەروەها مەسیحی كوڕی مەریەمیش (یان كردووە بەخوا) لە كاتێكدا فەرمانیان پێنەدراوە بێجگە لەوەی كە یەك خوا بپەرستن كە هیچ پەرستراوێكی ڕاست نییە بێجگە لە ئەو پاك وبێگەردی بۆ ئەو (خوا) لەوەی دەیكەنە هاوبەشی.

---

(١)_ ئەوانەی كە ئەولیاو پیاوچاكان دەكەن بەپەرستراوی خۆیان و لەهیچ شتێكدا موناقەشەیان ناكەن، كوێرانە ملكەچیان دەبن، ئەمانە هاوشێوەی گاورەكانن.

(٢)_ (الاحبار) واتە زانایان، وە (الرهبان) واتە: خواپەرستان، لە جیاتی خوای گەورە كردنیان بە خوا، ئەمە مانای ئەوەنییە سوژدەیان بۆ بردن و، سەربڕینیان بۆ كردن، نەخێر، بەڵكو بەو جۆرەیە كە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی باس كردوین كە حەرامەكانیان بۆ حەلاڵ كردن و، حەلاڵەكانیان بۆ حەرام كردن، گوێڕایەڵیان بوون، ئا ئەمە پەرستنیان بوو بۆ ئەوان.

(٣)_ ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە شیاو نییە گوێڕایەڵیی زانایان و كار بەدەستان و پێغەمبەران بكرێت، تەنانەت پێغەمبەرانیش شیاونییە لە جیاتی خوای گەورە بكرێن بە پەروەردگار، بەڵام گاورەكان مەسیحی كوڕی مەریەمیان كردووە بە كوڕی خوا، پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە لەوەی كە دەیڵێن، پەروەردگاریێتی تایبەتە بە خوای گەورەوە.

وفي المسند وصححه الترمذي عن عدي بن حاتم في تفسيره هذه الآية لما سأل النبي ﷺ عنها فقال: ما عبدوهم ؟ فقال النبي ﷺ ((أَحَلُّوا لَهُمُ الحَرَامَ، وَحَرَّمُوا عَلَيْهِمُ الحَلالَ، فَأطَاعُوهُمْ، وَكَانَتْ هَذِهِ عِبَادَتَهُمْ إِيَّاهُمْ))(١) واتـه: عـەدی كـوڕی حـاتم گوێبیسـتی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو ئەو ئایەتـەی دەخوێنـدەوە، بە پێغەمبەری خوای ﷺ فەرموو: ئێمە ئەمان دەپەرستن! پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فـەرموو: ((ئەوان حەرامەكانیان بۆ حەلاڵ كردن و، حەڵاڵەكانیان بۆ حەرامكردن، گوێڕایەڵیان بوون، ئا ئەمە پەرستنیان بوو بۆ ئەوان)).

---

(١)_ إسناده ضعيف: أخرجه الترمذي (٣٠٩٥)، والطبري في تفسيره (١٤/٢٠٩_٢١١).

قال أبوعيسى: هذا حديثٌ غريب، لا نَعْرِفُهُ، إلا من حديث عبدالسلام بن حرب، وغُطَيْفُ بنُ أَعْيَنَ ليس بمعروفٍ في الحديث.

قلت: كذا قال: وغطيف ضعيف، وقد ورد هذا المعنى، عن حذيفة موقوفاً عليه عند الطبري، وكذلك روي عن جماعة من السلف نحو هذا التفسير وظاهر الآية يساعده، والله أعلم.

بەڵێ، لە حەڵاڵكردنی حەرام كردنی حەڵاڵدا گوێڕایەڵیان كردن، بەڵام حەڵاڵكردن و حەرام كردنی تەنها مافی خوای گەورەیە، بۆ هیچ كەسێكی تر شیاو نییە حەڵاڵ و حەرام بكات، بەبێ ئەوەی بۆ قورئان و سوننەت بگەڕێتەوە، هەر كەسێك شتێك حەرام بكات بەبێ ئەوەی لە قورئان و سوننەتدا بەڵگەی لەسەر هاتبێت، با دڵنیا بێت، هاوبەشی خوای گەورەی كردووە لە پەروەردگارێتیدا، چونكە ئەوە مافی پەروەردگارێتییە.

بۆیـه گـووتراوه: لـه ڕاسـتیدا گەشـتنیان لـێ قەدەغـەکرا چـونکە بنچـینەکانیان پشـتگوێ خسـت (إنما حرموا الوصول بتضييع الأصول)[١]، چـونکه بنچـینه هـەموو بنەڕەتەکان بەجێهێنانی بڕواهێنانە بـەوەی کـە بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ دابـەزیوە، پێویستە بڕوا بە خـوا و پێغەمبەرەکـەی و بـەوەی کـە بـۆ پێغەمبەرەکـەی دابـەزیووە بکرێـت، بـڕوا بکرێـت بـەوەی موحەممـەد پێغەمبـەری خوایـە ﷺ، بـۆ هـەر هـەموو مـەخلوقات نێـردراوە، ئـادەمیزادو جنۆکـەکان، عـەرەب و عەجەمـەکانیان، زانـاو خواپەرستەکانیان، پاشاو جەماوەرەکەیان[٢]،

---

(١)_ دەربارەی ئەو کەسانەی کە گوێڕایەڵیی ئـەحبارو ڕوهبـان و ئـەولیا دەکـەن گوتراوە: گەشتیان لێ قەدەغەکرا چونکە ئوصول و بنەڕەتەکانیان پشت گوێ خست، مەبەست بـە (ئوصـول): بریتیـە لـە گوێڕایـەڵیی خـواو پێغەمبەرەکـەی، شـوێنکەوتنی قورئـان و سـوننەت، ئائەمانـە ئوصـول و، کـاتێ پشـتگوێیان خسـت، گەیشـتنیان بە ڕەحمەت و بەزەیی بە بەندی لە دەستدا بۆیە زانایان دەڵێن: (إنما حرموا الوصول بتضييع الأصول).

(٢)_ پێویستە بڕوا بەوەبکرێت کە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـۆ ئـادەمیزادو جنۆکە، عـەرەب و عەجـەم نێـردراوە، بـۆ هـەر هـەموو مرۆڤایـەتی نێـردراوە، بـۆ پاشـاکان، ئەمیرەکان، ڕەمەکی خەڵك، زانایان، نەفامان نێردراوە، ئەو بـۆ هـەر هـەموو مرۆڤایـەتی نێردراوە، لەسەر هەر هەموو خەڵکی واجیبە گوێڕایەڵی بن، لەسـەر هـەر هـەموو خـەڵکی واجیبە پا بەندی فەرمانەکانی بن، بۆ هیچ کەسێك نییە لە چوار چێوەی گوێڕایەڵ بوونی پێغەمبەری خوا ﷺ بچێتە دەرەوەو، دواتـریش بانگەشـەی ئـەوە بکـات کـە بـە خـوای گەورە گەیشتووەو، پێویستی بەپێغەمبەرﷺ ! نییە وەکو ئەوەی صۆفیەکان دەیڵێن، یـا بانگەشـەی ئـەوە بۆ وەلیـەکان بکـات کـە گوایـە زانـاترن ، بـوە بـە زانـاو عـاریف و ڕاستەوخۆ لە خواوە شت وەردەگرێ و، چیتر پێویستی بە پێغەمبەر نەماوە، وەکو

ئەوەی زیندەڕاییکارانی تەسەوف وادەڵێن، بەڵام پاش ناردنی پێغەمبەری خوا ﷺ پێویستە هەر هەموو مرۆڤایەتی گوێڕایەڵ و شوێنکەوتووی ئەو بن، تەنانەت ئەگەر پێغەمبەری دیکەش هەبێت واجیبە شوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەوێت وەکو ئەوە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وإذ أخذ الله ميثاق النبيين لما آتيتكم من كتاب وحكمة ثم جاءكم رسول مصدق لما معكم لتؤمنن به ولتنصرنه قال أأقررتم وأخذتم على ذلكم إصري قالوا أقررنا قال فاشهدوا وأنا معكم من الشاهدين﴾[آل عمران: ٨١] واتە: (بهێنەرەوە یادیان) کاتێک کە خوا پەیمانی وەرگرت لە پێغەمبەران کە هەرچیم دانێ لە نامەو حیکمەت (شەریعەت) لە پاشان پێغەمبەرێکتان بۆ هات بەبڕوا هێنەر بەو نامەی کە لە لاتانە دەبێ بڕوای پێ بهێنن وە یارمەتی بدەن خوا فەرمووی: ئایا دانتان نا بەم پەیمانەدا؟ وە لەسەر ئەوە پەیمانی منتان وەرگرت پێغەمبەران گوتیان: بەڵێ دانمان پیا ناو پەیمانمان بەست خوا فەرمووی کەواتە ئێوە بەشاهێد بن وە منیش لە گەڵ ئێوە یەکێکم لە شاهێدان. کە خوای گەورە دەفەرموێت: لە پاشان پێغەمبەرێکتان بۆ هات، مەبەستی موحەممەدە ﷺ، لەم ئایەتەدا ئەوە ئاشکرا دەبێت کە خوای گەورە لە پێغەمبەران پەیمانی وەرگرتووە، ئیتر بۆ کەسانی غەیری ئەوان دەبێ چۆنبێت، خوای گەورە ئەو پەیمانەی لە پێغەمبەران وەرگرتووە کە ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ نێردراو، یەکێک لەوان مووسا یان عیسا یان هەر یەکێک لەوان زیندوو بوو پێویستە شوێنی ئەم پێغەمبەرە ﷺ بکەون، چونکە پەیامەکە بە ئەو درا ﷺ، کە کۆتا پێغەمبەرانە، هەموو کەسێک پێویستە شوێنیکەوێت ﷺ، چونکە پەیامەکەی گشتیەو بۆ ئادەمیزادو جنۆکە و پێغەمبەران و غەیری ئەوانیشە، هیچ کەسێک ناتوانێت لە چوارچێوەی گوێڕایەڵیی ئەو بچێتەدەرەوە ﷺ، کەوابوو شێخانی ئەهلی تەصوف چۆن دەتوانن لە چوار چێوەی گوێڕایەڵیی ئەو بچنە دەرەوە، ئەگەر لە گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ چوونەدەرەوە ئەوە وەلی و دۆستی خوا نین، بەڵکو تەنها دۆستی شەیتانن.

وە هیچ کەسێك ڕێگەیەکی دیکەی نییە بۆ ئەوەی بەخوای گەورە بگات مەگەر شوێنی ئەم پێغەمبەرە ﷺ بکەوێت هەم بە ڕوخسار و هەم بە ناخ[1]، دڵنیابن ئەگەر مووساو عیساو پێغەمبەرانی دیکەی غەیری ئەوانیش پێی بگەیشتنایە بێگومان لەسەریان واجیب بوو شوێنی بکەون، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ لَمَا آتَيْتُكُم مِّن كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنصُرُنَّهُ قَالَ أَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَى ذَٰلِكُمْ إِصْرِي قَالُوا أَقْرَرْنَا قَالَ فَاشْهَدُوا وَأَنَا مَعَكُم مِّنَ الشَّاهِدِينَ(٨١) فَمَنْ تَوَلَّى بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ (٨٢)﴾[2] [آل عمران: ٨١_٨٢].

قالَ ابن عباس رضي الله عنهما مَا بَعَثَ اللَّهُ نَبِيًّا إِلاَّ أَخذَ عَلَيْهِ الْمِيثَاقُ، لَئِنْ بُعِثَ محمد وَهُوَ حَيٌّ لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ وَلَيَنْصُرَنَّهُ، وَأَمَرَهُ أَنْ يَأْخُذَ عَلَى أُمَّتِهِ الْمِيثَاقَ: لَئِنْ بُعِثَ محمد ﷺ وَهُمْ أَحْيَاءٌ لَيُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَيَنْصُرُنَّهُ[3]. واتە: ئیبن وعەبباس رضي الله عنهما فەرموویەتی: خوای گەورە هەر پێغەمبەرێکی ناردبێت پەیمانی ئەوەی لێوەرگرتووە کە ئەگەر زیندوو بوو و موحەممەد ﷺ نێردرا دەبێت ئیمانی پێ بێنێت و سەریبخات، وە فەرمانی بەو پێغەمبەرەش کردووە لە ئوممەتەکەی خۆی پەیمان وەربگرێت بەوەی ئەگەر زیندوو بوون و موحەممەد ﷺ نێردرا دەبێت ئیمانی پێ بێنن و سەری بخەن .

---

(١)_ بە ڕووکارو ناوەکی، ئەوە بەس نییە تەنها بە ڕووکار شوێنیی بکەوێت، ئەوە ڕێبازی مونافیق و دوو ڕووەکانە، بەڵکو پێویستە بەڕووکارو ناوەکی شوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەویت.

(٢)_ ﴿فَمَنْ تَوَلَّى بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ جا ئەوەی پاش وەرگرتنی ئەم پەیمانە پشتی هەڵکرد، ئەوە کەسانێکی فاسیق و دەرچوانن لەفەرمان، واتە: لە گوێڕایەڵ بوونی خوای گەورە.

(٣)_ أخرجه الطبري بلفظ قريب (٦/٥٥٦)، من طريق محمد بن أبي محمد، عن عكرمة أو سعيد بن جبير، عن ابن عباس.

-----------------------------------------------

-----------------------------------------------

-----------------------------------------------

ومحمد بن أبي محمد (وهو مولى زيد بن ثابت) مجهول، فالأثر ضعيف: وقد ورد معنى هذا الأثر عن علي أيضا عند ابن جرير (٦/٥٥٥)، وفي إسناده سيف بن عمر وقد أتهم بالوضع وورد هذا المعنى عن جمع من السلف.

وفيه أوجه أخرى في تفسير الآية، والله أعلم.

خوای گەورە گوێڕایەڵ بوونی ئەم پێغەمبەرەی بەسەر هەر هەموو خەڵکیدا واجیب کردووە، عەرەب و عەجەم، پەیامەکەی گشتییە بۆ تێکڕای ئادەمیزادو جنۆکە، ئەمەش یەکێکە لەو شتانەی کە خوای گەورە تەنها بەم پێغەمبەرەوەی ﷺ تایبەت کردووە، پێچەوانەی لە پێغەمبەرانی دیکە، لە تایبەتمەندیەکانی ئەو پێغەمبەرە ﷺ ئەوەیە کە پەیامەکەی گشتییە بەڵام پەیامی پێغەمبەرانی تری پێش ئەو بەقەومەکانی خۆیانەوە تایبەت بوو. مەبەستی سەرەکی لێرەدا ئەوەیە بەرپەچی ئەو کەسانە بدرێتەوە کە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە کەسانێکی دیکەی غەیری پێغەمبەری خوا ﷺ هەن واجیبە گوێڕایەڵیان بکرێت بەسەر خواو پێغەمبەر، بەنموونەی ئەو کەسانەی شێخ و تەریقەتەکانی خۆیان دەکەن بەهۆکاری گەیشتن بەخوای گەورە، وەکو زیندەڕۆییکارانی تەصوف، بەڵام دڵنیابن هیچ ڕێگەیەك بۆ بەخوا گەیشتن نییە تەنها لەڕێگەی ئەو پێغەمبەرەوە ﷺ نەبێت، خوای گەورە لە بارەوە دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ(٣١) قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ(٣٢)﴾[آل عمران: ٣١_٣٢] واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت کەواتە دوای من بکەون تا خواش ئێوەی خۆش بوێت وە لە گوناهەکانتان خۆش ببێت وە خوا لێخۆشبووی میهرەبانە بڵێ فەرمانبەری خوا و پێغەمبەر بکەن ئینجا ئەگەر پشت هەڵکەن ئەوە بێگومان خوا بێ بڕوایانی خۆش ناوێت. هەروەها کەسانێکی تریش هەن

-----------------------------------------------
-----------------------------------------------
-----------------------------------------------

ئەو بانگەشەیە دەکەن کە جوولەکەو گاورەکان لەسەریان پێویست نییە شوێنی موحەممەد ﷺ بکەون، بەڵکو لەسەر شوێنکەوتنی موساو عیسا دەمێننەوە، دڵنیا بن کەسانێکی تریش هەن لەوانەی خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام ئەو جۆرە قسانە دەکەن، دەڵێن: واجیب نییە تێکڕای خەڵکی شوێنی موحەممەد ﷺ بکەون، بەڵکو هەر کەسێك شوێنی مووسا بکەوێت لەسەر ئاینێکی ڕاستە، هەرکەس شوێنی عیسا بکەوێت لە کاتی ئەمڕۆماندا لەسەر ئاینێکی ڕاستە،، هەر هەموویان بەخوا دەگەن، وەلامدانەوەی ئەو جۆرە قسانەش لە قورئاندایە وەکو ئەوەی گوێبیستی بوون: ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ لَمَا آتَيْتُكُم مِّن كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنصُرُنَّهُ قَالَ أَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَى ذَلِكُمْ إِصْرِي قَالُواْ أَقْرَرْنَا قَالَ فَاشْهَدُواْ وَأَنَاْ مَعَكُم مِّنَ الشَّاهِدِينَ(٨١) فَمَنْ تَوَلَّى بَعْدَ ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ (٨٢) أَفَغَيْرَ دِينِ اللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ(٨٣)﴾[آل عمران: ٨١ـ٨٣]. یارمەتی بدەن، کەوا بوو ئەگەر یەکێك لە پێغەمبەران زیندوو بوایەن لەو کاتەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ نێردرا لەسەری واجیب دەبوو شوێنی بکەوێت، ئیتر بارو حاڵی کەسانی دیکەی وەکو سەرانی تەصەووف دەبێ چۆن بێت؟ ئەو کەسانەی ئەمڕۆ دەڵێن: ئێمە لەسەر ئایینی موساین یان لەسەر ئایینی عیساین درۆزنن، چونکە بەناردنی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایینی مووسا تەواو بوو، ئایینی عیسا تەواو بوو، ئایینی موحەممەد ﷺ تەنها ڕێگەیەکە بۆ گەیشتن بەخوای گەورە، بۆیە هەر کەسێك بە ڕاستی شوێنی ئەم پێغەمبەرە نەکەوێت کافرە ئەگەرچی واش ڕابگەیەنێت کە لەسەر ئایینی مووسا یان عیسایە، یان شوێنی شێخەکەی خۆی یان کەسانی تر دەکەون، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ﴾[آل عمران: ٣١]، ئەمە شتێکە واجیبە باوەڕت پێ هەبێت، پێویستە

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

بارەبرێکی بەهێزت هەبێت کە هیچ ئـایینێکی دیکـەی جگـە لـە ئایینەکـەی موحەمـەد ﷺ لە ئارادا نییە هەتا ڕۆژی قیامەت، هیچ ئایینێك نییە تەنها ئایینی ئەو نەبێت، هیچ کەسێك ڕزگاری نابێـت مەگـەر بـە شـوێنکەوتی موحەمـەد ﷺ، ئەمـە بـوو مانـای ئایەتەکە.

هەروەها خوای گەورە لەو بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُواْ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُواْ إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُواْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً بَعِيدًا(٦٠) وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَى مَا أَنزَلَ اللّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا(٦١) فَكَيْفَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ثُمَّ جَآؤُوكَ يَحْلِفُونَ بِاللّهِ إِنْ أَرَدْنَا إِلاَّ إِحْسَانًا وَتَوْفِيقًا(٦٢) أُولَئِكَ الَّذِينَ يَعْلَمُ اللّهُ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَعِظْهُمْ وَقُل لَّهُمْ فِي أَنفُسِهِمْ قَوْلاً بَلِيغًا(٦٣) وَمَا أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلاَّ لِيُطَاعَ بِإِذْنِ اللّهِ وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُواْ أَنفُسَهُمْ جَآؤُوكَ فَاسْتَغْفَرُواْ اللّهَ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمُ الرَّسُولُ لَوَجَدُواْ اللّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا(٦٤) فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا(٦٥)﴾[(١)] [النساء: ٦٠_٦٥]

---

(١)_ پێویستە لە دووبەرەکی و جیاوازیدا شەریعەتەکەی موحەمەد ﷺ بکرێت بە دادوەر، کە بریتیە لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، ئەگەر لە بواری بیروباوەڕدا یان لە ماڵ و سامان و ناکۆکی و مشتومڕ دا جیاوازیەك لە نێوان خەڵکیدا روویدا پێویستە قورئان و سوننەت بکرێت بە دادوەر، هەر کەسێك شتێکی دیکەی غەیری شەریعەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بکات بە دادوەر کافرە بەو مەرجەی لەو باوەڕدا بێت کە بۆی دروستە وا بکات، یان سەرپشك کراوەو ئەگەر ئارەزووی لێبێت حوکم بەشەرعی موحەمەد ﷺ دەکات یان بە یاسا دانراوەکانی ئەمڕۆ، یان حوکمێکی تر هەیە یەکسانە بەحوکمی قورئان و سوننەت، یان لە حوکمی قورئان و سوننەت چاکترە، یان لەو باوەڕ دابێت کە لە مڕۆدا یاسا دانراوەکان بۆ خەڵك چاکترە، کەسێکی لەو جۆرە کافرە بە کوفری گەورە کە لە چوار چێوەی ئیسلام دەیکات دەرەوە _پەنا بە خوا_، هۆی دابەزینی ئەو ئایەتانە وەکو ئەوەی ڕاڤەکارانی قورئان باسیان بۆ کردووین ئەوەبوو کە لە نێوان پیاوێکی مونافیق کە بانگەشەی ئەوەیدەکرد

واتە: ئایا ئاوڕێکت نەداوەتەوە بە لای ئەوانەی [illegible] وا خۆیانیشان دەدەن کە بە ڕاستی ئەوان باوەڕیان هێناوە بەوەی دابەزیوە بۆتۆ (کە قورئانە) بەوەش کە پێش تۆ دابەزیووە (کە تەوراتە) دەیانەوێت کە داد بەرن بۆ لای یەکێك کە حوکم بەبەرنامەی خوا ناکات لە کاتێکدا بە ڕاستی فەرمانیان پێکراوە کە بڕوایان پێنەبێت وە شەیتان دەیەوێت کە گومڕایان بکات بە گومڕایەکی دوور لە ڕاستی وە ئەگەر پێیان بوترێ: وەرن بۆ لای ئەوەی خوا ناردویەتیە خوارەوە وە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ دەبینی (ئەی موحەممەد ﷺ) دوو ڕووەکان ڕووت لێ وەردەگێڕن بە وەرگێڕانێکی ئەوا ئایا حالیان چۆن ئەبێت کاتێك بەسەرهاتێکی ناخۆشیان تووش بێت؟ بە هۆی ئەوەی دەستیان پێشی خستووە (کردویانە) پاشان دێنەوە بۆ لات و سوێند دەخۆن بە خوا تەنها نیازی چاکەو یەك خستنەوەمان بووە (کاتێك کە حوکم دەبەین بۆ لای غەیری خوا) ئەوانە کەسانێکن خوا دەزانێت چی لە دڵیاندا هەیە کەواتە ڕوویان لێ وەرگێڕە وە ئامۆژگاریان بکەوە پێیان بڵێ دەربارەی خۆیان ووتەیەکی ڕەوان و کاریگەر وە هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت گوێڕایەڵی بکرێت بە فەرمانی خوا وە بێگومان ئەگەر ئەوان کاتێ ستەمیان لە نەفسی خۆیان کرد بهاتنایە بۆلات و داوای لێ بووردنیان بکردایە لە خوا پێغەمبەریش داوای لێ خۆشبوونی بۆ بکردنایە بێ گومان دەیان بینی خوا پەشیمانی وەرگری بە بەزەییە نەخێر (وانییە کە خۆیان بە باوەڕدار نیشان دەدەن) سوێند بەپەروەردگارت بڕوادارنین تا تۆ نەکەنە دادوەر لە هەر ئاژاوە و دووبەرەکیەکی نێوانیاندا لە پاشان هەست نەکەن لە دەروونیاندا بە هیچ بێزارییەك لەو بڕیارەی تۆ داوتە و مل کەچ نەکەن بە ملکەچیەکی تەواو.

---

ئیمانی بە موحەممەد ﷺ هەیەو لە نێوان پیاوێکی جولەکەدا ناکۆکیەك ڕوویدا، پیاوە جولەکەکە گوتی با کێشەو دواکەمان بەرینە لای موحەممەد ﷺ، چونکە پێشتر دەیزانی موحەممەد ﷺ بەرتیل وەرناگرێت، بەڵام پیاوە دوو ڕووەکە گوتی:

----------------------------------------------------------------

----------------------------------------------------------------

----------------------------------------------------------------

کێشەو داواکەمان دەبینە لای کەعبی کوڕی ئەشرەفی جوولەکە چونکە پێشتر دەیزانی کەعبی کوڕی ئەشرەف بەرتیل وەرگرە، بۆیە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ﴾ ئایا ئاوڕێکت نەداوەتەوە بە لای ئەوانەدا کە وا خۆنیشان دەدەن، تەماشاکەن خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَزْعُمُونَ﴾ وشەی (الزَّعم)یش مانای درۆکردن دەبەخشێت، کەوا بوو ئەوان درۆزنن کاتێ وا خۆنیشان دەدەن کە باوەڕیان بە موحەمەد ﷺ هەیە، لە ڕاستیدا ئەوە تەنها بانگەشەکردنە، کە بەڕاستی ئەوان باوەڕیان هێناوە، واتە خۆیان وانیشان دەدەن کە باوەڕیان هێناوە واتە: بەو قورئانەی کە بۆ تۆ دابەزیووە بەو کتێبانەش کە پێش تۆ دابەزیووە دەیانەوێت دادو داواکاریەکانیان بەرن بۆ لای یەکێك کە حوکم بە بەرنامەی خوا ناکات، وەکو پێشتر باسم بۆکردن خۆ وانیشان دەدەن کە باوەڕیان بە موحەمەد ﷺ هێناوە کەچی پاشانیش دادو داواکاریەکانیان بۆ لای یەکێکی تری غەیری ئەو دەبەن، وەکو پێشتر ئاماژەم پێدا ئەو کەسەی داواکاری خۆی بۆ لای کەسێکی دیکەی غەیری پێغەمبەری خوا ﷺ بەرێت ئەوە هیچ باوەڕێکی پێ نییە ئەگەرچی بانگەشەی ئەوەش بکات، ﴿الطَّاغُوتِ﴾یش هەموو یەکێکە کە حوکم بە بەرنامەی غەیری خوای گەورە بکات، هەر یەکێك حوکم بەشتێکی دیکەی غەیری ئیسلام بکات ئەوە تاغوتە، ئەگەر جوولەکە بێت یان گاور بێت یان هەر کەسێکی دیکە بێت، لە کاتێکدا بە ڕاستی فەرمانیان پێکراوە کە بڕوایان پێنەبێت، خوای گەورە فەرمانی پێکردوون بڕوایان بەتاغوت نەبێت، خوای گەورە لەم بارەوە لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى لا انفِصَامَ لَهَا وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾[البقرة: ٢٥٦] واتە: ئینجا هەر کەس لە ڕێی بێ بڕوایی بگەڕێتەوە (بێ باوەڕ بێ بە هەر پەرستراوێك جگە لە خوا) وە بڕوابهێنێ بە خوا ئەوە بێگومان بەتوندی دەستی

...ێتووە بە دەستەگیرەیەکی قایمی بەهێزی وا (کە ئیسلام، یان ئیمانەکەیەتی) کە پچڕانی و بەربوونی بۆ نییە وە خوا بیسەری زانایە. لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوای گەورە بڕوابوونی بە تاغوت پێشی بڕوا بوون بەخوای گەورە خستووە، چونکە مەرجی ئیمان تەواوی بێباوەڕ بوونە بەتاغوت ﴿وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ﴾ شەیتان ئیبلیس _ بەر فەرمانی خوا بکەوێت _ هەروەها شوێنکەوتووانی شەیتان لە شەیتانەکانی ئادەمیزادو جنۆکە دەیانەوێت ﴿أَن يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً بَعِيدًا﴾ گومڕایان بکەن بەگومڕایەکی دوور لە ڕاستی، واتە لە هەق و لە ئیسلام دووریان دەخەنەوە، گومڕایان دەکەن بەگومڕایەکی دوور کە هیچ کۆتایەکی نییە، ئەو کەسەی حوکمی تاغوتی بە لاوە لەحوکمی ئیسلام پێ چاکتربێت، با دڵنیابێت گومڕایە بەگومڕایەکی زۆر دوور، دوور لە ڕێی ڕاست، دوور لە ئیسلام، دوور لە ئیمان بەخوا، بە هەموو جۆرە دووربوونێک، ﴿وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً بَعِيدًا﴾ گوێڕایەڵی شەیتان بوون و گوێڕایەڵی فەرمانی ئەو خوایە نەبوون کە فەرمانی پێکردن بێباوەڕبن بەتاغوت، تەماشاکەن گوێڕایەڵی شەیتان بوون و گوێڕایەڵی فەرمانی ئەو خوایە نەبوون کە فەرمانی پێکردن بێباوەڕبن بە تاغوت، لەگەڵ ئەوەش دا بانگەشەی ئیمان بەخوا دەکەن، تەماشای گوفتاری خوای گەورە بکەن ﴿يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُواْ إِلَى الطَّاغُوتِ﴾ دەیانەوێت کە داد بەرن بۆ لای یەکێک کە حوکم بە بەرنامەی خوا ناکات، ﴿يُرِيدُونَ﴾ دەیانەوێت، واتە: تا ئێستا دادەکەشیان نەبردووە، بەڵام تەنها دەیانەوێت دادەکە بۆ لای تاغوت بەرن، تەنها بەوە کوفردەکەن ئەگەرچی نەشیانبردبێت، تەنها بە ویستویانە بیبەن بەوەندە کوفر دەکەن ئەگەرچی ئەنجامیشیان نەدابێت _ پەنا بە خوا _ پاشان خوای گەورە لەو ئایەتەدا دەفەرموێت: ﴿فَكَيْفَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ﴾ ئایا باروحاڵیان چۆن دەبێت ئەگەر بەسەرهاتێکی ناخۆشیان تووش بێت بەهۆی ئەوەوە کە کردویانە؟ ئەگەر بەهۆی ئەم

کاره نەشیاوەیانەوە سزایەکیان بۆ هاتە خوارەوە، دڵنیا بن سزای ئەم کاره ناشیاوانەش زۆر نزیکە، ئایا باروحاڵیان چۆن دەبێت ئەگەر بە هۆی ئەو کاره نەشیاوەوە سزایەکیان بۆ بێتەخوارەوە، ﴿ثُمَّ جَآؤُوكَ يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ إِنْ أَرَدْنَا إِلاَّ إِحْسَانًا وَتَوْفِيقًا﴾ پاشان دێنەوە بۆ لات و سوێند دەخۆن: بەخوا تەنها نیازی چاکەو یەك خستنەوەمان بووە، کاتێ ویستمان کەسێکی غەیری تۆ داوەریمان لە نێوان دا بکات، مەبەستمان ئەوە بوو تەنها چاکە بۆ خەڵك بکەین و یەکیان بخەینەوە، دەڵێن: نیازمان پاکە، مەبەستمان ئەوە نەبوو بە تۆ بێباوەڕبین، نیازمان پاکە، بەڵکو مەبەستمان ئەوە بوو خەڵك ئاشت کەینەوەو چاکەیان لەگەڵ بکەین بە بڕینەوەی ناکۆکی و ئاژاوەکانی نێوانیان، باشە چاکە و یەك خستنەوە بە غەیری شەریعەتەکەی خوای گەورە دروستە؟ لە ڕاستیدا چاکە کردن و یەکخستنەوەی نێوان خەڵك تەنها بە شەریعەتەکەی خوای گەورە دروستە، تاغوت بە داوەرو ڕێکخەر دانانرێت، تەماشاکەن سوێند بەخوا دەخۆن کە تەنها نیازی چاکەکردن و یەکخستنەوەیان هەبووە، بەڵام ئەگەرچی خۆیان وانیشان بدەن و عوزرو بەهانەش بێننەوە، خوای گەورە هەر زانایە بەو هۆکارەی کە هانیدان دەدا بۆ ئەوەی تاغوت بکەن بە داوەری نێوانیان با عوزرو بەهانەش بێننەوە، نیازپاکی شتی پووچ و باتڵ نا شەرعێنێ، باتڵ هەر باتڵە، ئەگەرچی مرۆڤ نیازیشی پاك بێت لە ئەنجامدانیدا، ئەی ئەگەر نیازپاکی لە ئارادا نەبوو لەو گوفتارەدا، دەبێت چۆن بێت؟ ئەگەر ڕاستگۆش بن کە گوایە غەیری چاکەو یەکخستنەوەیان مەبەست نەبووە، ئەمەش دیسان نابێتە بەڵگەو بەهانە بۆ ئەوەی لە شەرع لادەن و، شتی تر بە داوەر بکەن، نەخێر، ئەی ئەگەر ئەوان درۆزن بن دەبێ چۆن بێت، ﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ يَعْلَمُ اللَّهُ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ﴾ ئەوانە کەسانێکن خوا دەزانێت چی لە دڵیاندا هەیە کەواتە ڕوویان لێوەرگێڕە، با ئەوان سوێند بخۆن کە

-----------------------------------------------

-----------------------------------------------

-----------------------------------------------

ئەبری چاکەو خێریان مەبەست نەبووە بەڵام عوزرو بەهانەیان قبوڵ مەکە، ﴿وَعِظْهُمْ﴾ وە ئامۆژگاریان بکە، تەنها ڕوویان لێ وەرمەگێڕەو وازیان لێبێنیت، نەخێر، بەڵکو پێویستە نکوڵیان لێبکەن و ئامۆژگاریشیان بکەن، ڕوویان لێ وەرمەگێڕەو وازیان لێبێنیت، نەخێر، بەڵکو پێویستە ئەوەیان بۆ ڕوون بکەیتەوە کە ئەوان لەسەر گومڕایی بوونەو، لە هەق ڕوویان وەرگێڕاوە، تۆش عوزرو بەهانەیان قبوڵ مەکە ﴿وَعِظْهُمْ﴾ ئامۆژگاریان بکە لەوەدا کە کردویانە، بەشکو پەشیمان ببنەوەو تەوبە بکەن، ئەوەی لێی دەفامرێتەوە ئەوەیە کە هەر کەسێك هەڵەیەکی ئاشکرای کرد پشتگوێ ناخرێت، بەڵکو واجیبە ئامۆژگاری بکرێت، بەشکو بگەڕێتەوەو پەشیمان بێتەوە یان بەڵگەی بەسەرەوە دامەزرێت، ﴿وَقُل لَّهُمْ فِي أَنفُسِهِمْ قَوْلاً بَلِيغًا﴾ دەربارەی نەفسی خۆیان وتەیەکی ڕەوان و کاریگەریان پێ بڵێ، لە نێوان خۆت و ئەوا، گوتەیەکی توندی تەدەغەکاریان پێ بڵێ، نەك گوتەیەکی ئاسان یا بەشێوازێك نەرمونیانی تێدابێت، نەخێر، گوتەیەکی ڕەوان و کاریگەر، لەسەر بیسەر کاریگەری خۆی هەبێت، چونکە ڕەفتارێکی مەترسیداریان ئەنجام داوە، بۆیە پێویستە گوفتارەکانت بەرامبەریان توندی و زبری تێدابێت، بەڵام پێویستە شتەکە بە نهێنی بێت تەنها لەنێوان تۆ و ئەواندا، ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلاَّ لِيُطَاعَ بِإِذْنِ اللّهِ﴾ وە هەر پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کرد بێت تەنها بۆ ئەوە بووە کە گوێڕایەڵی بکرێت بەفەرمانی خوا، بەڵام ڕەفتارەکەی ئەوان سەرپێچی کردنی پێغەمبەری خوایە ﷺ لە کاتێکدا کە واجیبە گوێڕایەڵی بکرێت ﴿إِلاَّ لِيُطَاعَ بِإِذْنِ اللّهِ﴾ واتە بەشەرعەکەی و بە فەرمانی شەرعی و بە فەرمانی قەدەری ﴿إِلاَّ لِيُطَاعَ بِإِذْنِ اللّهِ﴾ چونکە پێغەمبەرﷺ جگە لە شەرعی خوای گەورە هیچی تر ناهێنێت، ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی پێغەمبەر فەرمان بەوە دەکات تەنها بەوەی کە خوای گەورە فەرمانی پێداووە، حوکمیش ناکات تەنها بەوە نەبێت کە

--------------------------------------------------------------------------------

--------------------------------------------------------------------------------

--------------------------------------------------------------------------------

--------------------------------------------------------------------------------

خـوای گـەورە حـوکمی پێکردبێـت، ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ جَآءُوكَ فَٱسْتَغْفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ﴾ وە بێگومان ئەگەر ئەوان كاتێ ستەمیان لە نەفسی خۆیان كرد، تەماشاكە خوای گەورە پەشیمان بونەوەو تەوبەی خستنە ڕوو، ئەگەر چی ئـەوان لـە گوفتاری پێشویاندا ستەمیان لە نەفسی خۆیان كردو، ویستیان دادو كێشەكەیان بەرن بۆ لای یەكێك كە حوكم بە بەرنامەی خوای گەورە ناكات، پاشـان عـوزرو بەهانەیـەكی درۆشیان هێنایەوە، لەگەڵ ئەو هەموو تاوانە ناشیرینانەدا ئەگەر بۆ لای خـوای گـەورە بگەڕانایـەوەو، داوای لـێ خۆشـبونیان بكردایـەو، داوایـان لـە تـۆش بكردایـە داوای لێخۆشـبونیان بـۆ بكـەیت، ﴿لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا﴾ بێگومـان دەیـان بینـی خـوا پەشیمانی وەرگری بە بەزەییە، خوای گەورە لەوانە خۆش دەبێت كـە داوای تەوبەی لێدەكەن ئەگەر چی تاوانەكانیان ناشیرین و گەورەش بێت، كەوا بوو تاوانبار نابێت لە ڕەحمەت و بەزەیی خوای گەورە بێ ئومێد بێت، پێویستە هەستێت داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە بكات، بۆیە ئەگەر ئەوان داوای لێخۆشبونیان لە خوای گەورە بكردایەو پاشـانیش لەپێغەمبـەری خـوا ﷺ داوایـان بكردایـە داوای لێخۆشـبونیان بـۆ بكـات، بێگومان دەیانبینی خوای گەورە پەشیمانی وەرگری بەبەزەییـە، چـونكە دوعـاو نـزای پێغەمبەری خوا ﷺ گیرا بوو، هەروەها ئیستیغفارەكەشی قبوڵكراو بوو، خوای گەورە تەوبە وەرگرە، خێرا سزای بەندەكانی نادات، كەوا بوو ئەگەر كەسێك تووشی تاوانێك بوو ئەگەر گەورەش بێت با پەشیمان بێتەوەو داوای وەرگرتنی تەوبە لـەخوای گـەورە بكات، تەوبە لەبەندەكانی خۆی وەردەگرێت، لە كاتێ پێغەمبەری خـوا ﷺ لـە ژیان دا بوو داوای لێدەكرا ئیستیغفاریان بۆ بكات، بەڵام پاش مردنی پێغەمبـەری خـوا ﷺ داوای ئیستیغفار لەپێغەمبەری خوا ﷺ ناكرێت، كەسانێكی نەفام و گومڕا ئەم ئایەتە دەكەنە بەڵگەو دەچنە لای گۆڕی پێغەمبەری خوا ﷺ و داوای ئیستیغفاری لێدەكەن،

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

-------------------------------------------------------

لە کاتێکدا ئەم ئایەتە مەبەستی ئەو کاتەیە کە پێغەمبەری خوایە ﷺ لە ژیان دا بوو نەك پاش مردنی، چونکە پاش مردنی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای هیچ شتێکی لێناکرێت، نە ئیستیغفارو نەشتی تریش، هاوەڵان کاتێ تووشی ووشکە ساڵی و بێبارانی بوون داوایان لێنەکرد، بەڵکو لە عەبباسی مامی پێغەمبەریان ﷺ داوا کرد، داوایانی لێ کرد لە خوای گەورە بپارێتەوە بارانیان بۆ ببارێنێت، لەکاتێکدا ئەوان زاناترینی خەڵکن بەتەفسیرکردنی قورئان، ئەگەر لە ئایەتەکە واتێگەیشتنایە بچنە لای گۆڕەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ و داوای دوعاو نزاو ئیستیغفاری لێبکەن، بەدڵنیایی بۆ لای گۆڕەکەی دەچوون، نەدەچوونە لای عەبباسی مامی، باشە بۆ نەچونە لای گۆڕی پێغەمبەری خواو چوونە لای عەبباسی مامی؟ چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ مردبوو، عەبباسی مامی زیندوو بوو، هیچ شتێکیش لە مردوو داوا ناکرێت، بەلام زیندوو داوای ئەنجامدانی ئەو شتانەی لێدەکرێت کە توانای بەجێهێنانی هەیە وەکو دوعاو ئیستیغفارکردن بۆ کەسانی دیکە، هاوەڵان دەچوونە لای گۆڕی پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها بۆ ئەوەی سلاوی لێبکەن و هیچی تر، ئەگەر لە سەفەر بهاتنایەوە دەچوونە لای گۆڕی پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها بۆ ئەوەی سلاو لەخۆی و هاوەڵەکانی بکەن، هەروەها سلاویان لە مردووانی گۆڕستانیش دەکرد، سەردانی گۆڕستان تەنها بۆ سلاوکردن دروستە، بەلام بۆ ئەوەی داوای پێداویستیان لێ بکرێت دروست نییە، شیرك و هاوەڵ بڕیاردانە بۆ خوای گەورە، هەروەها بێژەی ئایەتەکەش ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە چوون بۆ لای گۆڕ بۆ داوای ئیستیغفارکردن جایز نییە، بۆچی ؟ چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ﴾ لەزمانی عەرەبیدا ئاوەڵفەرمانی (إذ) بۆ ئەو شتانە بەکاردێت کە لە زەمەنی ڕابردودا ئەنجام دراوە، لێرەدا خوای گەورە ئاوەڵفەرمانی (إذا)ی بەکارنەهێناوە، چونکە (إذا) ئاوەڵفەرمانێکە بۆ ئەو شتانەی کە

له داهاتوو دا روو دەدەن، کەوا بوو لە نێوان (إذ) و (إذا)دا جیاوازی هەیە، بێژەی ئایەتەکەش دەڵێت: ﴿إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ﴾ کاتێ ستەمیان لە نەفسی خۆیان کرد، واتە لە رابردوو دا، نەك لە داهاتوو دا پاش مردنی پێغەمبەری خوا ﷺ، پاشان لە کۆتایی ئایەتەکاندا سوێند بەخۆی دەخوات و دەفەرموێت: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ نەخێر وانییە کە خۆیان بەباوەڕدار نیشان دەدەن بەوەی کە بۆ تۆ دابەزیوەو ئەوەش کە بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆ دابەزیوە، ئەمە بەرپەرچ دانەوەیە بۆ ئەوان ﴿حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾ تا تۆ نەکەنە دادوەر لە هەر ئاژاوە و دوبەرەکیەکی نێوانیاندا، ﴿فِيمَا﴾ لە زمانی عەرەبیدا مانای گشتاند دەبەخشێت، واتە: پێویستە هەموو ناکۆکی و دووبەرەکی و جیاوازیەکان بۆ خواو پیغەمبەری خوا ﷺ بگەڕێندرێتەوە، لەو بارەوە خوای گەورە لەئایەتێکی دیکەدا دەفەرموێت: ﴿وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَيْءٍ فَحُكْمُهُۥٓ إِلَى اللَّهِ﴾[الشورى: ١٠] واتە: ﴿وە هەر شتێك کە تیایدا جیاواز بوون ئەوە بڕیارەکەی بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ﴾[النساء: ٥٩] واتە: جا ئەگەر دووبەرەکیتان هەبوو لە شتێکدا ئەوە بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەر ﷺ. پێویستە تەنها لە یاساکانی باری کەسێتیدا بۆ شەریعەت نەگەڕێینەوە، وەکو ئەوەی لە زۆربەی یان هەر هەموو وولاتە عەرەبیەکاندا مەگەر کەمێکی نەبێت پەیڕەو دەکرێت، لەو وولاتانەدا تەنها لە بواری یاساکانی باری کەسێتیدا وەکو میرات و هاوسەرگیری و شتی تردا حوکم بە شەریعەت دەکەن، بەڵام لە موعامەلات و لە بیروباوەڕدا حوکم بە شەریعەتناکەن و، بۆ قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ناگەڕێنەوە، دڵنیا بن ئەمە بەسنییە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾ واتە: لە هەر ئاژاوە و دووبەرەکیەکی نێوانیاندا، لەبیروباوەڕدا، لە ئاژاوەو

دووبەرەکیدا، لە ماڵ و سەروەت و ساماندا، هەموو شتێك بۆ قورئان و سووننەت دەگەڕێنرێتەوە، ﴿ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ﴾ لە پاشان هەست لە دەرونیاندا بە هیچ بێزاریەك نەکەن لەو بڕیارەی تۆ داوتە، ئەوە بەس نییە تەنها تۆ بکەن بە دادوەر لە هەر ئاژاوەو دووبەرەکیەکی نێوانیاندا، بەڵکو پێویستە لە ناخەوە هەست نەکەن بە هیچ بێزاریەك لەو بڕیارەی تۆ داوتە، پێویستە ڕازیبن بە حوکمی خواو بە حوکمی پێغەمبەرەکەی و ﷺ پێی قایل بن بە قایل بونێکی تەواو، بەڵام ئەو کەسەی لە ناخەوە هەست بەبێزاری و نارەحەتی دەکات بەرامبەر بە حوکمی خواو حوکمی پێغەمبەرەکەی ئیماندار نییە، خوای گەورە لەو بارەوە لە ئایەتێکی دیکەدا دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ﴾[محمد: ٩] واتە: ئەو تۆڵەیان لەبەر ئەوەیە کە بێگومان ئەوانە ڕقیان لەو قورئانە بوو کە خوا ناردوویەتی بۆیە خواش کردەوەکانیانی پووچ کردەوە. پێویستە باوەڕێکی بتەویان هەبێت ئەو هەقەو خۆیان بەهەڵەدا چوونە، ئەگەر بەئاشکرا قسەیان کردو گوتیان بەمە ڕازیی نابین و دادوەرێکی دیکەمان دەوێ، ئەوە باوەڕدارێکی تەواو نین، ﴿وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا﴾ و ملکەچ بکەن بە ملکەچیەکی تەواو، پێویستە تەسلیم و ملکەچی تەواو بۆ حوکمی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ بکرێت، پێویستە هیچ نارەزایی و دواخستنێك نەکرێت بۆ درێژکردنەوەی ناکۆکی و ئاژاوەیەك لە پێناو بوچکردنەوەی هەقی دژو نەیار یان خاوە خاو کردنی پێ بکرێت، بەڵکو پێویست بە تەسلیم و ملکەچی دەکات، پێویستە هەقی خاوەن هەقەکان بدرێتەوە کە خواو پێغەمبەرەکەی حوکمیان بۆ بڕیوەتەوە بەبێ هیچ خاوە خاوکردن و دواخستنێکی بە ئەنقەست، شاهێدە قسەکانمان لە ئایەتەکەدا ئەوەیە کە پێویستە خواو پێغەمبەرەکەی بکرێن بە دادوەر لە هەموو کێشەیەکدا، حوکمیان بکرێت قبوڵ بکرێت و خۆ بەو حوکمە تەسلیم بکرێت نەك حوکمی کەسانی دیکەو صۆفیەکان، جوولەکەو گاوڕ نەك حوکمی یاسا دانراوەکانی ئەمڕۆ.

# پێویست بوونی شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ

وە هەر مرۆڤێك موخالەفەی شتێك لەوانە بکات کە پێغەمبەری خوا ﷺ هێناویەتی، لەوەدا لاسایی و چاولێکەریی کەسێك بکاتەوە کە بە بۆچوونی خۆی وەلی و دۆستی خوایە، بێگومان بۆچونەکەشی لەسەر ئەوە بونیادناوە کە کەسەکە دۆستی خوایەو، گوایە لە هیچ شتێکدا موخالەفەی دۆستی خوا ناکرێت، بەلام ئەگەر ئەو کەسە گەورەترین دۆستانی خواش بێت _ وەکو گەورە هاوەڵان و شوێنی کەوتوانیان بەچاکە _ ئەو شتانەیان لێوەرناگیرێت کە موخالەفەی قورئان و سوننەت بکات[1].

---

(١)_ پێشتر شێخولئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێبێت _ پاش ئایەتەکان ئەوەی دووبارەکردۆتەوە کە گوێڕایەڵی هیچ کەسێك ناکرێت لەو شتانەدا کە موخالەفەی قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ تێدا دەکات، ئەگەرچی لە دۆستانی خوای گەورەش بێت، پاش پێغەمبەران هاوەڵانی بەڕێز گەورەترین دۆستانی خوای گەورەن لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر ئیجتیهاد بکەن و، گوفتارەکانیان موخالەفەی فەرمایشتەکانی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بوون، موخالەفەی ڕێبازی ڕاست و دروستی بوون، ئەوە وەرناگیرێت با عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ یان ئەبوبەکر ﷺ یان هەر کەسێکی تر بێت، ئەگەر گوفتارەکانی پێچەوانەی قورئان و سوننەت بوون وەرناگیرێت، ئەگەرچی ئیجتیهادیشی کرد بێت، هاوەڵانی بەڕێز بە قەستی موخالەفەیان نەدەکرد، ئەوان مەعصوم و پارێزراو نەبوون، ئیجتیهادیان دەکرد، هەموو سێك هەڵە دەکات و دەشپێکێت، هاوەڵانی بەڕێز بن یان کەسانی تری غەیری ئەوانبن، لەهاوەڵان ئەوەی موخالەفەی هەق بکات وەرناگیرێت، کەوا بوو لە کەسانی دیکە چۆن وەربگیرێت، بەتایبەت ئەو کەسانەی بانگەشەی دۆستایەتی خوای گەورە دەکەن و، گوایە فەرمانی وەلی ڕەتناکرێتەوە، لە بنچینەدا دۆستانی هەرە گەورەی پەروەردگار هاوەڵانی بەڕێزن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر ئیجتیهادیانکردو بەدوای هەقدا دەگران، بەلام

---------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------

نەیانپێکا ئەوە جایز نییە گوفتارەکانیان قبوڵ بکرێت، بۆیە کاتێ جیاوازی لە نێوان زانایاندا ڕویدا سەبارەت بەمەسەلەی ( فسخ الحج الى العمرة) و ئەبوبەکرو عومەر ﷺ ڕێگریان لەوە دەکرد، ئیبن وعەبباس ﷺ پێی فەرموون: هێندەی نەماوە لە ئاسمانەوە بەردە باران بکرێن، من دەڵێم: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی، بەڵام ئێوە دەڵێن: ئەبوبەکرو عومەر ﷺ فەرمووی، مەبەستی ئەوەبوو ڕای ئەبوبەکرو عومەر ﷺ وەردەگرن سەبارەت بە (عدم فسخ الحج الى العمرة) و، فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ پشتگوێ دەخەن کە فەرمانی بە هاوەڵانی کرد کاتێ کە تەواف و سەعیشیان کرد بوو کە تەحلیل بکەن و بیکەن بەعومرە، پاشان ئیحرام ببەستن و دەبن بە (متمتع)، کەوا بوو گوفتاری هیچ کەسێك پێشی گوفتاری پێغەمبەری خوا ﷺ ناخرێت.

ئەی ئەگەر ئەو کەسە هەر لە بنەڕەوتەوە دۆستی خوا نەبوو دەبێت چۆن بێت[1].

---

(١)_ باشە ئەگەر وەلی و دۆستی خوا نەبوو دەبێت چۆن بێت؟ بێگومان ئەو کاتە دۆستی شەیتانە کە نەگوێڕایەڵی خواو نەگوێڕایەڵی پێغەمبەریش دەکات، کەسانێك لەوانەی بانگەشەی دۆستایەتی خوای گەورە دەکەن، جادووگەرن یان خۆ بەغەیب زانن یا شەیتانن، ئەمانە بانگەشەی دۆستایەتی خوای گەورە دەکەن، لە کاتێکدا دوژمنی خوای گەورەو پێغەمبەرن ﷺ، دوژمنایەتی ئەم جۆرە کەسانە بۆ خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ ئاشکرایە، نوێژ ناکەن و لە بێنوێژی خۆیان ناشۆن و زەکات نادەن، چونکە لەو باوەڕەدان کە لە چوار چێوەی تەکلیفی شەرعی چونەتە دەرەوە، بە خوای گەورە گەیشتوون، هیچ تەکلیفێکی شەرعیان لەسەر نەماوە، دەڵێن: ئەم جۆرە کەسانە دۆستی خوان لە کاتێکدا دەیانبینن فەرزەکان پشتگوێ دەخەن و حەرامکراوەکان ئەنجام دەدەن، دەڵێن: ئەمانە تەکلیف و سەپاندنە شەرعیەکانیان لەسەر نییە چونکە بەخوای گەورە گەیشتن، بەڵام با دڵنیا بن ئەوان تەکلیفی شەرعیان لەسەر نەماوە، چونکە شێت بوونە.

## فریو نەخواردن بە کردەوە نائاساییە لە سروشت بەدەرەکان

تەماشای کەسانێکی زۆر دەکەی پاڵپشتیان بۆ بڕوا بوون بەوەی کەسانێك دۆستی خوا بن بەڵگەیان ئەوەیە کە لە هەندێ کاروبار دا موکاشەفەیەکی لێوە بەدیکراوە[1]،

---

(١)_ کاتێ پێیان دەگوترێت: بەڵگەت چییە لەسەر ئەوەی فلان کەس دۆستی خوا بێت؟ دەڵێن: چونکە شتانێکی غەریب و نامۆی لێوە بە دیدەکرێت، کەرامەتی هەیە، پێشتر ئەوەمان بۆ ڕوونکردنەوە کە لە نێوان کەرامەت و ئەو کردەوە نائاساییە لە سروشت بەدەرە شەیتانیانەی کە جادووگەران و خۆ بە غەیبزانەکان و شەیتانەکان دەیکەن جیاوازی هەیە، ئەمانە کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەر ئەنجام دەدەن، بەڵام کەراماتی پێناگوترێت، بەڵکو کردەوەی نائاسایی لەسروشتبەدەری شەیتانی پێدەگوترێت، وەکو فڕین بە هەوا دا، ئەسکلێ خواردن، بە نێو ئاگردا ڕێکردن، بەسەر ئاودا ڕێکردن، ئەمانە کردەوەی نائاسایی لەسروشت بەدەری شەیتانین، چونکە شەیتانەکان هەڵیان دەگرن و بە هەواو دەیانفڕێنن، ئەوان درۆزنن ئەسکلێ ناخۆن و ناچنە نێو ئاگرەوە، بەڵکو تەنها چاو بەستی لە خەڵك دەکەن، وای بۆ خەڵك پیشان دەدەن ئاگردەخۆن و، بە چەقۆ لە سکی خۆیان دەدەن، ئەوە درۆیە، لە ڕاستیدا تەنها چاو بەستی لە خەڵکی دەکەن، وەکو جادووگەرانی زەمەنی فیرعەون، خوای گەورە لەو بارەوە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿سَحَرُواْ أَعْيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَآءُو بِسِحْرٍ عَظِيمٍ﴾[الأعراف: ١١٦] واتە: چاو بەستیان لە خەڵك کرد و ترسێکی گەورەیان خستە دڵیانەوە وە جادوویەکی گەورەیان نواند. ئەو جۆرە جادووە بە جادووی (تخييل)ی ناوزەند کراوە، ئەو جۆرە جادووە ئەنجام دەدەن و، کەسانی نەفامیش دەڵێن: ئەوە کەرامەتە، ئەوە کەرامەت نییە، بەڵکو تەنها کردەوەی شەیتانی نائاسایی لە سروشت بەدەرە، بە واتایەکی تر کەسانێك موکاشەفەیان بۆ دەکرێت، موکاشەفەش بریتییە لەوەی کەسانێك شتانێك دەبینن کە کەسانی تر نایبینن، بەڵام

ئەمەیان لەلایەن شەیتانەوە بۆ ئەنجام دەدرێت، چونکە لەگەڵ شەیتاندا مامەڵە دەکەن، بۆیە هەواڵی شتانێکیان پێ ڕادەگەیەنێت کە کەسانیتر نایزانن، یان شتانێکیان پیشان دەدات و دەیبینن کە کەسانی تر نایبینن، هەموو ئەمانە کردەوەی شەیتانین و ئەو بۆیان جێبەجێ دەکات، بەڵام وەلی و دۆستی ڕاست و دروست ئەوەیە کە خوای گەورە لەو ئایەتەدا لە بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿أَلا إِنَّ أَوْلِيَاء اللَّهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ (٦٢) الَّذِينَ آمَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ(٦٣)﴾[یونس: ٦٢ _٦٣].واتە: ئاگادرا بن بێ گومان دۆستانی خوا ترسیان لە سەر نیە خەفەتیش ناخۆن ئەوانەی باوەڕیان هێناوە وەهەمیشە خۆیان دەپارێزن و لە خوا دەترسن. ئائەمەیە دۆستی خوا، بڕواداری لە خواترسی تەقواکارە، بەڵام پیاوی خراپەکاری کافر ئەمانە دۆستی خوای گەورە نین، بۆ جیا کردنەوەی دۆستان لە دوژمنان تەماشای کارو کردەوەیان دەکەین، ئەگەر کارو کردەوەکانی ڕاست بن بەپێی شەرعەکەی خوای گەورە جێبەجێی کردبن و، گوێڕایەڵی پەروەردگاری تێدا کرد بن، تەقواکار بێت ئەوە دۆستی خوای گەورەیەو، ئەو کردەوە نائاساییانەی ئەنجامی دەدات ڕێزو کەرامەتە و خوای گەورە پێی بەخشیووە، بەڵام ئەگەر کەسێکی کافرو خراپەکارو لە ڕێی ڕاست لادەربوو، فەرزەکانی پشتگوێ دەخست و، زیناکارو، نێر بازو، خراپ بوو ئەوە دۆستی خوای گەورە نییە، ئەگەرچی کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەریش ئەنجام بدات، بەڵکو ئەوە کردەوەی شەیتانیەو کەرامەت نییە، شەیتانەکان لەگەڵیدا مامەڵە دەکەن، بە هەوادا دەیانفڕێنن، ماوەی زۆر دوریان پێ دەبڕن، بەسەر ئاودا ڕێیان پێدەکات، لە ئاوی قوڵدا نوقمیان دەکات، بەسەر ئاگردا هەڵیان دەگرێت و ناکەونە نێوی، بەڵام نابێت بەم کردەوانە فریوبخورێت، مەگەر خاوەنەکەی بەتەواوی گوێڕایەڵی خوای گەورە بکات و مرۆڤێکی تەقوا کار بێت، وەکو ئەوەی بەسەر ئەهلی ئەشکەوت (أصحاب الکهف)دا ڕوویدا، وەکو ئەوەی بەسەر (خَضِر)دا هات، هەموو ئەمانە کەرامەت بوون.

یاخود هەندێ کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەری ئەنجامداوە، وەکو ئەوەی ئاماژە بۆ یەکێك دەکات و دەمرێت[1] یا بە هەوا دا بۆ مەککەو شوێنێ تر دەفڕێت[2]

---

(١)_ لەم بارەوە یارمەتی لە شەیتان وەردەگرێت، شەیتان ئەو مرۆڤە دەخنکێنێت کە ئەو ئاماژەی بۆ دەکات، ئیتر مرۆڤەکە دەمرێت، کەوا بوو لێرەدا شەیتان و کردەوەکانی ڕۆڵ دەبینن، ئیتر دەڵێن: فلان کەس دۆستی خوایە، لە کاتێکدا مرۆڤێکی کوشتووە.

(٢)_ ئەوەی دەیانفڕێنێت تەنها شەیتانە، شەیتان هەڵیان دەگرێت و، بە هەوا دا دەیانفڕێنێت، چونکە شەیتانەکان دەتوانن بە هەوا دا بفڕن، ئیتر لەگەڵ خۆیاندا هەڵی دەگرن، ئەگەر مرۆڤ شەیتانەکان بپەرستێت و گوێڕایەڵیان بێت و سەرپێچی خوای گەورە بکات ئەوان خزمەتی دەکەن، لەو بارەوە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ قَدِ اسْتَكْثَرْتُمْ مِنَ الإنسِ وَقَالَ أَوْلِيَاؤُهُمْ مِنَ الإنسِ رَبَّنَا اسْتَمْتَعَ بَعْضُنَا بِبَعْضٍ وَبَلَغْنَا أَجَلَنَا الَّذِي أَجَّلْتَ لَنَا قَالَ النَّارُ مَثْوَاكُمْ خَالِدِينَ فِيهَا إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ﴾[الأنعام: ١٢٨] واتە: وە ڕۆژێك (خوا) تێکڕا کۆیان دەکاتەوە (دەفەرموێ) ئەی دەستەو کۆمەڵی جنۆکە بێگومان ئێوە زۆر کەستان لە ئادەمیەکان گومڕا کرد وە دۆستەکانیان لە ئادەمی دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان هەندێکمان سوودو کەڵکمان لە هەندێکمان وەرگرت وە بەو کاتەو مۆڵەتە گەیشتین کەبۆت دیاری کردبووین خوا فەرمووی ئاگر شوێنتانە بەهەمیشەیی و بێ بڕانەوە دەمێننەوە تیایدا جگە لەو کاتەی کە خوا بیەوێ بەڕاستی پەروەردگارت کاردروستی زانایە، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَذَلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ الظَّالِمِينَ بَعْضًا بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾[الأنعام: ١٢٩] واتە: بەو شێوەیە هەندێ لە ستەمکاران دەکەین بە دۆست و پشتیوانی هەندێکی تریان بە هۆی ئەو کردەوانەوەی ئەنجامیان داوە. خوای گەورە شەیتانەکان بەسەر ئەو جۆرە کەسانەدا زاڵ دەکات، چونکە گومڕا بوون و خەڵکی تریشیان گومڕا دەکرد.

یا جار بە جار بەسەر ئاودا ڕێدەکات[١] یا بەبێ بوونی ئاو لە هەوا دا مەسینەیەك پڕ دەکات[٢] یا هەندێ کاتی خۆی بەغەیبزانیەوە بەسەردەبات[٣] یا جاربەجار لەپێش چاوی خەڵك دیار نامێنێت[٤] یا هەندێ خەڵك داوای یارمەتی لێدەکەن لەکاتێکدا ئەو لەوێ ئامادەنییە یا مردووە، ئیتر دەبینن دێتەلایان و پێویستیەکانیان بۆ جێبەجێدەکات[٥]

---

(١)_ بە هەقیقەت بەسەر ئاوەکەدا ڕێناکات، بەڵکو شەیتانەکان ڕێی پێدەکەن، ئیتر خەڵکی وادەزانن بەسەر ئاودا ڕێدەکات، بەڵام لە ڕاستیدا ئاوە هانییە، ئەو لە شوێنێکدا لەسەر زەوی دانیشتوەو، وای بۆ خەڵك پیشانداوە کە بەسەر ئاودا ڕێدەکات، چاو بەستیان لێدەکات.

(٢)_ مەسینەیەکی بە تاڵ دەهێنێت و، لەدەرەوە دایدەنێت و، بەبێ بوونی هیچ ئاوێك پڕ دەبێت لە ئاو، ئەمە لە لایەن شەیتانەکانەوە ئەنجام دەدرێت.

(٣)_ بەغیبزانی دەدوێت، واتە لە غیبەوە هەواڵی شتانێك دەدات، ئایا شتی لەو جۆرە دەشێت؟ لە هەندێ کاتدا هەواڵی شتانێك بەخەڵك دەدات، فلان کەس هات، فلان کەس چوو، فلان کەس مرد، هەواڵی شتانێك بە خەڵك دەدات کە لە پێش چاودا نییەو دیارنییە، ئەم شتە بەهۆی شەیتانەکانەوە بۆی ئەنجام دەدرێت.

(٤)_ ئەو لەگەڵ خەڵکیدایە بەڵام جار بە جار دیارنامێنێت، نازانن بۆ کوێ چووە؟ شەیتانەکان هەڵی دەگرن یان لە پێش چاوی خەڵك دەیشارنەوە، پاشان خەڵکیش دەڵێن: ئەمە دۆستی خوایە.

(٥)_ وەکو پێشتر ئاماژەی پێدرا، خەڵکانێك کە لە کەسانی ئامادەنەبوو یا لە مردووان داوای یارمەتی دەکەن، دەست بەجێ شەیتان خۆی بەشێوەی مردووەکە یان کەسە ئامادە نەبووە کە دەنوێنێت، چونکە شەیتان دەتوانێت خۆی لە شێوەی شتاندا بنوێنێت، ئینجا کە بانگی مردووەکە یا کەسە ئامادە نەبووە کەیان کرد،

---------------------------------------------

---------------------------------------------

---------------------------------------------

خاوەنەکەیان خۆی بەشێوەی ئەو دەنوێنێت و، وەڵامیان دەداتەوە، ئامادە دەبێت و ئەو شتانەیان بۆ دەهێنێت کە ئەوان دەیانەوێت، پاشانیش خەڵکەکە دەڵێن: ئەمە مردوەکەیە یان کەسە ئامادە نەبووەکەیە، لە کاتێکدا بە قیقەت شەیتانەو، لەو شێوەیەدا خۆی بۆ نواندوون.

..........

یان هەواڵی شتە دزراوەکان بە خەڵك دەڵێت[1] یان باروحاڵی کەسێکی ئامادە نەبوو یان نەخۆشی خۆیان و شتانێکی بەو هاوشێوانەیان پێ دەڵێت[2].

---------------------------------------------

(١)_ بە ڕاستی ئەمە کارەساتە، ئەگەر شتێکیان لێ وون بوو دەچنە لای خۆ بەغیب زانەکان و لێی دەپرسن کە ماڵ و شتەکانیان لە کوێیە؟، ئەو کەسەی دزیویەتی، ئیتر دەڵێن: ئەمە یەکێکە لەوەلیەکانی خوای گەورە، لە کاتێکدا بە حەقیقەت دۆستێکە لە دۆستەکانی شەیتان، چونکە خودی شەیتانە کە هەواڵی ئەو شتە وونبووانەو دزراوانەیان پێدەڵێت، یاخود شتە دوورەکەیان بە خێرایی بۆ دەهێنێت.

(٢)_ بەڵێ، کەوا بوو پێویست ناکات چیتر بە مۆبایل و بە تەلەفون و شتی تر پەیوەندی بکەیت، تەنها دادەنیشیت و شەیتان هەموو هەواڵی هەموو شتێکت پێڕادەگەیەنێت، پێیان دەڵێت: فلان کەستان ئاوهایەو فلان کەستان نەخۆشەو، فلان کەستان ئائێستا پێدەکات و، فلان کەستان ئا ئێستا تەندروستەو هتد.

بەڵام هیچ یەکێك لەو کردەوانە بەڵگەنین کە ئەو جۆرە کەسانە دۆستی خـوا بن[1]

بەڵکو ئەولیاو دۆستانی خوای گەورە یەك هەڵوێستن لەسەر ئەوەی کە ئەگەر پیاو بە هەوا دا بفڕێت، یا بەسەر ئاودا ڕێبکات، فریوی پێ ناخورێت تاوەکو شوێنکەوتەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و موافیـق و سـازیار بـوونی بـۆ فـەرمان و قەدەغـەکانی تەماشا نەکرێت[2].

وە کەرامەتی دۆستانی خوای گەورە زۆر لەو کردەوانە گەورەترە[3]

---

(١)_ هیچ یەکێك لەو کردەوانە بەڵگەنین لەسەر ئەوەی ئەو جۆرە کەسانە دۆستی خـوابن، مەگـەر خاوەنەکـەی لەسـەر گوێڕایـەڵیی و تـەقوای خـوای گـەورە بـە ڕێگـەی ڕاستدا بڕوات.

(٢)_ وریـا بـن ئەمـە سـودێکی زۆر گـەورەی تێدایـە، ئەوەیـە جیاکـاریی نێـوان دۆسـتای خـواو دۆسـتاتی شـەیتان، جیاکاریەکـە بریتیـە لـە شـوێنکەوتنی قورئـان و سوننەت، بۆیە ئەگەر بڕوادرێکی شوێنکەوتووی قورئان و سوننەت بێت، ئـەو کـردەوە نائاساییە لە سروشت بەدەرانـەی ئـەنجام بدەدات ڕێـزو کەرامەتێکـەو لەلایـەن خـوای گەورەوە پێ دراوە، بەڵام ئەگەر موخالەفەی قورئان و سوننەت بکات، ئـەو کـردەوە نائاسایە لە سروشت بەدەرانەی ئەنجامی دەدات شەیتانیەو، کەرامەت نییە، ئا ئەمەیە نیشانەی جیاوازیەکە، نیشـانەی جیاوازیەکـە تـەنها کـردەوەی نائاسـایی لـە سروشت بەدەر نییە بەڵکو شوێنکەوتنی تەواوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ.

(٣)_ بەڵێ، خوای گەورە جۆرە کەرامـەتێك بـە دۆسـتانی خـۆی دەبەخشـێت کە هەرگیز بە خەیاڵدا نایەت، بەڵام دۆستانی خوای گەورە فریوی پێناخۆن، لووت بـەرزی پێوە نـانوێنن، داوا لـە خـەڵك ناکـەن بەگـەورەیان دابنـێن، بـەڵکو خـاکێتی دەنوێنن، کەرامەت تەنها خاکێتی بە دۆسـتانی خـوای گـەورە دەبەخشـێت، هـەروەها دۆستانی ڕاسـتەقینە لەسـەر شـاردنەوەی کەرامەتـەکانیان سـوورن، بـۆ ئـەوەی هـیچ کەسـێك نایانبینن، چونکە ترسی خوایان لەدڵدایە.

دەرئەنجامدەرانی ئەو کردەوە نائاساییە لە سروشت بەدەرانە وەکو چۆن لەوانەیە دۆستی خوا بن، پێدەچێ دوژمنانی خواش بن[١] چونکە ئەو کردەوە نائاساییە لە سروشت بەدەرانە لە لایەن زۆرێك لەکافرو هاوەڵپەرستان و، ئەهلی کیتاب و دوو ڕووانەوە ئەنجام دەدرێت[٢] وە لە لایەن بیدعەچیانیشەوە ئەنجام دەدرێت، بەڵام تەنها شەیتان بۆیان جێبەجێدەکات[٣] کەوا بوو جایز نییە وابزانرێت کە هەر کەسێك شتێك لەو کردەوانەی ئەنجام دا ئیتر دۆستی خوایە، بەڵکو دۆستانی خوای گەورە بەو سیفات و کردەوەو باروحاڵانە هەڵ دەسەنگترێ کە قورئان و سوننەت ئاماژەی بۆ کردوون[٤]

---

(١)_ تەنها کەرامەت بەڵگە نییە، چونکە خاوەنەکەی یان وەلی و دۆستی خوای گەورەیە، ئەگەر لەسەر گوێڕایەڵی خوای گەورە بەردەوام بێت، وە دەشبێت بەدوژمنی خوای گەورە ئەگەر یاخی بێت و، سەرپێچی فەرمانەکانی بکات.

(٢)_ لەم سەردەمدا کافران و مولحیدان شتانێکی غەیبیان هەیە، بەڵام لە لایەن شەیتانەوە بۆیان ئەنجام دەدرێت، لە لایەن خوای گەورەوە نییە.

(٣)_ هەر هەموو ئەو کردەوانە شەیتانین، ڕێزو کەرامەت نین لە لایەن خوای گەورە، خوای گەورە شەیتانەکانی بەسەردا زاڵکردوون، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّا أَرْسَلْنَا الشَّيَاطِينَ عَلَى الْكَافِرِينَ تَؤُزُّهُمْ أَزًّا﴾[مريم: ٨٣] واتە: ئایا نەتدیوە (سەرنجت نەداوە) کە بێگومان ئێمە شەیتانەکانمان زاڵ کردووە بەسەر بێباوەڕاندا چاك هانیان دەدەن (بۆ کوفرو تاوان). ئیتر ئەو شتانە لەسەر دەستیان بەدیدێت، بۆ ئەوەی بەو جۆرە فریو بخۆن و، گومڕابن.

(٤)_ دۆستاتی خوای گەورە بەو سیفات و کردەوەو باروحاڵانە هەڵدەسەنگێرین کە قورئان و سوننەت ئاماژەی بۆ کردوون، نەك تەنها بە کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەر، بەڵکو بەئیمان و لە خوا ترسان و تەقواکاری سەنگیان بۆ دادەنرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (٦٢) الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ(٦٣)﴾.

وە بەنورو ڕووناکی ئیمان و قورئان شەریعەت دەناسرێت[١].

نموونەی ئەوە: وەك ئەو شتە نائاساییانەی ئاماژەمان پێکرد[٢] هاوشێوەکانیان پێدەچیٚ لە کەسانێکدا هەبن و، مرۆڤی وایان تیٚ دابێت دەستنوێژ نەشوات و، نوێژە فەرزەکان بەجێنەهێنێت[٣]،

---

(١)_ دۆستانی خوای گەورە بەنیشانەو ئاماژەکانی نورو ڕوناکی سەر ڕوخساریان و، بە بەردەوام بوون لەسەر ئەنجامدانی کردەوە چاکەکانیان و، بە گوفتارەکانیان و، بەهێمنی و هێوری و، دڵخۆشبوون بەزیکرو یادی خوای گەورە دەناسرێنەوە، ئائەمانەن دۆستانی خوای گەورە، بەڵام ئەگەر زیکرو یادی خوای گەورە لای دۆستانی شەیتان بکرێت ڕوویان گرژ دەبێت، چونکە ئەو زیکرو یادە شەیتانەکان دەسوتێنێت، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَحْدَهُ اشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِالآخِرَةِ وَإِذَا ذُكِرَ الَّذِينَ مِن دُونِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ﴾[الزمر: ٤٥] واتە: وە کاتێك یادی خوا بکریٚ بەتاك و تەنیا دڵی کەسانیٚ تێکدەچیٚ و بێزار دەبیٚ ﴿لا يُؤْمِنُونَ بِالآخِرَةِ﴾ کە باوەڕیان نییە بەڕۆژی دوایی کەچی کاتێك ناوی پەرستراوانی بێجگە لە خوا ببرێت دەبن.

(٢)_ ئەو شتە ئاماژە بۆ کراوانەی سەرەوە وەکو کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەرو، بەسەر ئاودا ڕێکردن و، بەنێو ئاگردا ڕێکردن و بەو هاوشێوانەیە، ئەم شتانە بەزۆری لە لایەن شەیتانەکانەوە ئەنجام دەدرێن، ئەو جۆرە کەسانە دۆستی خوای گەورە نین.

(٣)_ بەڵیٚ، دەڵێن: ئەمەیە وەلی و دۆستی خوا، تەکالیف و سەپاندنە شەرعیەکانی لەسەر نییە، بەڵکو ئەو تەکلیف و سەپاندنە شەرعیانە تەنها لەسەر ڕەمەکی خەڵکن، نەك کەسانی تایبەت کراو، ئەم جۆرە کەسانە تایبەتی تایبەتکراون، تەکالیف و سەپاندنە شەرعیەکانیان لەسەر هەڵگیراوە.

بەلکو تێکەڵاو بەشتە پیس و بۆگەنەکە بێت، تێکەڵاوی سەگەکان بێت[١] بۆ گەرماوەکان و، بۆ لای گسك دەران و، بۆ گۆڕستانەکان و، سەرگوردان و جێگەی خۆڵ و خاشاك بچێت[٢]، بۆنیان پیسەو خۆی پاك ناکاتەوە بەپاکێتی شەرعی بە غوسڵ و دەستنوێژ شتن و شوێنی پیسی پاکردنەوە، وە خۆی لەسەرجەم پیسیەکانی تر پاك ناکاتەوە، وقد قال النَّبِيّ ﷺ: ((لاَ تَدْخُلُ الْمَلاَئِكَةُ بَيْتًا فِيهِ جُنُبٌ وَلاَ كَلْبٌ))[٣] واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((فریشتەکان ناچنە ماڵێکەوە لەش گران و سەگی تێدا بێت)).

---

(١)_ ئەم جۆرە کەسانە نیشانەکانیان ئاشکرایە کە لە حەرامەکان و خراپەکاری و پشتگوێخستنی فەرزەکان خۆیان دوور ناخەنەوە، لە پیسێتی و گەندڵ بوون خۆیان پاك ناکەنەوە، خۆیان لە سەگ دوور ناخەنەوە، کە سووك و ڕیسواترینی ئاژەڵەکانە، بەڵکو تێکەڵاویان دەبن، لەگەڵیاندا دەژین، دڵیان پێخۆشە، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ سەگ ڕاگرتنی قەدەغەکردووە مەگەر بۆ سێ شت: پاسەوانێتی مەڕ و ماڵات، پاسەوانێتی کشتوکاڵ، بۆ ڕاوکردن، تەنها سێ شت، بەدەر لەمانە تێکەڵاویەتی سەگ جایز نییە، چونکە پیسە.

(٢)_ دۆستانی خوای گەورە بۆ مزگەوتەکان دەچن، دۆستانی شەیتانیش بۆ گەرماوەکان دەچن، چونکە گەرماوەکان شوێنی مانەوەی شەیتانەکانن، بۆیە دۆستانی شەیتان لەوێدا دڵیان ئاسوودە دەبێت، پەنا دەبەنە بەر ئاو دەستەکان چونکە جێگای شەیتانەکانە، بەڵام دۆستانی خوای گەورە مزگەوتەکان و ماڵەکانی خوای گەورە جێگەیانە، بەڵام دۆستانی شەیتان بۆ مزگەوت ناچن و نایانەوێ.

(٣)_ أخرجه أبوداود (٢٢٧و٤١٥٢)، والنسائي (١٤١/١)، (١٨٥/٧)، والدارمي (٢٨٥/٢)، وأحمد (٨٠/١و٨٣و١٠٧و١٣٩و١٥٠)، من طريق عبدالله بن نجي عن علي رضي الله عنه مرفوعاً.

فریشتەکان ناچنە ماڵێکەوە لەش گرانی تێدا بێت، ئەو سوودەی لێوەوە بەدەست نابێت بۆیە لە خۆدوورخستنەوە لە (خمت (أكبر) کە لەش گرانییە، چونکە پیسییەکی مەعنەوییە، هەروەها سەگیش، چونکە خودی سەگ پیسە، ئەو جۆرە کەسانە خۆیان لەش گرانیی پاك ناکەنەوە، دەست نوێژ ناشۆن، هەڵناستن بە پاککردنەوەو شوشتنی ئەو پیسییەی کە لە جلوبەرگ و جەستەیان دەدات، چونکە ئەو شتە بەهاکێنی و خۆ نزیك خستنەوە لە خوای گەورەوە دادەنێن هەروەها بە عیبادەت و پەرستنی دادەنێن، بەڵێ چونکە شتانەکان پۆخڵەواتیان خۆش دەوێت، شوێنی پیسیان خۆش دەوێت، بۆیە ئەوان لە دۆستانی شەیتانن چونکە هۆگری ئەو شتانەن.

..................

هەروەها سەبارەت بە شوێنی سەر ئاو دەفەرموێ: ((إِنَّ هذه الحُشُوشَ مُحْتَضَرَةٌ))[1] واتە: ((بەڕاستی شەیتانەکان لەم ئاودەستانەدا ئامادەن)).

---

(١) أخرجه أبو داود (٦)، وابن ماجة (٢٩٦)، وأحمد (٤/٣٦٩).

(الحش) واتە: ئاو دەست. شەیتان بەشوێنی مانەوەی خۆیدەکات، بۆیە ئاودەستی شەیتانیش مەبلی دەکات و تیایدا دادەنیشێت.

هەروەها دەفەرموێ: ((مَنْ أَكَلَ مِنْ هَاتَيْنِ الشَّجَرَتَيْنِ الْخَبِيثَتَيْنِ، فَلا يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا، فَإِنَّ الْمَلائِكَةَ تَتَأَذَّى مِمَّا يَتَأَذَّى مِنْهُ بَنُو آدَمَ))[1]، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەسێك لەم دوو سەوزە خراپانە بخوات، با نزیکی مزگەوتەکەمان نەبێتەوە، چونکە فریشتەکان بێزار دەبن بە هەموو ئەو شتانەی کە نەوەی ئادەمی پێی بێزار دەبێ)).

وقال: ((إِنَّ اللهَ تَعَالَى طَيِّبٌ لاَ يَقْبَلُ إِلاَّ طَيِّبًا))[2] واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بەڕاستی خوای گەورە پاکەو جگە لە پاکیش هیچی تری قبوڵ نییە)).

---

(١)_ صحيح: أخرجه البخاري (٨٥٥)، (٧٣٥٩)، ومسلم (٥٦٤).

پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ بەکارهێنانی بۆنی خۆش هانیداوین، تەنانەت خواردنی سەوزەکانی وەك سیرو پیازو هەرشتێکی بۆن پیسی لێ قەدەغە کردوین، ئەو کەسانەش ئەوانە دەخۆن ڕێگریی لێ کردوون بچنە مزگەوتەوە، چونکە کەسانێك بەچەندین بۆنی پیسەوە دەچنە مزگەوتەوە، لە فەرموودەکەشدا وشەی (الْخَبِيثَتَيْنِ) واتای خراپ و ناخۆش دەگەیەنێت، بەڵام لە شوێنی تر داهاتووە واتای پیس و حەڕام دەگەیەنێت.

(٢)_ صحيح: أخرجه مسلم (١٠١٥) من حديث أبي هُريرة ﷺ مرفوعاً.

بەڵێ، خوای گەورە پاکەو تەنها کردەوەو گوفتارو بۆنە پاك و خۆشەکانی قبوڵە، تەنها شتە پاك و خۆشەکانی قبوڵە، ئەمە بە پێچەوانەی شەیتانەکانەوەیە کە پیسەو تەنها پیسەکانیشی قبوڵە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەیەویست بچێتە ئاو دەستەوە سەرەتا قاچی چەپی بۆ نێو ئاو دەستەکە پێشدەخست و، دەیفەرمووێ: ((اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ)) واتە: ((پەروەردگارا پەنات پێدەگرم لە هەموو جۆرە پیسێتیەك و زیانی نێرەو مێیەی شەیتانەکان)).

وقالَ: ((إِنَّ الله نَظِيفٌ يُحِبُّ النَّظَافَةَ))[1] واتـه: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

((بەڕاستی خوای گەورە خاوێنەو خاوێنێتی خۆش دەوێت)).

وقالَ: ((خَمسٌ مِنَ الفَوَاسِق يُقتَلْنَ فِي الحِلّ والحَرَمِ: الحَيَةُ، وَالفَأرَةُ، والغُرَابُ، وَالحِدَأَةُ، وَالكَلْبُ العَقُورُ))[2] وفي رواية: ((الحَيَّةُ والعَقرَبُ)) واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

((پێنج شت زیانبەخشن لەنێو حەرەم و دەرەوەشیدا دەکوژرێن: مار، مشك، قەل ڕەش، سوورە دالّ، سەگی گاز گر))، لەڕیوایەتێکی تردا: ((مارو دووپشك)).

---

(١)_ ضعيف: أخرجه الترمذي (٢٧٩٩)، من حديث سعد بن أبي وقاص ﷺ مرفوعاً، وفي إسناده خالد بن إلياس وهو ضعيف. وقد أخرج مسلم من حديث ابن مسعود ﷺ أنه قال: ((إن الله جميل يحب الجمال))، (حديث٩١)، فهذا يغني عن حديث الباب الذي ذكره ابن تيمية.

بەڵێ، خوای گەورە جوانەو جوانی خۆش دەوێ، خاوێنە پاك و پووختە، بەڵام شەیتانەکان پیسن زیان بەخشن بۆگەنن.

(٢)_ صحيح: أخرجه البخاري (١٨٢٩)، ومسلم (١١٩٨)، من حديث عائشة ﷺ مرفوعاً.

زیانبەخشەکان دەکوژرێن، چونکە زیان بە خەڵکی دەگەیەنن، بەڵام تاقمێکی خەڵك دەیخۆن و، بە خواردنە پاکەکانی دادەنێن، قالۆنچەو دووپشك و زەردەواڵە و مێش دەخۆن و، بە خواردنە پاکەکانی دادەنێن، وشەی (الفواسق) لێرەدا مانای دەرچوون لە ئاسایی دەگەیەنێت، نەك مەعصیەت و سەرپێچی کردن.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی داوە بەکوشتنی سەگ[١].

وقال: ((من اقتنى كلبا لا يغني عنه زرعا ولا ضرعا، نقص كل يوم من عمله قيراط))[٢]

واتە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەو کەسەی سەگێ ڕابگرێت کە بۆ کشتوکاڵ و پاسەوانیتی مەڕومالاتەکەی سوودی نەبێت، هەموو ڕۆژێك بە ئەندازەی (قیراط)ێك لە پاداشتی کردەوەکانی کەم دەبێتەوە)).

وقال: ((لا تصحب الملائكة رفقة معهم كلب))[٣] واتە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((فریشتەکان هاوەڵێتی کەسانێك ناکەن کە سەگیان لەگەڵ دابێت)) .

هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرموێ: ((إِذَا وَلَغَ الْكَلْبُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ، فَلْيَغْسِلْهُ سَبْعَ مَرَّاتٍ إِحدَاهُنَّ بِالتُّرَابِ))[٤] صحيح: أخرجه البخاري (١٧٢)، ومسلم (٢٧٩)، من حديث أبي هُريرة رضي الله عنه مرفوعاً.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەرکات سەگێك لەدەفری یەکێکتاندا ئاوی خواردەوە، با حەوت جار بیشوات جارێکیان بەخاك و خۆڵ)) .

---

(١)_ صحيح: أخرجه البخاري (٣٣٢٣)، ومسلم (١٥٧٠) من حديث ابن عمر رضي الله عنهما مرفوعاً.

وقد ورد نسخ الأمر بقتل الكلاب فيما أخرجه مسلم (١٥٧٢)، من حديث جابر بن عبدالله: أمرنا رسولُ اللهِ بقتلِ الكلابِ، حتى أنَّ المرأةَ تقدَمُ من البادية بكلبها فنقتلهُ، ثم نهى النبي ﷺ عن قتلها، وقالَ: ((عليكم بالأسود البَهيمِ ذي النُّقطَتينِ، فإنه شيطانٌ)).

(٢)_ صحيح: أخرجه البخاري (٣٣٢٥)، ومسلم (١٥٧٦)، من حديث سفيان بن زهير رضي الله عنه مرفوعاً، وله عدة طرق عن النبي ﷺ في الصحيحين وغيرها.

(٣)_ صحيح: أخرجه مسلم (٢١١٣) من حديث أبي هُريرة رضي الله عنه مرفوعاً.

(٤)_ تا ئێستا کافران بە سەگ دڵخۆش و شادومانن، بەخێویان دەکەن، تا ئەو ئاستەی دەوڵەمەندانیان لە سەرە مەرگدا بڕێك پارە بۆ سەگەکانیشیان وەست

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

دەکەن، چونکە سەربازی شەیتانن و، شەیتانیش سەگی خۆش دەوێ، هەروەها کەسانێك لەوانەی خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام لە ماڵەکانیاندا سەگ ڕادەگرن، لەگەڵیدا ڕێدەکەن و لە ئۆتۆمبێلدا لەگەڵ خۆیدا سواری دەکات، خۆی بە کافران دەچوێنێت _سبحان الله_ هەموو شتێك مەیلی بۆ لای ڕەگەزی خۆیەتی، لەبەر ئەوەی ئەو جۆرە کەسانە تەبیعەت و سروشتیان وەکو سەگە بۆیە مەیلی لای سەگیش دەکەن.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَاكْتُبْ لَنَا فِي هَذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ إِنَّا هُدْنَا إِلَيْكَ قَالَ عَذَابِي أُصِيبُ بِهِ مَنْ أَشَاء وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَالَّذِينَ هُم بِآيَاتِنَا يُؤْمِنُونَ(١٥٦) الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالأَغْلاَلَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُواْ بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُواْ النُّورَ الَّذِيَ أُنزِلَ مَعَهُ أُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ(١٥٧)﴾[1] [الأعراف: ١٥٦_١٥٧] واتە:

(خوایە) لەم دونیایەدا چاکەمان بۆ بنووسە هەروەها لە ڕۆژی دواییشدا بەڕاستی ئێمە بۆ لای تۆ گەڕاوینەتەوە (پەروەردگار) فەرمووی سزاو ئازارم دووچاری هەر کەسێ دەکەم کە بمەوێ وە بەزەیی و ڕەحمەتیشم هەموو شتێکی گرتۆتەوە جا لە دوایی دا ئەو (بەزەیی یەم) دەنووسم بۆ ئەوانەی پارێزگارو لە خواترسن و زەکات دەدەن ئەوانەش کە بڕوا بە بەڵگەو نیشانەکانی ئێمە دێنن ئەوانەی کە شوێن پێغەمبەر و نێردراوی نەخوێندەوار دەکەون (کە لە لایەن پەروەردگارەوە هاتووە) ئەو کەسەی کە (خاوەن کتێبەکان) دەیبینن بە نوسراوی لایانە لە تەورات و ئینجیلدا کە فەرمانیان پێ دەکات بەچاکە و ڕێگرییان لێ دەکات لە خراپە شتە خاوێن و پاکەکانیان بۆ حەڵاڵ دەکات وە شتە پیسەکانیان لێ حەڕام (قەدەغە) دەکات و بارە قورس و گرانەکانیان لە سەر لا دەبات و ئەو کۆت و زنجیرانەش کە بەسەریانەوە بوون ئەنجا ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بەو (پێغەمبەرە) هێنا بێت و ڕێزو قەدریان بۆ دانا بێت یارمەتیان دابێت و پشتیوانیان لێ کردبێت و پەیڕەوی ئەو نوورەیان کردبێت (کە قورئانە) کە لە گەڵیدا نێرراوەتە خوارەوە ئەوان هەموو یان (خاوەن ئەو سیفەتانەی باس کران) لە ڕزگار بووانن.

---

(١)_ ﴿الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الأُمِّيَّ﴾ ئەوانەی شوێن پێغەمبەرو نێردراوی نەخوێندەوار دەکەون کە لەلایەن پەروەردگارەوە هاتووە، خوای گەورە ڕەحمەت و

بەزەیی خۆی بۆ ئەو کەسانەی کە شوێنی پێغەمبەرەکەی دەکەون دەنوسێت، بەڵام ئەوانەی شوێنی پێغەمبەرەکەی ناکەون ڕەحمەت و بەزەیی خوای گەورە نایانگرێتەوە، ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ﴾ شتە خاوێن و پاکەکانیان بۆ حەڵاڵ دەکات و شتە پیسەکانیان لێ قەدەغە دەکات، کەوا بوو شتەپاکەکان بۆ ئیمانداران بووتە حەڵاڵ و شتە پیسەکانیشیان لێ حەڕام کراوە بەڵام شەیتانەکان و شوێنکەوتوانی شەیتان پیسەکانیان خۆش دەوێت و هۆگری بوونە، ﴿وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالأَغْلاَلَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ﴾ بارە قورس و گرانەکانیان لەسەر لادەبات و ئەو کۆت و زنجیرانەش کە بەسەریانەوە بوون، چونکە خوای گەورە و کۆتی بەسەریاندا دابوو بەهۆی کوفرەکانیانەوە، بەڵام ئەگەر بەپێغەمبەری خوا ﷺ بڕوابێنن، خوای گەورە ئەو کۆتانەیان لەسەر لادەبات، مانای وشەی (إصْر)ی نێو ئایەتەکە بریتیە لە قورسکردنەوەی فەرمان و قەدەغەکانی سەریان، مانای وشەی (الأغلال)ی نێو ئایەتەکەش بریتیە لەو شتانەی کە خوای گەورە لێی حەڕام کردن و، لە پێشدا بۆیان حەڵاڵ بوو، خوای گەورە لەم بارەوە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿فَبِظُلْمٍ مِنَ الَّذِينَ هَادُوا حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَاتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ﴾[النساء: ١٦٠.] واتە: بەهۆی ستەمکردنەوە لە لایەن جوولەکەکانەوە لێیانمان حەڕام کرد چەند خۆراکێکی پاك و خاوێن کە حەڵاڵ کرا بوو بۆیان. تەماشای ئەم ئایەتە بکەن کە چۆن خوای گەورە چەند خۆراکێکی حەڵاڵ و پاکی لێ حەڕام کردن وەکو سزایەك. ﴿فَالَّذِينَ آمَنُواْ بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُواْ النُّورَ الَّذِيَ أُنزِلَ مَعَهُ أُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ ئەنجا ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بەو پێغەمبەرە هێنابێت و ڕێزو قەدریان بۆ دانابێت و یارمەتیان دابێت و پشتیوانیان لێ کردبێت و پەیڕەوی ئەو نوورەیان کرد بێت کە قورئانە و لەگەڵیدا نێرراوەتە خوارەوە ئەوانە هەر هەموویان لە ڕزگار بووانن، بێگومان تەنها ئەوە بەس

-----------------------------------------------------------------

-----------------------------------------------------------------

-----------------------------------------------------------------

نییە کە بزانیت پێغەمبەرەو ستایشی بکەیت و ... هتد، بەڵکو پێویستە شوێنی بکەویت، ئەوە ئەبوتالیبە ستایشی پێغەمبەری خوای ﷺ دەکردو، بەچاکی باسی ئایینەکەی دەکرد، بەڵام شوێنی نەکەوت و لەسەر کوفر مردوو چووە ئاگرەوە، بەجێهێنانی شوێنکەوتنی ڕاست و دروست زۆر پێویستە، شوێنی بەڵگەی قسەکەنمان لە ئایەتە موبارەکەکە ئەو ڕاستە قورئانیەیەك شاهیدیش دەفەمورێ: ﴿وَاتَّبَعُواْ النُّورَ الَّذِيَ أُنزِلَ مَعَهُ﴾.

# نیشانەکانی دۆستانی شەیتان

کەوا بوو ئەگەر مرۆڤ تێکەڵ بەو شتە پیس و بۆگەنانە بێت کە شەیتان خۆشی دەوێن، یان لە گەرماوەکان و ئەو ئاودەستانەدا بمێنێتەوە کە شەیتانەکانی تێدا ئامادەن، یان مارو دووپشك و زەردەواڵەو، گوێی سەگەکان بخوات کە بۆگەنن و زیانبەخشن و لە تەبیعەتی ئاسایی بەدەرن، یان میزو هەر پیسیەکی تری بەو هاوشێوانەی کە شەیتان خۆشی دەوێن بخواتەوە، یان داوا لە غەیری خوای گەورە بکات، لەمەخلوقات داوای فریاگوزاری بکات و ڕوویان تێبکات، یان بەرەو گۆڕی شێخەکەی سوژدە بەرێت و ئیخلاصەوە بۆ پەروەردگاری جیهانیان دینداری نەکات، یان تێکەڵ بە سەگ، یان مومارەسەی ئاگر کاری بکات، یان بۆ سەرگوردان و جێگە پیسەکان پەنابەرێت، یان بۆ گۆڕەکان بە تایبەت گۆڕی کافرانی وەکو جوولەکەو گاورەکان و موشریکن پەنا بەرێت، یان حەزی بە بیستنی قورئان نەبێت و خۆی لێ دور بخاتەوە، وە بیستنی گۆرانی و شیعری پێش بخات، بیستنی شمشاڵی شەیتان لەبیستنی گوفتاری ڕەحمان پەسەند تر بکات: هەموو ئەمانەی سەرەوە لە نیشانەکانی دۆستانی شەیتانە نەك نیشانەکانی دۆستانی ڕەحمان .

کەچی ئیبن ومەسعود ﷺ دەیفەرموو: ((با هەر یەکێکتان تەنها پرسیاری قورئان لەنەفسی خۆی بکات، ئەگەر قورئانی خۆشویست ئەوە خواشی خۆش دەوێت، ئەگەر ڕقیشی لە قورئان دەبۆوە ئەوە ڕقیشی لەخواو پێغەمبەرەکەیەتی))[1] .

---

(١)_ لە سیفەتە جیاکەرەوەکانی نێوان دۆستانی خواو دۆستانی شەیتان ئەوەیە کە دۆستانی خوای گەورە قورئانیان خۆش دەوێت، پێی شادومان دەبن، دەیخوێننەوەو، لە ماناکانی وورد بنەوە، چێژی لێوەردەگرن، بەقورئان خۆیان لەخوای گەورە نزیك دەکەنەوە، ڕووی خۆیانی لێ وەرناگێڕن و، نابن بەکۆسپ لەبەردەم فێربوونیدا، بەڵکو ئەوان بەبەردەوامی لەگەڵ قورئاندان. بەڵام دۆستانی

شەیتان لە قورئان دەسڵەمێنەوە، بە گۆرانی و هەڵپەڕەو دەف و تەپڵ لێدان و ئامێرەکانی ڕابواردن دەیگۆڕنەوە، وەکو ئەوەی ئاڵاوە صۆفییەکان و بیدعەچیان شەیدای گۆرانی ئامێرەکانی ڕابواردنن، ئەمە یەکێکە لە جیاکەرەوەکانی نێوان دۆستانی خواو دۆستانی شەیتان، کەوا بوو هەر کات قورئانی خۆشویست و پەیڕەوی نەکرد، گوێبیستی خوێندنەوەی بوو ئەوە بزانە یەکێکە لە دۆستانی خوای گەورە، وە هەرکات کەسێکت بینی ڕووی لە قورئان وەرگێڕا بوو، خۆشی نەدەویست، هۆگری نەبوو، بوبو بەکۆسپ لەبەردەم فێربونیدا ئەوە بزانە لە دۆستانی شەیتانە، بە واتایەکی تر هەر کەسێك ڕقی لە قورئان دەبۆوە بێگومان ڕقی لە خواو پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ، ئەمە نیشانەیەکی ئاشکرایە.

عوسمانی کوڕی عەففانیش ﷺ دەیفەرموو: ((ئەگەر دڵەکانمان بە تەواوی پاك بوایەتەوە دڵنیا بن لە فەرمایشتی خوای گەورە تێر نەدەبوو))[1].

هەروەها ئیبن و مەسعود ﷺ دەیفەرموو: ((زیکرو یادکرن ئیمان لە دڵدا دەچێنێت وەکو چۆن ئاو سەوزە دەڕوێنێت، گۆرانیش دوو ڕووی لە دڵدا دەچێنێت وەکو چۆن ئاو سەوزە دەڕوێنێت))[2].

---

(١)_ عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر دڵەکانمان پاك بوایەتەوە دڵنیا بن لە فەرمایشتی خوای گەورە تێر نەدەبوو، لە فەرمایشتی خوای گەورە بێزار نەدەبوو، بەڵکو دڵەکان بە بەردەوامی بە قورئانەوە پەیوەستن، چونکە خۆشیان دەوێت و، هەر کەسێکیش یەکێکی خۆشویست زۆر یادی دەکاتەوە، بۆیە هەر کات بێزا بوون و ڕوو وەرگێڕانی مرۆڤێکت لە قورئان بەدیکرد، بزانە لە قبونی ئیمان و ناپاکی لە دڵدایە.

(٢)_ لە نێوان قورئان و گۆرانیدا جیاوازیەکی گەورە هەیە، قورئان فەرمایشتی خوای گەورەیە، گۆرانیش قسەی شەیتانەکانە، شەیتانەکانی ئادەمیزادو جنۆکە، قورئان زیکرو یادکردنی خوای گەورە لە دڵدا دەڕوێنێت، وەکو چۆن ئاو سەوزە دەڕوێنێت، چونکە هەر کات ئاو دابەزیە سەر زەوی ڕووەکەکان دەڕوێنێت، لەو بارەوە خوای گەورە لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَتَرَى الْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ﴾ [الحج: ٥] واتە: وە زەوی دەبینی (لەزستاندا) خامۆشە ووشك و بێگیایە جا کاتێ بارنمان بەسەریدا باراند زەوی (ڕووەکی لێ دەڕوێ و) دەجولێ زەوی هەڵ دەدات (بەرزدەبێتەوە) و(زەوی) دەڕوێنێ لە هەموو جۆرە (گیاو گوڵێکی) جوان. بەم جۆرەیە نموونەی قورئان لەدڵاندا بەو شێوەیە، بەڵام گۆرانی نیفاق دوو ڕووی لەدڵدا دەڕوێنێت، نیفاق و دوو ڕوویش بریتیە لە دەرخستنی خەیرو شاردنەوەی شەڕێ گەورەی لە دڵدا، ئەمەیە نیفاق و دوو ڕووی،

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

-----------------------------------------------------

کەوا بوو گۆرانی دوو ڕووی دەڕوێنێت، نیشانەکانیشی بریتیە لە حەز بە قورئان نەکردن، حەز بەزیکرو یاد نەکردن، حەز بەنایین نەکردن، بۆیە ئەگەر کەسێکت بە بینی شەیدای گۆرانی و گۆرانیبێژان بو ئەوە بزانە ئەو شتانە دوو ڕووی لەدڵیدا دەڕوێنێنێ، ئیتر ڕقی لە قورئان دەبێتەوە، ڕقی لەئیمانداران دەبێتەوە، ڕقی لەئەهلی خێر دەبێتەوە، ئەوەیە بەرهەمی جێگیر بوونی گۆرانی و شمشاڵ و دەنگی گۆرانی بێژان لە دڵەکاندا کە عاشقان و صۆفیەکان مەیلی دەکەن، ئەوان تەنها لە گۆرانی چێژ وەردەگرن، بەردەوام و هەتا هەتایە لە ئۆتۆمبێل و لە ماڵ و لە هەر شوێنێکدا بن گۆرانی هاودەمیانە، یا لە ئێزگەکانەوە یا لەو ئامێرە تۆمارکارانەوە گوێبیستی دەبن. ئەوەیە نیشانەی نیفاق و دوو ڕوویی: ڕق لێبونەوەی زیکرو یادی خوای گەورە، ڕق لێبونەوە لە ئیمان و ئەهلی ئیمان، ئەو سوودەی لێرەوە دەستمان دەکەوێت بریتیە لە وریاکردنەوەی جەماوەری خەڵك لە گوێ نەگرتن لە گۆرانی کە دەستی گرتووە بەسەر خەڵکانێکی زۆری ئەمڕۆ دا، تا ئەو ئاستەی خۆیان بە کاتەکانی بڵاوکردنەوەی گۆرانیەوە سەرقاڵ دەکەن، تەنانەت بۆ نوێژی بەکۆمەڵی مزگەوتەکانیش ناچن ئەگەر کاتی بڵاوکردنەوەی گۆرانی هات، ئیتر بەلای گۆرانیەوە دادەنیشن و نوێژی بە کۆمەڵ پشتگوێ دەخات و ئامادەیە نوێژەکانی خۆی لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا پشتگوێ بخان بە مەرجێك گۆرانیەکانی لە دەست نەچێت. دەبن بە هاندەری گۆرانیبێژان و بە هونەرمەندانیان ناو دەبەن، وێنەی یادگاریان لەگەڵ دەگرن.

کەوا بوو ئەگەر هەر کەسێك بە ڕاستیەکانی ئیمان شارەزابێت و جیاوازی لە نێوان

حالی هۆشەویستانی ڕەحمانی و حالی خۆشەویستانی شەیتان بکات: ئەوە بەڕاستی

خوای گەورە لەنوور ڕووناکی خۆی خستۆتە دڵیەوە⁽¹⁾، لەم بارەوە خوای گەورە

دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ تَتَّقُوا اللَّهَ يَجْعَلْ لَكُمْ فُرْقَانًا وَيُكَفِّرْ عَنْكُمْ

سَيِّئَاتِكُمْ﴾[الأنفال: ٢٩].

---

(١) دڵ نووری ڕووناکی تێدایە، نووری ڕووناکی ئیمانی تێدایە کە بەهۆیەوە مرۆڤ دەتوانی جیاوازی بکات لە نێوان هەق و باتڵ، ڕێنموونیی و گومڕایی، خەیرو شەڕ، کوفرو ئیمان، دۆستانی خواو دۆستانی شەیتانی، لەو بارەوە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ تَتَّقُوا اللَّهَ يَجْعَلْ لَكُمْ فُرْقَانًا وَيُكَفِّرْ عَنْكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ﴾[الأنفال: ٢٩] واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر ئێوە خواناس بن و خۆتان بپارێزن هۆی جیاکەرەوە(ی ڕاست و ناڕاست)تان بۆ بە دەست دێنێت و لە گوناهەکانتان دەبورێ. وشەی (الْفُرْقَانُ)ی نێو ئایەتەکە ئەو واتایە دەبەخشێت کە خوای گەورە توانای جیاکردنەوەی نوور ڕووناکی خەیرو تاریکی شەڕ، ئەهلی خەیرو ئەهلی شەڕ بە بەندەکەی خۆی دەبەخشێت، بەڵام ئەگەر هەر مرۆڤێك ئەو توانایەی پێنەدرا بوو ئەوە بەڵگەیە لەسەر تاریکبوونی دڵی و نەبوونی هیچ نوورو ڕووناکیەك تیایدا، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَآمِنُوا بِرَسُولِهِ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِنْ رَحْمَتِهِ وَيَجْعَلْ لَكُمْ نُورًا تَمْشُونَ بِهِ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾[الحديد: ٢٨] واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە لە خوا بترسن و باوەڕبێنن بەپێغەمبەرەکەی دوو بەشتان لە ڕەحمەت و بەزەیی خۆی پێ دەبەخشێ وە ڕووناکی یەکتان دەداتێ کە ڕێنموونی پێبکەن ولێتان خۆش دەبێت وەخوا لێخۆشبووی میهرەبانە. کەوا بوو ئایەتەکە پەیامێکە بۆ ئەهلی کیتاب کە بڕوایان بەپێغەمبەرانی پێشوو هێناوە بۆ ئەوەی بە موحەممەدیش ﷺ بڕوا بێنن، بۆ ئەوەی

دوو پاداشتیان دەستکەوێت، پاداشتی بڕوا بوون بە پێغەمبەرانی پێشوو، وە پاداشتی بڕوابوون بە موحەممەد ﷺ، ئەوە بوو سوودی یەکەم، سوودی دووەم: بریتیە لەوەی کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَجْعَل لَّكُمْ نُورًا تَمْشُونَ بِهِ﴾ وە ڕووناکیەکتان دەداتێ کە ڕێنموونی و ڕێنوێنیی پێبکەن، خوای گەورە نورو ڕووناکیەکی ڕاستەقینە دەخاتە نێو دڵانەوە کە بە هیچ شێوەیەك لە ڕووناکیە هەست پێ کراوەکانی وەکو ڕووناکی خۆرو، ڕووناکی کارەباو ... هتد ناچێت. بەڵام با مەبەستی سەرەکیمان بیر نەچێتەوە کە نورو ڕووناکی دڵانە، لەوانەیە کەسی وا هەبێت چاوانی کوێر بن بەڵام خوای گەورە دڵیی بە ئیمان و زانست ڕووناك کردۆتەوە، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّهَا لا تَعْمَى الأَبْصَارُ وَلَكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ﴾[الحج: ٤٦] واتە: لە ڕاستی دا چاوەکان کوێر نابن بەڵکو ئەو دڵانە کوێر دەبن کە لە سینەکاندان. دڵنیابن چەندەها کەسی وا هەن نابینان بەڵام دڵەکانیان بەزانست و ئیمان ڕووناکە، وە چەندەها کەسی واش هەن دەبینن چاویان ساغە بەڵام دڵەکانیان کوێر بوو _ پەنا بەخوا _، کەوا بوو پشت بەستن بە نورو ڕووناکی دڵەکانە، ئەگەر نورو ڕووناکی چاوەکان لەگەڵ نورو ڕووناکی دڵەکان یەکیان گرت، ئەوە نیعمەت و بەهرەیەکی گەورەیە.

هەروەها خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلا الإِيمَانُ وَلَكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِ مَنْ نَّشَاءُ مِنْ عِبَادِنَا وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾[1] [الشورى: ٥٢] واته ﴿وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا﴾ هەر بەو شێوە (کە وەحی پێ دێ) قورئانمان بۆ تۆ نارد (ئەی موحەممەد ﷺ) ﴿مِّنْ أَمْرِنَا﴾ بەفەرمانی خۆمان ﴿مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلا الإِيمَانُ﴾ کە تۆ نەتدەزانی کتێب و ئیمان چی یە ﴿وَلَكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا﴾ بەڵام ئێمە ئەوەمان کردە ڕووناکی یەك ﴿نَّهْدِي بِهِ مَنْ نَّشَاءُ﴾ ڕێنموونی هەر کەسێکی پێ دەکەین کە بمانەوێت ﴿مِنْ عِبَادِنَا﴾ لە بەندەکانمان ﴿وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ وە بەڕاستی تۆ (خەڵك) ڕێنموونی دەکەیت بۆ ڕێگای ڕاست.

---

(١)_ خوای گەورە منەت بەسەر پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکات و نیعمەت و بەهرەکانی خۆی بیر دەخاتەوە و دەفەرموێت: ﴿وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا﴾ هەر بەو شێوە کە وەحی پێ دێ قورئانمان بۆ تۆ نارد ئەی موحەممەد ﷺ بەفەرمانی خۆمان، قورئان ڕوحی دڵەکانە، دڵ بەو ڕوحە دەژی، وەکو چۆن جەستە بە ڕوحی ژیان دونیا دەژی ژیانی ، وشەی (روح) چەند مانایەك دەبەخشێت جار بە جار مەبەست بەو ڕوحە ڕوحی نێو جەستەیە کە ژیان بە مرۆڤ دەبەخشێت و، ئیتر پێی دەجولێتەوەو، ڕێ دەکات و، هەست دەکات، جار بە جار ئەو ڕوحە مانای ڕوحی زانست و زرنگیی دەبەخشێت، ڕوحی نێو ئایەتەکەش ئەو مانایە دەبەخشێت، واتە: قورئان و سوونەتمان بە تۆ بەخشی ئەی موحەممەد ﷺ، کە بە ڕوح ناوی بردون، چونکە دڵەکانی پێ دەژێتەوە، ئەمەشی ڕوحی ڕاستەقینە لە، جار بە جاریش ڕوح مانای هێز دەبەخشێت، وەکو ئەوەی خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَأَيَّدَهُمْ بِرُوحٍ مِّنْهُ﴾[المجادلة: ٢٢] واتە: بە هێزی کردوون و سەری خستوون بە قورئان و ئیمان لە لایەن خۆیەوە. جار بە جاریش مەبەست بەو ڕوحە جبریلە _ علیه السلام _

وەکو ئـەوەی خـوای گـەورە لـە ئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الأَمِينُ﴾[الشعراء: ١٩٣] واتە جوبرەئیلی ئەمین هێنایە خوارەوە. ﴿وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا﴾ ئـەم ڕووحـە بریتیـە لـەو سـروش و وەحیـەی کـە بەسـەر پێغەمبـەردا ﷺ دابەزیووە، خوای گەورە بە ڕوح ناوی بردووە چونکە هۆکاری زیندەگی دڵـە، ﴿مِّنْ أَمْرِنَا﴾ واتە بەشەرع و فەرمانی خوای گەورە، ﴿مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلا الإِيمَانُ﴾ پێش ناردن، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم شتانەی نەدەزانی، کتێبی نەدەخوێندەوە، لەم بارەوە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذًا لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ﴾[العنكبوت: ٤٨] واتـە: وە تـۆ (ئـەی موحەممـەد ﷺ) پـێش ئـەم قورئانـە هـیچ کتێبێکـت نەخوێندۆتـەوە ﴿وَلا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ﴾ وە بەدەسـتی ڕاسـتت نەتنوسـیووە ﴿إِذًا لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ﴾ (ئەگـەر وا بوایـە) ئـەو کاتـە ناڕاستەکان (بێ بڕوایان) دەکەوتنە گومانەوە. پێشتر پێغەمبەری خوا ﷺ نەیدەزانی کتێب و ئیمان و وردەکاریەکانی ئیمانی چین، بەڵام پێش بوونی بـە پێغەمبـەر خـوای گەورە بەفیترەت ئیمانی خستبووە دڵیەوە بۆیە خۆی لە هاوەڵپەرستان جیاکرد بۆوە، لەسەر ڕێبازی ئیبراهیم پێغەمبەر ـ علیه السلام ـ خـوا پەرسـتی دەکـرد، لـە ڕاسـتیدا وردەکاریەکانی ئیمان تـەنها پـاش بوونی بـە پێغەمبـەر زانـی، پێغەمبـەری خـوا ﷺ خوێندنەوەی نەدەزانی بەپێچەوانەی ئەوەوە کە هاوەڵپەرستان بانگەشەیان بۆ دەکرد کە گوایە ئەم قورئانە بەسەرهات و داستانی پێشووەکانەو موحەممـەد داوای کـردووە بۆی بنووسنەوە، لە جوولەکەکانـەوە وەریگرتـووە، پێغەمبـەری خـوا ﷺ نەیـدەزانی بخوێنێت و بنووسێت، ﴿وَلَكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا﴾ بەڵام ئێمە ئەوەمان کردووە بە ڕووناکیەك، ئا ئەمەیە شـوێنی مەبەسـتی ئێمـە لـە ئایەتەکـە، ئـەم کتێبـەمان کـردووە بـە نـوور و ڕووناکی، قورئان نورو ڕووناکیە، ﴿نَّهْدِي بِهِ مَنْ نَّشَاءُ مِنْ عِبَادِنَا﴾ ڕێنموونی

----------------------------------------------------------
----------------------------------------------------------
----------------------------------------------------------

هەر کەسێکی پێدەکەین کە بمانەوێت لە بەندەکانمان، کەوا بوو هیدایەت و ڕێنموونی و ڕێنوێنی تەنها بە دەستی خوای گەورەیەو، خۆی دەزانێ کێ بە هیدایەت شایستەیەو کێ بە هیدایەتدان شایستە نییە، خوای گەورە ئەو هیدایەت و ڕێنموونیە بەهیچ کەسێك نابەخشێت، مەگەر بەوانەی کە پێی شایستەن، لەم بارەوە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾[القصص: ٥٦] واتە: بەڕاستی (ئەی موحەممەد ﷺ) تۆ ناتوانی ئەو کەسەی خۆشتبوێ ڕێنموونی بکەیت بەڵام خوا هەر کەسی بوێ هیدایەتی دەدات ﴿وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾ و ئەو (خوایە) زاناترە بەوانەی ڕێنموونی وەردەگرن. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾[القلم: ٧] واتە: بێگومان پەروەردگاری تۆ لە هەموو کەس زاناترە بەو کەسەی کە ڕێی ڕاستی خوای وون کرد بێ وە ئەو زانترە بەو کەسانەی کەڕێی ڕاستیان گرتبێ. تەنها خوای گەورە زانایە بەوەی چ کەسێك هیدایەتی قبوڵەو، چ کەسێکیش قبوڵی نییە، ﴿نَّهْدِي بِهِ مَنْ نَّشَاءُ مِنْ عِبَادِنَا﴾ ئەمە هیدایەتی سەرخستن و ئیمانە (التوفيق والإيمان)، بەڵام هیدایەتی ڕێنمایی و ڕێنوێنی (الدلالة والإرشاد) گشتییەو بۆ تێکڕای جەماوەری خەڵکە، بڕواداران و کافران، بۆ سەراپای خەڵکیە، قورئان ڕێنموونیی و ڕێنوێنە بۆ خەڵکی، واتە: ڕێگەی هەق لە ڕێگەی گومڕای ڕووندەکاتەوە، ڕێنوێنی دەکات، بەڵام هیدایەت و ڕێنموونیی تایبەت تەنها بۆ ئەهلی ئیمانە، ﴿وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ وە بەڕاستی تۆ خەڵك ڕێنموونی دەکەیت بۆ ڕێگای ڕاست. کۆکردنەوەی (الجمع) نێوان ئەو دوو ئایەتە: ئایەتی ﴿وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ صِرَاطِ اللَّهِ﴾ وە ئایەتی﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ﴾ چۆن دەبێت؟

مەبەست بە وشەی هیدایەتی نێو ئایەتی یەکەم: هیدایەتی ڕێنمایی و ڕێنوێنی و

----------------------------------------------------------------

----------------------------------------------------------------

----------------------------------------------------------------

ڕوونکردنەوەیە (الدلالة والإرشاد والبيان)، بەڵام مەبەست بە وشەی هیدایەتی نێو ئایەتی دووەم: هیدایەتی تەوفیق سەرخستن و ئیمانە (التوفيق والإيمان)، ئەمە تەنها بە دەستی خوای گەورەیە، ﴿صِرَاطِ اللَّهِ﴾ واتە: ئەو ڕێگە ڕاستەی تۆ ڕێنموونی خەڵکی بۆ دەکەیت ڕێگەی ڕاستی خوای گەورەیە. ئەمەش ڕێزێکی گەورەیە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ.

ئەمەش لەو ئیماندارانەیە کە ئەو فەرموودەیەی لەبارەوە هاتووە کە پێشەوا الترمذی لەئەبی سەعیدی خودریەوە ﷺ لەپێغەمبەری خواوە ﷺ دەیگێڕێتەوە، فەرموویەتی: ((اتَّقُوا فِرَاسَةَ الْمُؤْمِنِ فَإِنَّهُ يَنْظُرُ بِنُورِ اللَّهِ))[1] ضعيف: أخرجه الترمذي (٣١٢٧)، وابن جرير الطبري (٤٦/٤)، من طريق عطية، عن أبي سعيد مرفوعاً، وعطية _ وهو العوفي _ ضعيف. قال الترمذي: حديث حسن. واتە: ((خۆتان لە فیراسەت و ڕووناسیی بڕوادار بپارێزن _ هەستێکە لە دڵدایەو بەرانبەر یەکێك دروست دەبێت و لەواقعیشدا کوتومت وەکو خۆی دێتەدی _ چونکە بەنورو ڕووناکی خواوە تەماشا دەکات)) .

---

(١)_ هەر کەسێك بە تەواوی گوێڕایەڵی پەروەردگاری بێت و، بە قورئان کار بکات، ئەوە نورو ڕووناکیەك لە دڵیدا دروست دەبێت، کە نورو ڕووناکی ئیمان و نورو ڕووناکی زانستە، ئیتر بەو نورو ڕووناکیە خواییە تەماشا دەکات و، توانای جیاکردنەوەی نێوان هەق و باتڵ و، ڕێگەی ڕاست و گومڕایی و، سوود بەخش و زیانبەخشی دەبێت، بە پێچەوانە شەوە هەر کەسێك لەو نورو ڕووناکیە بێبەش کرا، ئیتر توانای جیاکردنەوەی نێوان خەیرو شەڕو، نێوان دۆستانی خواو دوژمنانی خوای نابێت، شتەکانی بەلاوە یەکسان دەبێت. فیراسەت و ڕووناسی: هەستێکە لەدڵدایەو بەرانبەر بە یەکێك دروست دەبێت و بێشبینی شتێکی لێ دەکرێت و لە واقعیشدا کوتومت وەکو خۆی بەدیدێت، ئیماندار فیراسەت و ڕووناسی بۆ دروستدەبێت، چونکە بە نورو ڕووناکی خواوە تەماشا دەکات، توانای جیاکردنەوەی ئەهلی خەیر لە ئەهلی شەڕی دەبێت، هەروەها ئەوانە دەناسێت کە پێشبینی خەیریان لێدەکات و، ئەوانەش کە پێشبینی شەڕیان لێدەکات، تەنها تەماشای کەسەکە بکات یەکسەر دەزانێت ئایا لە ئەهلی خەیرە یان لە ئەهلی شەڕە، پێشبینی ئەوەش دەکات کە لە ئاییندەدا چ بەسەر کەسەکەدا دێت، چونکە بەنورو ڕووناکی خواوە تەماشا دەکات، بە ڕواڵەت و دیمەن و سیماو ڕووخسار فریو ناخوات.

پێشتریش ئەو فەرموودە (صحيح)ەمان بۆ باسکردن کە ئیمامی بوخاری و کەسانی دیکەش دەیگێڕنەوە، ((لا يزالُ عَبْدِيْ يَتقرَّبُ إِليَّ بالنَّوافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ، فإذا أحْبَبْتُهُ كُنْتُ سَمْعَهُ الَّذِيْ يَسْمَعُ بِه، وبَصَرَهُ الَّذِيْ يُبْصِرُ بِهِ، وَيَدَهُ الَّتِي يَبْطِشُ بِهَا، وَرِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِيْ بِهَا، فَبِي يَسْمَعُ، وبِي يُبْصِرُ، وبِي يَبْطِشُ، وَبِي يَمْشي، وَإِنْ سَأَلَنِي لأُعْطِيَنَّهُ، وَلَئِنِ اسْتَعَاذَنِي لأُعِيذَنَّهُ، وَمَا تَرَدَّدْتُ عَنْ شَيْءٍ أَنا فَاعِلُهُ تَرَدُّدِي عَنْ قَبْض نَفْسِ عَبْدِي المؤْمِنِ، يَكْرَهُ الموتَ وأَكْرَهُ مَسَاءَتَهُ، وَلَابُدَّ لَه مِنْهُ))(١)

---

(١)_ ئەو فەرموودە هەندێکی هەندێکی دیکەی ڕاڤە دەکات، هەندێکی هەندێکی دیکەی ڕوون دەکاتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی ڕوونکردۆتەوە کە خوای گەورە بە سروش و وەحی بۆی دەنێرێت و فێری دەکات، ئەوە فەرموودەیەکی قودوسیەو خوای گەورە دەفەرموێت: ((لا يَزَالُ عَبْدِيْ يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ)) ئەوە ئێمە لە کەسەکانمان دەکەینە بەڵگە و پەشمانە ئەو فەرموودەکەت، خۆنزیکردنەوە لەخوای گەورە بەکردەوە چاکەکان دەبێتە هۆکاری بە دەست هێنانی خۆشەویستی خوای گەورە، بەڵام سەرپێچی کردنی خوای گەورە هۆکارە بۆ ئەوەی خوای گەورە ڕقی لە بەندەکەی خۆی بێت، خوای گەورە تەوبەکارانی خۆش دەوێت، پارێزکاران خۆش دەوێت، ئەوانەی خۆیان پاک دەکەنەوە خۆشی دەوێن، چاکەکارانی خۆش دەوێت، ئەهلی کردەوە چاکەکانی خۆش دەوێت، ئەوانەی بە بەجێهێنانی فەڕزو نافیلەو سوننەتەکان خۆیان لە خوا نزیک دەکەنەوە خۆشی دەوێن، ئەوەیە هۆکاری خۆشەویستنی خوای گەورە بۆ بەندەکەی و، پشتگیریکردنی خوای گەورە بۆ بەندەکەی خۆی، ((فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ كُنْتُ سَمْعَهُ الَّذِيْ يَسْمَعُ بِه، وَبَصَرَهُ الَّذِيْ يُبْصِرُ بِهِ، وَيَدَهُ الَّتِي يَبْطِشُ بِهَا، وَرِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِيْ بِهَا)) مانای ئەمە چییە؟ ماناکانی ئەوەیە کە دەفەرموێ: ((فَبِي يَسْمَعُ، وَبِي يُبْصِرُ، وبِي يَبْطِشُ، وَبِي يَمْشي))، واتە ئەم ئەندام و هەستانە بۆ هیچی تر بەکارناهێنێت مەگەر بۆ تاعەت و گوێڕایەڵی خوای گەورە نەبێت،

بۆیە تەماشای ئەو شتانە ناکات کە خوای گەورە تووڕە دەکات، تەماشای ئەو شتانە ناکات کە خوای گەورە حەرامی کردوون، وەکو ژنانی نامەحرەم و، عەورەت و، فیلمە ڕووتەکان و، شتەکانی ئینترنێت ، تەماشای ئەو شتانە ناکات، بەڵکو تەماشای ئەو شتانە دەکات کە سوودی پێدەگەیەنن، لە بواری بیستنیشدا گوێبیستی گۆرانی و شمشاڵ و ئامێرەکانی ڕابواردن نابێت، بەڵکو گوێبیستی زیکرو یادی خوای گەورە و قورئان و، (سبحان الله) و (لا إله إلا الله) دەبێت، گوێبیستی هیچ شتێك نابێت مەگەر ئەو شتانەی سوودی پێدەگەیەنن، گوێبیستی غەیبەت و دوو زمانیی و لە پاش ملەباسکردن و بە خراپی باسکردن نابێت، بەڵکو گوێبیستی خەیر دەبێت، چونکە خوای گەورە بیستنی دەپارێزێت، هەروەها بە دەستەکانی هیچ وەرناگرێت و نابەخشێت مەگەر لەبواری تاعەت و گوێڕایەڵی خوای گەورەدا بێت، تەنها لە بواری خەیردا وەردەگرێت و دەبەخشێت، دەستەکانی لەخەیردا بەکاردێنێت، لەبواری شەڕدا بەکاریان ناهێنێت، بۆ کوشتنی خەڵك و، لێدانی خەڵك بەنا هەق بەکاریان ناهێنێت، هەروەها گرتنە بەری ڕێگاشی تەنها بۆ تاعەت و گوێڕایەڵی خوای گەورە بەکاردێنێت، بۆ فێر بوونی زانست، بۆ ئەڵقەکانی زیکر، بۆ دەرسە شەرعیەکان، بۆ کۆڕە بەسوودەکان، بۆ مزگەوتەکان بۆ بەجێهێنانی نوێژو دانیشتن تیایدا ڕێدەکات، بۆ شانۆ و شوێنەکانی ڕابواردن و، کۆمەڵ بەستە خراپەکان ڕێی ناکات، بەڵکو ڕقی شتانەیەو خۆی لەو شوێنانە دور دەخاتەوە، چونکە خوای گەورە لەڕێکردندا پاڵپشتی دەکات و ڕێنمایی دەکات، لە زبرو زەنگی دەستەکانیدا پاڵپشتی دەکات و ڕێنمایی دەکات، لە بیستنی گوێکانیدا پاڵپشتی دەکات و ڕێنمایی دەکات، لە بینینی چاوەکانیدا پاڵپشتی دەکات و ڕێنمایی دەکات، ئەوەیە مانای ڕاستی فەرموودەکە. مانای فەرموودەکە بەو جۆرە نییە کە ( حلولیەکان) لێکی دەدەنەوە، گوایە خوای گەورە دادەبەزێتە نێو

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

---------------------------------------------------------------

جەستەی مرۆڤەوە _ تعالى الله عن ذلك _، چونکە هەندێکی فەرموودەکە هەندێکی دیکەی تەفسیرو ڕاڤە دەکات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووده‌کەی ڕاڤە کردووە، یان خوای گەورە ڕاڤەی کردوەو، پێغەمبەری خواش ﷺ لەپەروەردگاریەوە دەیگێڕێتەوە: ((فَبِي يَسْمَعُ، وَبِي يُبْصِرُ، وبِي يَبْطِشُ، وَبِي يَمْشِي))، پاشان دەفەرموێ: ((وَإِنْ سَأَلَنِي لأُعْطِيَنَّهُ، وَلَئِنِ اسْتَعَاذَنِي لأُعِيذَنَّهُ)) بە دڵنیایی هەر کات داوام لێ بکات پێی دەبەخشم، هەر کات پەنام پێ بگرێت پەنای دەدەم، چونکە ئەم مرۆڤە خوای لەگەڵ دایەو، دەیگرێتە ئەستۆ، پاشان خوای گەورە دەفەرموێ: ((وَمَا تَرَدَّدْتُ عَنْ شَيْءٍ أَنا فَاعِلُهُ تَرَدُّدِي عَنْ قَبْض نَفْسِ عَبْدِي المؤْمِنِ)) وە لە هیچ شتێکی دیکەدا ڕاڕاو دوو دڵ نەبووم بە ئەندازەی ڕاڕایی و دوودڵیەکەم بەرامبەر بە ڕوح کێشانی بەندە ئیماندارەکەم، ئایا خوای گەورە ڕاڕاو دوو دڵ دەبێت؟ وەڵامەکەی لەوەدایە کە خۆی دەفەرموێت: ((يَكْرَهُ الموتَ وأَكْرَهُ مَسَاءَتَهُ)) حەزی بە مردن و منیش حەزم بە ئازاردانی نییە، کەوا بوو مانای ڕاڕایی و دوودڵیەکەی خوای گەورە ئەوەیە کە حەزی بەوانە نییە کە بەندەکەی حەزی پێنییە، مرۆڤ هەر بە سروشت حەزی بەمردن نییە، خوای گەورەش حەزی بەوانە نییە کە بەندەکەی حەزی پێنییە، پاشان دەفەرموێ: ((وَلابُدَّ لَهُ مِنْهُ)) بەڵام مردنی ئەو دەبێ هەر ڕوو بدات.

کەوا بوو هەر کات بەندەیەك لەو بەندە صالحانەی کە لە فەرمودەکەدا هاتووە: لە نێوان سیفەتەکانی دۆستانی ڕەحمان و دۆستانی شەیتاندا جیاوازی کرد[١] وەکو چۆن کەسی دراو گۆڕ لە نێوان دیرهەمی چاك و دیرهەمی ساختەدا جیاوازی دەکات[٢]

---

(١)_ چونکە دونیا هەر دەبێت دۆستانێك بۆ ڕەحمان و دۆستانێکیش بۆ شەیتانی تێدابێت، هەموو ئەو دونیایە دۆستی ڕەحمان نین، هەمووشیان دۆستی شەیتان نین، بەڵکو کەسانێکی تێدایە دۆستی ڕەحمانەو کەسانێکیشی تێدایە دۆستی شەیتانە، بەندەی موسلمانیش توانای جیاکردنەوەی هەر دوو کۆمەڵەکەی نابێت مەگەر بە دوو شت کە ئیمان بەهۆی نورو ڕووناکی زانست، ڕووناکی عیبادەت و پەرستنە کە خوای گەورە دەیخاتە دڵیەوە.

(٢)_ بەڵام ئەو کەسەی لەو باوەڕەدایە کە گوایە بەڕەهایی هەر کەسێك کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەر ئەنجام بدات دۆستی خوای گەورەیە، با دڵنیا بێت توانای جیاوازی کردنی نێوان هەق و باتڵی نییە، چونکە تەنها کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەر بەڵگە نییە بۆ دۆستایەتی خوای گەورە، تاوەکو تەماشای کردەوەکانی نەکرێت، ئەگەر کردەوەکانی بریتی بوون لە تاعەت و گوێڕایەڵی و پەرستنی خوای گەورە ئەوە کردەوەی نائاساییە لە سروشت بەدەرەکانیشی کەراماتێکەو خوای گەورە لەسەر دەستی ئەو بەدیدێنێت، وەکو ڕێزگرتنێك بۆ ئەو، هەروەها لەبەر ئەوەی خۆی و کەسانیتریش پێویستیان بەو کەرامەتەیە، بەڵام ئەگەر کەسی ئەنجامدەری ئەو کردەوە نائاساییە لەسروشت بەدەرانە لە خوای گەورە یاخی بوو، فەرزەکانی پشتگوێ دەخست، حەرامکراوەکانی ئەنجام دەدا، ئەوە دۆستی شەیتانەو کردەوە نائاساییە لە سروشت بەدەرەکانشی شەیتانین و کەرامەت نین، پێویستە مرۆڤی موسڵمان توانای جیاکردنەوەی نێوان دۆستانی ڕەحمان و دۆستانی شەیتانی هەبێت، هەر لەو کردەوانەوە کە ئەنجامی دەدەن، نەك تەنها تەماشای سیماو ڕوخسارو ڕواڵەت

بن اولياء ا...

---

---

---

بكات، چونكه دۆستانی ڕاستەقینە ئەوانەن كە خوای گەورە لە بارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ آمَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ(٦٣)﴾[يونس: ٦٣]. واتە: ئەوانەی باوەڕیان هێناوە وەهەمیشە خۆیان دەپارێزن و لە خوا دەترسن. بە واتایەكی تر كەسانی دراو گۆڕەرەوە ئەگەر دراوی زێڕین و زیویان بۆ بچێت، هەر بە دەنگ كانزای پوخت لە كانزای ساختەكراو لە یەك جیادەكەنەوە، تەنها گوێبیستی دەنگی بێت پێی دەزانێت، یان لە تاقیگە تاقیان دەكاتەوە، هەروەها پێویستە مرۆڤی موسڵمانیش دۆستانی خواو دۆستانی شەیتان لە یەك جیاكاتەوە وەكو چۆن كەسی دراو گۆڕەرەوە داوی چاك و ساختە لە یەك جیادەكاتەوە.

وەکو چۆن ئەوانەی وەلاخە بەرزە دەناسن ئەسپی چاك و ئەسپی خراپ لە یەك جیادەکەنەوە[1] وەکو چۆن ئەوانەی سوار چاکی دەزانن ئازاو ترسنۆك لە یەك جیادەکەنەوە[2] وەکو چۆن پێویستە جیاوازی لە نێوان (پێغەمبەر زان)ی ڕاستگۆ و کەسی خۆ بە پێغەمبەرکەری درۆزن بکرێت[3]

---

(١)_ لە ڕوالەت ئەسپ و ماین وەکو یەکن، بەلام لە ڕووی سیفات و سوودەکانیانەوە جیاوازن، هیچ کەسێك توانای ناسینەوەیانی نییە مەگەر سوارچاکان و لێزانانی ئەو بوارە، ئەوانەی بە کردەیی لەو بوارەدا کاریان کردوەو، جیایان کردۆتەوە، بەلام ئەو کەسەی نەزانێت هەموویانی بەلاوە وەك یەکە.

(٢)_ هەروەها هەموو کەسێك سواری ئەسپ و ماین دەبێت، بەلام کەسانێکیان تێدایە ترسنۆك و لەرزۆکن و لە کاتی ترس و سلمینەوەدا ئەندامەکانی هەلیناگرن، ئەگەر سواری ئەسپ و ماین بێت دەکەوێتە خوارەوە، بەلام کەسانێکی سوارچاکی لێزانیش لە نێو خەلکیدا هەن کە گوێ بەڕوو بەڕوو بوونەوەی دوژمن نادەن، کەوا بوو مەرج نییە هەر کەسێك سواری ئەسپ و ماین بێت سوار چاك بێت، تەنها سوار چاکانیش ئازاکان و ترسنۆکەکان لە یەك جیادەکەنەوە، هەموو هونەرێکیش کەسانی لێزان و شارەزای هەیە دەیزانن و ئەمە لە ئەوە جیادەکەنەوە.

(٣)_ هەروەها پێغەمبەرایەتیش، کەسانێکی زۆر بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکەن، ڕەنگە کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەریش ئەنجام بدەن، دەلێن: ئەمە موعجیزەیە بەلام وەکو پێشتریش ئاماژەمان پێدا کردەوەی نائاسایی لە سروشت بەدەری شەیتانین، موعجیزە نین، هیچ کەسێکیش توانای جیاکردنەوەی پێغەمبەری ڕاستگۆ و کەسی خۆ بە پێغەمبەرکەری درۆزنی نییە مەگەر ئەهلی ئیمان و ئەهلی زانست و کەسانی زرنگ و کارامە نەبێت، ئەوانەی نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی و بەلگەکانی پێغەمبەرایەتی لە هیتر جیادەکەنەوە، کەوابوو پێغەمبەر نیشانەی هەیە و موعجیزەی هەیە، بەوانە لە کەسی خۆ بە پێغەمبەرکەری درۆزن جیا دەبێتەوە.

ئیتر لەنێوان موحەممەدی ڕاستگۆی دەستپاکی پێغەمبەری پەروەردگاری جیهانیان و موسا و مەسیح و غەیری ئەوان و، لە نێوان موسەیلەمەی درۆزن و، ئەسوەدی ئەعەنسی و تولەیحەی ئەلئەسەدی و ئەلحاریس ئەلدیمەشقی و باباهی ئەلرومی و درۆزنانی غەیری ئەوانیش جیاوازی دەکرێت[1]،

---

(١)_ بەو نیشانە پێغەمبەرایەتیانەی کە ئاماژە بۆ ڕاستگۆیان دەکات، جیاوازی لە نێوان پێغەمبەران و کەسانی خۆ بە پێغەمبەرزانی درۆزندا دەکرێت، کە لە نێوان خەڵکیدا بازاڕی خۆیان گەرم دەکەن و برەو بەکارەکەیان دەدەن، ئەمانە فێڵ لە خەڵکی دەکەن، بەڵام هەر زوو بەزوو درۆزنیی ڕەفتارو کرداریان ئاشکرا دەبێت، تەنها پێغەمبەرانی کە ئاسەوارو نیشانەو موعجیزاتەکانیان بەدرێژایەی زەمەن دەمێنێتەوە، دۆستی ڕاستەقینەی خوای گەورە کە دڵی بە زانست و ئیمان ڕووناك بۆتەوە دەتوانێت لەنێوان موحەممەدی ڕاستگۆو، موسەیلەمەی درۆزن و، ئەلئەسوەدی عەنسی و، تولەیحەی ئەلئەسەدیدا جیاوازی بکات، ئەمانە پاش پێغەمبەری خوا ﷺ بانگەشەی پێغەمبەرایەتیان کرد، موسەیلەمەی درۆزن و ئەلئەسوەد ئەلعەنسی لە کۆتایی ژیانی پێغەمبەری خوادا ﷺ بانگەشەی پێغەمبەرایەتیان کرد، بەڵام درۆزنانی خۆ بە پێغەمبەرزان پاش کەمێك شەڕەکەیان دەوەستێت و نامێنێت، درۆکەیان ئاشکرا دەبێت و، خوای گەورە کۆتایان پێدێنێت، بەڵام پێغەمبەرانی ڕاستگۆی دەستپاك ئاسەوارە ڕاستەکانیان و، ئیمانەکەیان و، ئاینەکەیان هەردەمێنێت، کەوا بوو لە نێوان ئیبراهیم و موسا و موحەممەدی ڕاستگۆ و پێغەمبەرانی دیکەی خوای گەورەو، لە نێوان درۆزنانـدا جیاوازییەکی گەورە هەیە. موسەیلەمەی درۆزن لە یەمامە دەرکەوت، پێشەوا ئەبوبەکری صیددیق سوپای موسڵمانانی بە سەرکردایەتی خالیدی کوڕی وەلیدی بۆ نارد، شەڕێکی سەخت لە نێوان هەر دوو لا دا ڕوویداو، بە کوشتنی موسەیلەمە کۆتایی هات، ئیتر شەڕو هەواڵی و ناوبانگی بڕایەوەو نەما _ سوپاس بۆ خوا _، بەڵام ئەسوەدی عەنسی لە یەمەن دەرکەوت، پێشتر موسڵمان بوبو، بەڵام لە

ئیسلام هەڵگەڕایەوەو، بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کرد، خەڵکێکی بێشومار لە دەوری کۆبونەوە، شانوشەوکەتێکی بۆ خۆی پەیداکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە موسڵمانانی دەوروبەری کرد بیکوژن ئەوە بوو کوشتیان و، ئەمیش شەڕو هەواڵی و ناوبانگی بڕایەوەو نەماو، موسڵمانان حەوانەوە _ سوپاس بۆ خوا _، تولەیحەی ئەلئەسەدی ئەمە موسڵمان بوو، پاش مردنی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ کۆمەڵی هەڵگەڕاوەکاندا لە ئیسلام هەڵگەڕایەوە، هاوەڵان لەگەڵیدا جەنگان تا شکستی هێنا، پاشان خوای گەورە جارێکی تر نیعمەتی ئیسلامی پێبەخشی و تەوبەی کردو گوتراوە بە شەهیدی لە جەنگەکانی دژ بە فارسەکاندا کوژراوە، ئەلحاریسی لدیمەشقی لەزەمەنی عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕواندا دەرکەوت، نازناوی (حارث الأعور)، خەڵکی دیمەشقە، بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کرد، بۆیە عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان دەستگیریکردو کوشتی، باباهی ئەلڕومی نایناسین، نازانم.

بەهەمان شێوە ئەو کەسە دەتوانێت لە نێوان دۆستانی خوای پارێزگار و دۆستانی شەیتانی گومڕادا جیاوازی بکات[1].

---

(١)_ ئیماندار دەتوانێت جیاوازی لە نێوان پێغەمبەرانی ڕاستگۆو کەسانی خۆ بە پێغەمبەرکەری درۆزندا بکات، چونکە پێغەمبەران نیشانەو بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتیان هەڵگرتووە، بەپێچەوانەی درۆزنانەوە کە هیچ نیشانەیەکیان بە دەستەوە نییە، بەڵکو تەنها سەر ل خەڵك دەشێوێنن، بەو جۆرە مرۆڤی موسڵمان دەتوانێت لەنێوان دۆستانی خواو دۆستانی شەیتاندا جیاوازی بکات، چونکە دۆستانی خوای گەورەش نیشانەی دیارو ئاشکرایان هەیە، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ آمَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ(٦٣)﴾[يونس: ٦٣]. واتە: ئەوانەی باوەڕیان هێناوە وە هەمیشە خۆیان دەپارێزن و لە خوا دەترسن. ئەوەیە نیشانەکانیان، بەڵام دۆستانی شەیتان خراپەکارن، درۆزنن، یاخی بوون کە تەنها شوێنی ئارەزووەکانیان دەکەون، فەرزەکانیان پشتگوێ دەخەن، حەرامکراوەکان ئەنجام دەدەن، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا وا ڕادەگەیەنن کە دۆستانی خوان، لە کاتێکدا دوژمنانی خوان، وە ئەو کەسانەی کە نورو ڕووناکی ئیمانیان لە دڵدا نییە باوەڕیان پێ دەکەن دەڵێن: ئەمانە دۆستی خوای گەورەن، ئەم جۆرە کەسانە زۆرن، ئەوانەی باوەڕیان پێدەکەن خەڵکێکی زۆرن کە لەو باوەڕەدان دۆستایەتیان هەبێت و لە جیاتی خوای گەورە دەیانپەرستن، سەربڕینیان بۆ دەکەن، نەزریان بۆ دەکەن _ پەنا بە خوا _. تەنانەت ئەگەر دۆستانی ڕاستی خوای گەورەش بن دروست نییە بپەرسترێن، بەڵام ئەگەر بانگی خەڵکی دەکرد بۆ پەرستنی خۆی ئەوە بێگومان دۆستی خوا نییە بەڵکو دۆستی شەیتانە، دۆستانی ڕاستەقینەی خوای گەورە قایل نابن بپەرسترێن بەڵکو نکۆڵی لەو کردەوە قێزەونە دەکەن، بەڵام پاش مردنیان خەڵك دەیانپەرستن و دەچنە سەر گۆڕەکانیان، ئەوانە دۆستانی خوای گەورەن بەڵام پەرستنیان جایز نییە، چونکە پەرستن بە تەنها ماف و هەقی خوای گەورەیە.

## بەشێك سەبارەت بەوەی کە حەقیقەت بریتیە لەوەی کە پێغەمبەران لەسەری ڕێککەوتوون[(١)]

---

(١)_ حەقیقەت بریتیە لە حەقیقەتی ئایین کە تێکڕای پێغەمبەران لە یەکەمیانەوە تاوەکو کۆتایان لە سەری بوون، کە بریتیە لە حەقیقەتی ئیسلام، چونکە پێغەمبەران و شوێنکەوتوانیان هەر هەموویان موسڵمانن، چونکە ئیسلام لەزمانی عەرەبیدا واتای تەسلیم بوون بەخوا بە یەك خوا پەرستی، ملکەچی بۆ خوا بە گوێڕایەڵ کردن، وە بەریبوون لە شیرك و شوێنکەوتووانی دەگەیەنێت، ئەمەش ئایینی تێکڕای پێغەمبەران بووە، هەر هەموویان موسڵمانن، شوێن کەوتوانیشیان موسڵمانن، هەر کەسێك شوێنی پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران کەوتبێت ئەوە موسڵمانە تا بە موحەممەد ﷺ کۆتایی هات، بۆیە ئیتر موسڵمان ئەو کەسەیە کە شوێنی موحەممەد ﷺ دەکەوێت، چونکە پەیامەکەی گشتییەو ئایینەکەشی هەر دەمێنێت و تاوەکو ڕۆژی قیامەت لە ناو ناچێت، بۆیە پاش ناردنی موحەممەد ﷺ پێویستە هەر هەموو خەڵکی شوێنی بکەون و، ئیمانی پێبێنن، تەنانەت جولەکەو گاوران و سەراپای ڕێبازو میللەتانی تروو هەر هەموو خەڵکی پێویستە ئیمان بە موحەممەد ﷺ بینن، پاش نادرنی پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ کەسێك ناتوانێت خۆی بە دۆستێك لە دۆستەکانی خوای گەورەوە پابەند بکات و، لە جیاتی خوای گەورە بیپەرستێت، یان شوێنی بکەوێت، جایز نییە شوێنی بکەوێت ئەگەر موخالەفەی پێغەمبەری خوا ﷺ بکات، با وەلیەك یان زانایەك یان ...هتد بێت، گوێڕایەڵی تەنها بۆ خواو پێغەمبەری خوایە ﷺ، ئا ئەمە حەقیقەتەکەیە، کەوا بوو پێغەمبەران و شوێنکەوتوانیان هەرهەموویان موسڵمانن، چونکە خوایان پەرستووە بەپێی ئەو شەرعەی بۆ پێغەمبەرەکان دابەزیووە، لە هەر سەردەمێك لەسەردەمەکان بە گوێرەی خۆی، شەریعەتێك لا دەبراو، شەریعەتێکی تر دەهات، پاشان لا دەبراو، شەریعەتێکی تر دەهات، تا بەموحەممەد ﷺ کۆتایی هات،

------------------------------------------------------------------------

------------------------------------------------------------------------

------------------------------------------------------------------------

ئیتر شەریعەت بوو بەشەریعەتەکەی ئەو کە دەمێنێت و، هەرگیز لا نابرێت و، ناگۆڕدرێتەوەو، گۆڕانکاریشی بەسەردانایەت. بە واتایەکی تر هەر هەموو پێغەمبەران لەسەر یەکخواپەرستی و، ڕێگریی کردن لە شیرك و هاوەڵپەرستی ڕێککەوتوون، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ﴾[النحل: ٣٦] واتە: سوێند بەخوا لەناو هەموو گەل و ئوممەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بەوەی تەنها خوا بپەرستن و دووركەونەوە لە (پەرستنی) هەر پەرستراوێکی تر. هەر هەموو پێغەمبەران بەپەرستنی خوای گەورە فەرمان دەکەن و، لە شیرك و هاو بەشدانان ڕێگریی دەکەن، لە سەر ئەمە بوون هەر هەموو پێغەمبەران ـ علیهم الصلاة والسلام ـ و خوای گەورە دەپەرستن بە گوێرەی ئەو شەریعەتەی لە کاتی خۆیاندا بۆیان دابەزیبوو.

حەقیقەت: حەقیقەتی ئایینە، ئایینی پەروەردگاری جیهانیان، بریتیە لەوەی کە هەر هەموو پێغەمبەران لەسەری ڕێکەوتوون، ئەگەرچی هەر یەکێکیان (شِرْعَةً) و (مِنهاج)ێکیشیان هەبێت[1].

وشەی (شِرْعَةً): بریتیە لە شەریعەت، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجاً﴾[2] [المائدة: ٤٨] واتە: دامان ناوە بۆ هەر ئوممەتێك لە ئێوە شەریعەت و ڕێگەیەکی ڕوون.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاء الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ(١٨)﴾[3]

---

(١)_ لەبەر ئەوەی شەرعی خوای گەورەبوو، بەدڵنیایی دەستگرتن پێوەی عیبادەت و پەرستن بوو، تاوەکو نەسخ دەبرویەوە و لا دەبرا، ئینجا کە نەسخ کراو لابرا وازی لێدەهێنراو، کار بە شەریعەتی نوێ دەکرا، بۆیە پەرستنی خوای گەورە بریتیە لە پەرستنیی بە گوێرەی هەر شەریعەتێك لە کاتی خۆیدا تاوەکو نەسخ دەکراو لا دەبرا، ئینجا دەچوونە سەر ئەو ئایینە نوێیە و واز لە ئایینی نەسخ کراو و لا براو دەهێنرا، چونکە ئەوەی ئەو فەرمانەی دەدا هەر خوای گەورە بوو.

(٢)_ وشەی (شِرْعَةً): واتای شەریعەت دەگەیەنێت، پێغەمبەران شەریعەتیان پێدراوەو، هەر یەکێك لەوانیتر جیاوازە، بەڵام لەبەر ئەوەی شەریعەت نەسخ نەکراوەو لانە براوە پێویستە کاری پێ بکرێت، کار پێ کردنیشی دەبێتە عیبادەت و پەرستن بۆ خوای گەورە.

(٣)_ خوای گەورە پێی ڕاگەیاندوین کە بۆ پێغەمبەرانی تر شەریعەتێکی داناوە، بۆ موحەممەدیش ﷺ شەریعەتێکی داناوە، فەرمانی پێکردوون شوێنیبکەون خۆی ئەوانەی کە ئیمانیان پێهێناوە. کەوا بوو هەر کەسێك شوێنی شەریعەتی موحەممەد ﷺ نەکەوێت، بێگومان شوێنی هەواو ئارەزووی خۆی کەوتووە، جایز نییە شوێنی

شەریعەتەکانی موسا و عیسا بکەویت، چونکە شەریعەتەکانی موسا و عیسا تەواو بوو و نەسخ کراو لا برا، بەڵکو تەنها شوێنی هەواو ئارەزوواتی خۆی کەوتووە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِنْ لَمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءَهُمْ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِنَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾[القصص: ٥٠] واتە: ئینجا ئەگەر بە گوێیان نەکردی (و وەڵامیان نەدایەوە) ئەوە بزانە کە تەنها شوێن هەواو ئارەزووی خۆیان دەکەون وە کێ لەو کەسە گومڕا ترە کە شوێن ئارەزووی خۆی بکەوێت بێ ڕێنموونیی لە لایەن خواوە ﴿إِنَّ اللَّهَ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ بێگومان خوا ڕێنموونیی گەلی ستەم کار ناکات. بۆیە هەر کەسێك شوێنی پێغەمبەر موحەممەد ﷺ نەکەوێت، بێگومان شوێنی ئارەزووەکانی خۆی کەوتووە، ئەگەر چی بڵێت: گوایە شوێنکەوتووی موسا یان عیسایە _ عليهما السلام _، لە ڕاستیدا ئەو کەسە تەنها درۆزنێکەو هیچی تر، چونکە موسا و عیسا _ عليهما السلام _ هانی خەڵکیانداوە بۆ شوێنکەوتنی موحەممەد ﷺ هەر کات لە لایەن خواوە نێردرا، تەنانەت خوای گەورە پەیمانی لە خودی پێغەمبەرانیش وەرگرتووە کە هەر کات موحەممەد ﷺ نێردراو، یەکێکیان زیندوو بوو پێویستە شوێنی بکەون، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ لَمَا آتَيْتُكُم مِّن كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنصُرُنَّهُ﴾[آل عمران: ٨١] واتە: (بهێنەرەوە یادیان) کاتێك کە خوا پەیمانی وەرگرت لە پێغەمبەران کە هەرچیم دانێ لە نامەو حیکمەت (شەریعەت) لە پاشان پێغەمبەرێکتان بۆ هات بەبڕوا هێنەر بەو نامەی کە لە لاتانە ﴿دەبێ بڕوای پێ بهێنن. تەماشاکەن خوای گەورە پەیمانی لەپێغەمبەران وەرگرتووە شوێنی موحەممەد ﷺ بکەون، ئەی بۆ کەسانی غەیری ئەوان دەبێت چۆن بێت؟.

إِنَّهُمْ لَن يُغْنُوا عَنكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَإِنَّ الظَّالِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُتَّقِينَ(١٩)﴾[1] [الجاثية: ١٨_١٩] واته: له پاشان تۆمان خستەسەر شەریعەتێك له بارەی ئاینەوە تۆش شوێنی بکەوە وە شوێن هەواو ئارەزووی ئەوانە مەکەوە کە نازانن بێگومان ئەوانە لە لایەن خواوە هیچ سوودێکت پێناگەیەنن وە بەڕاستی ستەمکاران هەندێکیان دۆست و پشتیوانی هەندێکیانن وە خوا دۆست و پشتیوانی پارێزکارانە .

---

(١)_ ستەمکاران هەندێکیان دۆست و پشتگیری هەندێکی دیکەیانن، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَكَذَلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ الظَّالِمِينَ بَعْضًا بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾[الأنعام: ١٢٩] واته: بەو شێوەیە هەندێ لە ستەمکاران دەکەین بە دۆست و پشتیوانی هێندێکی تریان بەهۆی ئەو کردەوانەی ئەنجامیان دەدا. خوای گەورە هێندێ لە ستەمکاران بەسەر هێندێکیترياندا زاڵ دەکات، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُم مِّنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾[البقرة: ٢٥٧] واته: وە ئەوانەی کەبێ بڕوان شەیتان دۆستیانە دەریان دەهێنێ لە ڕووناکی (وبیروباوەڕ)ەوە بۆ تاریکستان ئەوانە هاوڕێی دۆزەخن تیایا ئەمێننەوە هەتا هەتایە. بەڵام ئیمانداران خوای گەورە دۆست و پشتگیریانە، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا﴾[البقرة: ٢٥٧] واته: خوا دۆست و کار سازی ئەوانەیە کە بڕوادارن.

وشەی (المنهاج)یش: بریتیە لە ڕێگا[1]، لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَأَلَّوِ اسْتَقَامُوا عَلَى الطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَاهُم مَّاءً غَدَقًا (١٦) لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ وَمَن يُعْرِضْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِ يَسْلُكْهُ عَذَابًا صَعَدًا (١٧)﴾[2] [الجن: ١٦_١٧]

کەوا بوو (شِرْعَةً): لەزمانی عەرەبیدا وەکو سەرچاوەیە بۆ ڕووبار[3]، وشەی (المنهاج)یش: بریتیە لەو ڕێگەیەی کە ڕووبارەکەی پێدا دەڕوات.

---

(١)_ (المِنهاج) بریتیە لەو ڕێگەیەی کە مرۆڤ لەئایینەکەیدا لە سەری دەچێت.

(٢)_ ئەگەر لەسەر ڕێگاکە بەردەوام بوونایە واتە: لەسەر ڕێگەی ڕاست کە بەخوای گەورە دەگات، ئەوا خوای گەورە ئاوی بارانی پێدەنوشێن و، لە کاتی خۆیدا بۆی دەباراندن، بەڵام کەم بونەوەی باران لە ڕاستیدا بۆ تاوانەکانی نەوەی ئادەم دەگەڕێتەوە، خوای گەورە بەهۆی تاوانی نەوەی ئادەمەوە باران دەگرێتەوە، شوێنی مەبەستمان لە ڕستە قورئانەکە ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَلَّوِ اسْتَقَامُوا عَلَى الطَّرِيقَةِ﴾ واتە لەسەر ڕێگەی ڕاستی خوایی.

(٣)_ لە زمانی عەرەبیدا بەسەر چاوەی ئاو دەگوترێت: شەریعەت، (شريعة الماء) واتە سەرچاوەی ئاو.

مەبەستی خوازراویش: بریتیە لە حەقیقەتی ئایین، کە بریتیە لە پەرستنی خوای گەورە بە تەنها کە هیچ هاوبەشێکی نییە، ئەمەش بریتیە لە حەقیقەتی ئایینی ئیسلام[1] کە بریتیە لەوەی بەندە خۆی بە پەروەردگاری جیهانیان تەسلیم بکات و، خۆی بەغەیری ئەو زاتە تەسلیم نەکات[2] کەوا بوو هەر کەسێك بە خوا و غەیری ئەویش تەسلیم بوو موشریك و هاوەڵپەرستە، خوای گەورەش لەوانە خۆش نابێت کە هاوبەشی بۆ دادەنێن، وە هەر کەسێکیش بەخوای گەورە تەسلیم نەبوو، وە خۆی بە گەورە بزانێت و ئەو زاتە نەپەرستێت ئەوە یەکێکە لەو کەسانەی کە خوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾[غافر: ٦٠] واتە: بە ڕاستی ئەوانەی خۆ بە گەورە دەزانن کە بمپەرستن بێگومان بەسەر شۆڕی دەچنە دۆزەخەوە .

---

(١)_ پەرستنی خوای گەورە بە تەنها کە هیچ هاوبەشێکی نییە، ئەمەش بریتیە لە حەقیقەتی ئایینی ئیسلام، کە ئایینی تێکڕای پێغەمبەرانە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((نَحْنُ مَعَاشِر الْأَنْبِيَاء إخوة لِعَلاَّت دِينُنَا وَاحِد، وشرائعنا مختلفة )) واتە: ((ئێمەی کۆمەڵی پێغەمبەران برای باوکین و دایکمان جیاوازە، ئایینمان یەکێکەو، شەریعەتەکانمان جیاوازە)) کەوا بوو ئایینی پێغەمبەران یەکە کە ئایینی ئیسلامە ئەگەرچی شەریعەتەکانیان جیاوازە کە خوای گەورە بۆی داناون، چونکە خوای گەورە بۆ هەر ئومەتێك شەرعێکیان بۆ دادەنێت کە لەو کاتەدا گونجاویان بێت، پاشان خوای گەورە ئەوە نەسخ دەکات و لادەبات، شەرعێکی تر دادەنێت کە گونجاوی ئایندە بێت، ئیتر بەو جۆرە بوو تاوەکو موحەممەدیش ﷺ نێردرا، ئیتر خوای گەورە ئایینی ئیسلامی دابەزاند، کە گونجاوی هەموو زەمەن و شوێنێکە تاوەکو ڕۆژی قیامەت.

(٢)_ ئیسلام بریتیە لە خۆ بە دەستەوەدان و تەسلیم بوون بەخوای گەورە بە یەك خواپەرستی، و ملکەچکردن بۆ خوای گەورە بەگوێڕایەڵی کردن (الإسلام هو

---------------------------------------------------------------------------------
---------------------------------------------------------------------------------
-----------------------------------------------------------------------

(الإستسلام لله بالتوحيد، والإنقياد له بالطاعة)، وە تەسلیم نەبوون بە غەیری ئەو زاتە، بۆیە هەر کەس بە تەنها تەسلیمی خوای گەورە بوو ئەوە مرۆڤێکی موسڵمانی ڕاستەقینەیە، وە هەر کەس تەسلیم بە خوا و غەیری خواش بوو ئەوە هاوەڵپەرستە، وە هەرکەسیش تەسلیم بە خوای گەورە نەبوو ئەوە مولحیدێکی کافرە.

وە ئـاییـنی ئیسـلام: بریتیـە لـە ئـاییـنی پێشـین و پاشـینانی هـەر هـەموو پێغەمبەران[1]، وە ئایەتەکەی خوای گەورە کە دەفەرموێت:﴿وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسلام دِيناً فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ﴾[2] [آل عمران:٨٥] واتە: هەر کەسێك دوای دینێك بکەوێت جگە لە دینی ئیسلام ئەوە لێی وەرناگیرێ. گشتییە بۆ هەموو سەردەم و شوێنێك، بۆیە نوح و ئیبراهیم و یەعقوب و نەوەکانی یەعقوب أسباط و موساو عیساو حەوارییەکان ئایینی هەر هەموویان ئیسلامە کە بریتیە لەپەرستنی خوای گەورە بە تەنها کە هیچ هاوبەشێکی نییە .

---

(١)_ کە ماناکەی بریتیە لە یەکخواپەرستی و ئەنجامدانی عیبادەت و پەرستن بۆ خوای گەورە بە ئیخلاص، تەواو ئەمە بووە ئایینی هەر هەموو پێغەمبەران، تێکرای پێغەمبەران عیبادەت و پەرستنیان تەنها بۆ خوای گەورە بووە، لەشیرك و هاوەڵپەرستی خۆیان بەدوردەگرت، پاشان شەیخوئیسلام _ ڕەحمەتی خوا لێبێت _ چەند ئایەتێکیش لە قورئان دەهێنێتەوە کە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات.

(٢)_ ئیسلام بریتیە لە یەکخواپەرستی و خۆ دورخستنەوە لەشیرك و هاوبەش بڕیاردان، ئا ئەمەیە ئیسلام.

خوای گەورە لە بارەی نوحەوە دەفەرموێ: ﴿يَا قَوْمِ إِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكُم مَّقَامِي وَتَذْكِيرِي بِآيَاتِ اللَّهِ فَعَلَى اللَّهِ تَوَكَّلْتُ فَأَجْمِعُواْ أَمْرَكُمْ وَشُرَكَاءَكُمْ ثُمَّ لاَ يَكُنْ أَمْرُكُمْ عَلَيْكُمْ غُمَّةً ثُمَّ اقْضُواْ إِلَيَّ وَلاَ تُنظِرُونِ(٧١) فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَمَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى اللَّهِ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ(٧٢)﴾ [١] [يونس: ٧١_٧٢] واتە: ئەی گەلەکەم ئەگەر بەلاتانەوە قورس و گرانە مانەوەم لە ناوتاندا و ئامۆژگاری کردنم (بۆتان) بەئایەتەکانی خوا ئەوامن پشتم بەخوا بەستووە ئێوەش کارو بڕیاری خۆتان کۆکەنەوە لەگەڵ هاوبەشەکانتاندا ئینجا باکارو بڕیارەکانتان شاراوە نەبێ بە لاتانەوە (بەڵکو ئاشکرا بێت) پاشان پەلامارم بدەن و ماوەم مەدەن جا ئەگەر سەرپێچیتان کردم (پشتم تێ دەکەن) ئەوە من هیچ پاداشتێك داوام نەکردووە لێتان پاداشتی من هەر لە سەر خوایە وە فەرمانم پێ دراوە کە لە فەرمانبەر و موسڵمانان بم.

---

(١)_ نوح _ عليه السلام _ کە یەکەم پێغەمبەر بووە فەرموویەتی: ﴿وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ وە فەرمانم پێکراوە کە لە موسڵمانان بم، کەوا بوو ئەو موسڵمانە.

**هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ:** ﴿وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَاهِيمَ إِلاَّ مَن سَفِهَ نَفْسَهُ وَلَقَدِ اصْطَفَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا وَإِنَّهُ فِي الآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ(١٣٠) إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ(١٣١) وَوَصَّى بِهَا إِبْرَاهِيمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَا بَنِيَّ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى لَكُمُ الدِّينَ فَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ(١٣٢)﴾[1] **واتە: کێ ڕوو وەرئەگێڕێ لە ئاینی ئیبراهیم؟ مەگەر کەسێك کە خۆی هەرزە کرد بێت؟ سوێند بێ بێگومان ئیبراهیممان هەڵبژارد لە دونیادا وە بێ گومان ئەو لە ڕۆژی دوایی دا لە چاکانە** ﴿إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ﴾ **(هەڵی بژارد) لە کاتێکدا خوا پێی گووت: فەرمانبەردار بە (ئیبراهیمیش) ووتی: وا خۆم سپارد بە پەروەردگاری جیهانیان(١٣١)** ﴿وَوَصَّى بِهَا إِبْرَاهِيمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ﴾ **ئیبراهیم و یەعقوب ئامۆژگاری کوڕەکانی خۆیانیان کرد (وە هەر یەکەیان پێیان گووتن) ڕۆڵەکانم: خوا ئاینی ئیسلامی بۆ هەڵبژاردوون** ﴿فَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ **کەواتە مەمرن بەموسڵمانێتی نەبێت.**

**هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ:** ﴿وَقَالَ مُوسَى يَا قَوْمِ إِن كُنتُمْ آمَنتُم بِاللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُواْ إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ﴾[2] [يونس: ٨٤] **واتە: وە مووسا ووتی ئەی گەلەکەم گەر ئێوە بڕواتان بەخوا هێناوە ئەوە تەنها پشت بەخوا ببەستن ئەگەر ئێوە فەرمانبەرو ملکەچن.**

---

**(١)_ ئەوە ئیبراهیم پێغەمبەرە _ عليه السلام _ فەرموویەتی:** ﴿أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ **ئیبراهیم فەرمووی: وا خۆم بە پەروەردگاری جیهانیان سپارد، پاشانیش ئامۆژگاری ڕۆڵەکانی خۆیان دەکەن و، پێیان دەفەرموێ: ئیبراهیم و یەعقوب ئامۆژگاری کوڕەکانی خۆیانیان کردو، هەر یەکەیان پێیان ووتن ڕۆڵەکانم: خوا ئاینی ئیسلامی بۆ هەڵبژاردوون کەواتە مەمرن بەموسڵمانێتی نەبێت، کەوا بوو نەوەی ئیبراهیم هەر هەموویان موسڵمانن.**

**(٢)_ ئەمانەش قەومەکەی موسا پێغەمبەرن _ عليه السلام _ ئەوانەی ئیمانیان پێهێنا، ملکەچن واتە ملکەچی خوای گەورە بوون و، موسڵمان بوون.**

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَتَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ﴾[1] [الأعراف: ١٢٦] واتە: ئەی پەروەردگارمان ئارامیمان بەسەردا بڕێژە و بەموسڵمانێتی بمان مرێنە.

---

(١)_ ئەو جادووگەرانەی کە فیرعەون هێنابوونی بۆ ئەوەی بەرەنگاری موعجیزەکانی موسا _ علیه السلام _ ببنەوە، بۆیان دەرکەوت ئەوە کردە نائاساییە لە سروشت بەدەرانەی موساو هارونی برای سیحرو جادوو نین، لە ڕاستیدا تەنها موعجیزە بوون، چونکە هیچ دەستکاریەکی مرۆڤی تێدا نییە، سیحرو جادوو نەبوون، بۆیە کاتێ ئەو شتەیان بۆ ڕوون بویەوە گوتیان: ﴿رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَتَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ﴾ ئەی پەروەردگارمان ئارامیمان بەسەردا بڕێژەو بە موسڵمانێتی بمان مرێنە، کاتێکیش فیرعەون هەڕەشەی کوشتن و لە خاچدانی لێکردن، گوێیان بەوە نەداو، گوتیان: ﴿قَالُوا لَن نُّؤْثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَاءَنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالَّذِي فَطَرَنَا فَاقْضِ مَا أَنتَ قَاضٍ إِنَّمَا تَقْضِي هَٰذِهِ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا(٧٢) إِنَّا آمَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَايَانَا وَمَا أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنَ السِّحْرِ وَاللَّهُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ(٧٣)﴾[طه: ٧٢_٧٣] واتە: (ساحیرەکان) ووتیان ئێمە هەرگیز تۆ هەڵنابژێرین بەسەر ئەو نیشانەو موعجیزانەدا کە بۆمان هاتووە (وە تۆ هەڵنابژێرین بەسەر) ئەو خوایەی کە لە نەبوون ئێمەی دروست کردووە جا هەر چیت لە دەست دێت بیکە بێگومان تۆ تەنها لەم ژیانی دنیا دەستت دەڕواو بڕیار دەدەیت بەڕاستی ئێمە باوەڕمان هێنا بەپەروەردگارمان بۆ ئەوەی لە تاوانەکانمان خۆش ببێت هەروەها لەو جادووەش کە بە زۆر پێت کردین وە خوای گەورە (پاداشتی) چاکترەو بەردەوامترە. ئەوەبوو فیرعەون کوشتنی و سووکایەتی پێکردن، بەڵام بە موسڵمانێتی مردن.

وە یوسف پێغەمبەر _ علیه السلام _ دەیفەرمووێ: ﴿تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ﴾[1] [یوسف: ١٠١] واتە: بە موسڵمانێتی بم مرێنە و بمخەرە ڕیزی پیاو چاکانەوە (لە دوا ڕۆژدا).

بەلقیسیش گووتی: ﴿وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَانَ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾[2] [النمل: ٤٤] واتە لەگەڵ سولەیماندا منیش ملکەچ بووم بۆ پەروەردگاری جیهانیان.

---

(١)_ پاش ئەو هەموو مەینەتیەی بەسەر یوسف پێغەمبەردا هات _ علیه السلام _ ، وەپاش ئەوەی خوای گەورە بەو جۆرە ڕیزی پێبەخشی و پاش کوبونەوەی ئەندامانی خێزانەکەی، سوپاسی پەروەردگاری خۆی کردو، فەرمووێ: ﴿رَبِّ قَدْ آتَيْتَنِي مِنَ الْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِي مِن تَأْوِيلِ الأَحَادِيثِ فَاطِرَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ أَنتَ وَلِيِّي فِي الدُّنُيَا وَالآخِرَةِ تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ﴾[یوسف: ١٠١] واتە: ئەی پەروەردگارم بە ڕاستی پێت بەخشیووم هەندێك لە دەسەڵات و پاشایەتی وە هەندێکیش لە لێکدانەوەی خەوت فێرکردوم ئەی دروست کاری ئاسمانەکان و زەوی تۆ پشتیوان و یارمەتی دەری منی لە دنیا و لە ڕۆژی دوایی دا بەموسڵمانێتی بم مرێنە و بمخەرە ریزی پیاو چاکانەوە (لە دوا ڕۆژدا). یوسف پێغەمبەر _ علیه السلام _ داوای لە پەروەردگاری کرد دەرەنجامی چاکی پێببەخشێت و بە موسڵمانێتی بیمرێنیت، ئەمە بەڵگەیەکی ئاشکرایە کە یوسف _ علیه السلام _ موسڵمان بووە.

(٢)_ بەڵقیس شاژنی یەمەن بوو لە نێو هۆزی سەبەئدا، لەگەڵ سولەیمان پێغەمبەردا چیرۆکێکیان هەیە کە قورئان لە سورەتی (النمل)دا باسی دەکات، بەوە تەواو دەبێت کە کاتێ ئەو پەیام و پێغەمبەرایەتیە دەبینێ کە خوای گەورە بەسولەیمانی بەخشیوە، موسوڵمان بوونی خۆی ئاشکرادەکات و دەڵێت: ﴿قَالَتْ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَانَ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ [النمل: ٤٤] واتە: (بەلقیس) گوتی ئەی پەروەردگارم بە ڕاستی من ستەمم لە خۆم کردووە لەگەڵ سولەیماندا منیش ملکەچ بووم بۆ پەروەردگاری جیهانیان.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَحْكُمُ بِهَا النَّبِيُّونَ الَّذِينَ أَسْلَمُوا لِلَّذِينَ هَادُوا وَالرَّبَّانِيُّونَ وَالأَحْبَارُ﴾[1] [المائدة: ٤٤] واتە: ئەو پێغەمبەرانە حوكمیان پێ دەكرد موسڵمان و ملكەچ بوون بۆ ئەوانەی كە جوولەكە بوو هەروەها زانا و خوا ناسەكان و زانا شەرع زانەكان (حوكمیان پێ دەكرد).

حەواریەكانیش دەیانگووت: ﴿آمَنَّا بِاللَّهِ وَاشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾[2] [آل عمران: ٥٢].

---

(١)_ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَا التَّوْرَاةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ﴾ بێگومان ئێمە تەوراتمان نارده خوارەوە كە ڕێنمونیی و ڕووناكی تێدا بوو، تەورات ئەو كتێبەبوو كە خوای گەورە بۆ موسا پێغەمبەری _ عليه السلام _ دابەزاند، كە كتێبێكی زۆر گەورەیە، ئەو پێغەمبەرانەی كە لەپاش موسا پێغەمبەر _ عليه السلام _ نێردران حوكمیان بە تەورات دەكرد، ﴿الَّذِينَ أَسْلَمُوا﴾ گوتراوە پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل بە موسڵمان ناودەبرێن ﴿لِلَّذِينَ هَادُوا﴾ پێغەمبەران بە تەورات حوكمیان لە نێوان جوولەكەدا دەكرد.

(٢)_ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا أَحَسَّ عِيسَى مِنْهُمُ الْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِي إِلَى اللَّهِ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ اللَّهِ آمَنَّا بِاللَّهِ وَاشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ واتە: كاتێك كە عیسا هەستی كرد بەبێ بڕوایی گەلەكەی ووتی: كێ لە گەڵ مندا یارمەتی دەری دینی خوایە شاگردەكانی (حەواریەكانی) گوتیان ئێمە یارمەتی دەری دینی خواین، بڕوامان بە خوا هێناوە و تۆ ئەی عیسا شاهێد بە كە ئێمە فەرمانبەری ئەوین.

كەوا بوو ئایینی هەر هەموو پێغەمبەران: یەكە، ئەگەرچی شەریعەتەكانیشیان جۆراوجۆر ووبێت، كما جاء في الصحيحين عن النبي ﷺ أنه قال: ((إنّا معشر الأنبياء ديننا واحدٌ))[1] صحيح: أخرجه البخاري (٣٤٤٣)، ومسلم (٢٣٦٥). واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئێمەی كۆمەڵی پێغەمبەران ئایینەكەمان یەكە)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰ[2] أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ[3]

---

(١)_ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((نَحْنُ مَعَاشِرَ الْأَنْبِيَاءِ إِخوة لِعَلاّت دِينَنا واحد، وشرائعنا مختلفة )) واتە: ((ئێمەی كۆمەڵی پێغەمبەران برای باوكین و دایكمان جیاوازە، ئایینمان یەكەو، شەریعەتەكانمان جیاوازە)).

(٢)_ خوای گەورە لە ئایەتەكەی سەرەوە دەفەرموێ: ئەو ئایینەی بۆ داناوون كە بریتیە لە یەكخواپەرستی كە فەرمانی داوە بە نوح، یەكەم پێغەمبەر ئەوەش نیگامان كردووە بۆ تۆ و ئەوەش كە فەرمانمان داوە بە ئیبراهیم و مووساو عیسا، ئەمانە پێنج پێغەمبەرانی (أولو العزم)ن كە ئایینیان یەكە _ عليهم الصلاة والسلام _ كە بریتیە لە یەك خواپەرستی و وازهێنان لە شیرك و هاوەڵپەرستی و، خۆدورخستنەوە لێی.

(٣)_ ئەوەی خوای گەورە فەرمانی پێدابوون بریتی بوو لەوەی كە لەسەر ئەو ئایینەبن بەڕێك و ڕاستی و جیاوازی تێدانەكەن، ئەوەش بریتی بوو لە یەكخواپەرستی و، پەرستنی خوای گەورە بە تەنها و وازهێنان لە پەرستنی جگە لە خوای گەورە، پاشان فەرمووی: ((وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ)) جایز نییە بیروباوەڕ جیاوازی تێدا بكرێت، بەڵكو تەنها یەك عەقیدەو بیروباوەڕ بوونی هەیە كە بریتیە خوا بە یەكگرتن(یەكخواپەرستی) و وازهێنا لە هەموو ئەوانەی لە غەیری خوا دەپەرسترێن.

كَبُرَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ(١) اللَّهُ يَجْتَبِي إِلَيْهِ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ﴾ [الشورى: ١٣] واتـه: ئـەو ئايينـەی بۆ دانـاوون کـە فـەرمانی داوه بـەنووح و ئـەوەش نیگامان کردووه بۆ تۆ و ئەوەش که فەرمانمان داوه به ئیبراهیم و مووساو عیسا که له سەر ئەو ئایینەبن بەڕێك و ڕاستی و جیاوازی تێدا مەکـەن زۆر قـورس و گرانـە بـە لای هاوبەش دانەرانـەوە ئـەوەی ئـەوانی بـۆ بـانگ دەکـەیت خـوا هەرکەسـی بـویَ هـەڵی دەبژێریَ بۆ (موسوڵمان بوون) وە ڕێنموونیی کەسێك دەکات بۆ لای خوا بگەڕێتەوە.

---

(١)_ موشـریك و هاوڵپەرسـت لـە یەکخواپـەرسـتی دوردەکەوێتـەوە، لـەم بـارەوە خـوای گـەوره دەفـەرموێت: ﴿وَإِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَحْدَهُ اشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ وَإِذَا ذُكِرَ الَّذِينَ مِنْ دُونِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ﴾[الزمر: ٤٥] واتە: وە کاتێك یادی خوا بکرێت بەتاك و تەنها دڵیَ کەسانی تێکدەچیَ وە بێزار دەبیَ که باوەڕیان نییه بەڕۆژی دوایـی که چی کاتێك ناوی پەرستراوانی بێجگه له خوا ببرێت یەکسەر شادو ڕووخـۆش دەبـن. چـونکه کەسـانێکی زۆر لـە باسـکردنی یەکخواپەرسـتی و، بانگـەوازکردن بـۆ یەکخواپەرسـتی بێـزار دەبـن، دەڵـێن: بـە باسکردنی یـەك خواپەرسـتی خـەڵکی دور مەخەنەوه، بە ڕاستی ئەم شته مەترسیەکی گەورەیە، ئەوەی له یەکخواپەرستی ڕقـی دەبێتەوه مەترسیەکی گەورەی لەسەرە، ڕەنگه تووشی کوفر ببێت، کەوا بوو ئـەوەی ئیمانی لەدڵدا بێت ڕقی له یەك خواپەرستی نابێتەوه.

هـەروەها لـە ئایـەتێکی تـردا خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ(٥١) وَإِنَّ هَٰذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاتَّقُونِ(٥٢) فَتَقَطَّعُوا أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ زُبُرًا كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ(٥٣)﴾[1] [المؤمنون: ٥١_٥٣] واتە: ئەی نێرراوانی خودا لە خۆراکی پاك (حەڵاڵ) بخۆن وە کردەوەی چاك بکەن (چونکە) بەڕاستی من بەوەی ئێوە دەیکەن ئاگادارم وە بێگومـان هـەر ئەمەیە ئایین و دینی ئێوە (ئەی پێغەمبەران دەستی پێوە بگرن) کە یـەك ئـایین و بەرنامەیە وە منـیش پـەروەردگارتانم کەواتـە خۆتـان بپـارێزن (لـە تۆڵـەم) (شـوێنکەوتوانیان) ئایینەکـەیان (کـە یـەك ئـایین بـوو) پارچـە پارچـە کـرد لـە نێـوان خۆیانـدا بـە چەند پارچەیەك جا هەر کۆمەڵ و دەستەیەکیان دڵخۆشن بەو (بەشە ئایینەی) کە هەیانە.

---

(١)_ شاهێدی قسەکانمان لەو ڕستە قوڕ نیە دایە کە دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ هَٰذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاتَّقُونِ﴾ ئەی پێغەمبەران بێگومان هەر ئەمەیە ئایین و دینی ئێوە، دەستی پێوە بگرن، کە یەك ئایین و بەرنامەیە، منیش پەروەردگارتانم کەواتە: خۆتان لە تۆڵەم بپارێزن، کەوا بوو ئایینی پێغەمبەران یەکە ئاینیە و، ئەوان یەك ئوممەتن کە هـەر هـەموویان لەسـەر یەکخواپەرستی و، ئیمـان بـەخوان، ئـەوان یـەك ئوممـەتن لە یەکەمیانەوە تا کۆتاهەمینیان.

هەروەها خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ (٣٠) مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَاتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ (٣١) مِنَ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ(٣٢)﴾[١] [الروم: ٣٠_٣٢] واتە: کەواتە رووی خۆت رێک بکەرە ئایینی ئیسلام پاك و ڕاست بۆ خوا (شوێن ئایینی) داهێنراوی خوا بکەوە کە خەڵکی لە سەر دروست کردووە داهێنراوی خوا هیچ جۆر گۆڕانی بۆ نییە ئەو (ئایینەی باسکرا) هەر ئەوە ئایینی رێك و ڕاستە بەڵام زۆربەی ئادەمی نازانن (شوێن ئایین بکەون) بە تۆ بەکارانە بۆ لای خوا بگەڕێنەوەو لەو بترسن و بەچاکی نوێژەکانتان بکەن وە لە هاوبەش دانەران مەبن لەوانەی کە ئایینەکەیان بەش بەش کرد و بوون بە چەند بەشەوە هەر کۆمەڵێکیان بەو (ئایینەی) خۆیان دڵخۆش بوون.

---

(١)_ لەم ئایەتەدا خوای گەورە فەرمانی پێکردوون یەك ئوممەت بن، لەسەر یەك خوا پەرستی و ئیمانبن، بەڵام هەر جیابوونەوەو، جیاواز بوون، لەم بارەوە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَتَقَطَّعُوا أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ زُبُرًا﴾[المؤمنون: ٥٣] شوێنکەوتوانیان ئایینەکەیان کە یەك ئایین بوو، لە نێوان خۆیاندا پارچە پارچەی کرد بە چەند پارچەیەك، کتێب، هەر یەکێك چەندەها کتێب و دانراوی هەیە، پێچەوانەی ئەوەیە کە بەرامبەرەکەی لەسەریەتی و بڕوای پێیەتی، بەر پەرچی ئەویتر دەداتەوەو، کارەکانی ئاشکرا دەکات _ لا حول ولا قوة إلا بالله _، ئا ئەم ڕەفتارەیە کە خوای گەورە ئاگاداریی لە بارەوە، وە ئاگاداری کردوین، ﴿ كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ﴾[المؤمنون: ٥٣] هەر کۆمەڵ و دەستەیەکیان دڵخۆشن بەو بەشە ئایینەی کە هەیانە، ئەمەش کێشەیەکی ترە، گریمان جیاوازی ڕوویدا، بەڵام کە جیاوازیەکە ڕوودەدا لەتوانای مرۆڤدا نابێت لەسەر ڕاست و دروستی خۆی پێداگریی بکات، وە بەرامبەرەکەشی لەسەر هەڵە بێت، ناتوانێت پێداگریی لەسەر ئەمە بکات، بەڵکو

---

---

---

شیاوی پێچەوانە بوونە، ڕەنگە ئەو کەسەی موخالیفێتی لەسەر هەق بێت و، خۆی لەسەر هەڵە بێت، بەڵام ئەگەر لە بارێکدا لەسەر ڕاست و دروستی خۆی سوور بوو، بەرامبەرەکەی لەسەر هەڵە بێت  ئەمە کارەساتە، چونکە ناگەڕێتەوە، بەڵام یەکەم دەشێ بگەڕێتەوە، بەڵام ئەوەی لەسەر ڕاست ودروستێتی خۆی پێداگری دەکات و، گوایە کەسە موخالیفەکەی هەڵەیە، ئەو جۆرە ناگەڕێتەوە.

## ناوەرۆك